بوارێکدا و جگە لە فەلسەفەی ئیگزیستانسیالیزم، زۆر جەخت دەکەنە سەر هیۆمانیزم (مرۆڤگەرایی) و سکیۆلاریزمی ڕادیکاڵ (عەلمانییەت یان دونیاگەرایی).[1]

ئەمانە، چەند ئاراستەیەك بوون کە لە ناو ڕەوتی ڕۆشنبیرە فێمێنیستەکانی کوردستاندا باون و بە پێویست زانرا کە لە سەرەتای باسەکەوە بە کورتی باس بکرێن؛ چونکە ئەم بیرۆکانە لەم بەشەدا،زۆر دووبارە دەبنەوە و، هەروەك دواتر لە وتارەکانی ئەم ڕۆشنبیرانەدا دەبینین، لەوانەیە یەکێکیان هاوکات، خاوەن چەندین ئاراستە بێت لەو ئاراستانە؛ چونکە هەروەك مەرج نییە هەموو ئەم ئاراستانە لە یەك کەسدا هەبێت، مەرجیش نییە کە یەك کەس، لە یەك کاتدا خاوەن چەند ئاراستەیەکی فێمێنیستی بێت؛ بۆ نموونە تووشی ڕۆشنبیری فێمێنیستیی وا دەبین، کە سەرباری ئەوەی دیدگایەکی ڕادیکاڵیی هەیە، لە ڕوانگەیەکی دەروونکۆڵی و ئیگزیستانسیالیستیشەوە قسە دەکات. یان فێمێنیستی سۆسیالیستیش دەبینین کە ڕێکارێکی لیبراڵیش پێشکەش دەکات.

### 1.2- فێمێنیستی کورد، کاری ڕۆشنبیرایەتی و بابەتی ئازادیی ژن:

ڕۆژ نییە لەسەر بابەتی "ئازادیی ژن" شتێك نەبیسی یان نەخوێنیتەوە یان نەبینی! تەماشای تەلەڤزیۆن دەکەی دەبینی مێزگردێکی تایبەت بەم بابەتە تەرخان کراوە؛ گوێ لە ڕادیۆ دەگری، هەمان بابەت؛ ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێب دەخوێنیتەوە، دیسان هەمان بابەت! پوختەی هەموو قسەکانیشیان ــ کە زۆریش دووبارەیە ــ بریتییە لە "ئازادیی ژن".

زۆر دووبارەکردنەوەی "پەیام"ێك ــ بە پێی زانستی "کۆمەڵناسیی ڕاگەیاندن"* ــ نیشانەی ئەوەیە کە لە "پرۆسەی گەیاندن"دا کەموکورتییەك هەیە، کە یان لە "نێرەر"ە، یان لە "وەرگر"، یانیش لە "پەیام"ـەکە خۆیدایە. یەکێك لە خاڵە پێویستەکانی سەرکەوتنی پرۆسەی گەیاندنی پەیام ــ هەر پەیامێك ــ مەودا و مەجالی هاوبەشی شارەزایی و ئەزموون و ئاستی زانیاری و ڕۆشنبیریی نێوان نێرەر و وەرگرە، کە گرنگترین هۆکاری نزیککردنەوەی ئەم مەودا و مەجالەش، لە یەکتر تێگەیشتنە بەهۆی زمانی هاوبەشەوە. نێرەر ئەگەر سروشتی کۆمەڵگا و تایبەتمەندییەکانی وەرگر و جەماوەرەکەی نەناسێت و بە زمانی هاوبەشی ئەوان قسە نەکات

1 . بروانە: دوبووار، سیمون (2001)؛ "جنس دوم"؛ جلد 1و2؛ ترجمە: قاسم صنعوی؛ تهران: انتشارات توس.

* Sociology of Communication.

(زارەکی و نووسراو)، دیارە گرفتەکە لە خۆیدایە، نەك بینەر و بیسەر و خوێنەر. لەو حاڵەتەدا، زۆر دووبارەکردنەوەی پەیامیش وەك لێدانی چەکوش لە سندان و کوتانی ئاوە لە ئاوندا! پێم وایە کەموکورتیی ڕۆشنبیرانی فێمێنیست وەکو خاوەن بیرۆکە و نێرەری پەیامی ئازادیی ژن، لە سێ حاڵەت بەدەر نییە:

**یەك)** ئەوەی کەم بیر بکاتەوە، زۆر قسە دەکات! ئەوەیش کە زۆر قسە بکات، زیاتر تووشی هەڵە و قسەی بێسەروبەر و وڕێنە (هذیان) دەبێت. ئاسانترین کار بۆ ئەم تاقمە ڕۆشنبیرە بریتییە لە قسەکردن! ئەگەر قسەکانی ئەم ڕۆشنبیرانە بە پێوەری دەروونناسانە شی بکەینەوە، زۆربەی قسەکانیان بنەمایەکی ئەوتۆیان نییە و وەکو خانوویەکی ماکێتی و فلینەیی وایە کە بۆ فیلمسازی دروست دەکرێت و چۆنیان بوێت، دەری دەهێنن؛ تەنانەت با قەڵایەکی بەرزیش بێت، بەڵام بە پاڵپێوەنانێك یان فوویەك دەڕووخێت! بە دەربڕینێکیتر: ڕاستە کە قسەکانیان ئەستوونێکی ئەقڵی، مەنتیقی و مەعریفیی لە پشتەوە هەیە، بەڵام ئەم ئەستوونە هی خۆیان نییە و لە لایەن خۆیانەوە ئەندازەیی نەکراوە و، بۆ خانوویە ماکێتییەکەش دەست نادات؛ بۆیەش زۆر جار دەیانبینم کە لە ڕووی زەینییەوە زۆر پەرێشانن و دووچاری جۆرێك لە ئەنۆمیی مەعریفی بوونەتەوە و، زانستەکەیان دەلەنگێ! ئەم پەرێشانییەش هۆکاری خۆی هەیە: پێم وایە دەگەڕێتەوە بۆ زۆر کۆپیپێست (Copy & Paste)کردنی مەعریفە و زانیارییەکانی ئەملاوئەولا لە ناو پرۆسێسۆری مێشکیان، کە پێڕاناگات ئەم هەموو داتایە ئاڵۆز و هاوردەیە پرۆسێسینگ بکات؛ چونکە ئەم مەعریفانە بەرهەمی ئەو مێشکە نین و لە مێشکەکانی دیکە، بە زمانێکی دی و بۆ کەشوهەوایەکی دی، لەبەر مۆتیڤی تایبەت بە دۆخی خۆیان بەرهەمیان هێناون، هاوردە کراون و ئەوەش، هەم کاتی دەوێ تا جارێ خۆیان لێی تێبگەن و دواتر بکوردێنرێن، ئینجا دەستەبەندییان بکەن و سەرئەنجام بە زمانی بیسەر، بینەر و خوێنەر پێشکەشی بکەن! خۆ تەنها بە لاساییکردنەوەی قیافە و پۆزلێدانی ڕۆشنبیران و ئارایشتی پێش دەرچوون لە شاشەی تەلەڤزیۆن، هیچ لە دۆزەکە ناگۆڕێت. کێشە ئەوەیە کە کەسی ڕواڵەتگەرا و ڕووکەشبین، بە تەئکید لە شتی قووڵ و بەپێز، قووڵ نابێتەوە و هەر بە ڕواڵەتەوە خەریك دەبێت و، ئاگای لە کاکڵەی بابەتە مەعریفی و مەعنەوەییەکانی ناو مێشك و زەین نییە و، لە کۆڵ تویکڵ نابێتەوە؛ هەر ئەوەشە کە هەندێ هەڵسوکەوت و ڕەفتار لەو ڕۆشنبیرانە دەبینین، کە بینەر و بیسەر و خوێنەر، وەك خۆیان دەڵێن: تووشی "شۆك" بکەن! ئەمە ئاکامی پەرێشانی و شپرزەیی مەعریفی ـ زەینییە؛ ئەوانەی

زەینیان شێواو و ئاڵۆزە، پێویستە یەکەمجار لە دوای سافکردنی مێشك و زەینیان، زمانی خۆیانیش پاك و پاراو بکەن؛ واتە قسەیەك بکەن کە لێی تێبگەن و لە لایەنی بەرامبەریش داوا بکەن کە قسەیەك بکەن ئەوانیش لێی تێبگەن. "نوئام چومسکی"* ـ زمانناس و فەیلەسووفە ئانارشیست و تیۆرەوانی ئەمریکایی ـ بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە هەر ڕستەیەك کە لە ڕووی ڕێزمانییەوە تەواو بێت، مەرج نییە لە ڕووی ماناشەوە تەواو بێت، نموونەیەك دەهێنێت کە دەڵێت: "برازای سێگۆشەی ئێمە، عاشقی نیوەگۆیی ئێوە بووە!". دەبینین کە لە ڕووی ڕێزمانەوە تەواوە، بەڵام هیچ مانایەکی نییە!

**دوو)** زۆر دووبارەکردنەوەی بابەتێك، هەندێ جار نیشانەی درۆیەکی گەورەیە! لە "دەروونناسیی پڕۆپاگەندە"**دا تیۆرێك هەیە بە ناوی "درۆی گەورە" (The Big Lie)، کە لە قسە بەناوبانگەکەی "هیتلەر"ەوە وەرگیراوە کە دەڵێ: "ئەگەر ویستتان درۆیەك لە ناو کۆمەڵگادا وەك ڕاستییەك بڵاو بکەنەوە، بەردەوام دووبارەی بکەنەوە، تاکو لای خەڵك (بیسەر و بینەر و خوێنەر) قەناعەت دروست بێ و هەموو بڕوای پێ بکەن. درۆش چەند گەورەتر بێ، هێزی باوەڕپێکردنی زیاترە و خەڵك زووتر باوەڕ دەکات!".[1] "ژۆزف گوبێلز"***یش ـ وەزیری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی حکومەتەکەی هیتلەر ـ لەبارەی تەکنیکی پڕۆپاگەندەی ئینگلیزەکانەوە دەڵێ: "درۆ هەر چەند گەورەتر بێ، خەڵکی ڕەشۆك و عەوام ئاسانتر قبووڵی دەکەن. پێویستە بەردەوام دووبارە بکرێتەوە، تەنانەت ئەگەر بشبێتە مایەی گاڵتەپێکردن... هەندێ جار درۆی وا گەورەم دەکرد بە خۆشم سەرم سڕ دەما!".[2]

**سێ)** لەوانەشە گرفتەکە لە هەڵبژاردنی جۆری پەیام و ناوەڕۆکەکەی بێت. سروشتی کۆمەڵگا و جەماوەرەکەی (وەرگرانی پەیام)، جۆری پەیام دەستنیشان دەکەن. ئەگەر تاکی نێرەر هەر پەیامێك بە گوێرەی ویست و حەز و چاوەڕوانییەکانی خۆی ئامادە بکات، کە لەگەڵ سروشت و پێکهاتە و هەوێنی ئەو کۆمەڵگایە نامۆ بێت و نەگونجێت، زۆر سەختە کە پرۆسەی گەیاندنی پەیامەکەی سەربکەوێ؛ وەکو ئەوە وایە بێی لە مزگەوتدا بانگەشە بۆ مەی بکەیت، یان بەپێچەوانەوە بانگەشەی ئیسلام بکەی لە گازینۆیەکی پڕ لە مەیخۆر و سەرخۆش و داوایان لێ

---

* Noam Chomsky (1928-Present).

** Psychology of Propaganda.

1 . Hitler, Adolf (2012), "**Mien Kampf**", Translated by: James Murphy; Charleston: CreateSpace Independent Publishing Platform, p. 196.

*** Paul Joseph Goebbels (1897-1945).

2 . Goebbels, Joseph (1941), "**Die Zeit ohne Beispiel**", Munich: Zentralverlag der NSDAP., pp. 364-369.

بکەی نوێژی جەماعەتت لەگەڵ بکەن! کەواتە نموونەی پەیامی ئازادیی ژنانی وڵاتە ڕۆژئاواییەکان ڕوونوس بکەیت و دەرخواردی خەڵکی خۆمان بدەیت، ئەوەی فێمێنیستانی خۆمان دەیانەوێ، قەت لێی شین نابێت؛ پێم وایە هەر لەبەر ئەوەیشە کە ئەوەندە پێویستییان بە دووبارەکردنەوە هەیە.

لە لایەکی‌ترەوە، باسکردنی کێشەکانی ژنان لەم کۆمەڵگایە و وتنەوەی دووبارە و چەندبارەیان لە لایەن ئەم تاقمە ڕۆشنبیرانەوە، هونەر نییە؛ چونکە هەموو کەسێك، تەنانەت خەڵکی ئاسایی و نەخوێندەواریش دەزانن کە ژن، بە ڕاستی کێشەی هەیە و لە ژیان و دۆخێکی نموونەییدا نییە؛ کەواتە هەرگیز ئەم ڕۆشنبیرە فێمێنیستانە دۆزەرەوەی ئەم بابەتە نین، کە بەم شێوەیە مامەڵە لەگەڵ ئەم بابەتە دەکەن، گوایە هونەری ئەوانە خەڵك هەست بەو کێشانە دەکەن، بەڵکو نوخبە و کەسە بژاردەکانی دیکەش، لەوانەیە پێش ئەوانیش، وەك: مامۆستایانی ئایینی، مامۆستایانی زانکۆ، کۆمەڵناسان، دەروونناسان، مافناسان، یاساناسان و سیاسەتوانان لە هەبوونی ئەم کێشانە بەگازندەن و باسیان لێوە کردووە و دەشیکەن. ئەوەی کاری ئەم نوخبە ڕۆشنبیرانە جیا دەکاتەوە، ڕێگەچارە و چۆنیەتی ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ ئەم کێشانە، کە هەر کام لە ڕوانگەی خۆیەوە لێی دەڕوانێت و جۆری چارەسەرەکانیش پەیوەستن بە جۆری ئاراستەکانیانەوە؛ بۆ نموونە: لەوانەیە مەلایەکی کورد وەکو فێمێنیستێك گلەیی لە هەبوونی ئەم کێشانە بکات، هەر دووکیان دەڵێن کە کێشە هەیە و نابێ هەبێ و دەبێ چارەسەر بکرێن، بەڵام لە پێشکەشکردنی دەرمان و ڕاچێتەنووسین، یەکێك دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکانی ئایینی ئیسلام و، ڕەفتاری خەڵکی موسڵمانی ناپابەند بە ئایین کە کێشە دەنێنەوە بۆ ژنان، لە دەقە پیرۆزەکان و خودی ئایین جیا دەکاتەوە و داوایان لێ دەکات کە بەپێی ئایینەکەیان ڕەفتار بکەن کە بڕوایان پێیەتی. ئەوەی دیکە دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکانی مودێرنیتە و، ئەزموونی وڵاتە ڕۆژئاواییەکان دەکاتە پێوەر و چوارچێوەیەکی ژێدەری بۆ ڕەفتارەکانی ئەو تاکانەی کە دروستکەری ئەو کێشانەن بۆ ژنانی کورد.

بەرلەوەی لەسەر پەیوەندیی نێوان ئەم ڕۆشنبیرانە لەگەڵ بابەتی ئازادیی ژنان بدوێین، پێویستە باس لە لایەنە مەعریفی و هزرییەکەیان بکەین، کە کەرەستەی سەرەکیی کاری ڕۆشنبیرییە، وەك کەرەستەی ئارد بو نانەوا. بەپێی زانستی "زمانناسیی تێگەیشتن و فامین"*،

* Cognitive linguistics.

هەروەها "فەلسەفەی زمان"*، هەر قسەیەك كە دەكرێ، مەعریفە و تێگەیشتنێك لە پشتیەوە هەیە. پرسیار ئەوەیە: ئایا ئەو ڕۆشنبیرانەی ئەو قسانە دەکەن، دەرهاوێشتەی مێشکی خۆیانە، یان خۆراکێکی ئامادەکراوی هاوردەکراوە؟ ئێستا کاری ئەوان چییە و، دەبوو چ بوایە؟ ئایا ئەرکی خۆیان وەك کەسانێك کە هەڵگری پەیامێکی قورس و گرنگن، بە تەواوەتی جێبەجێ دەکەن؟

لە دوای خوێندنەوەی وتاری ڕۆشنبیرانی خۆمان، بۆم دەرکەوتووە کە ڕۆشنبیران ــ بەردەوام ــ ئەو لافە لێ دەدەن کە لە ڕوانگە و گۆشەنیگایەکی نوێیەوە دەڕواننە بابەتەکاندا؛ لە تاریکستانی وشکایەتی، دوگماتیزم، چەقین و فیکسیزم (Fixism) تێپەڕیون و، گۆڕانکاری، ترانسفۆرمیزم (Transformism) و دینامیکیبوونیان کردووەتە ڕێکار و ستراتیژییەتی خۆیان لە شیکردنەوەی بابەتەکان و پێشکەشکردنی ئەجیندا و پرۆگرامەکانیان؛ بۆیە بە ڕوانینێکی ڕەخنەگرانە دەڕواننە نەریت (Tradition) و نەریتخوازان و، ستاتیکییەت و نەگۆڕی، سەرنجنەدان بە گۆڕانکارییە ماددی، مەعنەوی، کولتووری و کۆمەڵایەتییەکان، ڕاکردن لە ڕەخنە، دەمارگیری و کەللەڕەقی، هەموو بە خاڵە لاوازەکانی دیدگای نەریتگەرایی دەزانن.

هەڵبەت شایانی باسە، هەوڵ و کۆششەکانی ئەو ڕۆشنبیرانەی کە بە ڕاستی لە پێناو دۆزینەوەی هاوسەنگییەکی کارامە و دروست و گونجاو لە نێوان توخمی "نەگۆڕ و ستاتیك" و "بگۆڕ و دینامیك" یان بە واتایەکیتر: سازان لە نێوان "نەریت" و "مودێرنیتە" دەکۆشن، جێگای دەستخۆشی و ڕێزە، بەڵام بەداخەوە ئەو تاقمەی کە مەبەستمانە و بە ناوی ڕۆشنبیر و فێمێنیستەوە لە میدیاکان دەردەکەون و بابەتەکانیان بڵاو دەکرێتەوە، بە پێچەوانەی ئیددیعا و بانگەشەیان، بە جۆرێك لە جۆرەکان، تووشی وەستان و وشکایەتی، لاساییکردنەوە و ڕووکەشبینی و نەبوونی تێفکرینی قووڵ بوونەتەوە. خوێندنەوەی بەرهەمەکان و بیستنی قسەکانیان، لانیکەم سەبارەت بە "بابەتی ژنان"، بە ڕۆشنی دەردەخات کە ئەوانە لە سەربەخۆیی بیروڕا و بۆچوون لە مەیدانی مەعریفە و هزر و ئەندێشە بێبەشن؛ بە شێوەیەك کە گرنگترین ئاسەواری نووسراو و زارەکییان (کە دواتر ئاماژەیان پێ دەکەین)، کەوتووەتە ژێر کاریگەریی بیروبۆچوونەکانی بیرمەندانی جیهانی ڕۆژئاوا و تەنانەت ڕۆشنبیرانی هاوچەرخی جیهانی عەرەبیش! کەوتنە ژێر ئەم کاریگەرییە لە بابەتی ژنان هەندێ جار ئەوەندە پڕ ڕەنگ و توخە، کە لە جیاتی پێشکەشکردنی نموونەیەکی کامڵ و یەکلاکەرەوە و گونجاو لەگەڵ بارودۆخی کۆمەڵگاکەمان، کە

* Philosophy of language.

بە ڕاستی هەست بکرێت ئەو نموونەیە باشترین ڕێگەچارە و بەدیلە، تەنها وەسف و پەسنی نموونەی ڕۆژئاوایی دەکەن و بەردەوام پێیداهەڵدەڵێن و، ئەزموونی ئەوان دەکەنە راچێتەی چارەسەری کۆمەڵگامان؛ کەچی لە هەموو ڕوویەکەوە هیچ پەیوەندییەکی بە کۆمەڵگای ئێمەوە نییە؛ نە لە ڕووی مێژووییەوە، نە جوگرافی، نە ئایینی، نە لە ڕووی سروشت و شوناس، نە کولتوور و دابونەریتەوە؛ نە "ژین"یان وەکو ئێمەیە، نە "ژان"یان؛ ئەوان بەشێوەیەك ژیاون کە نموونەی ئەو ژیانە لە هەموو مێژووماندا نادۆزرێتەوە؛ مێژوویان پڕە لە شەڕ، نەهامەتی، بەدبەختی، خوێن، ئاگر، تۆقاندن، چەوساندنەوە و هەوراز و نشێوی یەك لە دوای یەك؛ بۆیە کێشەی ئەوان زۆر جیاوازە لەوەی خۆمان (لە بەشی دووەمدا بە تێروتەسەلی باسی لێوە دەکەین). ئەو کێشە و نەخۆشییانەش هەڵقوڵاوی مێژوویەکی پڕ لە شۆڕش و گۆڕانکاریی زۆر خێرا و ئەمپەڕ و ئەوپەڕ (ئیفرات و تەفریت)ی بەردەوام بووە؛ زۆر سەیرە ئەوان لە بەر ژانی خۆیان لەوێ ــ شوێنێك کە ڕۆژ لێی ئاوا دەبێت ــ بناڵێنن، کە لە پێناو نەهێشتنی ئەو ژانە پەنایان بردووەتە بەر جۆرەها دەرمانی فیکری و فەلسەفی و، هەر ڕۆژێك دەرمانێکی نوێ و بەرهەمێکی نوێ، کە زۆر جیاواز بووە لەگەڵ دەرمانی دوێنێیان و، ئێمەش لێرە ــ شوێنێك کە ڕۆژ لێی هەڵدێت ــ لەبەر ژانی ئەوان، بناڵێنین! ئەوان ڕۆژێك لە ڕۆژان لەوێ سەریان ئێشاوە، ئێمە ئێستا لێرە سەرمان بە دەستماڵ دەبەستین!

نکۆڵی لەوە ناکرێت کە ڕۆژئاوا لە زۆر ڕووەوە بەتایبەتی لە ڕووی ماددی، تەکنۆلۆژیا، زانست، پلان و ڕێکخستنەوە تا ڕادەیەکی سەرسوڕهێنەر پێشکەوتووە و لە لووتکەی پێشکەوتندایە و پێویستە ئێمەش سوودیان لێ وەربگرین و چاویان لێ بکەین، بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو پێشکەوتنە و، دۆزینەوەی ئەم هەموو ڕێگەچارە و دەرمانانە بۆ زۆر کێشە و نەخۆشی، هێشتا بە دەست کێشەی ژن و خێزانەوە دەناڵێنن و نەیانتوانیوە ئەو کێشەیە چارەسەر بکەن و ڕزگاریان بێت، کەچی فێمێنیستان و زۆر ڕۆشنبیری خۆمان تەنها چاو لەو لایەنە دەکەن و لاساییان دەکەنەوە و، دەیانەوێ ئەزموونی ئەوان لێرە بەبێ لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە، وەك بریارێکی پێشوەختەی پەسەندکراو و ئیمزاکراو، جێبەجێ بکەن؛ وەك ئەو کەسەی کە جلوبەرگی کەسێك، کە تەنها بۆ خۆی گونجاوە، لەبەر کەسێکی دیکە بکات!

ڕاستە ئەمجۆرە کەسانە کاری ڕۆشنبیران دەکەن، بەڵام پێم وایە بەکارهێنانی چەمکی "ڕۆشنبیر" بۆیان لەم کتێبەدا زۆر نابار و نەگونجاوە؛ چونکە ڕۆشنبیربوون کۆمەڵێك سیفات و

تایبەتمەندیی هەیە کە لە خەڵکی عەوام و ئاسایی جیایان دەکاتەوە، کە ئەمانەی مەبەستمانە لە زۆربەیان بێبەشن، بەڵام لەبەر ئەوەی ـ بمانەوێ و نەمانەوێ ـ "کاری ڕۆشنبیرایەتی" دەکەن و ڕۆڵی ڕۆشنبیران لەو کۆمەڵگایەدا دەگێڕن و، کۆمەڵگاش بە لێراهاتنێکی کۆمەڵایەتی بە "ڕۆشنبیر" ناویان دەبات، توێژەریش ناچارە کە لێرە ئەم ناوەیان بۆ بەکار بێنێ!

ڕۆشنبیرانی ئێمە "ڕۆشنبیر"* و "ڕۆشنبین"** نین، بەڵکو "بەکاربەر" و "بەرهەمخۆر"ن! و لەبەر ئەوەی دەتوانن "زۆر" قسە بکەن و "هەموو" قسەیەکیش دەکەن، میدیاکان فەراغ و بۆشایی بەرنامەکانیانی پێ پڕ دەکەنەوە و ئەوەش هەموو ڕۆژ دووبارە دەبێتەوە، تاکو ئاخری ناوبانگی پێ دەردەکەن و وای لێ دێ هەم خۆیان (وەك نێرەر)، هەم میدیاکان (ناوەندەکانی ئامرازی گەیاندنی جەماوەری)، هەمیش خەڵك (وەرگری پەیام) وا دەزانن کە بە ڕاستی ڕۆشنبیرن و پێویستە بۆ هەموو بابەتێك (سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، شەڕ و ئاسایش، پەیوەندیی نێودەوڵەتی، کولتووری، تەندروستی و تەنانەت ئایینیش) بانگهێشت بکرێن و بۆ پرێستێژبەخشین بە بەرنامەکان و مێزگردەکان ئامادە بن!

کەچی، ڕۆشنبیر ئەو کەسەیە وا ڕۆشن بیر دەکاتەوە و ئەو شتانەی کە بۆ خەڵکی عەوام نهێنی و نادیارن و بە پێنج هەستەکان سەرلێدەرناکرێن، بۆ ئەو ڕوون و ڕۆشنە و سەری لێدەردەهێنێت. کەسێکی بەئاگا، هۆشیار و تێگەیشتووە، بەتایبەتی شارەزایی و زانیارییەکی تەواوی لە سروشت و واقیعی کۆمەڵگا و ژینگەی دەوروبەری خۆیەوە هەیە. خاوەن پەیامێکە بۆ ڕزگارکردنی کۆمەڵگا لە نەزانینەوە بۆ زانین. بۆ ناسینی کۆمەڵگای خۆی، پێویستە لاپەڕە شاراوەکانی فەرهەنگ و کولتوور، دابونەریت، باوەڕەکان، پێوەر، بەها و ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکانی یەك بە یەك هەڵداتەوە. بەرامبەر بە کۆمەڵگا، خۆی بە بەرپرسیار دەزانێت و بێدەنگ نابێت. ئامانجی دروستکردنی گۆڕان و پێشکەوتنی کۆمەڵگایە بۆ بەرەو باشتربردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و چەسپاندنی دادپەروەری. بۆ گەیشتن بەو ئامانجەش، بەردەوام "ڕەخنە" لە هەموو شتە ماددی و مەعنەوی و مرۆییەکانی کۆمەڵگا دەگرێت و، خۆی لە هەموو سنوورێك دەدات و هیچ بەربەستێکیش ناناسێت؛ نە بەربەستی سیاسی، نە کۆمەڵایەتی، نە ئایینی و نە ئابووری. بێدەنگ نابێ لە ترسی مووچەبڕین یان دەرکردن لە حیزبی سیاسی یان

* Intellectual, Enlightened

** Clear-Sighted, Clair-voyant

لابردنی پۆستی سیاسی و هتد! مەرج نییە ڕۆشنبیر خوێندەوارێکی ئەکادیمیك بێ، بەڵام نابێ ڕووکەشبین بێ یان لاسایی بکاتەوە؛ نە لە بیرکردنەوەدا، نە لە ڕەخنەگەری و نە لە هیچ کارێکی مەعریفیی دیکەدا. هەرکاتێ ڕۆشنبیر لاساییکەر و ڕووکەشبین و ڕواڵەتگەرا بوو، ئەوا دەبێتە کەسێکی ئاسایی کە هەندێ زانیاریی هەیە لەبارەی هەندێ بابەتی دیاریکراو، کە پێشتر خوێندوویەتی و زووتر لە خەڵکیتر بەدەستی کەوتووە و ئێستاش پێشکەشی ئەو خەڵکانەی دەکات کە لەو بابەتگەلە بێئاگان. کەسێك کە شیعری شاعیرێك ئەزبەر دەخوێنێتەوە، پێی ناڵێن شاعیر، با دەنگ و شێوازی خوێندنەوەی شیعرەکە لە شاعیر و هۆزانڤانەکەش خۆشتر و ڕەوانتریش بێت! لە لایەکی دیکەوە، ڕۆشنبیر چەند بەتوانا بێت لە ڕەخنەگرتن، پێویستە لە هونەری گوێگرتن لە ڕەخنەی بەرامبەریش بەتواناتر بێ. ئایا ئەم تایبەتمەندییە پێویست و گرنگانە لە ناو ڕۆشنبیرانی خۆماندا دەبینین؟!

ئەگەر یەکێك لە کارە سەرەکییەکانی ڕۆشنبیران هەورەك گوتمان ڕەخنەگرتن بێت لە هەموو شتێکی بچووك و گەورە، (جا ئەو شتە تایبەت بێت بە گەورەترین کەس، گەورەترین ئۆرگان، گەورەترین کار و گەورەترین بیرۆکە، بەبێ ڕەچاوکردنی بەربەستە کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابوورییەکان)، پێویستە لە بیستن و وەرگرتن و قبووڵکردن و تەحەموولکردنی ڕەخنەی بەرامبەرەکانیش پێشەنگ و سەرمەشق بن، کە بە داخەوە ڕۆشنبیرانی ئێمە لێی بێبەشن! جگە لەمەش، ئەم ڕۆشنبیرانە لە پرۆسەی "ڕەخنەگرتن" تەنها بۆ "ئایین" زیرەکن و ناوێرن باسی چاو و برۆی کەسێك بکەن کە بەندەیەکی خوایە، بەڵام لە ڕەخنەگرتن لە خوای ئەو بەندەیە زۆر بوێرن، کە بۆچی خوا ــ پەنا بە خۆی ــ بە دڵی ئەوان دونیای خەڵق نەکردووە و یاساکانی خۆی بە ویستی ئەوان دانەبەزاندووە و پرس و ڕاوێژی پێ نەکردوون! هەندێ جار وا دەبینم ئەگەر ئایین نەبووایە، ئەوان بە چی نانیان دەخوارد؟ پێم وایە بەو کردەوانە وەختە دڵنیامان بکەنەوە کە جگە لە لێدانی ئایین، هیچیتر نازانن و قسەیتریان پێ نییە؛ بۆیە لە هەر مێزگردێك، پێشکەشکردنی وتارێکی بیسراو، بینراو و نووسراو، هەوێنی قسەکانیان ئایین و ڕەخنەلێگرتنیەتی، با پەیوەندیی بە مژاری بابەتەکەشەوە نەبێت!*

* خۆ ئەگەر کەسێك بۆ نموونە مەلایەك لە مزگەوتێك، وەڵامی ڕەخنەکانی ئەوان بداتەوە و بەرگری لە باوەڕ و پیرۆزییەکانی ئایینی خۆی و زیاتر لە (90%)ی خەڵکەکەی بکات، بە دەمارگیر و دوگماتیست و کۆنەپەرست ناوی دەبەن و دیسان ئەم هەڵەش دەقۆزنەوە و دەیکەنە خۆراکی خۆیان و بابەتێکی دیکەی ڕەخنەگرتن لە ئایین و ئایینمەداران کە لێی ڕاهاتوون و وەکو بنێشت لە میدیاکان، کایەی جووڵانەوەی ئازادانەیان، دەجوێنەوە، بەڵام خۆیان ئامادە نین و بەرگەی نەك ڕەخنە، بەڵکو خستنەڕوو و وەسفی

پێم وایە ڕۆشنبیری ڕاستەقینە وێڕای ڕەخنەگرتن لە کۆمەڵگا، ئەو کەسەیە کە بۆ خەڵکەکەی ڕوون بکاتەوە لە کوێ، خۆیان بیریان کردووەتەوە و، لە کوێ لاساییان کردووەتەوە. پەیامی ڕۆشنبیر دەبێ ئەوە بێت کە خۆت بیر بکەرەوە و بە هیچ شێوەیەك مەبە بە لاساییکەر! نەك وەکو ئەو ڕۆشنبیرنمایانە کە تەنها بیرۆکەی ئەوانی‌تر دەگوازنەوە؛ زیاتر وەرگێڕی باشن تاکو بیرمەندێکی باش؛ قسە دەکەن، بەڵام قسەی خۆیان نییە! بیرکەرەوە و داهێنەری فیکر و هزر و ڕەخنە نین، بەڵکو ئەگەر بیریش بکەنەوە، تەنها بیر لە بیرکردنەوەکانی داهێنەرەکانی دیکە دەکەنەوە؛ ئەویش نە بۆ خۆراکی ئەقڵی و تێرکردنی لایەنی مەعریفیی خۆیان، بەڵکو بۆ بەکارهێنان و خۆدەرخستن و چۆنیەتیی نان پێخواردنی!

کەواتە هەر ڕۆشنبیرێك کە دوو سیفەتی "لاساییکردنەوە" و "ڕووکەشبینی"ی پێوە دیار بوو، بە ڕۆشنبیر لەقەڵەم نادرێت؛ چونکە ئەو کەسەی کە ناتوانێ فکر، هزر، مەعریفە و تەنانەت "ڕەخنە"یەکیش بەرهەم بهێنێت و، بەڵکو تەنها مەعریفە و هزر و ڕەخنەکانی بەرهەمهێن و داهێنەرەکانی دیکە دەگوازێتەوە و دووبارەیان دەکاتەوە، بۆی نییە ناوی "ڕۆشنبیر" لە خۆی بنێت یان لێی بندرێت؛ با ڕوخسار و ڕواڵەت (بۆ نموونە چاویلکە و قژی سەر و پۆشاك)ی وەك

---

بیرۆکەی خۆیان نییە، کە هەر خۆیان لە میدیاکان پێشکەشیان کردووە و، زوو هەڵدەچن و یادداشتنامە و سکاڵانامە تۆمار دەکەن و تەنانەت بە هەڵگرتنی لافیتە و پەڕۆ دەڕژێنە سەر شەقامەکان، وەك چۆن موسڵمانە ئاساییەکان بۆ دەربڕینی تووڕەیی و نارەزایی خۆیان بەرامبەر بە کاریکاتۆرە دانیمارکیکردەکان دێنە سەر شەقام! بۆ نموونە: "فەرمان خەرابەیی"، مەلایەکی کوردی ئەم وڵاتە و وتارخوێنی مزگەوتێکی ئەم کوردستانە بە نووسین و بڵاوکردنەوەی نامیلکەیەك ــ هەروەك خۆی دەڵێت ــ هەندێ ڕاستیی ونبووی لە پشت پەردەی نییەت و پیلان و قسە و دەستکەوتەکانی ئەو ڕۆشنبیر و فێمێنیستانە ئاشکرا دەکات، کە یەکەمجار (تامان شاکر، نەزەند بەگیخانی، خانم ڕەحیم، ڕێکپۆش عەزیز، هاوژین حەمەرەشید، هۆزان مەحمود، پەخشان زەنگەنە) هەر حەفتەکەیان لە بەیاننامە هاوبەشەکەی (2010/12/29)یاندا، کە ناویان لێ نابوو: "هێرشێکی نارەوا لە دژی بزووتنەوەی یەکسانیخوازی ژنان"، ئاوەها گلەییان لە حکومەت و لایەنە پەیوەندیدارەکان کردووە کە چۆن ڕێگەیان داوە ئەم کتێبە چاپ بکرێت: "بەداخەوە، لە بەرامبەر ئەم هەڵمەتەدا کەمتەرخەمی و لاموبالاتییەك لە لایەن حکومەت و لایەنە پەیوەندیدارەکانەوە هەستی پێدەکرێ؛ تەنانەت ئەو حیزبانەی کە خۆیان بە عەلمانیش دەزانن بێدەنگییان هەڵبژاردووە". بڕوانە: ماڵپەڕی کوردستان ئونلاین (2010/12/30)؛ کاتژمێر (16:30)؛ **"هێرشێکی نارەوا لە دژی بزووتنەوەی یەکسانیخوازی ژنان"**؛ لە ماڵپەڕی:

http://www.kurdistanonline.net/news/2350

ئەم مەلایە بە خۆی دەگێڕێتەوە: "دوای ئەم (*7*) کەسە، بەیاننامەیەکی‌تریان بڵاوکردووە کە ئەمجارە ئیمزای (*86*) کەسی لەسەر بوو، دواتر بەیاننامەیەکی‌تریان بڵاوکردووە کە ئیمزای (*100*) کەسی لەسەر بوو، دواتر یەکێك لەو ئافرەتانەی کە دانیشتووی ئەوروپایە، (*1000*) ئیمزای لە دژی کتێبەکە کۆ کردبۆوە. دواتر لە (*2011/1/5*) کۆمەڵە کەسێکی کەم ڕێپێوانیان لە دژم ئەنجامدابوو لەبەردەم پەرلەمان، هەروەك لە هەواڵێکی ڕووداونێت هاتبوو: ئەمڕۆ (*2011/1/5*) لەبەردەم پەرلەمانی کوردستان، ڕێکخراوەکانی ئافرەتان خۆپێشاندانێکیان بۆ بەردەم پەرلەمانی کوردستان ئەنجامدا و تێیدا داوایان لە سەرۆکایەتی پەرلەمان و وەزارەتی ئەوقافی هەرێمی کوردستان کرد، کە نووسەری نامیلکەی (ڕاستییەکی ونبوو) بدەنە دادگا. لەدوای ئەو سکاڵایەکی یاسایم لەسەر تۆمارکرا. بەهۆی ئەم سکاڵایەوە بانگی دادگا کرام...". بڕوانە: مەلا فەرمان خەرابەیی (2010)؛ **"ڕاستییەکی ونبوو"**؛ هەولێر: وێنەی ئەلکترۆنی؛ چاپی سێیەم؛ ل 6 - 7. پرسیار ئەوەیە: کێ دوگماتیست و دەمارگیرە؟!

ڕۆشنبیرە هەرە بەناوبانگەکانی ئەوپەڕی دونیاش بێ، با هەموو ڕۆژ لە شاشەی تەلەڤزیۆنیش دەربچێ و کۆڕ و سمیناری بۆ ساز بکرێت و هتد؛ چونکە ئەو تەنها تاکێکی خوێندەوارە؛ ئەویش خوێندەوارێکی وەرگێڕ و بەرهەمخۆر و لاساییکەر! پێم وایە هەر کەسێك کە لە فیکر و بۆچوون و مەعریفەدا لاسایی بکاتەوە، تەمەنە فیکری و مەعریفییەکەی زۆر کورت و بێبەرەکەت دەبێت. کەم کەس هەیە کە لە کۆمەڵگای خۆماندا (90) ساڵ عەمر بکات، بەڵام ئەگەر ڕۆشنبیرە ڕووکەشبینەکانمان (90) ساڵ تەمەن بکەن،* پێم وایە یەك ساڵی تەمەنیان، (90) ساڵ دووبارە دەبێتەوە! چونکە دەرنەچوون لە بازنەی لاساییکردنەوە، وایان لێ دەکات کە هەموو ڕۆژ و ساتێکی ژیانیان وەکو یەك بێت و، یەکساڵی تەمەنیان جارانی (90) ساڵ دەکرێتەوە؛ وەکو ئەسپێك کە بە دەوریدا بازنەیەکی داخراو و پەرژینکراو هەبێت و لەو بازنەیەدا بخولێتەوە، ڕاستە کە غار دەدات و دەجووڵێتەوە و مەودایەك دەبڕێت، بەڵام لە خاڵی (أ) دێتەوە خاڵی (أ) و تەنها لە دەوری خۆی دەسووڕێتەوە!

ئێمە دەبێ بە خۆمان بیر بکەینەوە و ئەوەی دەیکەین، لانیکەم بزانین بۆ دەیکەین و با بە هۆشیاری و ئاگادارییەوە بێت؛ تەنانەت ئەگەر لاساییکردنەوەش بێت؛ قورئان زۆر بە جوانی ئاماژە بەوە دەکات: ﴿لیهلك من هلك عن بینه و یحیی من حی عن بینه﴾؛[1] واتە: بۆ ئەوەی لەناو بچێ ئەو کەسەی لەناو چووە لە ڕووی بەڵگە و زانیارییەوە و، بۆ ئەوەی بژی ئەوەی دەژێ لە ڕووی بەڵگە و زانیارییەوە؛ مەبەستی ئەوەیە: کێشە ئەوە نییە کە هەندێ کەس بەشوێن لەناوچوون و ڕێگای گومرایی و نەهامەتی دەگەڕێن، بەڵکو کێشە ئەوەیە کە ئەو کارە لە ڕووی زانیاری و هۆشیارییەوە نەیکەن! لەوەش باشتر، زۆر باشە کە خەڵکانێك بە دوای هیدایەت و بەختەوەریدا بگەڕێن، بەڵام پەسەندتر ئەوەیە کە ئەوەش لە ڕووی ئاگاداری و هۆشیارییەوە بێت! کاری ڕۆشنبیر بەوەدا دیارە کە هەر کارێك کە دەکات، بە ئاقڵی و زانیاری و هۆشیارییەوە بیکات: ﴿و لا تقف ما لیس لك به علم إن السمع و البصر و الفؤاد کل أولئك عنه مسئولا﴾؛[2] واتە: شوێن شتێك مەکەوە کە زانیاریت لەبارەیەوە نەبێت؛ چونکە بە ڕاستی دەزگاکانی بیستن، بینین، ئەقڵ و تێگەیشتن هەر هەمووی بەرپرسیارە بەرامبەریەوە! ئەوە ئەرکی سەرەکیی ڕۆشنبیر و ڕۆشنبیرییە. ئەگەر مرۆڤ

* دوعا دەکەین کە خوا تەمەنیان درێژ بکات بۆ ئەوەی خەڵکی ئێمە پەندیان لێ وەربگرێ و فێری شت ببێ و ببنە مایەی ڕێنوێنی!

1 . (الأنفال: 42).

2 . (الإسراء: 36).

ئەمە بە باشی ڕەچاو بکات، ڕۆژبەڕۆژ لە چاولێکەری و لاساییکردنەوە دوور دەکەوێتەوە، یان لانیکەم دەزانێت لاسایی دەکاتەوە!

هەموو کۆمەڵگایەك پێویستی بە ڕۆشنبیر هەیە؛ چونکە هەموو کۆمەڵگایەك، بیەوێ و نەیەوێ، کەم یان زۆر، تووشی خەوتن و نەزانین دەبێت؛ واتە هەندێ هزر و بۆچوونیان هەیە کە نازانن چین و لە کوێوە هاتوون. هەندێ کار و کردەوە دەکەن، بەڵام نازانن کە بۆ دەیکەن. هەندێ هەڵوێستیان هەیە کە نازانن لە بەرچی هەیانە. هەندێ ئاراستە، هەست و سۆز، حەز و ئارەزوو، ڕق و کین، بڕیاری پێشوەخت و کلێشەییان هەیە، بە واتایەکی دیکە هەندێ "بەڵێ‌گوتن" و "نەگوتن"یان هەیە (لە هەموو کۆمەڵگایەکدا هەن) بێ ئەوەی لە کۆویژدانی کۆمەڵگایان ئاگادار بن و، نازانن کە ئەو هەمووە لە کوێوە هاتووە. بۆچی ئێمە لە هەندێ هەڵوێستدا بێدەنگ دەبین و لە هەندێکی دی بە قسە دێین؟ بۆچی هەندێ دیاردەمان پێ خۆشە و لە هەندێکی‌تر بێزارین؟ بۆچی هەندێ ڕاوبۆچوونمان پێ پەسەندە و هەندێکی دیکە ڕەت دەکەینەوە؟ هتد.. هەموومان ڕێك وەکو کەسێکین بەبێ ئەوەی ئاگای لێ بێ، بەدەم خەوەوە دەست و قاچی ڕادەوەشێنێت یان وڕێنەیەك دەکات و ناشزانێ بۆچی وای کردووە یان وا دەکات! ئێمە ــ کەم یان زۆر ــ زۆر شتمان بەبێ پرسیارلەخۆکردن و چۆناوچۆنی قبووڵمان کردووە، ناشزانین کە بەم شێوەیە قبووڵمان کردووە، تەنانەت ئەگەر بشزانین کە بەبێ چۆناوچۆنی قبووڵمان کردووە، نازانین لەبەر چ هۆکارێك بووە! هەندێ جار دەکەوینە ژێر کاریگەریی هەڵچوون و وروژان و هەست و سۆزەوە، بێ ئەوەی هەستی پێ بکەین؛ وەکو هاوڕەنگ و هاودەنگبوون لەگەڵ خەڵك بەبێ هۆکار؛ هەروەك قورئان ئاماژە پێ دەکات: ﴿و کنا نخوض مع الخائضین﴾؛[1] واتە: ڕۆ دەچووین لەگەڵ ئەوانەی کە ڕۆ دەچوون؛ مەبەستی ئەوەیە: خەڵك چییان دەکرد، ئێمەش بەدوویان دەکەوتین؛ لەگەڵ عامێ چوونە شامێ!

بەڕاستی ئێستا وامان لێ هاتووە کە چاوەڕوانین ڕۆژئاوا چ بکات تاکو ئێمەش چاوی لێ بکەین و لاساییان بکەینەوە، بێ ئەوەی بزانین کە هەر ڕەفتارێك، هۆکار و پاڵنەر و هزر و مەعریفەیەکی لە پشتەوەیە، کە لەوانەیە لە هیچ ڕوویەکەوە بۆمان گونجاو نەبێت و پێویستیشمان پێ نەبێت؛ وەکو بابەتی ئازادیی ژن کە فێمێنیستان و ڕۆشنبیرانی خۆمان

1. (المدثر: 45).

ئەوەندەی دووبارە دەکەنەوە. خۆزگە تەنها یەکجار لە خۆیان بپرسیبایە بۆچی ئەوەندە دەڵێینەوە؟ ئەو ئازادییەی کە بۆ کۆمەڵگەی کوردەواریی خۆمان داوا دەکەین، دیتێیل و مەبەست و چوارچێوەکانی چین؟ لە رۆژئاوا چی بەسەر ژن هاتووە، کە پەنای بۆ دروشمی ئازادیی بردووە و ئەوەندە لە پێناویدا تێکوشاوە؟ ئایا بە ڕاستی دۆخی ژنی کوردستانی بووەتە دۆزێکی "ئەوەندە" گەورە کە "ئەوەندە"ش بېێتە جێگای باس و گفتوگۆ و هەوڵ و کۆشش؟

بەداخەوە ڕۆشنبیرانی فێمێنیست هەر شتێك کە بۆن و ڕەنگی ڕۆژئاوایی لێ بێت، وەکو بڕیاری پێشوەختە و بیرکردنەوەیەکی لەقاڵبدراو، بە باوەشێکی ئاوەڵاوە قبووڵی دەکەن؛ خەڵك‌گوتەنی: بە فیتەیەك بەدوویان دەکەون و بە هەموو سازێکی ئەوان هەڵدەپەڕن! پێم وایە گەورەترین ڕەخنە دەبێت ئاراستەی ئەو ڕۆشنبیرانە بکرێتەوە کە بەم شێوەیە بیر دەکەنەوە و باشتر بڵێین بیرکردنەوەکانی رۆژئاواییەکان ڕوونوس و کۆپی‌پێست دەکەن و، قسەکان دووبارە و چەندبارە دەکەنەوە، بێ ئەوەی دەرمان و چارەسەرێکی ڕاستەقینە و گونجاو پێشکەش بکەن! ڕوونڤیسکردنی ڕاچێتەی نەخۆشییەکانی ئەودیوی جیهان بۆ نەخۆشییەکانی ئێمە بە ڕاستی زۆر گەوجانە و گێلانە و نەفامانەیە؛ ڕاستە کە ژنی ئێرەش لە هەندێ ڕووەوە وەکو ژنی ڕۆژئاوایی سەردەمانێك (و ئێستاش) تای لێیە و نەخۆشە، بەڵام هەبوونی "تا" نیشانەیەکی نەخۆشییە؛ نەك خودی نەخۆشی! دەیان نەخۆشی هەیە کە بە شێوەی "تا" خۆیان دەردەخەن؛ "تا"ی ئێمە بەهۆی بەکتریایەکە و "تا"ی ئەوان بەهۆی بەکتریایەکی‌تر، کە هەر یەك لە شوێنی تایبەت بە خۆی دەژیێت و سەر بە کۆمەڵێکی تایبەتن (وەکو پزیشکان دەڵێن: گرام نێگەتیڤ و گرام پۆزەتیڤ، یان ئەوەی لە ناو هەوا دەژیێ و ئەوەی لە ناو هەوا ناژیێت) و دژەبەکتریای تایبەتیشیان پێویستە بۆ لەناوچوون کە پێکهاتە، کارتێکردن و دەرژانگی هەرکامیشیان زۆر لە یەکتر جیاوازە؛ یەکێك لەوانەیە لە بەر خواردنی ماددەیەك نەخۆش بێ، کەسێکی‌تر لەبەر نەخواردنی هەمان ماددە! بۆیە دۆزینەوە و دەستنیشانکردنی نەخۆشی، هەنگاوی یەکەم و بنەمای چارەسەرییە.

ڕۆشنبیری ئێمە دەبێ لە وەڵامی ئەو پرسیار و ڕەخنانە خۆی نەشارێتەوە و لەجیاتی تەنها ڕەخنەگرتن و دادوەریکردن و خۆبەقازی‌زانین، ئەویش دادوەریکردنێکی یەکلایەنە و هەبوونی حوکم و بڕیاری پێشوەختە، ئایدیۆلۆژیا و پێشگریمانەی فیکری، فەلسەفی و مەعریفییەکانی، نموونەیەکی بەدیل، ڕوون، واقیعی و قسەهەڵنەگەر بۆ کۆمەڵگەکەمان پێشکەش بکات، کە زۆر

گونجاو و ڕێك بێت و هیچ شك و دوودڵییەك نەهێڵێتەوە؛ نە لە لایەن نەریتخوازان و نە لە لایەن نوێخوازانەوە.

ڕۆشنبیری فێمێنیستی کورد ئەگەر بیەوێت لە مەیدانی بابەتی ژنان ڕۆڵێکی چاکسازانە، بگۆڕ و دینامیك، چالاك و بەردەوامی هەبێت و تەمەنی کورت نەبێت، پێویستە دوور لە ڕووکەشیروانین و تێفکرینی ناقووڵ و پێشکەشکردنی قسە و وتاری دووبارە و هەندێ جاریش ئەجیندا و بەرنامەی دیکتەکراو لە لایەن بیانییەکانەوە، یەکەمجار دوای خاوێنکردن و پاککردنەوەی ناوماڵی خۆی لە ڕووی شوناس و ڕۆحەوە، هەروەها پێداچوونەوەی پێشگریمانە و بۆچوونە مەعریفییەکانی سەبارەت بە بابەتی ژنان، پلانێکی تەواو و کامڵ و گونجاو لەگەڵ واقیعی کۆمەڵگاکەمان بە ڕوونی و دیاریکراوی پێشکەش بکات، کە پشتبەستوو بێت بە شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی ئەو واقیع و بارودۆخەی کە هەیە و دواتریش توانای جێبەجێکردنی هەبێت، ئینجا بەرنامەکەی لە کۆڕە تایبەتییە هەرێمی و نێودەوڵەتییەکاندا بخاتە بەر باس و گفتوگۆ، بۆ ئەوەی پسپۆڕان و خاوەن بڕیارەکان، دادوەریی بکەن و ڕەخنە و سەرنجەکانیان بە وردی وەربگیرێ و بەو پاڵێنەیشدا تێپەڕێت. تەنها بەم گریمانەیە دەشێ بە ئایندەی ڕەوتی فێمێنیستانی ئێمە لە چارەسەرکردنی کێشە بنەڕەتییەکانی ژنان هیوادار و گەشبین بین.

### 1.3- ڕوانگەی ڕۆشنبیرە فێمێنیستەکانی کوردستان بەرامبەر بە مەسەلەی ئازادیی ژنان:

لێرە بە ڕەچاوکردنی بنەما فیکری و ئایدیۆلۆژییەکانی ڕۆشنبیرە فێمێنیستەکانی کوردستان و ئاراستە و دیدگا و هەڵوێستیان بەرامبەر بە بابەتی ئازادی و مافی ژنان، باس لە شێوازی مامەڵە و هەڵسوکەوتیان دەکەین لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم بابەتە، کە پێم وایە دەکرێت بە شێوەیەکی گشتی بە سێ ڕوانگەی سەرەکیدا دابەشیان بکەین:



مەبەست لەو سێ ئاراستە جیاوازە، ئەوە نییە کە هەریەکەیان بە تەواوەتی لەوی دی جیا و سەربەخۆیە، بەڵکو دەکرێ یەکێك ڕوانگەیەکی چەپ و خوانەناسانە (ئەیتیستی)ی هەبێ، بەڵام دەست وەربداتە بواری فەرهەنگی، کۆمەڵایەتی، تەنانەت دەروونی و سێکسیش و، ڕێگەچارەی خۆی پێشکەش بکات؛ وەکچۆن فێمێنیستی وا دەبینین بە وتارەکانیدا دیارە سەرەڕای ئەوەی دیدگایەکی مارکسیستیی هەیە، جاروبار لە ڕوانگەیەکی دەروونی و سێکسیشەوە، ڕوانیویەتە پرسی ژنان. هەشە فێمێنیستێکی لیبراڵە و لە ڕوانگەیەکی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتییەوە هەوڵی پێشکەشکردنی چارەسەر دەدات، بەڵام زۆر جار کێشەکانی ژنان دەبەسێتەوە بە هەبوونی ئاستەنگە سێکسی و پەیوەندییە دەروونی و خۆشەویستییەکەی ژن و پیاو. بە خوێندنەوە و تاوتوێکردنی وتارەکانیان، ئەم ڕوانگانە باشتر ڕوون دەکرێنەوە، کە هەندێ لەو وتارانە، ڕێك لە شوێنی خۆیدا یەکسەر وەڵام دەدرێنەوە، بەڵام ئەوانەی دیکە لە شوێنە جیاجیاکانی دیکە، بۆ ئەوەی لە دووبارەبوونەوە ڕزگارمان بێت، بە شێوەیەکی سیستماتیك شی دەکرێنەوە و تێبینییەکانی خۆمان لە سەریان دەخەینە ڕوو:

### 1.3.1- ڕوانگەی ئایدیۆلۆژیکی ـ سیاسی:

هەندێ لەو ڕۆشنبیرە فێمێنیستانە ـ هەندێ جار ـ لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ بابەتی ژنان نە بە نیگەرانی، پەرۆشی و پەژارەیەکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی، بەڵکو بە ئاراستەیەکی سیاسی و ئایدیۆلۆژی دەجووڵێنەوە. ئەو ڕەوتە بەرلەوەی خەمخۆری ژنان بێت و داکۆکی لە ئازادی و مافی ئەوان بکات، زیاتر وەك ئامراز و ئەهرۆمێك بۆ دژایەتیکردنی ئایینی ئیسلام و گروپە ئیسلامییەکانی کوردستان بە هەموو ڕەوتەکانیەوە (توندڕۆ و میانەڕۆ، سۆفیگەری یان سەلەفی، جا سەلەفییەتی جیهادی بێت، یان مەدخەلی) بەکاری دەهێنن و، ئازادیی ژنان وەك ستراتیژییەکی سیاسی دەزانن و، ستراتیژییەتی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی تەنها وەك دەرمانێکی کاتی و ئارامبەخش لەقەڵەم دەدەن؛ بە واتایەکیتر: ڕاستە بابەتی ژنان و کێشەکانیان لای ئەوان بابەتێکی گرنگە، بەڵام لەوە گرنگتر لێدانی ئایین و تەوژمە ئیسلامییەکانە؛ چونکە پێیان وایە کە تریاك چۆن مرۆڤ سڕ و وڕ دەکات، ئایینیش هەر وایە و مرۆڤی بێئاقڵ دەکات و کۆمەڵگاش وەپاش دەخات و، تا ئەو کاتەی ئایین بە سەر کۆمەڵگادا زاڵ بێت و حوکم بکات و دەست وەربداتە ژیانی

سیاسی و کومەڵایەتی، کۆمەڵگا پێش ناکەوێت و پرۆسەی "وەکئەوانبوون" (واتە بە ماتریالیست یان سکیۆلاریتەبوون) دوا دەخرێت.

ئەم تاقمە بە ناو ڕۆشنبیرانە دەڵێن کە "ئایینی ئیسلام" و "ئەریت و کولتووری کوردی" پاڵپشتیی "سیستمی پیاوسالاری" دەکەن و تەنها ڕێگەچارەش سڕینەوە و داڕنینی ئایینە لە ژیانی کۆمەڵایەتی، خێزانی و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان. ئەو ڕوانگەیە زیاتر لە نێوان فێمێنیستە چەپەکان (مارکسیست و سۆسیالیستەکان)، هەروەها ڕۆشنبیرە چەپ و ئەیتیستەکان، لەگەڵ سکیۆلاریستە ڕادیکاڵەکاندا باوە، کە ئامانجی هاوبەشی هەر هەموویان دژایەتیکردنی ئایینە، کە لەو شەڕەدا هاوکات لەگەڵ بەکارهێنانی چەکی مەعریفیی مارکسیزم و ماتریالیزم، کە هەست دەکرێت لە دوای ڕووخانی سۆڤییەت کاتی بەسەرچووە، پەنایان بردووەتە بەر چەکی "بەکەرەستەکردنی بابەتی ژنان"یش! سەیر ئەوەیە کە زۆربەی ئەو مارکسیستانە، لە سەردەمی دەسەڵاتی کۆمۆنیزمدا لە سۆڤییەت، ئەوانیش کۆمۆنیست بوون و دژی چەمکەکانی وەك "کاپیتالیزم" و "لیبرالیزم" و "پلورالیزم" و "دەستاودەستکردنی دەسەڵات" بوون و سەرچاوەی هەموو گەندەڵییەکانیان دەبردە سەر ئەم چەمکانە، بەڵام لەگەڵ ڕووخانی کۆمۆنیزم، یەکسەر جلوبەرگی دیموکراتیخوازانیان لەبەر کرد و ئێستاکە بە شێوەیەك بانگەشەی بۆ دەکەن، گوایە هەر لە منداڵییەوە دیموکراتخواز بوونە!

بۆ نموونە یەکێك لەو ڕۆشنبیرانە کتێبێکی نووسیوە بە ناوی "ئافرەت کێشەیەك بە درێژایی مێژوو"[1] کە تەنانەت پێڕست و ناوەڕۆکەکەی لە چوارچێوەی فەلسەفەی "ماتریالیزمی مێژوویی" مارکسیزمدا داڕێژراوە، وەك بڵێی مەبەستی نووسەر ڕاڤەکردنی قۆناغە مێژووییەکانی فەلسەفەی "کارل مارکس"ـە و هەمووی بریتییە لە پێشگریمانە تیۆرییەکان بە پاشخانێکی ماددیگەرایی ــ کۆمۆنیستی! ئینجا بە تەفسیرێکی "ماتریالیزمی دیالکتیکی"، ناوەڕۆکی هەر یەك لە بەشەکانی کتێبەکەی شی دەکاتەوە و بزوێنەری سەرەکیی هەموو ئەو گۆڕانکاری و پێشکەوتنانەی کە ژن بە درێژایی مێژوو تێیدا چەوساوەتەوە، (واتە قۆناغبەقۆناغ کە باسی چەوساندنەوەی ژن دەکات)، تەنها لە ماددە و هێز و ئامرازی بەرهەمهێنانی ئابووریدا کورت دەکاتەوە!

خوێنەر زوو هەست بەوە دەکات کە مەبەستی نووسەر لە وشەی "درێژایی مێژوو" لە ناونیشانەکەیدا، هەمان قۆناغەکانی: کۆمۆنی سەرەتایی، کۆیلایەتی، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری،

1 . سەرۆ قادر (2002): "ئافرەت کێشەیەك بە درێژایی مێژوو"؛ هەولێر: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە.

سۆسیالیزم و کۆمۆنیستیی زانستیی مارکسیزمە، کە بە پارادایمێکی چەپگەرایانە داڕشتووە و، قۆناغەکانی کێشەکانی ژن لە سەرەتای ژیانی مرۆییەوە (بەهەشتی یەکەمی و کۆمۆنی سەرەتایی) تا هاتنەکایەوەی کۆمۆنیستی زانستی (بەهەشتی دووەمی) بۆ جاری دووەم یەك لە دوای یەك دەهێنێت. بەشی یەکەم تا سێیەم: (شوێنی ئافرەت لە ئەفسانە و ئایندا)، (ئافرەت لە کولتوری فەرمانڕەوایە ئیسلامییەکاندا)، (یاسا و داب‌ونەریتەکان لە دژی ئافرەتن) بریتییە لە هەر سێ قۆناغی کۆمۆنی سەرەتایی، کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتی، بەڵام بەو جیاوازییە کە پێش هاتنی ئایینەکان، کە قۆناغی ئەشکەوتنشینی و کشتوکاڵیە و کۆمۆنیستەکان بە هەمان قۆناغی کۆمۆنی سەرەتایی دەژمێرن و لەبەر ئەوەی کەس خاوەندارێتیی هیچ کەس و هیچ خاك و هیچ ئامرازێکی بەرهەمهێنانی نەبوو و موشاعییەتی جنسی باو بووە (واتە فرەشوویی یان کۆسێکسیی)، بە بەهەشتی یەکەم لەقەڵەم دەدەن؛ بۆیە نووسەر ستایشی ئەم قۆناغە دەکات و، ئەگەرچی لە ڕاستییەکەیدا دوودڵە، بەڵام دەڵێت:

"[...]* ئافرەت دەسەڵاتدار بوە و دەورێکی زێتر لە پیاوی هەبوە و ماوەیەکی درێژ سەروەری کۆمەڵگا بوە و پیاوی خستە پلەی دووەمی دەوری کۆمەڵایەتی کە ئەم قۆناغە بە قۆناغی دایکسالاری لە لایەن لێکۆڵەران ناو دەبردرێت."[1]

ئەگەر سەیر بکەین دەبینین نووسەر لەو بەشانەدا "ئایین" و "ئەفسانە" پێك دەبەستێتەوە و دەیکاتە سەرچاوەی کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتیی مرۆڤ بە گشتی و، ژن بە تایبەتی؛ هەروەك لە دەستپێکی بەشی چوارەمدا دەڵێت:

"ئەوەی لەوەوپێش باسم کرد، قۆناغی دەرەبەگایەتیش دەگرتەوە."[2]

بەشی چوارەمیش (سەرمایەداری و کێشەکانی ئافرەت) بریتییە لە قۆناغی چوارەمی ماتریالیزمی مێژوویی کە قۆناغی سەرمایەدارییە. لە ناونیشانی ئەم بەشەش پڕ ئاشکرایە مارکسیستەکان دژی سەرمایەدارین و ناوەڕۆکەکەی پڕە لە ئەدەبیاتی مارکسیستە ئۆرتۆدۆکسەکان، وەك بەکارهێنان و دووبارەکردنەوەی چەمکەکانی: چینی پڕۆلیتار، بورژوا، ئامرازی بەرهەمهێنان، هۆشیاریی چینایەتی و شۆڕشی دژی خاوەندارانی داس و چەکوش، کە بە

* لەبەر ئەوەی هەندێ لە بابەتەکان زۆر درێژ بوو، یان پەیوەندییەکی ئەوتۆیان بە بابەتەکەی ئێمەوە نەبوو ـ هەروەك لە پێشەکیی ئەم کتێبەشدا ئاماژەمان پێ کردبوو ـ ئەو بەشەی لە وتار یان نووسینەکانی فێمێنیستان و ڕۆشنبیران کە خوێنەر لە کاکڵەی بابەتەکەوە دوور دەخاتەوە، بە دانانی سێ خاڵ [...] بریومەتەوە.

1 . سەرچاوەی پێشوو؛ ل 12.

2 . سەرچاوەی پێشوو؛ ل 14.

خوێنڕشتن (ڕەنگی سووری ئاڵای کۆمۆنیزم) نەبێ چارەسەر ناکرێت! بۆیە نووسەر بە بەکارهێنانی وشەی کێشەی ژن و بەستنەوەی بە چەمکی سەرمایەداری لە ناونیشانی ئەم بەشەدا، دیسان دەیەوێ بڵێت کە هەتا ئەو قۆناغەش کێشەکانی ژن بەردەوام بووە و هەر یەك لە سیستمی ئایین و سەرمایەداری خوڵقێنەری کێشەن بۆ مرۆڤایەتی بە گشتی و بۆ ژنیش بە تایبەتی. ئینجا لە بەشی پێنجەمدا (کۆمۆنیزم و بزووتنەوەی ئافرەتان) باس لە ڕزگاربوونی ژن دەکات لە سایەی هاتنی قۆناغی کۆمۆنیزم و بەرپابوونی دەوڵەتێکی کۆمۆنیستی لە سۆڤییەت، کە جگە لە چارەسەرکردنی زۆر لە کێشەی جووتیاران و نەتەوەکان و میللەتانی ژێردەست و چەوساوە، بووە ڕزگارکەری ژنان و دروستکردنی هۆشیاری و ڕۆشنبیری بۆیان و سەرهەڵدانی بزووتنەوە فێمێنیستەکان و سەندیکا و ڕێکخراوەکانی تایبەت بە ژنان. نووسەر لەو بەشەدا دەست بە ستایش و پەسنی ئەم قۆناغە دەکات، وەك بڵێت: ئەو بەهەشتە ونکراوەی هەموو بەشوێنیدا دەگەڕێن، ئا لەو قۆناغەیە!

سەیری ئەم دژایەتی و پارادۆکسە بکەن لە قسەکانیدا: لە هەمان کتێبدا دەڵێت:

"... لە هیچکام لە ئایینەکاندا باسی بەرابەری پیاو و ئافرەت نەکراوە. لە ڕووی عەمەلیشەوە نەیدەتوانی ئاوا بیرێك پێشنیار بکات و نە داوای جێبەجێ کردنیشی بکات."[1]

بەڵام لە چەند لاپەڕی دواتردا، کاتێك باس لە ئایینی ئیسلام دەکات، قسەکەی پێشتری لەبیر دەکات و دەڵێت:

"... ئافرەت بۆ یەکەمجار لە مێژوودا بە ڕوونی مافە ئیداری و ماڵی و کۆمەڵایەتییەکانی داندران. کوشتن و کۆیلەیی لەسەر هەڵگیرا، نسبەتێکی دیاریکراو لە میرات و مافە مالیەکانی بۆ داندرا، هەقی شووکردن و بە مەرجی دیاریکراویش مافی تەلاقی درایە، مەجالێکی فراوانی لە کارکردن بۆ کرایەوە، ڕێگای پێدرا لە نزیك پیاوەوە لە ئیدارەدا هاوکاری بکات. بۆیە ئەگەر دینەکان لە ڕووی ئینسانییەوە هەنگاوێکیان بۆ دەرهێنانی ئافرەت لە دەست کۆیلەیی هەڵنابێت، ئەوە ئیسلام بۆ یەکەمجار هەنگاوی بە کردەوەی لە دیاریکردن و جێبەجێکردنی هەندێك لە مافەکانی هاویشت. لەوەڕا ئەز باوەڕم وایە، کاتێك باسی مێژووی مافی ئافرەت دەکرێ، پێویستە لە هاتنی ئیسلامەوە دەست پێ بکرێ."[2]

1 . سەرچاوەی پێشوو؛ ل 24.
2 . سەرچاوەی پێشوو؛ ل 27.

لەوە عەمەلیتر چی؟! بڕواننە ئەم ڕستەیەش لە وتارێکیدا ـ بە ناونیشانی "کێشەی ژن لە کۆمەڵگای کوردستان" ـ کە دەڵێت:

"... بە گشتی ئەو کۆمەڵگایانەی کە دینی زەمینییان هەیە (هندستانی لێدەربچێ) ڕادەی بێماڤێتی ژن نابێتە هەڕەشە بە سەر گیانی ئەوەوە."[1]

ئەگەر مەبەستی ئایینی ئیسلامە، کە بە گوێرەی قسەکانی گەورە زانایانی ئەوروپا، بەتایبەتی دامەزرێنەرانی دروشمەکانی: مافی مرۆڤ، ئازادی، دادپەروەری، یەکسانی و برایەتی، لە سەردەمی شۆڕشی فەرەنسا و تەنانەت ئەم سەردەمەش، ئایینی ئیسلام فێرکەری ئەوان بووە لە داهێنانی ئەم چەمکە مرۆییانە؛* بۆ نموونە: "مارسێل ئاندرێ بۆواسار"** ـ ڕۆشنبیر و دیپلۆماتکاری سویسری** ـ لە کتێبە بەناوبانگی خۆیدا "مرۆڤگەرایی ئیسلام"*** بە تێروتەسەلی باس لەوە

1 . سەرۆ قادر (2014/4/14): "**کێشەی ژن لە کۆمەڵگای کوردستان**"؛ لە ماڵپەڕی: http://www.seroqadir.com

* بەپێی قسەکانی گەورە زانایانی سەردەمی ڕۆشنگەری، ڕۆژئاوا بۆ یەکەمجار چەمکەکانی مافی مرۆڤ، ئازادی، دادپەروەری، یەکسانی و برایەتی لە ئایینی ئیسلام فێر بووە؛ بۆ نموونە کەسێکی وەك "ئەلکساندر ڤولتێر" کە بیرۆکە و نووسینەکانی یەکێك لە هۆکارە هەرەسەرەکییەکانی بەرپابوونی شۆڕشی فەرەنسا بووە و، هەموو نووسینەکانی ڤولتێر لە ژێر ناونیشانی "**سەرجەم بەرهەمەکانی ڤولتێر**"(*Oeuvres complètes de Voltaire*) لە (72) بەرگدا چاپ کراون، چەندین جار بە توندی بەرگری لە ئایینی ئیسلام دەکات و داوا دەکات دروشمەکانی ئیسلامی (دادپەروەری، یەکسانی و برایەتی) بینە بنەمای فەرمانڕەوایی لە فەرەنسادا؛ بۆ نموونە لە کتێبی "شەرعیاتی پیاوی شەریف" لە وەڵامی پیاوە مەسیحییەکان و زۆرێك لە نووسەرانی ئەو کاتە، کە بە توندی ڕەخنەیان لە ڤولتێر دەگرت و بە ئیسلامهێنان و تورکی عوسمانی و خۆفروش تۆمەتباریان دەکرد، بەو پەڕی شانازییەوە دەڵێت: "هەموو ئایینەکان جگە لە ئایینی محەممەد بە چەواشەکاری بڵاو بوونەتەوە و دەستکاری کراون. تاکە ئایینی خودا کە لە دەستکاریی مرۆیی تەندروست ماوەتەوە، ئیسلامە. چونکە یاساکانی قورئان سەرەڕای چەندین سەدە وەکو خۆی بێگۆڕانکاری ئێستاش لە ئاسیا و ئەفریقا جێبەجێ دەکرێن، کە لە نێوان ڕەش و سپی، دەوڵەمەند و هەژار، شەریف و ناشەریف بە شێوەیەکی دادگەرانە و یەکسانانە جیاکاری و جیاوازی ناکات...": بڕواننە:

Voltaire (1820-1825), "**OEuvres complètes de Voltaire**", vol. 24, Paris: édition Lequien, pp. 529-534.

ڤولتێر، لە نووسینەکانیدا دان بەوەدا دەنێت، سەرەتا بەهۆی نەفامی و کاریگەرییەکانی ئایینی پیاوانی کەنیسە، دژایەتیی ئایینی ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلامی دەکرد و لە چەندین شانۆدا بێڕێزی پێ دەکات و تانەی لێ دەدات، بەڵام دوای خوێندنەوەی قورئان و وەرگێڕانی قورئان بۆ زمانی فەرەنسی، بە یەکجاری لە ئایینی مەسیحییەت هەڵدەگەڕێتەوە و بە چەندین کتێب ستایشی ئیسلام دەکات و لە میانەی نووسینە بڵاوکراوەکانیدا، دروشمی بەناوبانگی "ئازادی، یەکسانی، برایەتی" بە ئیلهامەوەرگرتن لە قورئان، بۆ یەکەمجار وەکو دانەرێك دادەڕێژێت و بەهۆی ئەو و کەسانێکی وەك "ژان ژاك روسۆ" ئەم دروشمە دەبێتە دروشمی سەرەکیی شۆڕەشی فەرەنسا. کار دەگاتە ئەو ڕادەیەی "روسۆ" لە کتێبی "گرێبەستی کۆمەڵایەتی"دا کە دژی تێکەڵاویی ئایین و دەوڵەت دەوەستێ، بەڵام ئیسلامی لەوە جیا دەکاتەوە و، دەڵێ: "محەممەد ڕاوبۆچوونی زۆر دروست و ڕاستاڵی هەبووە". بڕواننە:

Rousseau, Jean-Jacques (2011), "**Du contrat social**", Paris: Groupe Flammarion, p.174.

* Marcel André Boisard (1939-Present).

** لەساڵی (1980) بووە ئەندامی نەتەوەیکگرتووەکان، لە ساڵی (1992) بووە بەڕێوەبەری ڕێکخراوی فێرکاری و توێژینەوە سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکان (UNITAR)، لە ساڵی (2001) بووە جێگیری سەرۆکی گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان و، چەندین پڕۆژەی سیاسیی گرنگی پێشکەش کردووە کە لە بواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان پێشکەش کراوە، بە تایبەتی لە چارەسەری کێشەی شەڕ لە ناوچەکانی دیلتای نیجر لە ساڵی (2007). بڕواننە:

Swissinfo (JAN 12, 2007), "**swiss un agenda focuses on more reforms**": http://origin.swissinfo.ch/eng/swiss-un-agenda-focuses-on-more-reforms/5665002

دەکات، کە ئەوروپا قەرزداری ئیسلامە، کە ماوەی زیاتر لە (800) ساڵ لە ئیسپانیا (ئەندلۆس) حوکمی کردووە و زانایان و ڕۆشنبیران و تەنانەت قەشە مەسیحییەکان لە زانکۆکانی وەك كۆردۆبا و گرانادا و تۆلدۆ فێری زانست بوون و دەستیان پێ کردووە لە وەرگێڕانی کتێبە ئیسلامییەکان و لەوێشەوە فێری چەمکە مرۆییەکانی وەك: "ئازادی"، "دادپەروەری"، "یەکسانی"، "مافی مرۆڤ" و هتد بوونە؛[1] بۆ نموونە دەڵێت:

"بنەمای یەکسانیی مرۆڤ، یەکەمین بەردی بناغەی کۆمەڵگای موسڵمانە. مێژوو بە ڕوونی شایەتی دەدات کە ئایینی ئیسلام لە بەرپاکردن و گەشەپێدانی کۆمەڵگای یەکتاپەرستی، بێچینایەتی و جیاکاریی ڕەگەزی و نەژادی، هەروەها هەماهەنگ و یەکدەست، لە ڕێگەی بەهادان بە "ئازادی"، "یەکسانی" و "برایەتی"ی مرۆڤەکان، هەوڵ و کۆشش و ماندووبوونێکی زۆری بینیوە؛ ئەو سێ بنەمایانە بەهۆی ئیسلامەوە هاتنە ناو ڕۆژئاواوە و بوونە مەشخەڵ و پاڵنەری شۆڕشە گەورەکانی ڕۆژئاوایی."[2]

لەبارەی ژنانیشەوە دەڵێ:

"ژنی موسڵمانی ئیسپانی، لەو پەڕی ڕێز و ئازادیی بەهرەمەند بوو و لە هەموو بوارە کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانی کۆمەڵگادا بەشدار بوو... مەسیحییەکانی ئەوروپا لە ڕێگەی ئیسپانیاوە لە شاعیرە موسڵمانەکانەوە فێری ڕێزلێنان و گەورەگرتنی ژنان بوون."[3]

نووسەرێکی دیکە، لە بابەتێکی وەرگێڕدراویدا بە ناوی "باری کۆمەڵایەتیی ئافرەت لە ڕۆژگاری دێریندا" بە ڕوونی داکۆکی لە "فێمێنیزمی مارکسیست" دەکات و پێی وایە: لە کۆمەڵگای مرۆڤە سەرەتاییەکاندا لە نێوان ژن و پیاودا هیچ جۆرە جیاوازییەك لە ڕووی بەهرەمەندی و گەورەیی و تواناوە لە ئارادا نەبووە. پەیوەندیی سێکسی، ئازادانە و بێبەربەست بووە. سیستمی دایکسالاری و فرەپیاوی باو بووە، منداڵان باوکی خۆیان نەدەناسییەوە، بەڵام منداڵان دایکەکانی خۆیان باش دەناسی. لە سەردەمی دایکسالاریدا، ئیمتیاز و خێروبێری ئابووری و کشتوکاڵ و پیشەسازی و ئاژەڵداری لە دەستی ژناندا بووە، بەڵام لەگەڵ هاتنی ئایینەکان (تەوتەمیزم)، پەیوەندیی سێکسیی نێوان ژن و پیاو سنووردار کرا، و سیستمی مارەیی سەریهەڵدا

*** ئەم کتێبە بابەتی تێزی دوکتۆرای خاتوو "ڕێبێرتا مێندۆلا" (Reberta Mendola) بووە لە کۆلێژی "زمان و ئەدەبیاتی بێگانە" لە زانکۆی جێنۆڤای ئیتاڵیا لە ساڵی (2008).

1 . Boisard, Marcel (1979), "**L'humanisme de L'Islam**", Paris: Présence du monde arabe, pp. 1-432.
2 . Ibid., pp. 163-164.
3 . Ibid., p. 108.

و "تابۆ"کان یەك لە دوای یەك هاتنە کایەوە؛ تابۆ واتە حەرام و قەدەغەکردن و خۆلێدوورخستنەوە. تابۆکان پەیوەندیی سێکسیی نێوان کوڕ و دایك، خوشك و برا و ئەندامانی یەك تیرەی قەدەغە دەکرد و جگە لە هاوسەرگیریش، هەر جۆرە پەیوەندییەکی سێکسی بە تابۆ دەژمارد. بەم شێوەیە بوو کە موڵکایەتیی تایبەتی پیاوان دەستی پێ کرد و تەنها زەرەرمەندیش ژنان بوون. پیاوان بوونە خاوەنی جەستە و ڕۆحی ژنان و بە موڵکی خۆیان دادەنا. لە ئەنجامی ئەم موڵکایەتییە، تەڵاقیش سەریهەڵدا.[1]

فێمینیستێکی دیکە بە ڕوانگەیەکی سۆسیالیستییەوە لە وتارێکدا لە ژێرناونیشانی "عەقڵیەتی پیاوسالاری، لەمپەرێك لە بەردەم ئازادیی ژنان"دا دەڵێت:

"مرۆڤ لە سەرەتاکانی دەستپێکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی لەسەر گۆی زەوی بە شێوەیەکی دایك ڕەگەزی ژیانیان بە سەر بردووە، لەو ژیانەشدا ژن و پیاو لە پێوەندی نێوان خۆیاندا خاوەنی ئازادی و یەکسانی تەواو بوونە، کەچی مخابن مرۆڤ هەرچی قۆناغە یەك لە دوای یەکەکان ئەبڕێت و هەنگاو دەنێ بەرەو پێشکەوتن و ژیار، هاوکات ئەم پێوەندییە تووشی تەنگاوی و قەتیس بوونەوە دەبێت و لە ئاکامدا ژن دەبێتە کۆیلەی پیاو، چونکە ئیدی پێکهاتەی پیاوسالاری دەستی پێکردووە، لە کاتێکدا کە لە پێکهاتەی دایك ڕەگەزیدا مرۆڤەکان خاوەنی ئازادی تەواو بوونە لە هەموو بوارەکاندا. بە تایبەت بە دوای هاتنەئارای ئایینە یەك لە دوای یەکەکان لە نێو جیهانی مرۆڤایەتیدا ڕەوتی لە پەراوێزخستن و سەپاندنی زوڵم و زۆر بە سەر ژناندا پەرەی گرت و بەهێزتر بوو، لە کاتێکدا کە دەبوایە فەلسەفەی بنەڕەتی ئایین بەختەوەرکردنی مرۆڤ بوایە و پلانیشی هەبوایە بۆ گەیشتن بەو ئامانجە و هەوڵیشی بدایە کە بەرزەخۆی بدات بە ژنان، تاکو ئەوانیش ڕەوتی بە خوداپەرمینیان لا بەهێزتر بێ، چونکە ئەو دەمی ڕێزی بۆ لەشی خۆی دادەنا و باشتر لە ژیان چێژی ئەبرد، هەروەها بۆ کۆمەڵگاش بەکەڵك بوو. بەڵام بە داخەوە هیچ کە وای نەکرد، بەڵکو بەرزەخۆیشی لە ژنان ئەستاند و ڕەگەزی نێرینەشی بە سەریاندا زاڵ کرد و لە کۆمەڵگاش حیسابی پلەدوویان بۆ کرا، ئەم چەوساندنەوە لە ڕادەبەرە بە مەشەوە ڕانەوەستا و وای کرد کە دەبێ ژنان مێردەکانیان بە خودای دووهەم بزانن. ئەوەی کە جێگای ئاماژەیە ئەوەیە کە تەواوی ئەم شێوە بیرکردنەوەیە سەرچاوە لە عەقڵییەتی پیاوسالارییەوە دەگرێ کە ئایینیش دەورێکی بەرچاو دەگێڕێ لە پەرەسەند و جێگیرکردنی لە کۆمەڵگادا، چونکە ئەو بە فۆرمولەکردنی جۆرە پیرۆزایەتییەکی بۆ ئەو بیرۆکە پیاوسالارییە دەستەبەر کرد."[2]

1 . و: وریا قانع (2005)؛ "باری کۆمەڵایەتی ئافرەت لە ڕۆژگاری دێریندا (ئەزموونێك بۆ ئافرەتانی ئەمڕۆ) "؛ نووسینی: پرشنگ بابایی؛ سلێمانی: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم؛ ل 17-32.

2 . گوڵستان گوڵکار (بێ ڕێکەوت؟)؛"عەقڵییەتی پیاوسالاری، لەمپەرێك لە بەردەم ئازادیی ژنان"؛ لە ماڵپەڕی هەڵۆی کوردستان:

یان سەیری ئەم پاراگرافەی خوارەوە بکەن لە فێمێنیستێکی دیکە، کە بە ڕوونی ڕوانگەی ئایدیۆلۆژی و سیاسیی پێوە دیارە:

"بە سەرنج دانێکی خێرا بۆ ئەو مێژوویەی کە ئیسلامەتی بنەماکەی داڕشتوە، دەبینین جۆرەها سیاسەتی داگیرکاری و زەوتکاری پەرەیان بە خۆیان داوە، تەنانەت کە دەوڵەت و ئاین تێکەڵ بەیەك بوون، سیستمی پیاوسالاری زیاتر خۆی قووڵکردۆتەوە و ڕەگی داگیرکاری بەهێزتر بووە... وەلێ دەوڵەت لە ژوورەوەدا یاسا و شەریعەتی بەگوێرەی بەهێزکردنی حوکمی باوکسالاری ڕێك خستووە... ئەمەش یەکێکە لە چەمکەکانی ڕۆحی فاشیزم کە مۆری خۆی لە ژن داوە. لەم واتەیەدا کە دین و دەوڵەت یەکیان گرت، هێرشێکی دژواریان لەسەر ژن پێك هێنا، کە بووە هۆی داخستنی ژن هەتا ئاستێکی نزم و بێ ڕۆڵکردنی لە گشت چالاکییە فکری و ژیانییەکان."[1]

ئەگەر سەیری قسەکانی فێمێنیستێکی دیکەش بکەین لەو چاوپێکەوتنەدا، کە سەبارەت بە پرسی ژنان لەگەڵی ساز کراوە، دەبینین کە چۆن بە ئاراستەیەکی ئایدیۆلۆژیکی ـ سیاسییەوە، باس لەو پرسە دەکات و هەر لە دەستپێکی قسەکانیدا هەموو تاوانەکان دەخاتە ئەستۆی ئایینی ئیسلام؛ ئەگەرچی وتارەکەی لەبارەی ئازادیی سێکسییە، بەڵام پڕبەدڵ ئاوات دەخوازێ ئایینی ئێزدی، ئایینی زاڵی کۆمەڵگای کوردی بووایە:

"بێگومان پاراستن و ڕەچەڵەك و کەلتوری هەر گەلێك و ڕێگەنەدان بە تەفروتوناکردنیان لە لایەن زۆرداران و نەیارانیەوە خزمەتێکە بە ناسنامەی نەتەوەییمان لە لایەك و لە لایەکی دیکەشەوە بۆ مەسەلەی سیاسی و بەرەوپێشچوونی مەسەلەی نەتەوەییمان... بەڵام ئێمەی کورد نەمانکردووە... کەعبەی ئێمە مەکە نییە، بەڵکو لالشە، دەبێ ئێمە بۆ ڕەچەڵەکی بوونمان بگەڕێینەوە کە بوونی کورد لە کوردستانی ئێستادا هاوکاتە لەگەڵ بوونی سۆمەرییەکان لە ئێراقی ئێستادا... ئەویتریشیان چۆن عەرەب و جوولەکە ئاینەکەیان کردۆتە سەرچاوە بۆ دەسەڵاتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی، ئێمەش بە هەمان شێوە دەتوانین ئەو ئاین و میتۆلۆژییە خۆمالیانەی خۆمان وەك ڕەهەندێکی کەلتووری زیندوو بکەینەوە و بنەمایەکی سیاسی و کەلتوری نوێیی لەسەر دابنێین، بە تایبەتیش کە ئاینی ئێزدی تایبەتمەندی زۆری هەیە لە وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکا. خوا لە بنەڕەتەوە کوردە ئیتر بۆ دەبێ بە عەرەبی قسەی لەگەڵ بکەین؟!..."[2]

---

http://www.heloykurdistan.com/ku

1 . ماردین جەلال (2005)؛ "**پرادیگمای ژن**"؛ سلێمانی: وەزارەتی رۆشنبیری؛ ل 64 و 65.

2 . گفتگۆی ئەرسەلان مەحمود لەگەڵ "ڕێکپۆش عەزیز" (2010/5/22)؛ "**گەر خاوەن بزووتنەوەیەکی ڕاستینەیی فێمێنیزم بووایین، دەبوو بە لۆری لەعابەی سێکسیان لەبەردەم پەرلەمانی کوردستان هەڵبڕشتایە**"؛ لە ماڵپەڕی ئەمرۆ:
http://www.emrro.com/rekposheziz.htm

ئەوەش دەڵێت:

"دینی ئیسلام و پەیڕەوکردنی یاساکانی ئیسلام گەورەترین پێشێلکاری مافەکانی مرۆڤە و بە تایبەتی ژنان، بۆیە دەبێت بڕیار لەسەر جیاکردنەوەی دین لە دام و دەزگاکانی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا بدەین و کاریان بۆ بکرێت."[1]

بڕواننە قسەکانی ئەم فێمینیستەش کە چۆن باسی ئایینی ئیسلام و پارتە ئیسلامییەکان و تەنانەت عەلمانییەکانیش دەکات:

"تەنانەت پێش هاتنی ئیسلامیش دیاردەی لەشفرۆشیی ژنانی تێدا نەبووە و هەروەك چۆن دوور بووە لەوەی ئافرەتانی لە بازاڕەکانی نەخاسەدا بفرۆشرێن... ئێزیدییەکان ئەو جۆرە هەڵبژاردنە لە نێوان کچان و کوڕانیانا هەیە، ئەو دووانەی یەکتر هەڵدەبژێرن پێشتر لەگەڵ دەڕۆن و پاش ئەنجامدانی کاری سێکسی، ئینجا خێزانی کوڕە دەچن بۆ داوای کچە و ئەم چەشنە هەڵبژاردن و کولتوورە مرۆڤدۆستە لە زۆر شوێنیتری کوردستانیش هەبووە و هەیە، کەواتە ئەو تێروانینە بۆگەنە نێرسالارییەی پیاوانی کورد زادەی تێروانینی مێژووی کۆنی کورد نییە ئەوەندەی زادەی تێروانینی بۆگەنی ئایینی ئیسلامە، هیچ شتێك هێندەی ئیسلام کاریگەری بەسەر کوردەوە نەبووە، لەڕێی ئەو ئایینەوە هەرچی کلتوور و فەرهەنگی ناشیرین و خراپی عەرەب هەیە، گوێزرایەوە بۆ کورد و سیمای کۆمەڵی کوردی بە نێگەتیڤ گۆڕی... و لەو ڕۆژەوە ئیسلام پێی نایە کوردستان هەر بەشی ژنانی کورد بەشمەینەتیی و کوێرەوەرییە، قورئان ئەو کتێبەیە کە پڕە لە بەدڕەوشتیی بەرامبەر ئافرەتان... پاش ئەم هەموو ساڵە لە کوێرەوەریی و نەگبەتیی ئافرەتان پاش هاتنەپێشی تەوژمی دروستبوونی حیزبە ئیسلامییەکان، کوردیش چەندان حیزب و دەستە و تاقمی ئیسلامیی بۆ دروست بوون هەر لە بزووتنەوە و یەکگرتوی ئیسلامییەوە تا ئەوانیتر کە چەند پڕوپاگەندەی شتی باش بکەن، بەڵام هیچ جیاوازییەك لە نێوان ئەوان و (قاعیدە) و گروپە تیرۆریستییەکانیتردا نییە و هەر ئیسلام لە بنەڕەتەوە بیرۆکە و تێزێکی تیرۆریست و مرۆڤکوژە کە ئەمڕۆ بە پشتگیریی هەردوو حیزبە گەندەڵەکەی کوردستان تا دێت بەرەو پێش دەچن، لەجێی دروستکردنی شوێنە گشتییەکان و خزمەتکردنی خەڵك و جوانکردنی شارەکان و بەشارستانییکردنی کوردستان، تا دێت هەردوو حزبەکە زیاتر هاریکاریی مەلا و پیاوە ئایینییە بێکارە گەندەڵەکان دەکەن و لە کوێ بیانەوێ مزگەوتیان بۆ دروست دەکەن و تاد."[2]

---

١ . گفتگۆی ماڵپەڕی هاوبشتی لەگەڵ "کەژاڵ حەمە ڕەشید": **"یاسای باری کەسێتی و پەسەندکردنی فرەژنی لە لایەن پەرلەمانی کوردستان"**: وەرگیراوە لە: فەرمان خەرابەیی؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 75.

2 . شاناز بەرزنجی (بێ ڕێکەوت؟): **"ئێستای کچانی کوردستان و لەشفرۆشیی"**: لە ماڵپەڕی ئەمڕۆ:
http://www.emrro.com/estaykicani.htm

ئاراستە و ڕوانگەی سیاسی و ئایدیۆلۆژیکیی ئەم چەند فێمێنیستەش لەم یادداشتنامە هاوبەشەیاندا زۆر بە ڕوونی دیار دەبێت کە چۆن بەرامبەر بە لێدوانێکی ڕەسمیی پارتێکی سیاسیی سکیۆلاری کوردی، کە گوایە لەگەڵ هەر شتێك کە دژی سەوابت و شتەنەگۆڕەکانی ئایینی ئیسلام بێ، ناکۆکن و لە دژی دەوستێنەوە، دەنووسن:

"ئێمە کۆمەڵێك نووسەر و ئەکادیمیست و چالاکوان کە دۆزی یەکسانیی ژن و پیاو لە کوردستان بە لامانەوە لە دۆزە هەرەگرنگەکانی ناو کۆمەڵگایە، بە نیگەرانییەکی زۆرەوە چاودێریی گوتاری سیاسیی ئەم دواییەی بزووتنەوەی گۆڕان دەکەین. ڕێکخەری بزووتنەوەی گۆڕان لە کەناڵی کەی‌ئێن‌ئێن ڕایگەیاند کە: هەر شتێك نەگونجێت لەگەڵ سەوابتی دینی ئیسلامدا، ئێمە ڕەزامەندیی لەسەر نیشان نادەین و ڕەتی دەکەینەوە. ئەم لێدوانە دواتر لە لایەن هەندێك لەو ئەندامانەی بزووتنەوەکەوە کە بۆ پەرلەمان هەڵبژێردراون جەختی لەسەر کرایەوە. ئێمە نیگەرانین بەوەی کە ئەم بزوتنەوەیە ئاوا بێباکانە لەبەردەم ڕای گشتیدا خۆی پابەند دەکا بەوەی کە لە پەرلەمانی کوردستاندا هەر یاسایەك لەگەڵ شتەنەگۆڕ و جێگیرەکانی ئایینی ئیسلامدا ناکۆك بێ، لە دژی دەوەستێتەوە... بۆیە پێمان وایە کە دەبێ گونجاندنی ئاین لەگەڵ گیانی سەردەم و پێداویستییەکانی مرۆڤی سەدەی بیست‌ویەکدا ببنە بنەمای ستراتیژ و کاری هێزە سیاسییەکان لە کوردستاندا."[1]

بەپێی میتۆدۆلۆژیی ڕەخنەگریی زانستییانە، ناکرێ تەفسیراتی ئەو کەسانە بە شتێکی بابەتی و زانستی لەقەڵەم بدەین؛ چونکە ئەوانە لە دەرەوەی ئایین، بە ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراو و چاوێکی ماددیی ڕەها، مەنتقێکی زاتی و نابابەتییانە، پێشگریمانە و چوارچێوەیەکی سکیۆلاری، باگراوندێکی چەپگەرایانە و تەفسیرێکی پۆزیتیڤیستانە سەیری ئایین دەکەن و دەیخەنە بەر تیری ڕەخنەی ماددی کە خۆی ئەسڵەن مادده نییە!

ڕق و کینە بەرامبەر بە ئیسلام هەندێ جار وایان لێ دەکات کە زاتییەتی تێفکرین و ناخەکەیان بەدەر بکەوێ. سەیری وەڵامی ئەو ژنە فێمێنیستە بکەن، کە وەك بەرپرس و چالاکڤان لە بواری مافی ژنان لە سەنتەرێکی تایبەت بە ژنان کار دەکات، چۆن لەبەرامبەر ئەو پرسیارە کە

1 . نەزەند بەگیخانی، نەجیبە مەحمود، هۆزان مەحمود، نەڤین ئیبراهیم فەتاح، ڕۆژا حوسێن، ڕووناك فەرەج، چۆمان هەردی، ڤینۆش فایەق (2013/10/7)؛ **"یادداشتنامەیەك ڕووەو بزووتنەوەی گۆڕان و ڕای گشتی: پلەدوویی ژن لە شتە نەگۆڕ و جێگیرەکانی هێزێك نییە کە ڕێزی بۆ مرۆڤ هەبێ"**؛ لە ماڵپەڕی ئەمرۆ:

http://www.emrro.com/pileduyijin.htm

ئاراستەی دەکرێت وەڵام دەداتەوە: (بە بڕوای تۆ پرسی ژنان لە ڕووی کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە بەرەو پێش چووە؟)، دەڵێت:

"گەر بە پێی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان لە جیهان و کوردستان و ناوچەکە سەیری بکەین هێشتا زووە دەربارەی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی قسە بکەین لەبەر ئەوەی خۆسووتاندن و کوشتن بەردەوامە، ژمارەی لەچك بەسەر زۆر بووە، ئەمە نیشانەی ئەوەیە بەرەو دواوە دەچین."[1]

لۆژیکێکی زۆر ناتەندروستە کە هەبوونی ژنانی لەچکبەسەر بە پاشکەوتن و پێچەوانەکەشی بە خاڵی پێشکەوتن بزانین و تەنانەت بخرێنە ڕیزی کێشەکانی وەك کوشتن و خۆسووتاندنەوە! قسەی ئەم فێمێنیستە وەك پێشەنگێك لە داواکارانی مافی ژنان، ئەم تێگەیشتن و شیکردنەوەمان دەداتێ کە گوایە یەکێك لە سەرەکیترین چالاکییەکانیان لە نەهێشتنی حیجاب ـ وەك ڕەفتارێکی ئایینی ـ چڕ دەبێتەوە، ئەوەش خۆیلەخۆیدا مانایەکیتر دەبەخشێ کە ئامانجی هەرەسەرەکییان دژایەتیکردنی ئایین بێت و بەس! بۆ نموونە یەکێکی دی لە پێشەنگەکانی فێمێنیزمی کوردی، نیگەرانە کە ژمارەی لەچکبەسەر لە شاری سلێمانی ڕۆژبەڕۆژ لە زیادبووندایە:

"... بە گوێرەی هەواڵی ماڵپەڕێکی کوردی، ڕێژەی ژنانی باڵاپۆش لە پایتەختی ڕۆشنبیری ڕوو لەزیادبوونە... لە پێنجەمین فێستیڤاڵدا کە لە سلێمانی بەڕێوە چووە، *400* کچی ئەم شارە حیجابیان لەسەر نراوە و باسی ئەوەیان بۆ کراوە کە دەبێ هەموو کچ و ژنێکی کورد وەك ئەوان بکەن و جەستەی خۆیان بشارنەوە..."[2]

ئەگەر چالاکیی ئەم فێمێنیستانە و بەرپابوونی سەنتەرەکانیان بۆ نەهێشتنی لەچك و حیجاب کورت بێتەوە ـ کە پێدەچێت واش بێ، ئەگەر قسەی ئەم بەرپرسانە بە پێوەر وەربگرین ـ ڕەنگە کاری ئەوان وەك کاری لێدانی بزمار بێت لە بەردێکی ڕەق، کە تەنها ئەنجامەکەی خواربوونەوەی بزمارە یەكلەدوایەکەکانە! لێرە ئەم پرسیارانە دروست دەبن: ئایا خۆیان کە لەچکیان لەسەر نییە، چییان کردووە و چییان بەرهەم هێناوە بۆ ژنانی کوردی وەك خۆیان کە ڕۆژانە پێویستیان پێیە؟ ئایا تۆقەیەکی ژنانەیان دروست کردووە، کە ژنانی بێحیجاب لە قژی خۆیانی بدەن؟ ئایا کرێمێکی ئارایشتییان دروست کردووە، کە ناچار نەبن لە دەرەوە بیکڕن؟ لە لایەکیترەوە تۆ کە وەکو بەرپرسێکی سەنتەری بواری ژنان باس لە "خۆسووتاندنی ژنان" دەکەی کە بەشێکی هەرە

---

1 . چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕووناك فەرەج (2013): **"سەنتەری ڕووناکبیری و راگەیاندنی ژنان"**؛ گۆڤاری سەردەمی ژن: ژمارە 2: ل 337.

2 . تامان شاکر(2014/1/9): **پایتەختی ڕۆشنبیری و فێستیڤاڵی حیجاب**: لە ماڵپەڕی ڕووداو:
http://rudaw.net/sorani/opinion/090120141

گەورەی ژنان، بێلەچك و بەلەچكیش، ئەوانەن كە بە ڕووداو دەسووتێن،[1] چیت بەرهەم هێناوە بۆیان لەجیاتی ئامێری نەوتی وەك سۆپا و پەرەمێز و چرا، كە لە نەوت و ڕووداوی دڵتەزێن قوتار بن؟ ئەگەر وەك بەرپرسێك خەمخۆری ژنانی كوردی، بۆچی لە پێناو نەهێشتنی بەكارهێنانی ئامێر و كەرەستەی نەوتی خەبات ناكەی، كە دەبێتە هۆی ئاسایش و دەستبەتاڵی زیاتری ژنان؛ بەتایبەتی ئەو ژنانەی كە لەچكبەسەر نین و لەجیاتی تێكردنی نەوت لەو ئامێرانە، سوود لە كاتەكەی وەردەگرن و كارێكیتر وەكو ئارایشتكردن، گەڕان، خوێندنەوە، سەرگەرمی و وەرزش بكەن؟ ئەقڵ و لۆژیكی تەندروست، هەروەها كێشەناسیی واقیعبین و ڕیالیستییانە وا حوكم دەكەن، كە بەر لە هەموو شتێك دەبێ پلان و هەوڵ و كۆششەكانی ئەم سەنتەرانە، بۆ ئەوەی ژنان بتوانن خۆیان پێبگەیەنن، دابینكردنی سەرەتاییترین ماف و پێداویستییە فیزیۆلۆژییەكان* بێت؛ وەك: دابینكردنی كارەبا و ئاو و جادەی باش و قیرتاوكردنی بەردەرگاكان، كە بەپێی واقیعی كۆمەڵگای ئێمە، سوودمەندی یەكەم ژن دەبێت، كە حەوشەی ماڵەكەی لەبەر قیرتاونەبوونی كۆڵانەكان بەردەوام قوڕاوی و تۆزاوییە، بەردەوام خەریكی پەمپەلێدانی ترومپا (مزەخە)ی ئاوە بۆ ئەوەی ئاو بكاتە تانكی سەربان، خەریكی گەسكدانە و قاپشۆردن و جلشۆردنە كە هەموویشی بە دەستە. یان كارەبا نییە كە كاری پێ بكات، یان لەبەر هەژاری ناتوانێ ئەو ئامێرانە دابین بكات! ئایا لەچك نیشانەی پاشكەوتنە، یان پەمپەلێدانی پەرەمێز و ترومپا لەم سەردەمەدا؟ ئایا پارادۆكس نییە كە ژنێكی بێحیجابی ئارایشتكراوی مودێل ڕۆژئاوایی (پێشكەوتوو بە قسەی ئەوان!)، خەریكی دەرهێنانی نەوت بێ لە بەرمیلەكانی بەر دەرگا، یان خەریكی پەمپەلێدانی ترومپای ئاو بێ، یان بەردەوام خەریكی خاوێنكردنەوەی ئاوەڕۆ و جۆگەڵەی بەر دەرگای ماڵەوە بێ؟ چەندین وڵات هەن كە ژنانیان لەچكبەسەر نین و لە دۆخ و ژیانێكی زۆر ناخۆش و دوور لە مرۆڤایەتیدان؛ بۆ نموونە: ئایا ژنانی كۆریای باكوور لەچكیان هەیە و باڵاپۆشن كە تەنانەت ناتوانن ببنە خاوەن

1 . ئەگەر ژمارەی هەموو ئەو ژنانەی كە بە ئاگر سووتاون (سووتانی بە ڕووداو و خۆسووتاندن) لە دوو ساڵی (2012) و (2013) كۆ بكەینەوە، بە پێی ئاماری ڕەسمیی وەزارەتی ناوخۆ، بەڕێوەبەرایەتی توندوتیژی دژ بە ئافرەتان، بە تێكڕایی دەگاتە (707) كەس كە (489) كەس لە دوو ساڵەدا بە ڕووداوی نەخوازراو سووتاون، بەڵام ڕێژەی خۆسووتاندن بریتییە لە: (218) كەس؛ كەواتە (70%) بریتین لەوانەی كە سووتاون، (30%) ئەوانەی كە خۆیان سووتاندووە: "**ئاماری توندوتیژییەكان لە دژی ئافرەتان لە هەرێمی كوردستانی عێراق، ڕاپۆرتی ساڵانەی (2012) و (2013)**"؛ وەزارەتی ناوخۆ: بەڕێوەبەرایەتی گشتی بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی دژی ئافرەتان.

* ئەم پێداویستییە فیزیۆلۆژییانە بە گوێرەی تیۆریی "هەرەمی مازلۆ" ـ كە دواتر باسی دەكەین ـ بنچینەی هەرەسەرەكیی پێداویستییەكانی مرۆڤە بۆ خۆپێگەیاندن و خۆسەلماندن، كە مازلۆ لە نێوان پێنج پەیژە پێداویستییەكانی، بە یەكەمین و سەرەتاییترین پەیژەی داناوە.

مۆبایلێکیش[1] و لە سەرەتاییترین ماف و ئازادی بێبەشن؟[2] ئایا ژنانی "چین"یش حیجابیان هەیە کە لە هەندێ شوێنی ئەو وڵاتەدا هێشتا دابونەریتی کۆنیان ماف بە ژنان نادات لەگەڵ پیاوەکان لەسەر یەك سفرەی نان خواردن دابنیشن؟[3] ئایا لەبەر لەچکە و پۆشتەکردنی ژنانە کە منداڵانی خۆیان ئەگەر کچ لەدایك بن، لەناو دەبەن؟[4] ئایا ژنانی "هیند"یش لەبەر حیجابە، کە ئێستاش بەهۆی نەریتێکی قێزەوەن، کە ئەنترۆپۆلۆژیستەکان پێی دەڵێن: "منداڵکوژیی مێینە" (Female Infanticide)، ساڵانە بە هەزاران منداڵی ساوای مێینە لەناو دەبردرێن، بەم پاساوە کە ئەگەر دایك منداڵی کچ لەناو ببات، دەبێتە گەرەنتی بۆ ئەوەی سکەکەی‌تری ببێتە کوڕ؟[5] ئایا خۆتان بە پێشەنگ و هەڵگری مەشخەڵی ئازادیی ژنان لە کوردستان دەزانن؟ مەگەر ژنانی لەچکبەسەر، ژن نین؟ ئەو ئازادییەی کە دەتانەوێ چییە و چ کەسانێك دەگرێتەوە؟ ئایا ژنان بەگشتی و ژنی لەچکبەسەریش بەتایبەتی ئازاد نین، کە چی لەبەر بکەن یان نەکەن؟ منیش دەتوانم بە هەمان لۆژیکی ئەو ژنە، زۆر شت بکەمە ئەگەری پێشکەوتن یان پاشکەوتن! بۆ ناڵێین: هۆی دواکەوتنی کۆمەڵگەکەمان دەگەڕێتەوە بۆ هەبوونی ژنانی بێحیجابی وەك خۆی؟ بەڵام ئایا ئەو لۆژیکە دروستە؟ بەستنەوەی پێشکەوتن و دواکەوتنی کۆمەڵگایەك بە نیو مەتر قوماشی لەچکەی

1 . Kim, Yonho (2014), "**Cell Phones in North Korea**", US-Korea Institute at SAIS: VOA (Voice of America), p. 54.

2 . UN, General Assembly, Human Rights Council (7 February 2014), "**Report of the commission of inquiry on human rights in the Democratic People's Republic of Korea**", pp. 1-34.

3 . چەند ساڵ پێش خەریکی خوێندنەوەی کتێبێکی پزیشکی بووم کە گەیشتمە بابەتێك کە زۆر سەرنجڕاکێش بوو! ئاماژە بە شێرپەنجەی گەدە دەکرد لە وڵاتی چین، کە دەیگوت لەو وڵاتەدا پیاوان لەبەر خواردنی گەرم زیاتر لە ژنان تووشی ئەم نەخۆشییە کوشندەیە دەبنەوە، لەبەر ئەوەی ژنان خواردن بۆ پیاوان دادەنێن و بەخۆشیان مافی دانیشتنیان نییە لەسەر سفرە و، پیاوان خواردنی گەرم دەخۆن و ژنانیش دوای ئەوان خواردنی سارد دەخۆن! بڕوانە: رانکوهی، دکتر منصوره (2000)؛ "**بیماریهای ناشی از کمبود مواد غذایی**"؛ تهران: انتشارات مستعان؛ صص 123 – 124. بۆ جەختکردنەوە لە ڕاستیی ئەو بابەتە زیاتر لەسەرم کۆڵییەوە کە لە سەرچاوەیەکی دیکەم خوێندەوە کە ئەمە نەریتێکی کۆنە و لای هەندێ نەریتخوازە چینییەکاندا هێشتا ماوەتەوە: "لە کتێبێك کە دوو هەزار ساڵ پێش ئێستا نووسراوەتەوە هاتووە: پێکەوە دانیشتنی ژن و پیاو لە یەك شوێن ڕەوا نییە، دەبێ چرا و کاسەی ئاو و قاپی خواردن و شانەی سەریان لەیەکتر جیا بێت. ژن دەبێ ئەو شتانە بۆ پیاو لە ناو سینییەك ئامادە بکات و دواتر بڕوات...". بڕانە: نشریەی عالم نسوان (1923)؛ "**زن و تاریخ**"؛ تهران: (بیجا؟)؛ ص 677. یان نەریتی شکاندن و گرێدانی پێیەکانی ژنان و کچانی چینی بە مەبەستی بچووکمانەوەی پێیەکان وەك پێی بۆکەشووشە، بەو خەیاڵەی کە پێی درێژ دەبێتە هۆی بەهێزکردنی حەزی سێکسیی، کە هەتا ساڵی (1912) زاینیش لە کۆمەڵگای چینی بەردەوام بووە! بڕوانە:
Mackie, Gerry (1996), "**Ending Footbinding and Infibulation: A Convention Account**", American Sociological Review 61 (6). pp. 999--1017

4 . Williams, Jessica (2007), "**50 Facts That Should Change the World**", Icon Books Ltd; Revised edition edition; pp. 32-39.

5 . Anderson, John W. and Moore, Molly (April 25, 1993), "**The Burden Of Womanhood: Third World, second Class**", The Washington Post, From: http://www.washingtonpost.com

سەرەوە وەك ئەوەی وایە من بڵێم: مادام ڕەنگی چەرچەفەی سەر تەختی نووستنی ئەو خاتوونە فڵان ڕەنگ نییە، کوردستان قەت سەربەخۆ نابێ! لە لایەکیترەوە، کوا؟ هیچ ژنێکی بێحیجاب لەبەر "بێحیجابی"یەکەی گەیشتووەتە پۆستی سەرۆکایەتیی وڵاتێکی وەکو کوردستان، یان وەزارەتێك، تاکو ببێتە پاڵنەرێك بۆ ژنە لەچکبەسەرەکان و فڕێدانی لەچکەیان؟ بەپێی ئەم لۆژیکە سەقەتە، ئەگەر نەبوونی لەچکە ببێتە هۆی پێشکەوتن، دەبێ ڕووتبوونەوە ببێتە لووتکەی پێشکەوتن! (لەبارەی حیجاب دواتر بە وردی وتارەکانیان تاوتوێ دەکەین).

کاتێك کە قوتابی بووم لەگەڵ چەند کەسێك لەو ڕۆشنبیرانە پێکەوە لە یەك قۆناغی خوێندندا بووین. لەکاتی پێشکەشکردنی سمینارێکدا سەبارەت بە زانستی دانیشتووان، یەکێکیان دەستی بەرز کردەوە و قسەکانمی بڕی و بە تانەلێدان و بەبێ ئەوەی پەیوەندیی بە بابەتەکەی منەوە هەبێت، وتی:

"من پێم وایە دواکەوتنی ئێمەی کورد لەبەر ئیسلامە؛ چونکە ئیسلام حەبی مەنع لە سکپڕی بە حەرام دەزانێ، بۆ نموونە باوکم لەبەر ئەو پابەندییە بووە کە زۆر منداڵی خستووەتەوە و لەبەر زۆربوونی ژمارەی ئەندامانی خێزان، ئێمە وەك پێویست پێش نەکەوتووین و لە خۆشگوزەرانی بێبەش بووین!؟"*

جارێکیتر یەکێکیان لە قۆناغێکیتر، کاتێك کە مامۆستاکەمان بابەتی پلانی کۆمەڵایەتیی ڕاڤە دەکرد و دەیگوت کە لە دانانی پلان بۆ شار پێویستە ڕەچاوی هەموو شتێك بکرێت وەك جادەکان، پارك و خزمەتگوزارییەکان و شوێنی عیبادەت، وەك: مزگەوت و کەنیسە و هتد، ئەو کەسە دەستی بەرز کردەوە و قسەکانی مامۆستای بڕی و وتی:

"مامۆستا! چیتر پێویستیمان بە مزگەوت نییە. بەس لە شاری هەولێر زیاتر لە سێسەد مزگەوت هەیە! خۆ کێشە تەنیا بوونی مزگەوت نییە، بەڵکو هەر مزگەوتێك پێویستە مەلایەکی هەبێت و ئەو مەلایەش تریبۆنێکی ئازادی بۆ دەڕەخسێ بۆ هەزاران کەس و...!؟"**

---

* ئیسلام لە پێشگیری لە منداڵبوون و دەستنیشانکردنی ژمارەی منداڵان هیچ ڕێگر نییە! ئەگەر ژمارەی دانیشتووانی هەموو کوردستان ـ بە منداڵەکانی باوکی ئەو ڕۆشنبیرەوەش ـ (5) ملیۆن کەس بن، ئەگەر داهاتی ڕاستەقینەی هەر یەك لەو هاووڵاتییانە بە دادپەروەرانە دابەش بکرێت، چەند ئەوەندەی ئێستا دەبوو کە لە زۆر وڵاتانی دەوروبەر زیاترە، سەرەڕای زیادبوونی ڕێژەی دانیشتووانیان، کە ناچارن بۆ کار و بژێوی خۆیان بێنە کوردستان. ئایا دابەشکردنی نادادپەروەرانەش خەتای ئیسلام یان زۆربوونی ژمارەی دانیشتووانی کوردستانە؟!

** خۆ ئەگەر سێسەد مزگەوتمان لە هەولێر هەبێت و واش دابنێین هەموویان ئیمام و وتارخوێن و تریبۆنێکیان هەیە کە هەفتانە وتارێکی دیکتەکراو لە لایەن وەزارەتی ئەوقافەوە، پێشکەشی جەماوەرێکی تایبەت (واتە نوێژکەران) بکەن، کە ساڵانە تەنها دەکاتە

لە هەموویان سەیرتر ئەوەیە کە فێمێنیستێکیتر لە توێژینەوەی خۆیدا هۆکاری خۆسووتاندنی ژنانی کورد دەگەڕێنێتەوە بۆ "ئایینی ئیسلام"! ئایینێك کە هەموو ئامانجی ئەوەیە کە مرۆڤایەتی لە "ئاگر" و "سووتان"ی ئەم دونیایە و دواڕۆژ ڕزگار بکات، لای ئەو ژنە توێژەرە بە هاندانی ژنان بۆ خۆسووتاندن ژمێردراوە؛ ئایا نازانێ کە لە ئیسلامدا هەرکەس خۆی بسووتێنێ تەنانەت بە فەرمانی سەرۆکەکەش بێ، قەت لەو ئاگرە ناهێتەدەر؟* سەیری لۆژیکی ئەقڵەبڕی ئەم توێژەرەش بکەن، کە چۆن ئایینی ئیسلام بە هۆکاری خۆسووتاندن دادەنێت و لە ژێر ناونیشانی "هۆیەکانی خۆسووتاندن"ی هێناویەتی و ئەمەش بە "لێکۆڵینەوە" لەقەڵەم دەدات!

"فاکتەرە ناوەکییەکان بریتین لە: کەلتوور، داب‌ونەریت و ئایینی ئیسلام."[1]

لە دەرئەنجامەکانیشدا دەڵێت:

"خۆسووتاندنی ژنان بوّتە پراکتیسێکی ڕوو لە زیادبوون لە کۆمەڵگەی کوردی. ئەم بەشە [واتە بەشێك لە لێکۆڵینەوەکەی] وەسفی ئەو دیاردە ترسناکەی کرد و گفتگۆی لەسەر ڕوخسارە سەرەکییەکانی کرد. دەستەواژەی سووتان مانایەکی ئایینی و کەلتووری گرنگی هەیە لە کۆمەڵگەی کوردی و دەتوانرێ بە هۆکاری گرنگ دابنرێ کە دەبێتە هۆی بەکارهێنانی سووتان وەك میتۆدێك بۆ ڕەفتاری خۆکوژی بە شێوەیەکی بەربڵاو."[2]

پێم وایە ئەو خاتوونە، کە "ئایینی ئیسلام" بە هۆکاری سووتانی ژنان دەزانێت، لەگەڵ "ئایینی پیاوانی کەنیسە"، ئایینی پرۆفسۆر و سەرپەرشتیاری توێژینەوەکەی (کە مامۆستای زانکۆیەکی هوڵەندە)، بەهەڵە وەرگرتووە. سەردەمی ڕابردوو، باب و باپیرانی ئەم سەرپەرشتیارە و ئەم

---

(48) وتاری نیوساعەتی، بەڵام ڕۆشنبیران دەیان تریبۆنی ئازادیان هەیە لە میدیاکان (ئامرازی گەیاندنی بینراو، بیسراو و نووسراو)، کە ڕۆژانە بگرە هەر کاتژمێرێك بیانەوێ ئازادانە و سەربەستانە هەرچی پێیان خۆشە دەیڵێن و کەسیش ناتوانێ ڕێگریان بێت!

* بوخاری لە سەحیحەکەیدا دەگێڕێتەوە: "پێغەمبەر ـ د.خ ـ سرییەیەك (چەند کەسێك) دەنێرێتە شوێنێك و پیاوێك لە ئەنسارەکان دەکاتە سەرۆکیان و ئەمر دەکات کە هەموو دەبێ گوێڕایەڵی بن. گروپەکە بەڕێ دەکەون و لەڕێگا تووشی کێشمەکش دەبن و سەرۆکەکەیان تووڕە دەبێت و پێیان دەڵێت: ئەی پێغەمبەر ـ د.خ ـ منی نەکردووەتە سەرۆکتان و ئەمری پێ نەکردوون کە هەمووتان گوێڕایەڵم بن؟! هەموو وتیان: بەڵێ ڕاستە! سەرۆکەکە وتی: جا بڕۆن چڕوچیلکە خڕبکەنەوە و بێنن، دوایی فەرمانی کرد کە ئاگر بکەنەوە، پاش ئەوەی ئاگرەکە خۆش بوو، وتی: هەر هەمووتان بچنە ناو ئاگرەکەوە! دیسان بووە کێشمەکێش و هەندێ وتیان: مادەم پێغەمبەر ـ د.خ ـ فەرموویەتی لە ئەمری دەرنچن، پێویستە فەرمانەکەی جێبەجێ بکەین. هەندێکیتر ڕێگەیان گرت و نەیانهێشت بچنە ناو ئاگرەکەوە و وتیان: ئێمە شوێنکەوتووی پێغەمبەر ـ د.خ ـ بووین و ئیمانمان هێناوە کە لە ئاگر قوتار بین، ئێستاش تۆ ئەمرمان پێ دەکەی کە خۆمان بسووتێنین؟! کاتێ گەڕانەوە لای پێغەمبەر ـ د.خ ـ و بۆیان گێڕایەوە کە پێغەمبەر ـ د.خ ـ لەو کاتە فەرمووی: سوێند بەخوا! ئەگەر فەرمانتان جێبەجێ بکردایە و بچوونایە ناو ئاگرەکەوە، هەرگیز لەو ئاگرە نەدەهاتنەوە دەرەوە! ئینجا فەرمووی: ئیتاعە و گوێڕایەڵی تەنها بۆ کردەی چاك و مەعروف و شایستەیە". (صحیح البخاري، کتاب المغازي، باب سرية عبدالله به خذافة، حديث الرقم: 3993).

1 . چەلەنگ ڕەشاد یەحیا (2009)؛ **"دیاردەی خۆسووتاندنی ژنانی کورد لە دیدی مافی ئافرەتەوە"**؛ هەولێر: وەزارەتی مافی مرۆڤ؛ ل 25.

2 . سەرچاوەی پێشوو؛ ل 33 و 34.

کۆمەڵە پرۆفسۆرە ئەوروپییانە بوون، کە توێژەر لەبەر یارمەتیدانیان لە لاپەڕەی (11)دا سوپاسیان دەکات، لە سەدەکانی پانزدە تا هەژدە، (60) هەزار ژنیان سووتاندووە![1] واتە سووتێنراون، نەك وەك ئەو ژنانەی کە لێرە خۆیان دەسووتێنن! توێژەر لە شوێنێك دەرسی خوێندووە کە سەردەمێکی نە ئەوەندە دوور، بە پاڵنەرێکی ئایینی ژنیان دەسووتاند، کەچی لێرە بە ناوی لێکۆڵینەوە، ئایینی ئیسلام بە هۆکاری هەرەگەورەی خۆسووتاندنی ژنانی کورد ناو دەبات، تەنها بەم پاساوە کە لە ئیسلامدا زۆر باسی ئاگری دۆزەخ کراوە! بۆچی ئەو سەرپەرشتیار و ئەو پرۆفسۆرانە کە هەندێکیان ئەندامی کۆمیتەی "سیداو"ی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکانن، هەندێکیان چالاکڤانی مافی مرۆڤن هەر سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان، باسی ئایینی وڵاتانی خۆیانیان نەکردووە کە مێژووەکەشی ئەوەندە دوور نییە، تاکو لە بیر بکرێ! بۆ نموونە: بە بڕیاری کەنیسەکانی پرۆتستانتیزم (کە خۆی شۆڕشێکی ئایینی بوو دژ بە نەریتی کۆنەپەرستی مسیحییەت) لە دوای هاتنە سەر حوکم و دەسەڵات، هەر کەس دەبووە موسڵمان یەکسەر دەسووتێنرا![2]

---

1 . بڕوانە: د. چۆمان هەردی (2013)؛ "**ڕەهەند و میکانیزمەکانی چەمکی جێندەر لە کۆمەڵگای کوردیدا**"؛ گۆڤاری سەردەمی ژن؛ سەنتەری مارگرێت و دەزگای ڕۆشنبیری جەمال عیرفان؛ ژمارە 2؛ ل 128.

2 . مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کە لە کاتی دەسەڵاتی "کالڤین"، زۆر کەس بە تاوانی کوفر و بێباوەڕی و هەڵگەڕانەوە لە ئایین، بە زیندوویی سووتێنراون! یەکێك لەو کەسانە "میکائیل سرڤێتۆس" (M. Serveto) ـ فەیلەسوف و پزیشکی ئیسپانی ـ بوو کە بەهۆی ئیسلامهێنان و دژایەتی و ڕەخنەگەری لەسەر باوەڕی "سێپیرۆزان/ تثلیث" و "شۆردنی لەش بە ناوی پیرۆز/ غسل تعمید" دەستگیر کرا و بە فەرمانی کەنیسەکانی کالڤین بە تۆمەتی هەڵگەڕانەوە لە ئایین، لە خاچ درا و بە زیندوویی سووتێنرا! دەڵێن: لە زانکۆکانی تەندەلۆس فێری ئەندازیاری و ئەستێرەناسی ببوو و تەنانەت "جان برنال" ـ مێژوونووسی بەناوبانگ ـ دەڵێت: یەکەم کەس بووە کە سووڕانەوەی خوێن لە ناو جەستەی مرۆڤدا دۆزیوەتەوە و لە ساڵی (1553) کتێبێکی بەناوبانگی نووسیوە بە ناوی "دووبارە بونیادنانەوە و نوێژەنکردنەوەی بونیادی ئایینی".(بی ناس، جان (2008)؛ "**تاریخ جامع ادیان**"؛ ترجمە: علی اصغر حکمت؛ چاپ 17؛ تهران: انتشارات علمی ـ فرهنگی؛ ص 680)؛ بڕوانە مێژووی دادگاکانی تەفتیش لە سەردەمەی مەسیحییەتدا کە بە هەزاران کەس تەنها لەبەر موسڵمانبوونیان سووتێنراون. کەسێکی وەك "ئەلکساندر ڤۆلتێر" بە باسێکی دوورودرێژ و هێنانەوەی نموونەی زۆر، بە شەرەمەزاری ئاماژە بە پرۆژەی سووتاندنی موسڵمانان دەکات؛ بۆ نموونە دەگێڕێتەوە: "ئەو وەحشی و دڕندانە خۆیان شایەتن کە موسڵمانان چۆن لەگەڵ مەسیحییەکان و یەهودییەکان و تایفەکانی دیکە لە نیشتمانی خۆیان بەو پەڕی ڕێز و ئازادییەوە مامەڵە دەکەن. بە ڕاستی شەرم و نەنگە بۆتان! ئەو نموونەی ئیسلامەتی و نەرم و نیانییەکەی نەیتوانیوە دڵی ڕەق و بەردینی ئەو دڕندانە نەرم بکات، کە لە نیشتمانێکی بچووکی وەك پورتۆگال، موسڵمانان دەکوژن! باشە ئەو موسڵمانانە چییان کردووە کە دەبێ بسووتێنرێن؟ لەوانەیە تەنها لەبەر ئەوە بێ کە باوکانیان پێستێکی کەم لە ئەندامی نێرینەیان لەبەر چاودێریی تەندروستی لێکراوەتەوە و ئەو دڕندانە لێناکەنەوە؟ یان لەبەر ئەوەیە کە لە یەك ڕۆژدا چەند جار سەر و جەستەیان دەشوون و حەمام دەکەن و پێنج جاریش دەم و چاویان دەشوون و ئەو دڕندانە هەفتەی جارێکیش خۆیان ناشوون؟ یان لەبەر ئەوەیە کە لەکاتی نوێژکردن بەرامبەر خوای خۆیان کە پێی دەڵێن: الله، دەستی خۆیان هەتا ژێرگوێیان بەرز دەکەنەوە؟ ئاخ! ئای هاوار! ئەی براکانی من! سووتاندنی خەڵك چۆن دەکرێ؟. ئەی گورگ و پڵنگە دڕندەکان! ئەی خورافەپەرستەکان! ئەگەر ئایینی ئێوە لەسەر هەق بووایە، هەرگیز ناچار نەدەبوون کە بەم شێوازە ڕەفتار بکەن. هەرگیز ناچار نەدەبوون پیرەمێردێکی حەفتا ساڵان لەگەڵ سی‌وسێ کەسی‌تر لەبەر باوەڕهێنانیان بە ئیسلام لەناو ئاگری ئەو دۆزەخەی کە دومینیکییەکان دروستیان کردبوو، بەزیندوویی بسووتێنن!..."؛ بڕوانە:

ئەگەر بمانەوێ، وەڵامێکی کۆمەڵناسییانەی ئەو توێژەرە بدەینەوە، ئەم پرسیارانەی ئاراستە دەکەم: ئەگەر ئایینی ئیسلام، تەنها لەبەر ئەوەی کە قورئان زۆر ئاماژە بە ئاگری دۆزەخ دەکات، بە هۆکاری خۆسووتاندنی ژنانی کورد دەزانی، بۆچی تەنها ژنان خۆیان دەسووتێنن و پیاوان نا؟ ئایا پیاوانیش موسڵمان نین؟ بۆچی تەنها ژنە کوردە موسڵمانەکان، کە لەوانەیە زۆربەشیان نەزانن قورئانیش بخوێننەوە، خۆیان دەسووتێنن، بۆچی ژنە عەرەبە موسڵمانەکان لە وڵاتێکی وەك سعوودیا کە قورئان لەوێ دابەزیوە، خۆیان ناسووتێنن؟ بۆچی ژنە موسڵمانە مالیزی، ئەندەنووسی، پاکستانی و تاجیکەکان و هتد، خۆیان ناسووتێنن؟ ئایا ئەم دیاردەیە تەنها تایبەت نییە بە ژنی کورد؟ ئەی ئەو ژن و پیاوانەی باکووری کوردستان (تورکیا) کە لەبەر هۆکاری سیاسی نەتەوەیی لە خۆپیشاندانەکان لە وڵاتە ئەوروپییەکان لەبەردەم میدیاکان، خۆیان دەسووتاند، ئایا ئەوەش پەیوەندیی بە ئیسلامەوە بووە؟ یان پەیوەندیی بە چەوساندنەوەی پیاوان و سیستمی پیاوسالارییەوە هەبووە؟ ئەی ئەو ئامارانەی کە دەردەخەن کە هەندێ لەو ژنانە لە ڕقی دایکیان خۆیان سووتاندووە چین؟ یان ئەو ژنانەی کە بەهۆی ڕووداوێکەوە سووتاون چین؟ پێم وایە ئەم توێژەرە، سەرەتاییترین هۆکاری سووتانی ژنانی لەبیر کردووە، کە هەر توێژەرێك لە خاڵی یەکەمی لیستی هۆکارەکانی دادەنێت، کە ئەویش بەردەستبوونی ئاگرە لە ڕێگای ئامێر و کەرەستەی سووتەمەنی و ئاگراوی؟ ئامارە ڕەسمییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی ناوخۆ، بەڕێوەبەرایەتیی گشتی توندوتیژی دژ بە ژنان ئاماژە بەوە دەکەن، کە لە هەردوو ساڵی (2012) و (2013)، هەروەها (9) مانگی (2014)، (939) ژن بە ئاگر سووتاون و مردوون، کە (651) کەس ئەوانەن کە بە ڕووداوی نەخوازراو سووتاون، کە دەکاتە نزیکەی (70%)، هەرچی ئەوانەی کە خۆیان سووتاندووە (288) کەس بوونە، کە ڕێژەی (30%) پێك دەهێنن و لەوانەش ڕێژەی (17%) نەخۆشیی دەروونییان هەبووە![1]

کەواتە هۆی هەرە سەرەکیی خۆسووتاندن یان سووتانی ژنانی کورد دەگەڕێتەوە بۆ بەردەستبوونی ئاگر و ئامێری ئاگراوی وەك: پەرەمێز و سۆپا و فانۆس، کە بە نەوت کار دەکەن؛

---

Voltaire, op.cit., pp. 280-281.

1 . ڕاپۆرتی ساڵی (2012) و (2013)ی بەڕێوەبەرایەتیی گشتی توندوتیژی دژ بە ئافرەتان؛ هەمان سەرچاوە. هەروەها: بڕوانە: ماڵپەڕی ڕووداو (2014/11/25) ئەم ئامارە ڕەسمییانەی لە ڕاپۆرتێك بە ناونیشانی "**بەپێی ئامارەکان هیچ مانگێك لە هەولێر بێ کوشتنی ژنێك تێنەپەڕیوە**" بڵاو کردووەتەوە:

http://rudaw.net/NewsDetails.aspx?PageID=81993

بۆ نموونە لە وڵاتانی دیکە بۆ حەمام و خۆشۆردن یان چێشتلێنان و نانکردن پەرەمێز بەکار ناهێنن، هەروەها بۆ خۆگەرمکردنەوە سوود لە سۆپای نەوتی وەرناگرن، یان بۆ ڕووناککردنەوەی ژوورەکان سوود لە فانۆس و چرای نەوتی وەرناگرن؛ چونکە بەردەوام بەبێ پچڕان کارەبایان هەیە! کەواتە نەوتیان پێویست نییە کە وەك ژنی کوردستانی ئێمە بە دەببە، بهێنن و بیبەن و لە ناو ئەو ئامێرانەی بکەن و ئینجا بە ڕووداوێکی دڵتەزین بسووتێن یان لە ڕقی کەسێك ـ پیاوێك یان ژنێك ـ خۆیان بسووتێنن. ئەگەر لەدوای هۆکاری کولتووریش بگەڕێین، بۆ ناڵێین سەرچاوەی ئاگر لە کوردستان دەگەڕێتەوە بۆ ئایینی زەردەشتی و ئاگری نەورۆز، کە ئاگر لای کوردە زەردەشتییەکان بە شتێکی پیرۆز لەقەڵەم دراوە و پەرستوویانە؟ سەیر ئەوەیە کە ئەو توێژەرە لە ڕاسپاردەکانی بۆ حکومەت و لایەنە پەیوەندیدارەکان، هیچ باسێکی لە ڕێگەی ڕزگاربوون لەو کەرەستانە نەکردووە و تەنها ئاماژە بە دانانی یاسا یان گۆڕینی یاسای شەرعی و مەدەنی دەکات!

لەوانەیە هیچ کام لەو فێمێنیست و ڕۆشنبیرانە وەك ئەو خاتوونە، کە بەرپرسی سەنتەرێکی تایبەت بە ژنان و کادرێکی چالاکی بواری مافی ژنان بووە، بوێر و ڕاستگۆتر نەبووبێ، کە ڕاشکاوانە دژایەتیی خۆی لەگەڵ ئیسلام ڕادەگەیەنێت و ئایینی مەسیحییەتی پێ باشترە لە ئیسلام و دان بە توندڕەویی خۆی دادەنێت و دەڵێت:

"من توندڕەوم... ئیسلام هەر هەموو زیانە بۆ مافی ژنان. ئایینی ئیسلام منی بە پلە دوو داناوە... مەلایەك گوتی: ژن میوانە... لە میراتدا ژن یەك بەشی هەبێت و پیاو دوو بەش. بۆچی پیاوێکی نەزان، ژنێکی زانا ئاوا حیسابیان بۆ بکرێت... ئایینی مەسیحی یەکسانی تێدایە."[1]

کەسێك کە مێژووی ئەورووپای خوێندبێتەوە، پەی بەوە دەبات کە هەڵوێستی ئەم تاقمە ڕۆشنبیرە بەرامبەر بە ئایینی ئیسلام، وەکو هەڵوێستی ڕۆشنبیرانی ئەورووپایە بەرامبەر بە ئایینی مەسیحییەتی سەردەمی تیۆکراسی (Theocracy)[*]، کە زۆر شێلگیرانە دژی وەستانەوە؛ ڕەفتار و مامەڵەی ئەو ڕەوتە لە ڕۆشنبیران، بۆ ئەوەی وەکو ئەوان لەقەڵەم بدرێن و بڵێن ئەوانەش

---

1 . ڕووناك ڕەئوف سەعید (ئابی 2007)؛ گۆڤاری بزاو؛ ژمارە 12؛ وەرگیراوە لە توێژینەوەی: بێدار فارس عەزیز و نیگار دلێر ئەحمەد: "**فاکتەرەکانی زۆربوونی هەڵوەشانەوەی هاوسەریی و ڕۆڵی قانوون و ڕێگەکانی چارەسەری**"؛ هەولێر: دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی (2008)؛ ل 68 - 69.

* تیۆکراسی بریتییە لە: حکومەتی پیاوانی ئایینی و ڕێبەر و پێشگۆ و کاهنە ئایینییەکان، کە خۆیان بە نوێنەری خودا دەزانن و فەرمانەکانیشیان وەك فەرمانی خوا بە پیرۆز لەقەڵەم دەدرێن.

ڕۆشنبیر و پێشکەوتوون،* کۆپیی ڕەفتاری ئەوانە؛ بەم جیاوازییە کە ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوایی لەسەر بنەمای شارەزایی و ناسینی ئایینی خۆیان و مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست و دەسەڵاتی دیکتاتۆریی کەنیسە و پیاوانی مەسیحییەت، بە خەبات و کۆشش و کاری بەردەوام گەیشتنە ئەزموونێکی گونجاو بۆ خۆیان کە بەرهەم و داهێنانی خۆیانیش بوو و، دژایەتیی ئایین و کەنیسەیان کرد، بەڵام ڕۆشنبیرانی ئێمە جگە لە لاساییکردنەوەی ڕواڵەتی فیزیکی و جەستەیی (وەك پۆشاك و شێوازی پرچی سەر و ڕیش و سمێڵ و چاویلکە و ...!)، هەروەها چاولێکەریی فیکری و مەعریفی و کۆپیپێستکردنی جیهانبینی و بوونناسی و مرۆڤناسیی ئەوان، لە دژایەتیی ئایینیش چاو لەوان دەکەن؛** بەم جیاوازییە کە گوزارەکان جیاوازن: ئەوە "ئیسلام"ـە و ئەویش "مەسیحییەت"ی سەدەکانی ناوەڕاست! هەروەها ئەوان باش شارەزای ئایینی خۆیان بوون، بەڵام ڕۆشنبیرانی ئێمە زۆر کەم ئاشنای ئیسلامن، یان هەر نایناسن؛ بۆیەش "خۆسووتاندنی ژنانی کورد" لەگەڵ "سووتاندنی ژنانی ڕۆژئاوایی" هەتا سەدەی هەژدە لە لایەن کەنیسەوە تێکەڵ دەکەن. هەندێ جاریش لەبەر نەزانین ئایەتەکان بە هەڵە وەردەگێڕن، یان ماناکەیان ئاوەژوو دەکەنەوە،*** یان ئەو شوێنەی کە مەبەستیانە دەیهێنن و پێش و پاشەکەی دەبڕن! یان لە نێوان ڕا و تەفسیری جۆراوجۆر و تەنانەت جیاواز، تەنها ئەو ڕا و تەفسیرە هەڵدەبژێرن کە لە

---

* هەڵسەنگاندنی خۆ بە چاوی کەسانی بێگانە، بەو مانایەی کە تاك بە چاوی خەڵکی بێگانە سەیری خۆی بکات و خۆی هەڵسەنگێنێ، ئینجا ڕەفتارێك بکات تاکو ببێتە کەسێکی وەك ئەوان، ئەمە لە دەروونناسیدا بە نەخۆشیی دەروونی لەقەڵەم دەدرێت، کە دەبێتە هۆی ڕەفتاری چاولێکەرانەی سلبی و لەڕادەبەدەر.

** لە دەروونناسیدا ئەم شێوازە لاساییکردنەوە بە میکانیزمێکی بەرگریی دەروونی دادەنرێت لەبەرامبەر سەرکوتە دەروونییەکان کە پێی دەگوترێ: (Identification) هاوشێوە و هاوپێکردنی خۆی لەگەڵ ئەو کەسانەی لە ژینیاندا شوێنێکی گرنگیان هەیە؛ وەکو ئەستێرەکانی وەرزشی و ئەکتەرەکانی سینەمایی. ئەگەر ئەم پرۆسەیە درێژخایەن و قووڵ بوو، ئەو کاتە دەبێتە نەخۆشییەکی دەروونی، کە پێی دەگوترێ: نەخۆشیی ناسنامەیی لە کەسایەتی (Personal Identifity). لەو نەخۆشییەدا تاك، جگە لە هاوشێوەکردنی حەز و سەلیقەکانی، وتار و قسە و ڕاوبۆچون و هزری لایەنی نموونەییەکەی لاسایی دەکاتەوە بە شێوەیەك ناسنامەی تایبەتی و سەربەخۆیی کەسایەتییەکەی لە دەست دەدات!

*** سەیری ئەم نووسەرە فێمێنیستە بکەن کە چۆن ڕەخنە لە ئیسلام دەگرێت و پاشان بۆ شایەتیی قسەکانی ئاماژە بە ئایەتێك لە قورئان دەکات کە لە هیچ قورئانێکدا نادۆزینەوە؛ ئایەتێك دەهێنێتەوە وەك بڵێی وەرگێڕانی قسەکانی ئەوە! "ئایین خراپترین گواستنەوەیە لە جیاوازی بایۆلۆژییەکان بۆ دونیایەکی بێ ماف و سەرکوتکەر و لە قاڵبدراوی کۆمەڵایەتی بۆ ژنان، کە کاریگەری و قورسایی گەورەی لەسەر کەلتوور و یاسا و خێزانیش داناوە. ئایین ئەوەندە مێشکی مرۆڤی بچووك کردۆتەوە، کە بڕوای بە وەهم و بۆچوونی ناواقعی بەرامبەر بە ڕەگەزی مێ هەبێت و تا دەگاتە ئەو ڕادەیەی ژنان ناسنامەی خۆیان وون بکەن، ئەفسانەی ئایینی وایکردووە، مرۆڤ لە ئاست ڕاستییەکانی ژیانکردن کوێر و نادیدە بێت، ئایین پێمان دەڵێت جەستەی ژن بەشێکە لە موڵکی پیاو و دەتوانێت وەك کێڵگەکانی ئازادانە بیکێڵێت، هەر وەك لەم ئایەتە هاتووە "نسائکم حرث لکم فاحرثهن کما تشائون". (بڕوانە: فەرمان خەرابەیی (2010)؛ "ڕاستییەکی وونبوو"؛ چاپی یەکەم؛ هەولێر؛ ل 78 - 79). خۆی مەبەستی ئایەتی (نساؤکم حرث لکم فأتوا حرثکم أنى شئتم: واتە ژنانتان کێلگەن و شوێنی چاندنی وەچەن، جا بە هەر شێوەیەك دەتانەوێت تۆو بوەشێننە ناو کێڵگەکەتانەوە)؛ (البقرة: 223). دواتر بە تێروتەسەلی باسی ئەم ئایەتە دەکەین.

بەرژەوەندیی ئامانجیان بێت! (دواتر باس لە هەندێ نموونە دەکەین)، یان هۆکاری ڕووداوێکی دیاریکراو بۆ ڕووداوێکیتر، کە لە ڕووی کات و شوێنەوە جیاوازە، بە چەواشەکاری بۆی دەگەڕێننەوە تەنها بۆ ئەوەی خوێنەر یان بیسەر یان بینەر فریو بدەن!

ڕیفۆرمخوازە بەناوبانگەکانی ئیسلام "شێخ محەممەد عەبدە" و "سەید جەمالەدین ئەفغانی" دەڵێن:

"ڕۆشنبیرانی ئەوروپی بەرامبەر بە ئایینی خۆیان هەقیان بووە کە پشتی تێ بکەن و فڕەی بدەنە ناو گۆشەیەکی کەنیسە و لەوێ بیبەستنەوە، هەروەها ئێمەش بەهۆی پشتتێکردن لە ئایینی خۆمان، شایانی پاشکەوتنین؛ ئەوان ئایینیان پشتگوێ خست، پێشکەوتن و ئێمەش ئایینمان پشتگوێ خست، دوا کەوتین!"[1]

### 1.3.2- ڕوانگەی دەروونی ـ سێکسی:

هەندێکیتریش، ئەوانەی پێشووش، جاربەجار بە شیکردنەوە و ئاراستەیەکی دەروونی و سێکسییەوە دەڕواننە پرسی ژنان و، کێشەکانی ژنان دەبەستنەوە بە نەبوونی ئازادی لە خۆشەویستی و سەربەخۆیی سێکسی و خۆخستنە ژێر ڕکێفی سیستمی نێرسالاریی پیاواندا کە لەو پەیوەندییە سێکسییەدا، تەنها لایەنی براوە، یەکلاکەرەوە، خاوەندار، چێژوەرگری ڕاستەقینە، بکەر و سۆبژێکت پیاوە؛ بۆیە پیاو خۆی بە خاوەنی جەستەی ژن دەزانێ و ژن بە کێڵگەیەك دادەنێ کە جگە لە کێلانی کێڵگەکە بە کەیفی خۆی، وەچە و منداڵی بۆ دەربێنێ و لە کۆتاییشدا ئەو منداڵە بە ناوی ئەو تاپۆ دەکرێت و بە ناوی باوکەوە دەناسرێتەوە! ئەو ڕەوتە زیاتر ڕۆشنبیر و فێمێنیستە چەپ، ڕادیکاڵ، دەروونکۆڵ و ئیگزیستانسیالیستەکان دەگرێتەخۆ، کە زۆربەشیان لە دەرەوەی وڵات لە ڕۆژئاوا ژیاون یان دەژین. زۆربەی ئەوانە هەروەك بینیمان، لە وتار و قسەکانیان بە دژایەتی و لێدانی ئایین دەست پێ دەکەن و، ئینجا بە بانگەشەی ئازادی لە پەیوەندیی خۆشەویستی و لیبراڵییەتی سێکسی کۆتایی پێ دەهێنن، وەك بڵێین ئامانجی هەرە سەرەکییان لەوەدا کورت دەبێتەوە و بە جۆرێك لە جۆران ڕەنگدانەوەی شکستە سۆزییەکان و گرێ دەروونییە ـ سێکسییەکانە. پاڵنەری نارەزایی و گلەیی ئەوان لە ئایین و کولتووری کۆمەڵگای کوردەواری دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بەربەست و چوارچێوانە، کە لەبەردەم ئازادیی ڕەهای سێکسی و

[1] . آل احمد، جلال (2010)؛ "**در خدمت و خیانت روشنفکران**"؛ تهران: انتشارات فردوس؛ چاپ 6؛ ص 62.

خۆشەویستی دانراون؛ گوایە هەر چوارچێوەیەك کە ڕێگری لە پەیوەندیی خۆشەویستی و ئازادیی سێکسی بکات و ببێتە ئاستەنگێك بۆ حەز و ئارەزووەکانیان، بە شتێکی کۆن و بۆگەنی ناو دەبەن. هەر یاسایەکیش دژی ئەم بیرۆکەیە بێت، بە یاسای سەدەی تاریکی و نامرۆیی لەقەڵەم دەدەن و دەڵێن لەگەڵ جاڕنامەی مافی مرۆڤ ناگونجێت! بۆ نموونە: یەکێك لە پێشەنگەکانی ڕەوتی فێمێنیزم لە کوردستان، لەمبارەیەوە وتارێکی تێروتەسەلی بە ناونیشانی "ڕوانینی کێشەئامێزی مرۆڤ بۆ سێکس لە کۆمەڵگە نەریتی و نائازادەکان: کوردستان وەك نموونە" لە گۆڤارێکی تایبەت بە بواری ژنان و ڕۆشنبیری سەر بە "یەکێتیی ئافرەتانی کوردستان"، کە خۆی سەرنووسەریشیەتی، دەنووسێت و بە پێویست دەزانێ کە سێکس وەك هەر غەریزە و ڕەمەکێکی دیکەی مرۆڤ بە ئاسایی سەیر بکرێت. دواتر لە ژێر تیشکی فرۆیدیزمەوە دەروونشیکارییەکی بۆ دەکات، کە بەربەستە ئایینی و کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانی سێکس بە تابۆ، ئینجا لەوێشەوە سەرهەڵدانی کێشە و گرێیە دەروونییەکان دەزانێ. پاشان دەیبەستێتەوە بە کۆدە ئایینییەکان، بەتایبەتی چیرۆکی پەیدابوونی ئادەم و حەوا بە گێڕانەوە (ڕەوایەت)ی تەورات، کە چۆن ژن لە پرۆسەی سێکسدا دەبێتە پاشکۆ و ژێردەستی پیاو و، بەپێچەوانەوەش پیاو دەبێتە داگیرکەر و خاوەن جەستەی ژن و سزاسەپێنەری، ئەگەر ژن لە خواست و ویستەکانی سەرپێچی بکات.[1]

سەیری ئەم وتارانەی خوارەوەش بکەن (هەندێکیان لە قاڵبی چاوپێکەوتندا بووە):

"سەردەمانی پێش ئیسلام و بە ڕێژەیەکی کەمتریش پاش سەپاندنی ئیسلام بەسەر زۆرینەی کورددا و تا ئێستاش دیاردەی هەڵبژاردنی ئارەزوومەندانەی نێر و مێ لە نێو کورددا هەبووە و هەیە و بە ئاساییش سەیر کراوە، ئێزیدییەکان ئەو جۆرە هەڵبژاردنە لە نێوان کچان و کوڕانیانا هەیە، ئەو دووانەی یەکتر هەڵدەبژێرن پێشتر لەگەڵ یەکتر دەڕۆن و پاش ئەنجامدانی کاری سێکسی، ئینجا خێزانی کوڕەکە دەچن بۆ داوای کچەکە... مەلا و پیاوە ئایینییەکانی کوردیش ڕۆڵیان لەم گۆڕانکارییە نێگەتیڤەدا بینی و سەدان هەنگاو ژیانی ئاسایی کوردیان شێواند و ئەو کەشە جوانەی هەڵبژاردنی نێر و مێ بۆ یەکتریان بە بەدڕەوشتی دایە قەڵەم و لەجێیدا کولتووری ناشیرینی فرەژنیی و کڕین و فرۆشتنی ئافرەتان بە ناوی مارەیی و ئەو چەشنە نەریت و شتە بێواتایانەیان هێنایە ناوەوە... لەگەڵ ئەوەشدا ڕێژەی خۆشەویستیی و ئارەزووی یەکترهەڵبژاردن و سێکسی ئازادانەی نێوان ئەو نێر و مێیانەی یەکتریان خۆش دەوێ بەرەو کەمی دەڕوا."[2]

1 . مەهاباد قەرەداغی (2014): "ڕوانینی کێشەئامێزی مرۆڤ بۆ سێکس لە کۆمەڵگە نەریتی و نائازادەکان: کوردستان وەك نموونە"؛ گۆڤاری شیکار؛ ساڵی یەکەم؛ ژمارە 4؛ ل 7-41.

2 . شاناز بەرزنجی؛ هەمان سەرچاوە.

ئەمەش گلەییەکانی بەم شێوەیە دەردەبڕێت:

"من ئاماژە دەکەم بە یەکێك لەو قۆناغانەی کە داگیرکردنی ژنی پیا تێپەڕیوە لەلایەن پیاوەوە، کە بە فەلۆکراتیزم* ناوزەد دەکرێت، (مانای بە سەروەر ڕاگرتنی چووك یان گونی پیاو) ئەم قۆناغە پێش دەستپێکردنی پیاوسالاری بوو، مانای لەو کاتەوە دەستی پێکردووە کە پیاو هەستی کردووە دەوری چییە لە منداڵبووندا، لەو کاتەوە چووکی پیاو دەبێتە تەوەرێکی سەرەکی و سەرجەم مەسەلەکانی دیکەی لە دەوری دەسووڕێنەوە بە بوونی ژنیشەوە، و چووکی پیاویش دەبێتە فاکتەرێکی سەرەکی چەوساندنەوەی ژنان... یان لە ڕووی یاساییەوە هەبوونی فرەژنی، قەدەغەبوونی لەباربردنی منداڵی ناخواستە،** لێدانی ژنان، نشوزکردنیان، ئەمانە هەمووی پاشماوەی قۆناغی فەلۆکراتیزم و بنەڕەتی یاساکانیەتی کە لە کۆمەڵی ئێمەدا ماوەتەوە. ئافرەت بێ پیاو لە کۆمەڵی ئێمەدا بوونی نییە، هەتا بەشداری هەبێ لە پۆستی وەزاری و پەرلەمانتاریدا، چونکە هەموو پێناسەی بوونی ژنان لە کۆمەڵی ئێمەدا لەمەڕ چووك یان گونی پیاوە، یان بڵێم بەو پێیەیە کە چەند لەگەڵ پیاو دەخەوێ، لەمەڕ ئافرەت لە کۆمەڵگای ئێمەدا چوار واژە هەیە سەبارەت بە بوونی ئەویش ئەمانەن: کچ، ژن، قەیرەکچ، بێوەژن. کچ ئەو کەسەیە کە هێشتا لەگەڵ پیاو سێکسی نییە، ژن ئەو کەسەیە کە لە پرۆسەیەکی بەردەوامی سێکسدایە لەگەڵ پیاو، قەیرەکچ ئەو کەسەیە کە تەمەنی چۆتە سەرەوە بەڵام تا ئێستا پیاوی دەست نەکەوتووە لەگەڵی بخەوێ، بێوەژنیش ئەوەیە کە ئیتر پیاوەکەی نەماوە تا لەگەڵی بخەوێ، دەکرێ لێرەدا تۆ بە من بڵێی ئەو ئافرەتە سەربەخۆیانە کێن کە بەشداریان هەیە لە پۆستە ئیداری و

* فالۆکراتیزم (Phallocratism) واتە زەکەریپیاوپەرستی. هەندێ لە فێمێنیستەکان پێیان وایە مێژووی زوڵم و چەوساندنەوەی سێکسی کۆنترە لە چەوساندنەوەی چینایەتی، کە مارکسیزم باسی دەکات. ئەوان ڕیشەی هەموو جیاکارییە مرۆییەکان دەگەڕێننەوە بۆ جیاکاریی ئەندامی سێکسیی پیاو و ژنان.

** ئەی ئەگەر ئەو منداڵەی کە دەیانەوێ لەباری ببەن کچ بێ چی؟ ئایا ئەو منداڵە بەستەزمانە ژنی ئایندە نییە و مافی ژیانی نییە وەك ئەو فێمێنیستە؟ دیارە ئەو فێمێنیستانە کە داکۆکی لە ئازادی و مافی ژنان دەکەن، مەبەستیان لە "ژن" تەنها ئەو ژنانەیە کە تەمەنێکی دیاریکراویان هەیە و دەتوانن سێکس بکەن؛ واتە کچێك کە ئەندامی مێینەی نەگەیشتووەتە ئەو ڕادەیەی کە کەڵکی سێکس بدات، مافی ژیانی نییە و پێویستە بۆ ئاسانکاری لە پرۆسەی سێکسیی ئەو ژنە دووگیانەدا، کۆرپەکەی لەبار ببرێت! ئایا ئەو کچە کۆرپەلەیە کە ئەو فێمێنیستە داوا دەکات لەبار ببرێت، نابێتە ژنی ئایندە؟ لەوانەشە لە ئایندەدا ببێتە فێمێنیستێکی وەك خودی خۆی یان زۆر لەو پێشتریش کە تەنانەت کۆتایی بە سەردەمی پیاوسالاریش بێنێ، بیکاتە ژنسالاری! ئایا پێی خۆشە ئەو بەڵایە (لەناوبردنە) کاتێك خۆی لە سکی دایکی بووە، بەسەری بهاتایە؟ گوایە مافی ژن لای ئەو کەسانە بریتییە لەو ژنەی کە توانایی و هێز و وزەی سێکسیی پێ گەیشتبێ و تا ڕادەیەك گەشە کردبێ کە ئامادە بێ بۆ پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ نێرینە، هەروەها نەگەیشتبێتە تەمەنێك کە چیتر بە کەڵکی سێکس نەیەتەوە! بۆیەش داوا دەکەن کە ژنێك کە لە ڕێگەی سێکسەوە (شەرعی یان ناشەرعی) بە منداڵی ناخواستە سکپڕ دەبێ، منداڵی خۆی تەنانەت ئەگەر کچیش بێ لەناو ببات، تا نەبێتە ڕێگر لە سێکسی دووبارە و چەندبارەی ژنە خاوەن سکەکە! لەلای ئەوان ئەو کچە کورپەلەیە مافی نییە بژێ و بمێنێ؛ چونکە "سێکس"ی نییە کە "ماف"ی هەبێت، بەڵام ئەو ژنە مافی هەیە تەنانەت کچە کۆرپەلەیەش (واتە ژنی ئایندە) لەناو بەرێت؛ چونکە ئەو ژنە هێشتا تەمەنی گونجاوە بۆ سێکسکردن (شەرعی یان ناشەرعی) و ئەگەر پیربوو و بەساڵاچوو، ئەو کات ئەو پیرەژنەش (وەکو ئەو کۆرپەلەیە) مافی نامینێ و دەبێ فڕێ بدرێتە ناو خانەی بەساڵاچووان! کەواتە مافی ژن لای ئەو فێمێنیستانە واتە مافی ئەو ژنانەی کە دەتوانن سێکس بکەن! ئایا ئەوە خۆی لە خۆیدا فالۆکراتیزم نییە؟!

حکومیەکاندا؟ بۆیە سەرئەنجام ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە هەندێ لە ژنان لە پەرلەمانی کوردستان فرەژنی بە سووکایەتیکردن بە خودی ژنان تێناگەن، بەڵکو پاساو بۆ چالاکی گونی پیاوان دێننەوە... کەواتە ئەمڕۆ لە کۆمەڵگەی ئێمەشدا تەوەری بیری ژنانیش لە دەوری بەرزراگرتنی چووکی پیاودا دەسووڕێتەوە دەنا دەرکردنی یاسایەکی لە جۆری فرەژنی لە کۆمەڵگادا لە لایەن هەندێ لە ژنانەوە هێندە پاساوی بۆ نەدەهێنرایەوە تا ڕەوایەتی پێبدەن. گەر ئێمە بزووتنەوەی ڕاستەقینەی فێمێنیزممان هەبووایە، دەبوو بە لۆری لاعابەی ئۆتۆماتیکی سێکسیان* لەبەردەم پەرلەمانی کوردستان هەڵبڕشتایە، چونکە یەکێك لە پاساوەکانی ئەوان بۆ مەسەلەی فرەژنی ئەوەیە کە ژمارەی ژن زیاترە لە پیاو لە کوردستان، گەر پێوانەی ژن بە پێی گونی پیاو بێت ئەوا زۆر لەعابەی سێکسی ئۆتۆماتیکی هەیە کە زۆر لەو پیاوانە باشترن بۆ ژن کە باوەڕیان بە فرەژنی هەیە، ڕەنگە ژن لە ڕێی ئەو لەعابەیەوە باشتر بە پلەی ئۆرگاسم بگات تا ئەو پیاوەی ژن دەکاتە کۆیلەی خۆی و لەشی بەکار دەهێنێ بۆ مەسەلەی سێکس. بۆیە دواجار لە وڵاتێکدا کە ژن خاوەنی لەشی خۆی نەبێ، ئەبێ چۆن ژنی وەزیر و پەرلەمانتارمان هەبێ... دەتوانم بڵێم مەسەلەی سێکس تەوەرێکی گرنگی مرۆڤە، کێشەکە ئەوەیە هەموو مرۆڤەکان خوازیاری مومارەسەی سێکسن، بەڵام کاتێ کە دێتە سەر قسە لەسەرکردنی بە شێوەیەکی کراوە لە کۆمەڵی ئێمەدا ئەوا ڕووبەڕووی بەگژدا چوونەوە دەبیتەوە بە شتێکی تایبەتی دێننە ئاژمار، من خۆم وەك کەسێکی فێمێنیست زۆر باوەڕم بەو وتەیەی ڕادیکاڵ فێمێنیستەکان هەیە کە دەڵێن: "ئەوەی تایبەتییە، سیاسییە" و پێداگرتن لەسەر ئەوەی گەر بمانەوێ کۆمەڵگاکەمان یەکسان بێ دەبێ لە ژووری نووستنەکانەوە دەست بکەینەوە بە دیموکراتیسەکردنی کۆمەڵگا. دەبێ ئێمە بزانین چی لەسەر سیسەمەکانی نووستن ڕوودەدات و کێ بڕیاری ئەوە دەدات لەوێ کە سێکس چۆن بێت و کێش بڕیارەکان بەجێ دێنێ... ئەوەی کە لە کۆمەڵی ئێمەدا هەیە بە ناوی خۆشەویستییەوە ئامانج لێی تەنها سێکسە و ئامانجیش لە سێکس بەرهەمهێنانی منداڵە، بۆیە دواجار ژن لەو پرۆسەیەدا تەنها کێڵگەی تۆوی پیاوە هیچ خواست و ئارەزوویەکی لەبەر چاو ناگیرێ."[1]

ئینجا بەم شێوەیە باس لە شێوازەکانی پەیوەندییە سێکسییەکان دەکات و شێوازی باوی "هاوسەرێتیی" نێوان ژن و پیاوێك، بە دیکتاتۆرییەت دەزانێ:

"دوای ئەوەش مەسەلەی سێکس پەیوەندییەکی مرۆییە و مەرج نییە لە نێوان ژن و پیاوێکدا بێ (*Heterosexualitet*)، ئەمڕۆ پەیوەندییە سێکسییەکانی نێوان ژن و ژن

---

* بریتییە لە ئەندامی نێرینەی لاستیکی لەسەر شێوازی گۆشتی و سروشتی کە لە وڵاتانی ئەوروپا، ئەو شوێنەی کە ئەم فێمێنیستە لێ دەژێ، لە بازاڕەکاندا دەفرۆشرێ و هەندێ جار لە لایەن سێکسۆتراپەکان و پزیشکانی دەروونی ـ سێکسی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ساردیی سێکسی و نەگەیشتن بە حاڵەتی ئۆرگاسم وەکو چارەسەرێکی سێکسی پێشنیاز دەکرێت!

1 . گفتگۆی ئەرسەلان مەحمود لەگەڵ "ڕێکپۆش عەزیز"؛ **"گەر خاوەن بزووتنەوەیەکی ڕاستینەیی فێمێنیزم بووایـن، دەبوو بە لۆری لەعابەی سێکسیان لەبەردەم پەرلەمانی کوردستان هەڵبڕشتایە"**؛ هەمان سەرچاوە.

(*Lesbisk*)، پیاو و پیاو (*Homosexuell*)، هێندەی مەسەلەی هێترۆسێکسوالت گرنگە، و یا ڕەنگە بۆ هەندێ کەس مەسەلەی سێکس تەنها (*Annoni*) لە ڕێی عادەی سریەوە بە ئۆرگاسم بگات، ڕەنگە ئەمە ڕاستییەکی ڕەهای کۆمەڵگەی ئێمە بێ کە مەسەلەی سێکس تەنها بە ژنێك و پیاوێکەوە دەبەستێ کە ئەمە هێترۆنۆرماتی (*Heteronorm*) پێدەڵێن مانای هەموو مرۆڤەکانی کۆمەڵگە بە زۆر و ئیجباری پەیوەندییە سێکسییەکانیان دەبێ لە نێوان ژن و پیاوێکدا بێت کە لە ڕاستیدا ئەمە ڕوانگەیەکی دیکتاتۆرییانەیە لە مەسەلەی سێکسدا... بەڵام بۆ ئێمەی کورد زۆر زەحمەتە بزانین چی لەو دیوی دەرگای ژووری نووستنەکانەوە ڕوودەدات لەبەر ئەوە ژن و پیاو بە ئاشکرا ناتوانن باس لە گرفتە سێکسییەکانیان بکەن بە شێوەیەکی کراوە لە کۆمەڵدا... ژن بە پێی نۆرمەی کۆمەڵگە خۆی لەو پرۆسەیە دەدزێتەوە یان ژن خوازیاری سێکس نییە لە کاتێکا ژنی ئەوروپی گەر بە پلەی ئۆرگاسم نەگات لەگەڵ هاوسەر یان هاوڕێکەی، جگە لەوەی کە ڕاوێژ بە پسپۆڕانی سێکس و دکتۆرەکان دەکات بە دەیان لەعابەی سێکسیش تاقی دەکەنەوە بۆ ڕاهێنانی لەشی خۆی بۆ گەیشتن بە پلەی ئۆرگاسم... کردنی عادەی سری بۆ ژنان زۆر باشە، چونکە لایەنی سێکسییان بەهێز دەکات، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەمە بە شتێکی خراپ و گوناح لە کۆمەڵی ئێمەدا لێکدەدرێتەوە... من لەویادا ئاماژەیەك بەو تیۆرییەی کە ڕۆژئاواییەکان هەیانە سەبارەت بە پیاوی لای ئێمە کە هەمیشە پیاوی ڕۆژئاوا خۆی بە بنەمای هەموو پەیوەندییە مرۆیی و ئاوەزییەکانی دادەنێ و پیاوانی ڕۆژهەڵاتیش باگراوەند و نائاوەزی دێننە ئاژمار... پیاوی ئەوروپی خۆی بە بوونەوەرێکی کۆنترۆڵبار دەزانێ، بەڵام پیاوی لای ئێمە بە بوونەوەرێکی بێکۆنترۆڵی ئاژەڵئاسای غەریزی، و لەویادا من پرسیارم ئەوەیە کە ئایا فرەژنی یەکێك نییە لەو بەڵگانە بۆ پیاوی ڕۆژئاوایی کە پیاوی ئێمە تا کانارەکانی پلەی ئاژەڵیی و غەریزەی ببا؟ بێگۆمان با، چونکە مەسەلەی فرەژنی ناچێتە خانەی پەیوەندییە مرۆییە یەکسانەکان، بەڵکو ژیانێکی بەربەری غابەیە، کۆیلەدارییە..."[1]

ئامارەکانی بەشی دووەمی ئەم کتێبەمان بەو فێمێنیستە دەڵێ کە ئایا پیاوانی ئێمە بێکۆنترۆڵ و ئاژەڵی و غەریزین و هیچ خۆیان پێ ناگیرێ، یان پیاوانی ڕۆژئاوایی؟ ئایا فرەژنی بە فۆرمی ئیسلامییەوە ژیانێکی غابەیی و کۆیلەدارییە، یان ئەو فرەژنییە کە لە فۆرمی ڕۆژئاواییدا باوە و پراکتیزە دەکرێت؟

ئەم فێمێنیستەش کەمێك نەرمتر و هێورتر، بە پێشکەشکردنی ڕێگەچارەش دەڵێ:

"جێگای داخە، لەبەر نەزانی و دواکەوتوویی، هەروەها لەبەر سەرداریەتیی مزگەوت و گرنگیدانی سەرەکیی دەسەڵاتی سیاسی و ڕۆشنبیریش تەنها بە سیاسەتەوە (سیاسەت لە ئاستێکی لۆکالی و حیزبیدا)، پەروەردە و هۆشیاری سێکسی لە کۆمەڵگەی ئێمە نەك هەر

1 . سەرچاوەی پێشوو.

گرنگی پێنەدراوە، بەڵکو بە واتایەکی جیا و وەکو "ناحەز" و "عەیبە" لێکدراوەتەوە. لە ئەنجامدا چەشنی وشەی "سێکس" وەکو تابو مامەڵەی لەگەڵ کراوە و لە ژیانی سیاسی و گشتی و ئاشکرای خەڵك وەدەرنراوە. ئەمە لە کاتێکدا، سێکس ئەمڕۆ لە کوردستان ئامادەییەکی زۆری لە شوێنە گشتییەکاندا هەیە؛ لە دانیشتن و نوکتە و باسەکانی سەرمێز، سێکس بابەتی سەرەکیی قسە و باسەکانە. ئەم ئامادەییە، لە یەك کاتدا گوزارەیە لە هێزی سەرکوتکردن و چەپاندن و نەبوونی ئازادی و ڕاددەی کۆنترۆڵی گروپ بەسەر تاکدا، لە هەمان کاتیشدا تینوویەتی و پەرۆشی و هەوڵی خەڵکە بۆ شکاندنی تابو و حەرامەکان. بەڵام ئەم پەرۆشی و هەوڵانە بە هاندەر و پاڵپشتی عەقڵی ئاراستە ناکرێن و ستراتیژیەتێکی دیاریکراویان نییە... بۆ سێکس و نەبوونی پەروەردە و هۆشیاری سێکسی هاوتا لەگەڵ هێزی چەپاندن و کۆنترۆڵی گروپە کۆنەخواز و سەرکوتکەرەکان، هاندەرن بۆ ڕوودانی کردەوەی نامرۆڤانەی وەکو دەستدرێژیی باوکان بۆ سەر کچەکانیان، منداڵبازی، سێکسکردن لەگەڵ ئاژەڵ، هتد... لە نەبوونی هۆشیاری و پەروەردەی سێکسیدا، هەروەها بەهۆی ڕاددەی چەپاندن و سەرکوتکردن و نەبوونی ئاووهەوایەکی ئازاد بۆ دەربڕینی حەز و ئارەزووەکان، یەکێ لەو ئامرازانەی کە بوّتە ڕێنیشاندەر و چەشنی ڕێنومایی سێکسی لە کوردستان بەکاردەهێنرێت، فیلمی ڕووتە (فیلمی پۆرنۆ)... هەندێ کەس ئەو بارودۆخەی کوردستان بە "ئازادی" و "کرانەوە" دەزانن و مەلاکانیش وەکو "بەرەڵلایی و بەدڕەوشتی" ناوی دەبەن... کاتێ لە ڕۆژئاوا لە دوای شەڕی جیهانی دووەم خەڵك بۆ ڕزگاربوون لە وێرانییەکانی جەنگ و سەرکوتکاری دەسەڵاتی ئایینی و سیاسی لە ساڵانی شەستەکان شۆڕشی کولتووریان هەڵگیرساند، ئەوە بە خەبات و ئیرادە و هۆشیارییەوە جۆرێك لە ئازادیی سێکسیان بەرقەرار کرد. دواتر دەسەڵاتی سیاسی لە جیاتی بەرەو ڕووبوونەوە و لێدانی ئەو ئازادییە، پرۆگرامی پەروەردە و هۆشیارکردنەوەی سێکسی داڕشت بۆ بەرچاوڕوونی خەڵك و پاراستنیان لە نەخۆشی و توندوتیژی. ئەمڕۆ ئەم پرۆگرامانە بەشێکن لە سیستمی پەروەردەی وڵاتانی ڕۆژئاوا. لە کوردستانیش پێویستە ئەم مەسەلەیە چیتر چاوپۆشی لێنەکرێت و وەکو ئەولەویەت بهێنرێتە پێشەوە و ستراتیژیەتی ئاراستەکردن و پلانی کاری بۆ دابڕێژرێت. لەم بارودۆخەی کوردستاندا کە ڕەگی لە ناو شاراوەیی و نهێنیدا داکوتاوە، درۆ و خیانەت و توندوتیژی و ترس و تۆقان و ئینکاریکردنی خاسیەتی زاڵی پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکانن، نێوان ژن و پیاو و کچ و کوڕانن. ئەوەی کە جێگەی سەرنجە، ئەو پەیوەندیانە زۆر کەم لە چوارچێوەی خۆشەویستیدا ئەنجام دەدرێن کە خەڵك لە کوردستان بە قەد ئازادی پێویستی پێی هەیە. جگە لە کچ و کوڕە عاشق و نامورادەکان، ئەو ژن و پیاوانەی ئەمڕۆ لە کوردستان بەم شێوازە دەژین، بەهۆی کۆمەڵێك هۆکاری مێژوویی و کولتوری، تینوو و ماندوو و پەرێشان و وێرانن... لەمەش ترسناکتر ئەوەیە کە لەبەر ئەوەی عەقڵییەتی گشتی گەشەی نەکردووە، ئەوە ژنەکان بەرەوڕووی توندوتیژی عاتیفی و سایکۆلۆژی و فیزیکی دەبنەوە. کاتێ کار دەگاتە ئاستی سکپڕی و نەمانی پەردەی کچێنی، لەبەر نائومێدی و پەرۆشی و ترس و تۆقان لە ئابرووچوون،

کچەکانمان هانا بۆ خۆسووتان و خۆکوشتن دەبەن. یا ریسوا دەکرێن و بە دەستی خێزان و کۆمەڵگە (دەستی برا و باوك و ئامۆزا و مێرد و عەشیرەت، هتد) دەکوژرێن. خۆ ئەوانەی کە کەمێك هۆشیارییان هەیە و دەیانەوێ کۆرپەلەکە لەباربەرن یان پەردەی کچێنی (ئەو درۆیە گەورەیەی کە شەرەفی پیاوانی کۆمەڵگە دواکەوتووەکانە و هەزاران هەزار ژنی لە پێناو کوژراوە) دروست بکەنەوە، ئەوە خۆیان دەخەنە بەردەستی کەسانی نەشارەزا و لە ژووری تاریك و نهێنی بە بێبوونی ئامرازە سەرەکییەکانی نەشتەرگەری ژیانی خۆیان دەخەنە مەترسییەوە... لە بارودۆخێکی ئاوادا و کاتێ کۆمەڵگە بە هێزی غەریزە ڕەفتار دەکات و دەسەڵاتی سیاسیش ستراتیژییەت و پرۆگرامی پێویست و گونجاوی نییە بۆ ئاراستەکردن و چاککردنی ئەو بارودۆخە، ئەوە مزگەوت دەبێتە هێزی زاڵ و ڕابەری کۆمەڵگە. مزگەوتیش لە ڕێگای سەرکوتکردن و ریسواکردنی ئازادی بە ناوی بەڕەڵڵایی و بەدڕەفتاری و بەدڕەوشتییەوە خەڵك چەواشە دەکات و کۆمەڵ بەرەو دواکەوتوویی و نابەخشندەیی و توندڕەوی ڕادەکات. هەستکردن بە گوناهیش کە مەلاکان لە ڕێگای گوتارە نەشاز و پڕ لە نەزانییەکانیان برەوی پێدەدەن، کچ و کوڕێکی زۆر بەرەو نەخۆشیی دەروونی وەکو خۆخواردنەوە و خەمۆکی تا ئاستی خۆکوشتن دەبات. پێویستە چی بکرێت؟... ئەرکی دەسەڵاتی سیاسییە. ئەرکی جێبەجێکردنی پرۆگرامەکەش دەکەوێتە ئەستۆی... ڕێکخراوە مەدەنییە ناوخۆ و نێودەوڵەتییەکان و میدیای بیستراو و بینراو و نووسراو. ئەمڕۆ لە کوردستاندا لەسەر ئاستی دەسەڵاتی سیاسی و کۆمەڵگەی بەناو مەدەنیش، هەموو توانایەك خراوەتە گەڕ بۆ خۆسەپاندن و خۆدەوڵەمەندکردن و بەرەوڕووبوونەوە و لێدان و سەرکۆنەکردنی یەکتری، بەڵام لە هیچ لایەکەوە هەوڵی جدی نەدراوە بۆ ئاراستەکردنی پەروەردەیەکی سێکسی دروست و زانستی، بۆ ڕزگارکردنی کۆمەڵگە لەو عەقڵییەتە دواکەوتوو و چەوسێنەرەوەی کە مرۆڤەکان بەرەو نەخۆشی و ڕووخان و مەترسی کوشندە دەبات. تاکە هێزێك کە تا ئێستا ئەم مەسەلەیەی ئاراستەکردبێ هێزە ئیسلامییەکانن، بەڵام دیارە ئەو هێزە ئیسلامییانە مەسەلەکە لە بەرژەوەندیی ئایدیۆلۆژیای ترسناکی خۆیان بەکاردەهێنن و هەفتانە لە ژێر ناوی بەرەنگاربوونەوەی "بەڕەڵڵایی و بەدڕەوشتی" لە مینبەری مزگەوتەکانەوە هێرش دەکەنە سەر ژن و ئازادی و مافی مرۆڤ. ئەگەر دەسەڵاتی سیاسی بە بێمساوەمەکردن ئەولەویەت نەداتە ئەو مەسەلانە و کۆمەڵگەی مەدەنیش شێلگیرانە هاوکاری نەکات، ئەوە گرفتەکان تەشەنە دەکەن تا ئاستێك کە ڕێگەگرتن و بەرەنگاربوونەوەیان لە داهاتوو زۆر سەخت دەبێت. وزەی مرۆیی لە وزەی نەوت و گاز گرنگترە بۆ نەتەوە و سەروەریی وڵات، بۆیە پێویستە بە هەمان ئاستی باڵا گرنگی پێبدرێ."[1]

1 . د. نەزەند بەگیخانی (2010/5/23)؛ **"ئاراستەیەك بۆ وزەی سێکسی لە کوردستان"**؛ ڕۆژنامەی هاووڵاتی؛ ژمارە 630؛ ل7؛ وەرگیراوە لە ماڵپەڕی کچی قەندیل تایبەت بە مافی مرۆڤ و پرسی ژن:

http://kchiqendil.wordpress.com/page/4

پرسیار: سەرەڕای ئەم ئازادییە ڕەهایە و لیبراڵییەتە سێکسییە لە ڕۆژئاوا و هەبوونی شوێنی تایبەت و یاسایی بۆ تێرکردنی سێکس ـ کە گوایە ئەم فێمێنیستە لە نەبوونی ئەم شوێنانە لە کوردستان بەگلەییە ـ ئەی ئەوەندە دەستدرێژیی سێکسی سەر ژنان، کچان، منداڵان و ئاژەڵان لەوێ لەبەرچییە؟ لە بەشی دووەمدا ئامارە سەرسوڕهێنەرەکانی دەستدرێژیی باوکان و خزم و کەسوکاری پلە یەك لەسەر کچان و ژنان دەخرێنە ڕوو، کە پێویستە ئەم فێمێنیستانە ڕێگەچارەیەك بۆ ئەوان بدۆزنەوە؛ بەتایبەتی ئەوانەی وەك ئەوەی پێشوو، کە لە دەرەوە دەژین و لە نزیکەوە شایەتی ئەو واقیع و بارودۆخەن!

هەروەها سەرەڕای ئەم هەموو ئەزموون و پرۆگرامانە لە ڕۆژئاوا، ئەی بۆچی ئەو هەموو خەڵکە تووشی ئایدز دەبن؟ ئامارەکانی بەشی دووەم لەبارەی نەخۆشیی ئایدز، ئەو ژنانەی کە لە ڕۆژئاوا لە ئەنجامی پرۆسەی سێکسی تووشی بوونە، نیشانەی ئەوەیە کە وزەی سێکس هەروەك خودی ئەو فێمێنیستەش دان پێدا دەنێت، لە وزەی ئەتۆم مەترسیدارترە و ئەگەر نەخرێتە سەر ڕەوگەیەکی ڕاست و دروست، کۆمەڵگا تێك دەدات. ئەم فێمێنیستە لەبەر ترسی بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشییە ترسناکە لە کوردستان، ئەو وتارەی نووسیوە و بە زەنگێکی مەترسیداری بۆ کۆمەڵگاکەمان دەزانێ.[1]

سەیری ئەم فێمێنیستەش بکەن کە بە چ دەربڕینێکی تەشەراوی و شاعیرانە، دژایەتیی خۆی بەرامبەر بە یاسای فرەژنی لە کوردستان دەخاتە ڕوو:

"هاوسەرە خۆشەویستەکەم، ئەی جوانترین پیاوی جیهان، من زۆر حەز ئەکەم پیاوت بەسەر بێنم... ئەگەر ڕاستیت ئەوێت خۆشم نازانم هۆکاری چییە! ڕەنگە هۆکارەکەی ئەوە بێت من لە لایەنی سێکسی لە تۆ تێر بووم و حەزم لە ڕابواردنە لەگەڵ پیاوانیتر، من ناتوانم خیانەتت لێبکەم، ناچارم ئەم ڕێگایە ئەگرمە بەر، لەبری خیانەت ئەچم سێ مێردیتر ئەکەم. یا ڕەنگە هۆکاری ئەوە بێت من ئەتوانم تۆ تەڵاق بدەم، بەهۆی ئەو مارەییە زۆرەی کە بۆ تۆم داناوە! ببورە خۆشم نازانم هۆکاری چییە کە ئەم بڕیارەم داوە، بەڵام ئەوە دەزانم کە زۆر حەز دەکەم چوار مێردم هەبێت و بە ئارەزووی خۆم هەر شەوەی لای یەکێکیان بخەوم؟"[2]

(دواتر بە تێروتەسەلی وتارەکانیان لەسەر فرەژنی شی دەکەینەوە).

1. سەرچاوەی پێشوو.
2. شنۆ محەممەد (2012/11/12): "ئەمەوێ پیاو بەسەر پیاوەکەم بێنم، حەز ئەکەم چوار مێردم هەبێت"؛ لە ماڵپەڕی: http://xwdakan.com/xwdakan/index.php/sm/3169-0.html

### 1.3.3- ڕوانگەی فەرهەنگی ـ کۆمەڵایەتی:

هەندێکیتر لەو ڕۆشنبیرانە، دوور لە هەر بیانوو و پاڵنەرێکی سیاسی، گرنگییان داوەتە کێشەناسیی ژنان لە ڕەهەندە جیاجیاکانی کۆمەڵایەتی، خێزانی، ئابووری، پەروەردەیی و فەرهەنگی و، مەبەستی ڕاستەقینەیان چارەسەرکردن و پێشکەشکردنی دەرمانە؛ وەکو چاکسازیی یاساکان، گۆڕانی کولتووری و فەرهەنگی و دروستکردنی هۆشیاریی ڕۆشنبیری، گۆڕان لە بونیادی ئیداری و دروستکردنی هەماهەنگی لە نێوان ئاراستەی نەریتگەرایی و مودێرنیتەدا. ئەو ڕەوتە لە نێو فێمێنیستانی لیبراڵ و ئیمانداریشدا دەبینین. سەیری ئەو وتارانەی خوارەوە بکەن:

"بەسە و ئێستا کاتی ئەوەیە زۆر شێلگیرانە کار بکەین بۆ گۆڕینی ئەم بارودۆخە و... گۆڕینی ئەم واقیعە... بۆیە بە ڕای من دەبێت دابینکردنی خۆشگوزەرانی و ئاسایشی نێو خێزان ئامانجی سەرەکی سیاسەتی حکومەتی هەرێمی کوردستان بێت... ئەوەی کە لەم سەردەمەدا زۆر پێویستە هەماهەنگی و کاری هەمەلایەنە و سەکۆی هاوبەشە لە نێوان هەموو گروپ و توێژەکانی کۆمەڵگە بە ڕێکخراوە مەدەنییەکان و ڕێکخراوەکانی ژنان و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و دەزگا حکومییەکانەوە... لە بەر ئەوەیە کە دەڵێم دەبێ میزاج و بیروباوەڕی شەخسی لە "بواری تایبەت" و "بواری گشتی" کار لەیەکتر جیابکرێتەوە... بەپێی لێکۆڵینەوەی مەیدانیی من، بۆم دەرکەوتووە کە دوای هەندێ دەستکاری لە چەند بڕگەیەکی یاسایدا بە تایبەتی لەمەڕ (غسل العار)، هەر لە سەردەمی دوو ئیدارەیی و تا دوایی گەورەترین پرۆتێست لە دژی ئەو گۆڕانکارییانەی کە کرا، لە نێو توێژی دادوەران بوو، دوای ئەوان توێژی مامۆستایانی ئاینی بوو. ئێستاش هەر ئەم دوو توێژە ناکۆکن لەسەر ئەم یاسایە نوێیە (یاسای جێندەر). یەکێکیان دەڵێ کەموکوڕی تێدایە و ئەویتر دەڵێت شیرازەی خێزان و کۆمەڵگەی کوردی تێکدەدات، هەر یەکە بە بیانوویەکەوە بێبایەخی دەکات. دیارە حکومەتیش وەکو پێویست زەمینەسازی نەکردووە و سیستمێکی جێبەجێکردنی نەخستۆتە سەرپێ... یاسا زۆر جار لاستیکییە و دەتوانی لێکدانەوەی جیاجیای بۆ بکەی... بەڵام بەشێکی دادوەران لە وڵاتەکەی ئێمە ئەو قەناعەت و هۆشیارییەیان نییە، بە ئەقڵییەتێکی نەریتخواز کار دەکەن. یاسای بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی خێزانی، دەبوایە دەمێك بوو بخرابایە بواری جێبەجێکردنەوە... بۆ نموونە یاسای توندوتیژی خێزانی هەمەلایەنە و کۆمەڵێك وەزارەت دەگرێتەوە، دەبێ ئەم سیستمە بە هاوکاری ئەو وەزارەتانە دابڕێژرێت و ئاراستە بکرێت و کاری پێ بکرێت. ئەمە زۆر گرنگە، ئینجا پەرلەمان چاودێر بێت بەسەریەوە، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و ڕاگەیاندنیش چاودێرێکی دیکە بن... بە ڕای من کە باسی ئاین دەکەی، پێویستە جیاوازی بکرێت لە نێوان ئاین وەك بیروباوەڕی تاك و ڕێکخەری پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودا و جێبەجێکردنی ئەرکەکانی خواوەند لەسەر مرۆڤ کە من زۆر ڕێزم بۆی هەیە و شایانی لێدەنێم، لەگەڵ ئیسلامێکی سیاسیی توندڕەو کە ئاین لە جوانی و پیرۆزیەکانی بەتاڵ

دەکاتەوە و حیزبی سیاسیی توندڕەو برەوی پێدەدەن. ئەمانە دوو شتی زۆر جیاوازن... بە ڕای من توێژە ئاینیەکان دەتوانن ڕۆڵ ببینن، ئێمە پێویستمان بە هاوکاری هەموو چین و توێژەکانی ناو کۆمەڵگا هەیە، بە زانایانی ئاینیشەوە.. ڕاگەیاندن ڕۆڵی زۆر زۆر کاریگەری دەبێت. ئەمڕۆ گەر ڕاگەیاندن ستراتیژیەتێکی جێندەری هەبێت، بە پێوەری ئێتیکی (ئەخلاقی) نێونەتەوەیی کار بکات، دەتوانێت کاریگەرییەکانی زۆر پۆزەتیڤ لەسەر کۆمەڵگا دابنێت، بەڵام بەهەر هەموو کەناڵە حیزبی و سەربەخۆ و ئەهلی و حکومی و ناحکومیەکانەوە هیچ ستراتیژیەتێکی جێندەرییان نییە."[1]

یەکێکی دیکە دەڵێ:

"... ئێستا کوردستانی باشوور ئازادە و ئابوورییەکی باش و گونجاوی هەیە، بە بەراورد لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست؛ سیستمی دیموکراسی و ئازادییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان سەری لە کەشکەشانی فەلەکە، کۆمەڵە و ڕێکخراوی جۆراوجۆر زۆرن، میدیا و دەزگای ڕاگەیاندن بە لێشاوە، پارێزەرانی مافەکانی ژن و منداڵ و گەنجان و بێسەرپەرشتان هەر لە ژمار نایەن، لیژنە و کۆبوونەوە و لێدوانەکان ڕۆژانە چەندبارە دەکرێنەوە و... لە کاناڵەکانی تیڤی و رادیۆ و رۆژنامە و گۆڤار و سایتەکاندا بڵاودەکرێنەوە، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو ڕێکخراو و لیژنە و مێدیا و پارێزەرانەی مافی ژنان و ... کەچی هێشتاش ژنان هەر دەکوژرێن، دەسووتێنرێن و بێسەروشوێن دەکرێن، یان ئەگەر هەر نەبێت وایان لێدەکەن ژنان بۆ خۆیان دەست ببەن بۆ کردەوەی خۆکوژی بە ڕێگای جیاواز، ئەوە هەر لە کوردستانی ئازاد دا، جا چی بکات بە پارچەکانی دیکەی کوردستان کە لە بارودۆخێکی زۆر خراپتردان... بۆیە ژنان بەبێ بیرکردنەوە لەوەی چیبکەن و کام ڕێگا هەڵبژێرن و لە کام لاوە بتوانن بیر و هزر و ئەندێشە و کەسایەتی پیاو بگۆڕن، ڕاست ئەو کارە دەکەن کە نابێت بیکەن! خۆخنکاندن و سووتاندن و خۆکوشتن بە گوللە و ... کە ئەمە نە کاردەکاتە سەر ئەقڵییەتی پیاوی کورد و نە ڕێگای گەیشتن بە یەکسانی نێوان ژن و پیاویش کورتتر دەکاتەوە... پیاوێك کە لە سەرەتای ژیانییەوە وا پەروەردە کرابێت کە ژن، ژنی ماڵە و... کوڕێك کە وا بارهێنرابێت کە خوشکەکەی دەبێ لە ژێر ئەمر و فەرمانی ئەودا بێت، ... ئیدی چۆن باوەڕ دەکرێ لە ماوەی چەند هەفتە و مانگ و ساڵدا بێتە پیاوێك کە بە کچەکەی بڵێت: فەرموو تو مرۆڤێکی ئازاد و سەربەخۆی و وەك چۆن تۆ مافی ئەوەت نییە سنوور بۆ من دەستنیشان بکەی، هەر بەو جۆرەش من ڕێگا بە تۆ دەدەم سنووری ژیان و گوزەرانی خۆت دیاری بکەی!... ئەگەر ژنی کورد پێیان وابێت بە شەو و ڕۆژێك دەتوانن ئەقڵییەت و کەسایەتی پیاوی کورد ڕاست وەك کەسایەتی و ئەقڵییەتی پیاوانی ئەورووپا بگۆڕن، ئەوە زۆر بە هەڵەدا چوونە و هەرگیز گۆڕانکارییەکی وا

1 . چاوپێکەوتنی گۆڤاری سیڤیل لەگەڵ د. نەزەند بەگیخانی (2012)؛ **"ئیرادەی سیاسی لە سەرۆکی حکومەت دەبینم بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتی نوێ"**؛ لە ماڵپەڕی سیڤیل: http://civilnews.org ـ هەورەها ماڵپەڕی ڕێکخراوی ڕاگەیاندن و ڕووناکبیریی ژنان: http://www.rewankurd.net

بەلەز نابینین و ئەوە تەنها خەیاڵە و بەس! ... ژنانی ئوروپا ئەوەندە بە ئاسایی ئەو ئازادی و یەکسانییەیان دەست نەکەوتووە... هەتا ژنانی کوردیش وا بە ئاسانی بتوانن ئەو کارە بکەن و کۆمەڵگایەکی پیاوسالاری بگۆڕن بە کۆمەڵگای یەکسان و مرۆڤ سالار... هەر بۆیە باشترین ڕێگاچارە بۆ گەیشتن بە مرۆڤ سالاری لە کۆمەڵگای کوردەواریدا، ئەوەیە کە ژنان وێڕای کار و خەبات لە نێو کۆمەڵگا و وشیارکردنەوەی ژنان و ئارامکردنەوەی پیاوان لەو دژایەتیکردن و بەرهەڵستکاریەی کە لەسەری بەردەوامن، دەبێ زۆر لە سەرخۆ و بە ئارامی دەست بدەنە دەستی یەکتر و لە هەمان کاتیشدا یارمەتی وەرگرتن لەو یاسا و ڕێسایانەی کە بە قازانجی ژن پەسەند کراون، ژنان دەبێ بەر لە هەموو شتێك کاربکەن بۆ چەسپاندنی یاساکان و پاشانیش کاراکردنی ئەو یاسایانە... کە لە بەرژەوەندی ژنان دەرچوونە و کاریان پێناکرێت؛ ئەوە لە لایەنی یاساییەوە، بەڵام لەمەڕ گۆڕینی کەسایەتی و ئەقڵییەتی پیاوی کوردەوە، ژنان دەبێ لە ماڵی خۆیان دەست پێبکەن و کاربکەن بۆ گۆڕینی کەسایەتی و بیر و هزری پیاوی کورد... ئاسانترین ڕێگا بۆ بە یەکسانکردنی کۆمەڵگای پیاوسالاری و دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی یەکسان و مرۆڤ سالار ئەوەیە کە، ژنان وەك مامۆستای پەروەردە لە ماڵەکانیانەوە دەست پێبکەن... هەروەها ژنان لە دایەنگە و قوتابخانە و تەنانەت زانکۆ و دامودەزگا دەوڵەتییەکانیشدا دەبێ بە ئەرکی سەرشانیان هەستن... گومان لەوە دانیە کە کچ و کچەزاکانیان بە ئارامی و لە دونیایەکی یەکسان و دوور لە توندوتیژیدا ژیان بە سەر دەبەن! هەروەك ئەوەی لە ئەوروپاش ... دەبینین کە کچ و نەوەکانیان بە ئازادی و یەکسانی ژیان دەگوزەرێنن..."[1]

وەڵامەکان و تێبینییەکانمان دواتر بە شێوەیەکی ڕێکخراو دەخەینە ڕوو.

1 . قادر خەندەڕەش (2013)؛ "باشترین ڕێگاچارە بۆ گەیشتن بە مرۆڤسالاری چییە؟"؛ لە ماڵپەڕی:
http://www.heloykurdistan.com/ku

## 2- ئازادی چییە؟.. قەفەسەکان چین؟

لەم تەوەرەشدا باسی چەمکی "ئازادی" دەکەین و لە چەندین ڕووەوە لێی دەکۆڵینەوە؛ چونکە چەمکی ئازادی یەکێکە لە چەمکە لاستیکییەکان کە هەر یەك لە ڕوانگەی خۆیەوە ڕایدەکێشێ و بە ویست و پێوەری خۆی پێناسەی دەکات، کە بەپێی ویست و پێوەری کەسێکی دیکە لەوانەیە هەمان ئازادی بە کۆت و قەفەس دابنرێت؛ بۆیە بە پێویست دەزانین مەبەستی خۆمان لە چەمکی "ئازادی" لەو کتێبەدا ڕوون بکەینەوە؛ چونکە بەبێ دیارکردنی ئەم چەمکە مەبەست لە ئازادیی ژنیش ئاسان نابێت بۆ شیکردنەوە و تێگەیشتن. ئینجا لە بەشی دووەمی ئەم تەوەرەدا هەوڵ دەدەین لەسەر چەمکە دژەکەی واتە "قەفەس" و کۆت و بەندەکانیش بدوێین.

### 2.1- ئازادی چییە؟.. ئازادی چی نییە؟

#### 2.1.1- چەمکی ئازادی لە فەرهەنگەکاندا:

ئازادی لە زمانی <u>عەرەبیدا</u> بە وشەی (الحرية) هاتووە. لە دائرة المعارفی "پتروس بوستانی" بەم شێوەیە هاتووە: "ئازاد واتە کەسێك کە عەبد و کۆیلە نییە، ئازادییش بە حاڵەتێك دەگوترێت کە تاك ئازادە و بە پێچەوانەی کۆیلایەتی و بەندایەتییە".[1]

ئازادی لە زمانی <u>فارسیدا</u> بە هەمان "آزادی" هاتووە. لە فەرهەنگی "دهخدا"دا بەم شێوەیە لێك دراوەتەوە: "ئازادی پێچەوانەی بەندایەی، کۆیلایەتی، دیلی و یەخسیری، زۆرداری و ناچارییە و هەبوونی دەسەڵات و توانستی کردنی کارێك یان وازهێنان لێی، هەروەها توانایی و مافی هەڵبژاردنە".[2]

لە زمانی <u>ئینگلیزیشدا</u> بە هەر دوو وشەی "Liberty" و "Freedom"[*] هاتووە. لە فەرهەنگی "ئۆکسفۆرد"دا بەم شێوەیە پێناسە کراوە: "بریتییە لە دۆخێکی سەربەستانە لە ناو کۆمەڵگادا، دوور لە هەر

---

1 . البستاني، بطرس (1980)؛ "**دائرة المعارف**"؛ بيروت: دارالمعرفه؛ ج3؛ ص7.

2 . دهخدا، علی اکبر (1995)؛ "**لغت نامه دهخدا**"؛ دانشگاه تهران، دانشکده ادبیات؛ ج1.

* چەمکی "Freedom" زیاتر لە تێکستە سیاسی و یاساییەکاندا بەکار دێت.

سنووردارێتی لە لایەن هێز یان دەسەڵاتێکەوە بەرامبەر بە ڕەفتاری تاك یان دیدگایەکی سیاسی و چۆنیەتی ژیان؛ پێچەوانەی زیندانیکردن و کۆیلەبوونە؛ سەربەخۆیی تاك لە کۆنترۆڵکردنی ژیان و چارەنووسی خۆی؛ مافی هەڵبژاردن، مافی ئەنجامدانی کار و چالاکی، مافی قسە و دەربڕین بەبێ هیچ بەربەستێك".[1]

لە زمانی کوردیشدا بە مانای "ئازادبوون، سەربەستی، ڕەهایی، ڕزگاری، سەربەخۆبوون، دژی بەندەیی"[2] هاتووە؛ واتە: "بارودۆخ یان چۆنیەتیی ئازادبوون، نەبوونی ئاتاجی و ناچاری و بەرگری لە کار یان هەڵبژاردندا، ڕزگاری لە کۆیلایەتی و بەندبوون یان لە ژێر فەرمانی کەسێکدا، ڕزگاری لە بارودۆخێکی ناخۆش و نالەبار، هەروەها هەبوونی ماف یان ڕێی کارکردن بە پێی ویستی خۆی".[3]

### 2.1.2- چەمکی ئازادی لە فەلسەفەدا:

ئازادی لە مانا فەلسەفییەکەیدا بە تایبەتمەندی و توانستێك دەگوترێت لە ناخی مرۆڤدا، کە لە بوونەوەرەکانی دیکەی جیهان جیای دەکاتەوە، ئەویش بریتییە لە: ئیختیار و هێزی هەڵبژاردن و ویست و خواستێك کە وشیارانە و ئاگایانە دەکرێت.

هاوواتای "ئازادی" لەم ڕووەوە لە زمانی عەرەبیدا بە چەمکی "إختیار: هەڵبژاردن" هاتووە؛ نەك "الحریة". ئازادی بە مانای هێزی ئیرادە و هەڵبژاردن، چەمکێکی میتافیزیکییە، کە پەیوەندیی بە لایەنی بوونناسی و مەعریفەی فەلسەفییەوە هەیە. ئازادی لە ڕووی بوونناسییەوە کاریگەرییەکی گرنگی هەیە لەسەر بابەتی ئەرك و واجبی مرۆڤی ئیماندار و سزا و پاداشت لە دواڕۆژدا کە فەیلەسووف و بیرمەندە موسڵمانەکان، لە ژێر ناونیشانی "جەبر و ئیختیار"دا زۆر باسیان لێوە کردووە. ئازادی بە مانا فەلسەفییەکەی لەگەڵ ئازادی بە مانا کۆمەڵناسییەکەی، کە دواتر باسی دەکەین، وابەستەی یەکترن؛ چونکە بڕوا بە ئازادیی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتیی مرۆڤ، گرێدراوە بەو پێشگریمانەیەوە کە مرۆڤ بوونەوەرێکی سەربەست و موختارە و لە کردەوە، ڕەفتارەکان و هەڵبژاردنەکانی، بەرپرسیارە.[4]

1 . Oxford dictionaries Language matters, "**Liberty & Freedom**", from: http://www.oxforddictionaries.com/definition/english/liberty?q=Liberty

2 . عەبدوڵڵاپوور، هەژیر (2008)؛ "**فەرهەنگی هەژیر**"؛ هەولێر: دەزگای موکریانی؛ بەرگی1؛ ل 23.

3 . روحانی، ماجد مردوخ (2010)؛ "**فرهنگ فارسی ـ کوردی**"؛ سنندج: دانشگاه کردستان؛ چاپ 1؛ ص 23.

4 . آرمین، محسن (2011)؛ "**جریانهای تفسیری معاصر و مسئله آزادی**"؛ تهران: نشر نی؛ ص 22.

### 2.1.3- چەمکی ئازادی لە عیرفان و ئەخلاقدا:

لە ئەدەبیاتی عیرفانی و تەسەوفیشدا تووشی مانایەکی دیکەی چەمکی ئازادی دەبین، کە ئەویش بریتییە لە: بێنیازی لە خەڵك و نەهێشتنی کۆت و بەندی ماددی و ماددەپەرستی و، ڕزگاربوون لە مەیل و ئارەزووە دەروونییەکان و کەویکردن و کۆنترۆڵکردنی نەفسی سەرکێش. بەندەیی و کۆیلایەتیی ڕاستەقینە لە لایەن عارف و سوفییەکان بریتییە لە: یەخسیربوونی هەوا و هەوەسی نەفس. هەر کەسێك کە پشت لە سەروەت و سامانی دونیا و حەز و شەهوەت و ئارەزووە ماددییەکانی بکات، ئەو تاکێکی ئازادی ڕاستەقینەیە، تەنانەت ئەگەر لە ڕواڵەتدا نۆکەر و کۆیلەش بێت. ئازادی بە بڕوای حەکیم و عارفەکان بە تێکڕایی بریتییە لە: تەنها بەندایەتیکردنی خوا و پشتکردن لە غەیری ئەو.[1] هەروەك "ئیبنی عەرەبی" پێی وایە: "ئازادی لە ڕێگەی بەندایەتی و عبوودیەتی ڕەها بۆ خوا و ملکەچبوون بەرامبەر بە ربووبییەتی ئەو بەدی دێت".[2] ئەم مانایە لە ئازادی (لە ڕووی عیرفانییەوە) زۆر جیاوازە لەگەڵ مانا کۆمەڵناسییەکەی ئازادی؛ چونکە ئازادی لە ڕوانگەی عیرفانەوە تەنها پەیوەستە بە دەروونی تاك و ناخی مرۆڤەوە، کەچی ئازادی بە مانا کۆمەڵناسییەکەی گرێدراوە بە کۆمەڵگا و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤەوە.

### 2.1.4- چەمکی ئازادی لە کۆمەڵناسیدا:

لە ڕووی کۆمەڵناسییەوە، ئازادییەکانی تاك بەسەر دوو جۆر دابەش دەبێت: "ماف و ئازادییە مەدەنییەکان"، "ماف و ئازادییە سیاسییەکان". مادام مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە و لەگەڵ هاوچەشنەکانی خۆی لە ناو کۆمەڵگادا دەژیت و، ناشکرێ بەبێ دروستکردنی پەیوەندی و کارلێکی کۆمەڵایەتی پێکەوە کۆمەڵگایەك دروست بکەن، کەواتە پێویستە ئازادییەکانیشی لەسەر بنەمای کۆمەڵایەتی پێناسە و جێبەجێ بکرێن. نابێ لە ناو کۆمەڵگادا فەرامۆش بکرێت، یان ماف و ئازادییەکانی بکرێنە قوربانیی کۆمەڵگا؛ ئازادی لەم ڕووەوە بە ڕەچاوکردنی پەیوەندییەکانی تاك لەگەڵ کۆمەڵگا (خێزان، دراوسێ، گەڕەك، دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان، دەوڵەت)ـەوە پێناسە دەکرێت.

---

1 . بروانه: روزنتال، فرانس (2000): "**مفهوم آزادی از دیدگاه مسلمانان**"؛ ترجمه: منصور میراحمدی؛ قم: مرکز انتشارات دفتر تبلیغات اسلامی حوزه علمیه قم؛ صص 155-168.

2 . إبن عربي، محي الدين أبوعبدالله محمد بن علي (1986)؛ "**الفتوحات المكية**"؛ بيروت: دار صادر؛ ج2؛ ص187.

"ماف و ئازادییە مەدەنییەکان" خۆی بەسەر دوو جۆر دابەش دەبێت: یەکەم) ماف و ئازادییە سەرەتاییەکان: بریتییە لە ئازادییە تاکەکەسییەکان (ئازادیی فیزیکی لە بەرامبەر کۆیلایەتی)، ئاسایش (ئازادی لە دەستدرێژی، دەستبەسەرکردن و زیندانیکردنی ناڕەوا)، ئازادی لە ژیانی خێزانی، ئازادیی موڵکایەتی و پاراستنی خانوو و سامانەکانی، ئازادیی مامەڵە و بازرگانی و کەسب و کار، ئازادیی هاتوچۆ و ئازادیی پەیوەندییەکانی. ئەم دەستە لە ئازادییەکان کەمترین و سەرەتاییترین مافی هەر مرۆڤێکە کە لە ژیانی ڕۆژانەیدا پێویستیی پێیەتی و لە ڕووی مێژووییشەوە لە هەموو ماف و ئازادییەکان گرنگتر و سەرەتاییترە. دووەم) ماف و ئازادییە تەواوکەرەکان: کە بریتین لە ئازادیی بیروڕا و ئەندێشە، ئازادیی ئایینی، ئازادیی فێربوون، ئازادیی هونەری و ئەدەبی، ئازادیی قسەکردن و قەڵەم و نووسین، ئازادیی چاپەمەنییەکان، ئازادیی چوونەناو گروپ یان سەندیکا یان ڕێکخراوێك. ئەم دەستە لە ماف و ئازادییەکانیش، بە بەراورد لەگەڵ دەستەی یەکەم، لە ئاستێکی بەرزتردان و لە ڕووی مێژووییشەوە بەم دواییانە بۆ مرۆڤ باس کراون. بەڵام "ماف و ئازادییە سیاسییەکان": دەوەستنە سەر مافی بەشداریکردن لە هەڵبژاردنەکاندا، مافی بەکارهێنان و بەدەستهێنانی پۆستی سیاسی و حکومی، مافی دەستگەیشتن بە دادگاکان و مافی شایەتی و هتد.[1]

ئازادی بە شیکردنەوەیەکی کۆمەڵناسانە، خۆی لە دوو مانادا دەدۆزێتەوە: یەکەم) ئەوەیە کە مرۆڤ لەبەردەم فشار و ئازار و کێشەنانەوە و زیانی ئەوانیتر نەبێت. دووەم) ئەوەیە کە بتوانێت هەرچی بیەوێ بیکات، بەو مەرجەی کە ئازار و کێشە و زیانی کەسێکی دیکەی لێ نەکەوێتەوە و نەیخاتە ژێر فشارەوە. بە یەکەمی دەڵێن: "ئازادیی نەرێنی" و بە دووەمیش: "ئازادیی ئەرێنی".[2]

ئازادی لە مانا کۆمەڵناسییەکەیدا یەکەمجار لە مانا سلبی و نەرێنییەکەیدا دەرکەوت؛ بەو واتایەی کە نکۆڵیکردنە لە هەموو بەربەست و چوارچێوەیەك کە لە لایەن خەڵکەوە لەبەردەم تاکدا دادەنرێن؛ بە واتایەکیتر: ئازادیی سلبی، نکۆڵیکردن و ڕەتکردنەوەی هەموو زۆرداری و ناچارکردنێکە کە لە ئیرادە و ویستی تاکەکانی دیکەوە سەرچاوە دەگرێ و چالاکییەکانی تاك بەرتەسك دەکەنەوە؛ وەکو ئەو ڕەوت و بزووتنەوە ئازادیخوازانەی کە لە ڕۆژئاوا بەرامبەر بە

1 . موحد؛ محمد علی (2003)؛ "در هوای حق و عدالت: از حقوق طبیعی تا حقوق بشر"؛ تهران: نشر کارنامه؛ صص 222-223.
2 . منبع پیشین؛ ص 213.

دەستتێوەردانەکانی سیستمی کەنیسە و دەرەبەگایەتی (فیۆدالیزم) سەریان هەڵدا، کە زیاتر ئازادیی تاکەکەسی و تایبەتی و مەدەنیی دەگرتەوە. لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی پیشەسازی و دروستبوونی چینی کۆمەڵایەتیی نوێ و لە ئاکامدا گۆڕانکاری لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتی ـ ئابوورییەکاندا، وردەوردە داواکارییەکان بۆ بەدەستهێنانی ئازادییە سیاسییەکان دەستیان پێ کرد و بەم پێیە بوو کە بزووتنەوە دیموکراسیخوازەکان لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا سەرتاسەری ئەورووپای گرتەوە و چەمکی "ئازادی" لە چەمکی "دادگەری" و "یەکسانی" نزیك بووەوە و، سەرباری حاشاکردنی چوارچێوە و بەربەستە کۆمەڵایەتییەکان، کە هەڵقوڵاوی ویست و ئیرادەی خەڵکی دیکەیە (لایەنی سلبی و نەرێنیی ئازادی)، بەشداریی هاووڵاتییان لە پرۆسەی بڕیاردان لە چارەنووس و بەڕێوەبردنی کارەکانی خۆی بە سەربەخۆییش هاتەکایەوە (لایەنی ئیجابی و ئەرێنیی ئازادی).[1] جیاکردنەوەی ئەم دوو مانایە لە ئازادی (واتە ئازادیی سلبی لە ئازادیی ئیجابی) کە دەرئەنجامی وردبینیی فەلسەفییانەی "ئایزیا برلین"ـە*، بەو پێوەرەی کە خۆی دایناوە، باشتر ڕوون دەبێتەوە و لێی تێدەگەین: ئەو پێ دادەگرێتەوە لە سەر ئەوەی کە ئازادیی سلبی لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەردەکەوێت کە دەڵێت: "حکومەت تا چ ڕادەیەك و تا چەند مافی دەستتێوەردانی ژیانی منی هەیە؟" و ئازادیی ئیجابیش لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا ڕوون دەبێتەوە کە دەڵێت: "چ کەسێك مافی حکومەتکردنی هەیە بەسەر منەوە؟".[2]

هەندێ جاریش ئازادی بە مانای "سەربەخۆیی"** هاتووە؛ بە تایبەتی لە دوای سەرهەڵدانی بزووتنەوە نەتەوەییەکان و دژە داگیرکارەکان لەو کۆمەڵگایانەی کە کەوتوونەتە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی داگیرکەریی بێگانەکان. بەپێی پێناسەی ئەو بزووتنەوە نەتەوەییانە بۆ ئازادی دەکرێ بڵێین بریتییە لە: نەفی و حاشاکردنی هەر بەربەستێك کە لە لایەن ئیرادە و ویستی بێگانەکان لەبەردەم ویست و خواستی نەتەوەیەك دادەنرێت بۆ چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیان و دەستنیشانکردنی چارەنووسیان. بابەتی ئازادی لە لایەن ئەو بزووتنەوانەوە، لە ئازادیی تاکەکەسی و مرۆییەوە دەگۆڕێت بۆ ئازادیی نەتەوەیی و نیشتمانی کە لێرە زۆر لە هزری "ناسیۆنالیزم" نزیك دەبنەوە. هۆی پێشوازیکردنی میللەتانی ژێردەستی کۆلۆنیالیزم و داگیرکەران و سەربەخۆخوازان

---

1 . آرمین: همان منبع: صص 26-27.

* Isaiah Berlin (1909-1997).

2 . برلین، آیزایا (2014)؛ "**چهار مقاله درباره آزادی**"؛ ترجمه: محمد علی موحد؛ چاپ 3؛ تهران: خوارزمی؛ ص 248.

** Independence

لەو پێناسەیە بۆ ئازادی، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەستە دەروونییەی کە حەز دەکەن شوناس و ناسنامەی خۆیان بپارێزن؛ ئەو ناسنامەی کە لە لایەن داگیرکاران و بێگانەکان سووك و بێڕێز کراوە و نکۆڵیی لێ کراوە. ئەگەر میللەتێکی وەکو کورد، داوای سەربەخۆیی دەکات و نایەوێ ژێردەستی نەتەوەکانی دیکەی وەك عەرەب و تورك و فارس بێت، لە ڕاستیدا حوکمی ئەوان بە کۆت و بەند و زنجیر دەزانێ، بەڵام ئەگەر هەمان حوکم و دەسەڵات و کورسی لە لایەن کوردێکەوە بەڕێوە ببرێت، بە سەربەخۆیی و ئازادیی ڕەهای دەزانێ.

## 2.2- ئازادی لە (أ).. ئازادی بۆ (ب):

لە دوای ئەم پێناسانە، ئێستا دەتوانین بە شێوەیەکی وردتر مەبەست لە چەمکی ئازادی ڕوون بکەینەوە؛ چونکە ئازادی (زیاتر لە مانا کۆمەڵناسییەکەی) هەڵگری دوو ناوەڕۆك یان دوو پرسیارە کە دەبێ بەر لە هەر شتێك وەڵامەکانیان بە ڕوونی بدرێنەوە، تاکو مەبەست و ئامانج لەو ئازادییەی کە بانگەشەی بۆ دەکرێت و لە پێناویدا خەبات دەکرێت، ڕوون و دیار بێت.

کاتێك کە دەڵێین "ئازادی"، پێویستە وەڵامی ئەو دوو پرسیار بدەینەوە:

1. ئازادبوون (لە) چی؟
2. ئازادبوون (بۆ) چی؟

هەر کەسێك کە بانگەشەی ئازادی دەکات، دیارە لە هزرێك، یان لە کەسێك، یان لە سیستم و بارودۆخێك ڕازی نییە و دەیەوێ لە کۆت و بەندی ئەو هزرە، یان ئەو کەسە، یان ئەو دۆخ و سیستمە ئازاد ببێت و هەڵبێت و پەنا بباتە بەر هزرێکیتر، یان کەسێکیتر، یان بارودخێکیتر، کە پێی وایە باشتر و گونجاوتر و بەسوودترە لە هی یەکەم؛ واتە لە واقیعی یەکەم ناڕازییە و قبووڵی ناکات و لە بەرامبەریدا دەڵێت: (نە بۆ تۆ!)؛ بۆیەش دەیەوێت لێی ئازاد و ڕزگار بێت و پەنا دەباتە بەر واقیعی دووەم، کە پێی خۆشە و لێی ڕازییە و لە بەرامبەریدا دەڵێت: (بەڵێ بۆ تۆ!).

بۆ نموونە: ئەگەر کەسێك لە ژوورێك هەست بە گەرما بکات، کە پێی خۆش نییە و بەرگەی نەگرێت لە بەرامبەریدا، هەوڵ دەدات بە جۆرێك لە جۆرەکان کەشوهەوای ئەو ژوورە وەها بگۆڕێت کە هەست بە ئاسوودەیی و تەنایی بکات؛ ئەگەر ئەو کەسە لە جیاتی هەوڵدان بۆ

ساردکرنەوەی ئەو ژوورە بەردەوام هاوار بکات: گەرمامە! گەرمامە! ئایا فێنك دەبێتەوە و هەست بە حەسانەوە دەکات؟ یان بە پێویست دەزانێت لە جیاتی گلەیی و بۆڵەبۆڵکردن، چەند کارێکی بێوچان بۆ گەیشتن بە مەبەستەکەی ئەنجام بدات؟ بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە بەر لە هەموو شتێك هۆکار و سەرچاوەی ئەو گەرمایە بدۆزێتەوە، ئەگەر ئامێرێکی گەرمکەر پێیە، بیکوژێنێتەوە (لێرە واتە ئازادبوون لە گەرما!) ئینجا لە دوای "نە"گوتن بەو دۆخە، بەدوای ئامرازی گونجاودا بگەڕێت بۆ ساردکرنەوەی ژوورەکە بە پێی واقیع و بارودۆخی ئەو ژوورە و تواناکانی؛ هەندێ شوێن تەنها بە کردنەوەی پەنجەرەکان ئەنجامی دەبێت، بەڵام هەندێ جاریش پێویستی بە داگیرساندنی ئامێرێکی ساردکەرەوە دەبێت، ئەگەر کارەبا هەبێت! ئەگەر نا باوەشێنکە بەکار دێنێ! (لێرە واتە ئازادبوون بۆ لای فێنکبوونەوە!). ئەگەر ئەو کەسە لە واقیعی یەکەم تێنەگات و واقیعی دووەمیش نەناسێت، یان هەر لەتاو ئەو گەرمایە دەمێنێتەوە، یانیش زیاتر لە پێویست ژوورەکەی سارد دەکاتەوە بە شێوەیەك کە دووبارە لەو دۆخە نوێیەش دەناڵێنێت و ئەم جارە گلەیی دەکات: سەرمامە! سەرمامە! هەروەها ئەی ئەگەر کەسانێکی دیکەش لەو ژوورەدا بن؟ ئایا نابێ ڕەچاوی حاڵی ئەوانیش بکرێ؟ لەوانەیە ئەوان وەکو خۆی ئەوەندە لەو گەرمایە بەگازندە نەبن و پێیان دۆخێکی ئاسایی بێ؟ یان لەدوای ساردکردنەوە، دیسان بە دۆخە نوێیەکەش ڕازی نەبن؟

لەسەر ئەم بنەمایە و ئەم نموونە سادەیە، ئەم پرسیارە ئاراستەی ڕۆشنبیرە فێمێنیستەکانی خۆمان دەکەم کە بەردەوام بانگەشەی ئازادی ژن دەکەن و بە دەنگێکی بڵند بەبێ پسانەوە هاواری بۆ دەکەن: مەبەستتان لە ئازادیی ژن چییە؟ ئەم داواکردنەتان نیشانەی ئەوەیە کە دەبێ ژنی کورد بەدەست شتێکەوە بناڵێنێ و هەست بە کۆت و بەندێك بکات، کە ژیانە ئاساییەکەی لێی تاڵ کردبێت و ڕێگەی لە پێشکەوتنی گرتبێت، وەك کەسێك کە بێهۆ لە ناو قەفەسێك بەند کرابێت؛ بۆیە ئەو کۆت و زنجیرانە چین؟ واتە: (ئازادی لە چی؟) لە وەڵامدا دەبێ زۆر بە ڕاشکاوی بڵێن: ئازادی لە فڵان کۆت و زنجیر، لە فڵان کەس، لە فڵان سیستم، لە فڵان کێشە و هتد! لە دوای دیاربوون و تێپەڕاندنی ئەم قۆناغە، پرسیاری دووەم لێیان دەکرێت، کە ئەویش بریتییە لە: (ئازادی بۆ چی؟)؛ واتە لە دوای ڕزگاربوون لە دۆخی یەکەم دەتانەوێ پەنا ببەنە بەر چ لایەنێك؟ کوا بەدیل و نموونەتان کە لە پێناو گەیشتن بەو ئازادییە تێدەکۆشن؟ لە وەڵامی هەر هەموویان، لە میانەی وتارەکانیان و هەروەها ئەو چەند ساڵانەش کە ڕووبەڕوویان بوومەتەوە،

ئەوە دەبیستین و دەخوێنینەوە، کە ڕۆژئاوا باشترین نموونە و سەرمەشقە و پێویستە ئێمە و هەموو وڵاتانی ڕۆژهەڵاتیش لە مەسەلەی ژن بەتایبەتی و، بابەتەکانی دیکەش بە گشتی چاویان لێ بکەین:




ڕۆشنبیرە فێمێنیستەکان لە جیاتی هاوارکردن و ئەوەندە وتنەوەی "ئازادیی ژن! ئازادیی ژن!" (وەکو ئەو نموونەیەی کە بەردەوام هاوار دەکات: گەرمامە! گەرمامە!) پێویستە مەبەستی خۆیان لە ئازادیی ژنان ڕوون بکەنەوە؛ ئازادی لە چی؟ ژن دەبێ لەو کۆمەڵگایەدا لە چ کۆت و بەندێك ئازاد بکرێت؟ ئەوە نیوەی کارەکەیە. نیوەکەی‌تر دەبێ بە ڕوونی بڵێن کە دەتانەوێ ژنی کورد بە چ ئاقارێك ببەن و بەدیل و جێگرەوەی واقیعی پێشووتان چییە؟ چۆن دەسەلمێنن کە واقیعی (ب) لە (أ) باشتر و سوودمەندترە و تەمەنی درێژترە؟ کێ دەڵێت ژن لەو واقیعەش تووشی کێشە و نەهامەتی و قەفەس و زنجیری نوێتر و توندتر نابێتەوە؟ کێ دەڵێت لە نموونەی دووەمدا هەست بە ئازادی و حەسانەوە دەکات؟ نموونەی ئەو گۆڕانکاری و شۆڕشانە لە مێژوودا زۆرن کە لە پێناو گۆڕینی حاڵەتێك بۆ حاڵەتێکی‌تر خەباتێکی خوێناوییان کردووە، کەچی تەنها ناوی دیکتاتورەکان و ڕەنگی کورسی و قەفەسەکان گۆڕاوە و دواتر خۆزگەیان خواستوە بۆ حاڵەتی ڕابردوویان!

من پێم وایە ئەگەر زۆر بە وردی و قووڵی بە ڕەچاوکردنی ئەو دوو پرسیارە (ئازادی لە چی؟) و (ئازادی بۆ چی؟) سەیری بابەتی ئازادی بکەین، دەبینین کە هەموو جۆرە ئازادییەك، ئازادییەکی دووەمی پێویستە؛ چونکە کاتێك ناتەوێ لە ژێر بار و فەرمان و ڕکێفی کەسێك یان هزرێك یان سیستمێکدا بژی، پەنا دەبەیتە بەر حاڵەتی دووەم و لەوێش دەکەویتە ژێر بار و فەرمان و دەسەڵات و ڕکێفی کەسێکی‌تر، هزرێکی‌تر، سیستم و دۆخێکی‌تر!

بۆ نموونە: کاتێك کە عارف یان دەروێشێك پشت لە دونیا و ماڵی دونیا و حەز و ئارەزووەکانی دەکات، بەو مەبەستەی کە ماددیات زنجیر و کۆت و بەندن و مرۆڤ دەکاتە کۆیلە و بەندە و پاشکۆی خۆی، ڕاستە کە لە هەوەسێکی دەروونی ڕزگاری دەبێت، بەڵام لە ڕاستیدا پێم وایە لە هەمان کاتدا ڕووبەڕووی هەوەسێکی دیکەی دەروونی دەبێتەوە، کە لە ناوەڕۆك و جەوهەردا

لەگەڵ هەوەسی یەکەم یەك شتە. هەوەسێك کە من دەتوانم سەرکوتی بکەم یان لە دژی بوەستم و بەرەنگاری ببمەوە، سەرئەنجام هەوەسێك لە ناو دەروونی خۆمدا دەبینمەوە کە بە تەواوەتی تێرم کردووە؛ بۆ ئەوەی ئەو هەوەسە تێر بکەم، هەوەسێکی دیکەم پشتگوێ خستووە!

بە پێچەوانەوە: کەسێکی ماددیگەرا بهێننە بەرچاوتان کە لە پێناو ماددە وماڵی دونیا و حەز و ئارەزووە نەفسانییەکەی وێڵ و سەرگەردانە؛ هەر رۆژ لەگەڵ گۆڕانکاری و هەڵکشان و داکشانی ماددە، ئەویش دەگۆڕێ. لەوانەیە دایك و باوك و منداڵ و خێزان و خزم و کەسوکار و دراوسێ و خەڵکی گەڕەك و هاووڵاتییانی لە بیر بکات، بەڵام لەبەر ماددە و شتە ماددییەکان وەك ئۆتۆمۆبیل و پۆشاك و خواردن و هەموو ئەو شتانەی کە دەروێش و عارفەکان بە کۆت و زنجیری دەزانن، شەو بکاتە رۆژ و رۆژەکەش بکاتە شەو. هەر مۆدیلێك بێتە بازاڕ، ئەو لە شەیداکانی بێت و باوەشی بۆ بکاتەوە! ئایا ئەوە تاکێکی ئازادە؟ ئایا ئەو کەسە بەندکراوی کۆت و زنجیری ماددە و هەوا و هەوەسە دەروونییەکانی خۆی نییە؟

**2.2.1- پێوەرەکانی دەستنیشانکردنی کۆت و ئازادی:**

لێرەدا دەبێ هەندێك لەسەر ناوەڕۆکی ئازادی، بەتایبەتی لە وەڵامی پرسیاری دووەم (ئازادی بۆ چی؟) بوەستین و باش ڕوونی بکەینەوە؛ چونکە بەپێی شیکردنەوەی سەرەوە هەر کەسێك لە واقیعێك ئازاد بێت (جا ئەو واقیعە کەسێك، یان هزر و بۆچوونێك، یان سیستمێك بێت) و پەنا بباتە بەر واقیعێکی دیکە، واقیعی دووەمیش بۆی دەبێتە کۆت و بەند و قەفەسێکی دی؛ چونکە تەنها شوێنەکان، کەسەکان، بابەتەکان، ناوەڕۆکەکان، حاڵەتەکان و ڕواڵەتەکان دەگۆڕێن و ملکەچبوون، چۆکدادان، گوێڕایەڵی، پاشکۆیی و سنووردارێتی لە هەر دوو واقیعەکەدا هەر دەمێننەوە! لێرەیە کە ئەم پرسیارە گرنگە دروست دەبێت: "بۆچی حاڵەتی یەکەم بە کۆت دەزانرێ و حاڵەتی دووەم بە ئازادی؟"؛ بۆ نموونە: چ پێوەرێك هەیە کە پێمان بڵێت: حوکمی بێگانە کۆتە و حوکمی خۆمانە، ئازادییە؟ ئایا لە هەردوو حاڵەتدا حوکم و دەسەڵاتگێڕی و بکە و مەکەی تێدا نییە؟ ئایا لە هەردوو حاڵەتدا ژێردەستی و ملکەچی و خۆگونجاندن لەگەڵ ویستی هێز و دەسەڵات، بوونی نییە؟ ئایا لە هەردوو حاڵەتدا چالاکییەکانی مرۆڤ دەستنیشان ناکرێن کە چی بکات و چی نەکات و چۆن بکات و چۆن نەکات؟ کەواتە مرۆڤ کەی دەگاتە ئازادیی ڕاستەقینە؟

ئەمە هەمان ئەو باس و پرسە گرنگەیە کە پەیوەندیی نێوان دوو چەمکی "ئازادی" و "هێز و دەسەڵات" شی دەکاتەوە؛ باسێك کە فەیلەسووفەکان و زانایانی سەردەمی کۆن و نوێ لە سەری ناکۆکن و بە درێژایی مێژوو کێشمەکێش و گەنگەشەیان بووە:

**2.2.1.1- یاسا:**

هەندێ فەیلەسووف و بیرمەند پێیان وایە کە دەستنیشانکردنی ئازادی بە هۆی یاسا و ملکەچبوون بەرامبەر بە یاسا، هەمان ئازادییە و هیچ لە ئازادی کەم ناکاتەوە؛ بۆ نموونە "جۆن لۆك"* دەڵێت:

"لەو شوێنەی کە یاسا نەبێت، ئازادییش نابێت؛ چونکە یاسا نەقڵانییەکان ڕێڕەو و ئاقاری بەرژەوەندییە گشتییەکانی هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا دیاری دەکەن و ناهێڵن ئێمە بکەوینە نێو قوڕ و زەلکاو و، لە هەڵدێر قوتارمان دەکات؛ بۆیە شیاو نییە کە یاساکان بە سنووردارێتی و چوارچێوەداری ناو ببەین. هەروەها دەڵێت: ڕاکردن لە یاسا سروشتییەکان کە هەمان یاسا نەقڵانییەکانن، واتە دژایەتیکردنی نەقڵ و ژیری و بوون بە مرۆڤی سەرکێش و بەرەڵا و ناژەڵئاسا."[1]

"ژان ژاك روسۆ"**ش پێی وایە کە:

"تاك، خۆی و هەموو هێز و تواناکانی دەخاتە ژێر ڕکێفی دەسەڵات و هێزی گەورەی خەڵك (کۆمەڵگا) و لە دروستکردنی کەسایەتییەکدا بەشدار دەبێت کە بریتییە لە کۆمەڵێك لە فیداکارییەکانی هەموو تاکەکان؛ بۆیە ناتوانێت ئازاری هیچ کامیان بدات. من کە خۆم ملکەچ و تەسلیمی خەڵك دەکەم، لە ڕاستیدا نابمە تەسلیم و ملکەچی هیچ کەسێك؛ چونکە هەر شتێك کە لە دەست دەدەم، لە دەستی کەسێکیتر وەریدەگرمەوە. مرۆڤ بە قبووڵکردنی گرێبەستی کۆمەڵایەتی، ئازادیی سروشتی و مافی بێسنووری خۆی بۆ بەدەستهێنانی هەر شتێك کە دەیەوێ و پێی دەکرێ کە بە دەستی بهێنێ، لە دەست دەدات و دەکاتە قوربانی، بەڵام لە جیاتی ئازادیی مەدەنی و مافی خاوێندارێتی هەر شتێك کە هەیەتی، بەدەست دەهێنێ."[2]

* John Locke (1632-1704)

1 . Locke, John (2002), **"Second Treatise of Government"**, New York: Dover Publications, p. 32.

** Jean- Jacques Rousseau (1712-1778)

2 . Wraight, Christopher D. (2008), **"Rousseau's The Social Contract: A Reader's Guide"**, London: Continuum Books. pp 43-51.

"مونتسکیۆ"* ش پێی وایە کە:

"ئازادی ئەوە نییە کە هەر کەسێك هەرچی بیەوێ بیکات، بەڵکو ئازادی بریتییە لە: ئەنجامدانی ئازادانەی کارێك کە پێویستە بیکات و، ناچارنەکردن لەو کارەی کە نابێ بیکات. بەڵام ئەوە کێیە کە دیار دەکات چی پێویستە بکرێت؟ دیارکردنی حوکمی "دەبێ" و "نابێ" بەدەست "یاسا"یە؛ کەواتە ئازادی مافی مرۆڤە و بریتییە لە مافی ئەنجامدانی ئەو کارانە کە یاسا ڕێگەی پێ دەدات و خەڵك ئازادن کە چالاکییەکانی خۆیان تەنها لە چوارچێوەی یاسادا ئەنجام بدەن."[1]

لێرەیە کە ئەو، هەڵوێستە لیبراڵییەکانی خۆی لەبیر دەکات و دەڵێت:

"ئازادی بەو مانایە نییە کە ئێمە هەرچی بمانەوێ بکەین، یان هەر کارێك کە تەنانەت لە ڕووی یاساشەوە ڕێگەپێدراو بێت ئەنجام بدەین، بەڵکو ئازادی تەنها ئەو مانایە دەگەیەنێت کە: ئازاد بین لەو شتانەی کە دەمانەوێ ئەنجامیان بدەین!"[2]

هەمان قسەش لە لایەن "کانت"**ـەوە دووبارە کراوەتەوە.[3]

هەروەك دەبینین ئەو دژایەتی و جیاوازییە لە نێوان "هێز" و "ئازادی"دا لە هزری فەیلەسووفە سیاسییەکاندا بە شێوەیەکی سەیر یەك دەگرێت، تا ڕادەیەك کە پەیوەندیی دیالکتیکی نێوان "هێز" و "ئازادی" لە کۆتاییدا دەبێتە "یاسا" و هەموو لەسەر ئەو سەنتێزە ڕێك دەکەون و یاسا دەبێتە چوارچێوە و سنووری ئازادی بۆ مرۆڤەکان، بەڵکو دەبێتە هەمان ئازادی. هەر بۆیەش هەندێ لە زانایان "ئازادی" بە واتای "ملکەچی و تەسلیمبوون" بەرامبەر بە "یاسا" دەزانن. ئەو یاسایەش پێویستە یاسایەکی سەرووتر و زاڵتر بێت کە هەموویان بۆ ملکەچبوون و گوێڕایەڵیی خۆی ناچار بکات و ئەم ناچاریی و ملکەچبوونەش ببێتە شتێکی لۆژیکی و یاساوهەڵگر کە شیاوی قبووڵکردن بێت بۆ هەموو لایەك.

"مالینۆفسکی"*** ـ ئەنترۆپۆلۆژیست و مرۆڤناسی بەناوبانگی پۆڵۆنیایی ـ دەڵێت:

"ئازادی لە زات و ناوەڕۆکی خۆیدا وەرگری ئەو زنجیرانەیە کە لە ناو خودی مرۆڤدایە؛ ئەو زنجیرانەی کە مرۆڤ پێی خۆشە و تێیدا ئاسوودەیە. هەروەها دانان و قبووڵکردنی جڵەوێکە کە مرۆڤ بەرەو ئەو ئامانجەی دەبات، کە هەڵیبژاردووە و بۆی گرنگە."[1]

* Charles-Louis de Secondat (Montesquieu), (1689-1755)

1 . منتسکیو، شارل دو (1983)؛ "روح القوانین"؛ ترجمه: علی اکبر مهتدی؛ چاپ هشتم؛ تهران: انتشارات امیر کبیر؛ ص157.

2 . هلد، دیوید (1992)؛ "مدلهای دموکراسی"؛ ترجمه: عباس مخبر؛ تهران: روشنفکران؛ ص 118.

** Immanuel Kant (1724-1804)

3 . برلین؛ همان منبع؛ ص 272.

*** Bronisław Kasper Malinowski (1884-1942)

"ئایزیا بەرلین" ـ فەیلەسووف و تیۆرەوانی کۆمەڵایەتی سیاسیی سەدەی بیستەم ـ لە کتێبەکەیدا "چوار وتار دەربارەی ئازادی"* دەڵێت:

"ئەگەر خۆشبەختیی ڕاستەقینەی مرۆڤ تەنها بەند بێت بە سیستمێکی دیاریکراو و ستایل و شێوازە ژیانێکی کۆمەڵایەتییەوە، گریمان ئەو سیستمە ئەقڵانییە دۆزرابێتەوە و هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا لێ تێبگەن و قبووڵی بکەن و ملکەچی بن، ئەو کاتەیە کە دەتوانین ئەم ملکەچبوونە دڵخوازانە و خوازیارانەیە لە بەرامبەر ئەو سیستمەدا، بە هەمان ئازادیی ڕاستەقینە و جەوهەری ئازادی ناو ببەین. بەڵام پێدەچێت هیچکام لەو گریمانانە نەیەنە دی؛ بۆیە ئەگەر وای دابنێین ئەو سیستمە ئایدیاڵەش بێتە جێ و تەنها زانایان و بیرمەندان بتوانن لێی تێبگەن و تەنانەت لە پێناو خۆشبەختی و بەختەوەریی خەڵکی عەوام، ناشارەزا و تێنەگەیشتووش پراکتیزە بکەن و خەڵکەکە بە زۆرەملێ ناچار بکەن بە ملکەچبوون، ناتوانین بە ئازادیی ناو ببەین."[2]

واتە: ئازادیی ڕاستەقینە ئەو کاتە دێتە دی کە تاکەکانی کۆمەڵگا پڕبەدڵ، بە حەز و ویستی خۆیان ملکەچی سیستم و چوارچێوەیەك بن؛ چ لێی تێبگەن، یان لێی تێنەگەن. ناکرێ بە زۆرداری سیستمێك لە لایەن زانایان و دەسەڵاتدارانەوە بەسەر خەڵکدا بسەپێندرێ لە حاڵێکدا بەو سیستمە ڕازی نین، بەو پاساوە کە خەڵك نازانن کە بەرژەوەندی و خۆشبەختیی ئەوان بەندە بەو سیستمەوە. سیستمێك چەند ئایدیاڵ و نموونەیی و کامڵ و بەسوودیش بێ، مادام خەڵك پێی ڕازی نەبن، ناتوانین بە زۆرەملێ ملکەچیان بکەین؛ ئەو کاتە نابێتە ئازادی، بەڵکو دەبێتە دیکتاتۆری. بەڵام ئەگەر هەمان سیستم لە لایەن خەڵکەوە دەنگی پێدرا و خوازیارانە ملکەچی بوون، ئەو کاتە ئازادیی ڕاستەقینە بەرپا دەبێت. بەم پێیە بە زەبر و زۆرداری سیستمی دیموکراسی بەسەر ئەندامانی کۆمەڵگایەکی نەریتی و خێڵەکیدا بسەپێنین، کە پێی ڕازی نین و بڵێین: ئەوان نازانن کە دیموکراسی بۆیان باشترە! بە پێچەوانەشەوە دروستە.

کەواتە هەروەك دەبینین، هەندێك لەو زانا و فەیلەسووفانە ملکەچبوون لە بەرامبەر یاسا، بە هەمان ئازادی ناو دەبەن؛ واتە لە وەڵامی پرسیاری یەکەم و دووەم (ئازادی لە چی؟) و (ئازادی بۆ چی؟)، پێیان وایە ئازادی لە فەوزا و بەرەڵایی و کۆیلایەتی و نەبوونی دەسەڵات بۆ لای ملکەچبوون بەرامبەر بە یاسا، هەمان ئازادیی ڕاستەقینەیە کە هەندێکیان پێیان وایە هەر

1 . Malinowski, Bronislaw (1976), "Freedom and Civilization", Westport CT: Greenwood Publishing, p. 30.

* Liberty: incorporating four essays on liberty.

2 . برلین؛ همان منبع؛ ص 28.

یاسایەك شایانی ئەو ملکەچبوونە نییە و بەڵکو دەبێ "یاسایەکی نمونەیی و باڵا و زاڵ" بە سەر هەموو یاساکانەوە هەبێت کە هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا پڕبەدڵ و بە ئارەزووی خۆیان ملکەچی بن، ئەو کاتە ئەوە دەبێتە ئازادیی ڕاستەقینە و حاشاهەڵنەگر.

ئەم "یاسا نموونەیی"یە چییە؟ سەبارەت بەو یاسا نموونەییەش دیسان زانایان و بیرمەندان لەگەڵ یەکتری ناکۆك دەبن و هەر یەك بە شتێك دەزانێت کە لەگەڵ ئەوەیتر جیاوازە؛ بۆ نموونە: "تۆماس هۆبز"* ئەو یاسایە زاڵە بە "یاسای سروشتی" ناو دەبات و پێی وایە کە فەرمانڕەوا پێویستە لەسەر بنەمای یاسای سروشتی، یاسا دابنێت. "ڕوسۆ"ش سەرچاوەی ئەو یاسایە دەگەڕێنێتەوە بۆ "ڕۆح و ئیرادەی کۆمەڵگا" و پێی وایە خەڵك بە ویستی خۆیان ملکەچی کۆمەڵگا دەبن و بەشداریی لە کۆمەڵگادا دەکەن بۆ دروستکردنی کەسایەتییەك لە ڕێگەی چاوپۆشین لە ماف و ئازادیی تاکەکەسیی خۆیان، کە ناوی ئەو کەسایەتییە لای روسۆ بریتییە لە "یاسا"، کە تاکەکانی کۆمەڵگا بەخۆیەوە ملکەچ دەکات و، وایان لێ دەکات کە "ڕەفتارێکی ئەقڵانی" بکەن و ئەوەش نە تەنها سنووردارکردنی مرۆڤ نییە، بەڵکو ناچارکردنی مرۆڤە بۆ ئازادی.[1] "فرێدریش هێگل"** یش دژایەتی نێوان "یاسا" و "ئازادی" بە شتێکی ڕواڵەتی لەقەڵەم دەدات و ملکەچبوون بەرامبەر بە "دەوڵەت"ی بەهێز و دەسەڵاتدار، کە بە دەوڵەتی وەك خوا دەزانێ، بە لووتکە و ئەوپەڕی ئازادی ناو دەبات و پێی وایە ئازادیی کامڵی مرۆڤ لە ملکەچبوونی کامڵ و خۆبەخشانە و دڵخوازانەی ئەودایە بەرامبەر بە دەوڵەتی دەسەڵاتدار؛ چونکە لە بنەڕەتدا ئەو ملکەچی خۆیەتی و سەری بە خۆی سپاردووە.[2]

**2.2.1.2- ئایین:**

دەبێ لێرە جەخت لەوەش بکەینەوە کە ئازادی بە مانای ملکەچی و تەسلیمبوون لە بەردەم یاسای نموونەیی و سەرووتر، بۆچوونێکی نوێی زانستی و فەلسەفی نییە، بەڵکو ئەم بۆچوونە لە ناو هزری هەموو ئایینە ئاسمانییەکانی پێشوو و ئێستاشدا هەیە. ئیمانداری ڕاستەقینە هەر لە

* Thomas Hobbes (1588-1679).

1 . برلين، آيزيا (2005)؛ "به نام آزادی: نقد و بررسی آرای شش متفکر عصر جديد"؛ ترجمه: محمد امين كاردان؛ تهران: مرواريد؛ ص 77.

** Georg Wilhelm Friedrich Hegel (1770-1831).

2 . راسل، برتراند (1986)؛ "تاريخ فلسفه غرب"؛ ترجمه: نجف دريابندی؛ تهران: پرواز؛ ج 2؛ ص 953.

موسڵمانانەوە بگرە تاکو مەسیحییەکان و یەهوودییەکان، تەنها ئەو کات هەست بە ئازادیی ڕاستەقینە دەکەن کە خۆیان لەگەڵ ئەو سیستمە نموونەییە و زاڵە بگونجێنن کە سەرچاوەکەی وەحی و سرووشە و لە لایەن خوڵقێنەری مرۆڤەکان و جیهانییەکانەوە دابەزیوە و بە سەریاندا سەپێنراوە؛ بۆ نموونە:

**2.2.1.2.1- ئازادی لە ئایینی ئیسلامدا:**

ئامانجی سەرەکی و یەکەمینی ئیسلام ئەوەیە کە مرۆڤەکان لە هەموو کۆت و بەند و قەفەسێك ئازاد بکات، کە ئەم کۆت و قەفەسانە دوو ڕەهەندیان هەیە: "قەفەسی دەروونی" و "قەفەسی دەرەکی"، کە جۆری ئازادییش دەستنیشان دەکەن، کە بریتین لە: "ئازادیی دەروونی" و "ئازادیی دەرەکی":

یەکەم) "ئازادیی دەروونی" بریتییە لەوەی کە تاك لە دەروونی خۆیدا لە ڕووی هزری و بیروباوەڕەوە (واتە لایەنی عەقیدەوە)، هەروەها لە ڕووی هەست و هەڵچوون و ناخ و دەروونەوە (واتە لایەنی عیبادەتەوە)، کەس جگە لە "الله"، بە خوای خۆی نەزانێ و نەیپەرسێ، کە ئیسلام بە یەکتاپەرستی (تەوحید) ناوی دەبات، کە بریتییە لە: عبوودیەت و بەندایەتی و پەرستشی خوای گەورە و تاقانە و، خۆدوورخستنەوە لە هەموو کەس و شتێك جگە لەو، کە قورئان بە "الطاغوت" ناوی لێ دەبات.[1] تاکی موسڵمان کە شایەتمان دێنێ[2]، باوەڕی وایە کە تەنها یەك خوا هەیە کە غەیبە و نابینرێ، بەڵام هەموو گەردوون بە تێکڕایی نیشانەکانی بوونی ئەون.[3] ئەوەندە دەسەڵاتی هەیە کە مرۆڤ دەژێنێ بێ ئەوەی پرس بە کەس بکات و دەشیمرێنێ بێ ئەوەی مۆڵەت لە کەس وەربگرێ.[4] موسڵمان پێی وایە ژیان تەنها ئەو ژیانە نییە کە لەو دونیایەدا دەژێ و دەمرێ، بەڵکو هەروەك ئەو کۆرپەڵەیە کە لە دونیایەکی تاریکی نۆ مانگیدا دەژیا و دێتە سەر ئەو دونیایە نوێیە، ڕۆژێك لە ڕۆژان لەم دونیایەش دەچێتە دونیایەکیتر و قۆناغ و ژیانێکیتر؛ ئەویش لای کەسێك کە خوڵقێنەر و مرێنەرەکەیتی؛[5] بۆیە لە مانای شایەتمان تێدەگات،

1 . بڕوانە ئەم ئایەتانە: (البقرة: 256-257)، (النساء: 60 و 76)، (المائدة: 60)، (النحل: 36)، (الزمر: 17).
2 . أشهد أن لا إله إلا الله و أشهد أن محمدا رسول الله.
3 . زۆر لە ئایەتەکانی خوا کە دەفەرمێت: "و من آیاته ..." هەموو ئاماژە بەوە دەکەن. بۆ نموونە لە (الروم: 50) دەفەرمێت: ﴿فانظر إلى آثار رحمت الله...﴾.
4 . (الأنبياء: 23).
5 . (النحل: 78)، (البقرة: 156)، (الحديد: 5) و...

ـێ جگە لەو خوایە کە ژین و مردن و ڕزق و ڕۆزی و گەڕانەوەی بەدەستە، کەس شایانی ئەوە ـیە کە ملکەچی بێ؛[1] هەروەك ئافراندنی بەدەستە، فەرمانیشی بەدەستە.[2] هەروەك چۆن خوای ـسمانەکانە، خوای زەویشە.[3] مرۆڤ لە ئیسلامدا گەورەترین و بەنرخترین بوونەوەرە کە خوای گەورە کردووەتە جێنشین لەسەر گۆی زەوی و جڵەوی کاروباری زەویی پێی سپاردووە[4] و ئەمری پێ کردووە کە زەوی ئاوەدان بکاتەوە؛[5] ئاوەدانیی ماددی، فیکری، سیاسی، ئابووری و ژینگەیی؛ بۆ ئەم مەبەستەش هەموو ئامرازێکی پێویستی زۆر سەیر و سەرسوڕهێنەری داوەتێ کە نەیداوە بە هیچ ئافرێندراوێکی دیکەی خۆی؛[6] بۆیە ئەو مرۆڤە سەربەست و خاوەن ئیختیارەی هەرئاوا وێڵ و سەرگەردان نەکردووە کە کردەوەکانی دژ بە سیستمی بوون و فیترەت و سروشت بێت.[7] مرۆڤ لە ئیسلامدا لە لایەن خواوە بەرەڵا نەکراوە، کە لەگەڵ سیستمی بوون بێگانە بێت و نە خۆی وەکو مرۆڤ و نە ژیان و نە جیهان و بوونەوەرانی دیکەش نەناسێتەوە و لە کۆتاییدا خوای خۆشی لە بیر بکات.[8] خوای گەورە لە نێوان یاساکانی حاکم بەسەر جیهان و یاساکانی حاکم بەسەر مرۆڤ و تواناکان و بەهرەکانیدا جۆرە سازانێك و گونجانێکی دروست کردووە، تا لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی مرۆڤ لەگەڵ جیهانی زۆر پتەو و ڕێکوپێك، کە بیەوێ و نەیەوێ ملکەچی ئەمری خوایە و هەرگیزیش هەڵە ناکات، تووشی خۆپێکدادان نەبێت.[9] مرۆڤ لە ئیسلامدا سەروەری زەوییە و ئەو زەوییە و هەموو شتەکانی ناوی و دەرەوەیدا، کە لە ئاسمانەکانە، بۆ مرۆڤ ئافرێندراوە و دەستەمۆ کراوە؛ بۆیە مرۆڤ زۆر لەوە گەورەتر و بەنرخترە کە ببێتە بەندە و کۆیلەی شتێکی لە خۆ نزمتر و کەمتر، یان لانیکەم کەسێکی وەك خۆی کە هاوتا و هاوشان و هاوچەشنیەتی بەبێ جیاوازی؛ جا پێغەمبەر بێ یان دوژمنی پێغەمبەر، ئاقڵ بێ یان بێئاقڵ، عەجەم بێت یان عەرەب، سپیپێست بێت یان ڕەش، لە ڕۆژئاوا بێت یان ڕۆژهەڵات.[10] هەرکات

1 . (الزمر: 62-67)، (الغافر: 44)، (الأحزاب: 36) و...
2 . (الأعراف: 54).
3 . (الزخرف: 84).
4 . (الإسراء: 70)، (البقرة: 30).
5 . (هود: 61).
6 . (الجاثية: 13)، (لقمان: 20)، (إبراهيم: 32-34) و...
7 . (المؤمنون: 17)، (الروم: 30)، (الفاطر: 43).
8 . (الحشر: 19).
9 . (فصلت: 11)، (الروم: 26)، (الرعد: 15) و...
10 . (الإسراء: 23)، (التوبة: 30)، (الكهف: 110)، (المائدة: 17)، (النساء: 172) و...

مرۆڤ بەبێ مۆڵەت و ئیزنی خوا ملکەچی بەندەیەکی خۆڵقێنراوی وەك خۆی بێت، له ڕاستیدا دەبێتە بەندە و کۆیلەی ئەو کەسە، کە ئیسلام ئەوە بە کوفر و شیرك بۆ خوا لەقەڵەم دەدات و هیچ کەسێك ـ با پێغەمبەریش بێ ـ بۆی نییە کە لەخۆیەوە یاسا و بەرنامەی ژیان بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی دابڕێژێت، مەگەر خوا له ڕێگەی سرووشەوە کە سەرچاوەی کتێبە ئاسمانییەکانە ئەمری پێ کردبێت و ڕێگەی پێدابێت.[1] پەیامی هەموو پێغەمبەرانیش له ئادەمەوە بگرە تا خاتەم، هەموو بریتی بووە له: تەسلیمبوون بە خوای تاقانە، کە تەنها ئەو ڕەها و موتڵەقە. ئەوە له ئیسلامدا لووتکەی ئازادی و سەربەستییە. مرۆڤ بە پێی سروشتی خۆڵقێنراوی خۆی دەبێ له ژیانی خۆیدا شتێك یان کەسێك بپەرستێت و ملکەچی بێت، تەنانەت ئەگەر هەوا و هەوەسی دەروونیی خۆیشی بێت. مرۆڤ له ئیسلامدا چەند بەندەیەی موخلیس و بێگەردی خوا بێت، بەو ئەندازەش ئازاد دەژمێردرێت؛ چونکە بۆ مرۆڤ نییە کە ملکەچی کەسێکی وەك خۆی بێت، تەنانەت با ئەو کەسە لەو دەوڵەمەندتر و بەهێزتر و زاناتر و سپیتر یان چاوکاڵتر بێت! کەواتە بەندەی خوا بوون گەورەترین پلەوپایەیە کە مرۆڤ دەتوانێ زۆر بە ئاسانی وەری بگرێ؛ ئەویش تەنها له ڕێگەی ملکەچی بەرامبەر بە بەرنامەی خوای تاقانە. پەیوەندیی "مرۆڤ" لەگەڵ "خوا" له ئیسلامدا بریتییە له پەیوەندیی نێوان عەبد و خاوەن عەبد، بەڵام له یەهوودییەتدا بریتییە له پەیوەندیی دوو ڕکابەر و ململانێکەر![2] یان له مەسیحییەتدا بریتییە له پەیوەندیی نێوان باوك و کوڕ! یان له ئایینی هندۆ و بووداییدا بریتییە له یەکبوون و تێکەڵبوونی خالق و مەخلوق!

کەواتە وەڵامی ئیسلام بۆ ئەو دوو پرسیارە بریتییە له: (ئازادبوون له چی؟) واتە: ئازادی له هەموو کۆت و بەندێکی مرۆڤی و ماددیی غەیری خوا. (ئازادبوون بۆ چی؟) واتە: ئازادی بۆ لای بەرنامە و مەنهەجی خوا کە سوود و قازانجی هەموو مرۆڤەکان، بە ژن و پیاوەوە، بە عەجەم و عەرەبەوە، بە ڕەشپێست و سپیپێستەوە ڕەچاو کراوە و له پێناو ڕازیکردنی کەسێك، مافی کەسێکیتر پێشێل ناکات. هەموو بە لای خوا یەکسانن و کەس گەورەیی و فەزڵی بە سەر کەسەوە نییە... ئەوە پوختەی مانای ئازادیی دەروونییە له ئیسلامدا، بەڵام ئەگەر کەسێك نەیەوێت ببێتە بەندەی خوا و پشت له ئایین و بەرنامە و مەنهەجەکەی بکات و بڕوای پێ نەبێ

1 . (النحل: 51-52)، (الشورى: 21) و...

2 . بڕوانە: ئەفسانەی خۆلێکدانی یەعقووب و یەهوە (خوای بەنی ئیسرائیل) له کتێبی تەورات، دەروازەی سیودووەم له سفری ئافراندن (تەکوین): (24- 30).

ۆ لە ڕووی فیکری و هزرییەوە قەناعەتی بۆ دروست نەبێ، ئیسلام چۆن مامەڵەی لەگەڵ دەکات؟ ێرەیە کە باسی "ئازادیی دەرەکی" لە ئیسلامدا دێتە پێش:

دووەم) "ئازادیی دەرەکی" بریتییە لە: ئازادی لە بیروباوەڕ و ئایین، ئازادی لە هزر و شێوازی بیرکردنەوە، ئازادیی قسەکردن و ڕادەربڕین، ئازادی لە کردەوە و چالاکیدا، ئازادیی لە هەموو هەڵبژاردنێك لە ژیاندا. قورئان زۆر بە وردی باس لەو جۆرە ئازادییانە دەکات و دەڵێت: لە سیستمی ئافراندندا، هەڵبژاردنی عەقیدە و بەرنامە بە زۆر و ناچاری نییە؛ هەموو مرۆڤێك ئازاد خەڵق کراوە و دەبێ لەسەر ئەم دونیایە ئازادانە بژێ و هەر ڕێگا و عەقیدە و ئایین و بەرنامەیەکی دەوێ، بە حەزی خۆی بۆ خۆی هەڵیبژێرێت، بەڵام لە دواڕۆژدا بەرپرسیارە و وەڵامی ئەو هەڵبژاردنانەی دەداتەوە؛ بۆ نموونە دەڵێت: هەر کەس دەیەوێ با ئیمان بێنێ و هەر کەسێکیش نایەوێ با کافر بێت.[1] کەس بۆی نییە، تەنانەت پێغەمبەریش، کە خەڵك ناچار بکات ئیمان بێنن؛[2] چونکە هیچ زۆرداری و ناچارییەك نییە لە هەڵبژاردنی ئایین و عەقیدەدا.[3] ئیسلام پێی خۆشە کە هەموو خەڵك ئیمان بهێنن و بچنە بەهەشتەوە،[4] بەڵام کەسیش بە زۆری ناباتە بەهەشتەوە. ڕێگا، دیارە و هەموو شت ڕوون کراوەتەوە، ئەوە تاکە کە خۆی بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت. لە ڕاستیدا، ئایین و ئیمان و عەقیدە، بابەتی دەروونین و پەیوەندیی بە ڕۆح و دڵ و ناخ و قەناعەتی مرۆڤەوە هەیە و، هەروەکچۆن بە ڕیاکاری و دووڕوویی (نفاق) قبووڵ ناکرێت،[5] بە نابەدڵی (إکراه) و زۆر (إجبار)یش بەدی نایەت. ئیمان، پەیمان و پابەندییەکی دەروونییە کە مرۆڤ بە ئیرادە و ویستی خۆی لە ناخەوە قبووڵی دەکات؛ بۆیە ئیسلام، ئیمانی بە ناچاری و بە زۆرەملێ قبووڵ ناکات، بەڵکو بە "تەسلیمبوون و خۆبەدەستەوەدان" ناوی دەبات.[6] ئازادیی هەڵبژاردنی ئایین و عەقیدە و بیروباوەڕ بە "ئازادیی تەکوینی" ناو دەبردرێت. هەر لەم کایەیەوە، ئازادییەکیتر هەیە کە پێی دەگوترێ: "ئازادیی تەشریعی"؛ بەو مانایە کە هیچ کەسێك بۆی نییە خۆی سەرووتر و گەورەتر لە کەسێکی دیکە بزانێ و مافی نییە کە خەڵك بکاتە بەندە و کۆیلەی خۆی و، ئیرادە و خواستی خۆی بە پێچەوانەی ئیرادە و خواستی ئەوان، بەسەریاندا

1 . (الکهف: 29)، (المزمل: 19)، (الإنسان: 3).
2 . (یونس: 99)، (القصص: 56)، (ق: 45)، (الأنعام: 66)، (الإسراء: 65)، (الفرقان: 43)، (الزمر: 41) و...
3 . (البقرة: 256) و (الأنعام: 149) و...
4 . (البقرة: 208).
5 . (المنافقون: 1-3) و...
6 . (الحجرات: 14).

بسەپێنێ و وەك قورئان دەفەرمێ ببێتە گەورە و ئەربابی خەڵك؛[1] چونکە لە ئیسلامدا مرۆڤەکان هەموویان بێهەڵاوێژکردن و جیاکردنەوە، لە مافدا یەکسانن و کەس لە کەسێکی دیکە بەرزتر نییە. بەڵام ئەگەر کەسێك بیەوێ لە جیاتی شەرعی خوا، شەرعێکیتر هەڵبژێرێ و بەدڵ ملکەچی بەرنامەکانی بێ، ئەوا دیسان ئازادە و کەس بۆی نییە ڕێگریی لێ بکات، تەنانەت با هەوا و هەوەس و ئارەزووکانی بپەرستێ.[2] قورئان زۆر بە ڕاشکاوی باسی ئەم تاقمە مرۆڤانە دەکات و دەڵێ کە لە ڕۆژی دواییدا، ئەمانە زۆر پەشێمان دەبنەوە و خۆزگە دەخوازن کە هەرگیز کەسێکی وەك خۆیانیان نەکردایەتە گەورەی خۆیان، کە لەو دونیایەدا ببوونە پاشکۆ و کۆیلە و ژێردەست و گوێڕایەڵی ئەوان؛ بە شێوەیەك کە حەلاڵ و حەرامی خۆیان بەدەستی ئەوان سپاردبوو؛[3] چونکە لە ئازادیی تەشریعی، ڕاستە کە مرۆڤ لەم دونیایەدا ئازادە کە هەر شەرع و یاسایەکی بیەوێ هەڵبژێرێ، بەڵام ڕاشدەگەیەنێ و هوشداری دەدات کە: لادان لە یاسا و شەرعی خوا، واتای دەرچوونە لە بەندایەتی و عبوودییەتی خوا.[4] دەرچوون لە بەندایەتیی خواش، زوڵم و ستەمە لە خودی خۆی؛[5] چونکە بەهۆی ئەم گومڕاییەوە، دەڕواتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.[6] هەروەك خوا لە قورئاندا دەفەرمێ: "ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون، ئاواتەخواز دەبن کە خۆزگە موسڵمان بوونایە؛ بۆیە (لەو دونیایەدا ئازادن کە چی بکەن و) وازیان لێ بێنە با هەرچی دەیانەوێ بخۆن و ڕابوێرن و هیوا و ئاواتیان سەرگەرم و بێئاگایان بکات، سەرئەنجام خۆیان دەبیننەوە لە ڕۆژی قیامەت کە چییان بەسەر دێت".[7] هەروەها لە دەیان ئایەتدا بە بەرفراوانی باسی ئازادیی بیرکردنەوە (تفکر) و ژیری و ئاوەز (تعقل) و بەڵگەهێنانەوە (برهان) دەکات؛[8] چونکە پێی وایە، مرۆڤ بەو بیرکردنەوە و ئەندێشەوە مرۆڤە و، لە گیانلەبەرەکانی دیکە جیا دەبێتەوە؛[9] بۆیە بەبێ ئازادی لە ئەندێشە و بیرکردنەوەدا، هزر و ئەندێشە هیچ مانایەکی نابێ و هەروەك چۆن ملکەچبوونی

---

1 . (آل‌عمران: 64)، (التوبة: 31)، (یوسف: 39).
2 . (الفرقان: 43).
3 . (الأحزاب: 67-68)، (البقرة: 166-167)، (آل‌عمران: 100-101).
4 . (الشورى: 21).
5 . (الطلاق: 1).
6 . (الأحزاب: 36).
7 . (الحجر: 2-3).
8 . بڕوانە ئەو ئایەتانەی کە دەڵێن: (أفلا تتفکرون؟)، (أفلا تعقلون؟)، (أفلا تذکرون؟)، (أو لم ینظروا؟)، یان (قل هاتوا برهانکم...!)؛ وەکو: (الأنعام: 50)، (البقرة: 76)، (الأنبیاء: 10)، (الذاریات: 20-21)، (هود: 30)، (الأعراف: 185)، (البقرة: 111)، (الأحقاف: 4) و...
9 . (الإنسان: 2)، (الإسراء: 36).

مرۆڤ بەرامبەر هزری کەسێك بەبێ چۆناوچۆنکردن و لێکۆڵینەوە بە "لاساییکردنەوە" (تقلید) دەزانێ و زۆر سەرکۆنەی دەکات، ملکەچبوونی زۆردارنەش بەرامبەر بە هزرێك، بە کۆیلایەتی و دیکتاتۆری دادەنێ، کە ئیسلام لە ڕیشەوە دژیەتی.[1] لە ئیسلامدا تاك ئازادە بەرامبەر هەر بابەتێك کە دەیەوێ قسەی لەبارەیەوە بکات و ڕاوبۆچوونی خۆی دەرببڕێت، ئەگەر پێچەوانەی ڕاوبۆچوونی پێغەمبەریش بێت.[2] ئەو هەموو جەختکردنەوەیە لەسەر "شورا"،[3] "ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە"،[4] "دووری لە چاولێکەری و زەمکردنی"، "ئیجتیهاد لە دین و دونیادا"، هەموو نیشانەری ئازادیی ڕادەربڕینە لە ئیسلامدا.[5] پێغەمبەر ـ د.خ ـ دەفەرمێ: "گەورەترین جیهاد، قسەیەکی دادگەرانەیە بەرامبەر حاکمێکی زۆردار و چەوسێنەر"،[6] نێردراوی سوپای ئیسلام "ربعی کوڕی عامر" ـ ر.خ ـ بەرامبەر فەرماندەی سوپای ئێرانییەکان لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتابدا ـ ر.خ ـ کە ئەو پرسیارەی لێی کرا: "بۆچی هاتوونەتە ئێرە؟"، دەڵێ:

"خوای گەورە ئێمەی ناردووە تاکو ئەو بەندانەی کە ئەو دەیەوێ، لە پەرستش و عیبادەتی بەندەکانی خوا ڕزگار بکات و بیانبات بۆ پەرستن و عیبادەتی خوای بەندەکان، هەروەها لە تەنگی و ناخۆشیی دونیا بۆ لای دڵخۆشی و فراوانییەکەی و، لە ستەمی ئایینەکان بۆ لای دادپەروەریی ئیسلام."[7]

قورئان جەخت لەسەر ئەم جۆرە ئازادییانە دەکاتەوە و دەڵێ: مژدە بدە ئەو بەندانەی من، کە گوێ لە هەموو قسەیەك دەگرن و، باشترینیان هەڵدەبژێرن.[8] هەروەها لە دەیان ئایەتدا، ئاماژە بە ئازادیی کار و کردەوە و هەڵسوکەوت و چالاکی دەکات. مرۆڤ ئازادە هەر کارێکی پێ خۆشە بیکات،[9] بەڵام خوا، کاری باش و پەسەند، بە خێر و چاکە دەزانێ و بکەرەکەی دەباتە بەهەشتەوە و، کاری خراپیش بە گوناه دەژمێرێت و ئەگەر تەوبە نەکات و لێی پەشیمان

---

1 . (البقرة: 170)، (الزخرف: 22-23)، (الإسراء: 72)، (لقمان: 21) و...

2 . بڕوانە ژیاننامەی پێغەمبەری ئیسلام ـ د.خ ـ کە چۆن ئەسحابەکەی ـ ر.خ ـ لە پرسە جیاجیاکاندا ئازادانە ڕاوبۆچوونی خۆیان تەنانەت دژی ڕاوبۆچوونی پێغەمبەریش ـ د.خ ـ دەربڕیوە و ڕای ئەوانیش قەبووڵکراوە.

3 . (آل‌عمران: 159)، (الشورى: 38)، (النمل: 32)، (البقرة: 233).

4 . (آل‌عمران: 104)، (التوبة: 71 و 112)، (المائدة: 79).

5 . بڕوانە: کریم، عماد محمد (2006): "**حرية الرأي و التعبير: تنميتها و ضوابطها من منظور إسلامي**"؛ أربيل: مكتب التفسير للنشر و الإعلان؛ صص 14-91.

6 . ﴿إن من أعظم الجهاد كلمه عدل عند سلطان جائر﴾. (رواه الترمذي و إبوداود و إبن ماجه).

7 . عماد محمد كريم؛ المصدر نفسه؛ صص 28-29.

8 . (الزمر: 17-18).

9 . بڕوانە ئەو ئایەتانەی کە دەفەرمێ: (إعملوا ما شئتم...) وەکو: (فصلت: 40).

نەبێتەوە، تووشی ئاگری دۆزەخ دەبێت. لە ڕووی سیاسیشەوە، مرۆڤەكان ئازادن كە چ كەسێك دەكەن بە سەرۆك و گەورە و دەسەڵاتداری خۆیان، بەو مەرجەی كە دیكتاتۆر نەبێ و خەڵك بە كۆیلەی خۆی نەزانێ و حەڵاڵ و حەرامی خەڵك بەدەست خۆیەوە قۆرخ نەكات. لە ئیسلامدا بنەمای حوكم سێ شتی نەگۆڕن و لە هیچكامیان خۆش نابێ: یەكەم: عەدڵ و دادگەریی لە فەرمانڕەوایەتیدا. دووەم: حوكمی پرس و ڕاوێژ (شورا). سێیەم: دەنگدانی ئازادانە (بەیعەت). هەر فەرمانڕەواییەك كە لەسەر ئەم سێ بنەمایە دامەزرێ بە فەرمانڕەواییەكی دادپەروەر و تەندروست و تەمەندرێژ ناوی لێ دەبات؛ چونكە لە سایەیدا كەس زوڵمی لێ ناكرێت و ناچەوسێنرێنەوە، هەروەها بە شێوەیەكی دوور لە دیكتاتۆری و تاكەهێزی و حوكمی بنماڵەیی و بۆماوەیی، حوكمێكی پەرلەمانی و شورایی دەگێڕێت.[1]

پرسیار ئەوەیە: هەموو ئەم ئازادییانە لە ئیسلامدا، ئایا سنووردارن یان بە شێوەیەكی ڕەها و لیبراڵین؟ ئیسلام لەبەر ئەوەی ئایینی هاوسەنگی و میانەڕەوییە، بەو واتایەی كە لە نێوان هەموو پەیوەندییە دووانەییەكانی: (تاك و كۆمەڵگا)، (ژن و پیاو)، (ڕۆح و جەستە)، (دونیا و دواڕۆژ)، (دین و ژین)، (عیبادات و موعامەلات)، (نەگۆڕ و گۆڕاوەكان)، (ئیمان و كردار)، (زانست و ئەخلاق)، (ئەرك و ماف)، (وەحی و ئەقڵ)، (مادده و مەعنا)، (دەق و ئیجتیهاد)، (هەژار و دەوڵەمەند) و هتد، هاوتەرازی و هاوكێشەیی دروست دەكات، لە نێوان (ئازادی و بەرپرسیارییەتی)ش هاوسەنگییەك دروست دەكات، بۆ ئەوەی ئازادییەكانی تاك و كۆمەڵگا تێك نەشكێن و لە مومارەسەكردنی ئازادییەكاندا، نە تاك و نە كۆمەڵگاش زەرەرمەند و زیانبار نەبن؛ چونكە لە ئیسلامدا زەرەر و زیان لە خودی تاك و لە تاكەكانی دیكەش، قەدەغە كراوە و تاك بۆی نییە كارێك بكات كە زیان بە تاكەكانی دیكە بگەیەنێت؛[2] بۆ نموونە: تاك ئازادە كە حەرامێك ئەنجام بدات وەك مەیخواردنەوە یان زیناكردن، بەڵام بۆ ئەوەی تووشی سزای كۆمەڵگا نەبێتەوە، پێویستە لە شوێنێكی دوور لە چاوی خەڵك، وەك ماڵی خۆی بیكات، كە لەو حاڵەتەدا كەس بۆی

1 . بۆ زانینی ئازادییە سیاسییەكانی مرۆڤ و تایبەتمەندییەكانی حوكم لە ئیسلامدا، بڕوانە: المطيري، د. حاكم (2007): **"ئازادی یان تۆفان"**؛ وەرگێڕانی: فاتح محەممەد سەنگاوی؛ هەولێر: نووسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوكردنەوە و ڕاگەیاندن.

2 . ﴿لا ضرر و لا ضرار فی الإسلام﴾؛ واتە: زیانگەیاندن نە بە خود و نە بە كەسانی دیكە لە ئیسلامدا نییە. (رواه إبن ماجه و الدارقطني و الإمام مالك).

ـیـە ئازادییەکانی لێی زەوت بکات. ئەو بۆ خۆی گوناه دەکات و گیرۆدەی (حق الله) و (حق النفس) دەبێتەوە، نەك (حق الناس).[1]

### 2.3- ئازادیی ژنان، وەك داواکاریی فێمێنیستان و دیکتاتۆریی ئازادیکوژ:

هەموو مەبەستم لە هێنان و تاوتوێکردنی مانای ئازادی لەو تەوەرەدا ئەوە بوو کە بگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە ئێستا دەمەوێ بخەمە ڕوو: بەپێی ئەم تێگەیشتنە لە چەمکی "ئازادی" کە باسمان کرد، ناکرێ لایەنێك (جا کەسێك بێت، یان گروپێك)، لایەنەکانی دیکەی کۆمەڵگا ناچار بکات ملکەچی خواست و داواکاری و دروشم و ئەجیندا و بەرنامەکانی بن و پێی ڕازی بن، هەرچەندە ئەو لایەنە تێگەیشتووتر، لێهاتووتر، زاناتر، پرۆفیشناڵتر، خەمخۆرتر و دڵسۆزتریش بێت، یا بەرنامە و دروشمەکانیشی باشتر و کارامەتر و گونجاوتر و کامڵتر و ئایدیاڵتر بێت؛ چونکە ئەمە ڕێك دژی ناوەڕۆکی ئازادییە، کە خۆی لە ویست و ئیرادەی سەربەستانەی کەسەکاندا دەبینێتەوە، نەك ویست و ئیرادەی کەسێك بۆ کەسێکی دیکە. نابێ ویست و حەزی کەسێك یان کەسانێك، هەرچەند بلیمەت و نوخبەش بن، بکرێتە پێوەر و یاسا و، بەسەر خەڵکی کۆمەڵگادا بسەپێنرێت، کە لەگەڵ ویست و خواستیان یەکانگیر نین. پێم وایە ئەمە جۆرێکە لە "نوخبەگەرایی"* (Elitism) کە ئیرادەی کەسێك، یان چینێك، یان توێژێك، یان گروپێك، یان ڕێکخراوێك، بەسەر خەڵکی عەوام و ئاساییدا دەسەپێنێت؛ وەکو ئەو پزیشکەی کە نەخۆشەکەی ناچار دەکات بە زۆرەملێ نەشتەرگەریی بۆ بکات، هەرچەندە ئەو نەشتەرگەرییەش لە خزمەتی

1 . باشترین نموونە ئەوەیە کە: "مسوەری کوڕی مەخرەمە لە عەبدولرەحمانی کوڕی عوف ـ ر.خ ـ دەگێڕێتەوە: "من و عومەری کوڕی خەتتاب شەوێك پێکەوە لە مەدینە پاسەوانیمان دەکرد کە گوێمان لە دەنگی بەرزی هەندێ کەس بوو لەماڵێکەوە کە سەرخۆش بوون و خەریکی خواردنەوەی مەی بوون، کە نزیك بووینەوە، عومەر وتی: ئەی عەبدولرەحمان! دەزانی ئەوە ماڵی کێیە؟ وتم: نە! وتی: ئەوە ماڵی "ڕەبیعەی کوڕی ئومەییەی کوڕی خەلەفە" و خەریکی خواردنەوەی مەین، چی بکەین؟ عەبدولرەحمان وتی: ئەی خوای گەورە ئەهیمان لێناکات کە سیخوڕی نەکەین (ولا تجسسوا)؟ ئێمە ئێستا وا سیخوڕی دەکەین! عومەر وتی: وایە، ڕاست دەکەی! و بەجێمان هێشتن". بڕوانە: أخرجە عبدالرزاق فی المصنف (231/10)؛ ومن طریقە الحاکم فی المستدرك (419/4)؛ والبیهقي فی السنن الکبری (333/8).

* "نوخبەگەرایی" یان "بژاردەتەوەری" ئاراستەیەکە کە بەپێیەوە، ژمارەیەکی دیاریکراو لە تاکەکان وەك نوخبە و بژاردەیەك لە ناو کۆمەڵگادا جیا دەکرێنەوە، کە دەشێ خاوەن پێگەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی تایبەت، یان سەر بە بنەماڵەیەکی پایەبەرز بن، یان بە هەبوونی زیرەکی و لێهاتوویی، سەرمایە، زانست، پسپۆڕیی، یان ئەزموونێکی بەرز و باڵا، یان کۆمەڵێك سیفەتی دیکە لە خەڵکی ئاسایی دیکەی کۆمەڵگا جیا دەکرێنەوە؛ بۆیەش کاریگەریی یان هەژموونیان لە تاکەکانی دیکە زیاترە و، دیدگا و بۆچوونیان سەبارەت بە هەر بابەتێکی دیاریکراو لە هی تاکەکانی دیکە زیاتر گرنگی پێ دەدرێت و بە جددیتر وەردەگیرێت. بۆچوونەکانی ئەم تاقمە لە تاکەکەسەکانی کۆمەڵگا لەوانەیە لە سوود و قازانجی کۆمەڵگادا بێت، یان پسپۆڕی و توانایی و ئەقڵییەتەکەیان، بیانکاتە ڕێبەر و پێشەوا و بەڕێوەبەری کۆمەڵگا.

خودی نەخۆشەکەدا بێت و ژیانیشی لە مەترسیی ڕزگار بکات! پێم وایە دروشم و داواکارییەکانی فێمێنیزمیش بۆ ژنانی ئاسایی کە بڕوایان بە فێمێنیزم نییە، یان نەگەیشتوونەتە ئاستی هۆشیاریی فێمێنیستەکان، یان وەکو ئەوان بیر ناکەنەوە و، ناشیانەوێ وەکو ئەوان بیر بکەنەوە و، بەڵکو جیهانبینیی جیاواز، ڕەفتاری جیاواز، بەرنامەی جیاواز و پێناسەی جیاواز بۆ ژیانی خۆیان هەڵدەبژێرێن، خۆیلەخۆیدا جۆرێکە لە "دیکتاتۆریی ئازادیکوژ" و سەپاندنی ویست و حەزی چەند نوخبەیەکە بەسەر زۆرینەی ژنانی کۆمەڵگادا، کە باش یان خراپ نایانەوێ وەکو ئەوان بژین، یان وەکو ئەوان بیر بکەنەوە ؛ بۆ نموونە: لە دیالۆگی نێوان دوو فێمێنیستی بەناوبانگ "بتی فریدن" و "سیمۆن دوبوڤار"دا هاتووە کاتێك "فریدن" بە دوبوڤار" دەڵێ:

"من پێم وایە ژنان ئەو مافەیان هەیە کە ئەگەر بیانەوێ لە ماڵدا بمێننەوە و منداڵەکانی خۆیان گەورە و پەروەردە بکەن."[1]

"دوبوڤار" بەم شێوەیە وەڵامی دەداتەوە:

"هەرگیز! ئێمە نابێ ئەو مافەیان بۆ قایل بین. هیچ ژنێك نابێ مانەوە لە ماڵدا هەڵبژێرێت و خۆی خەریکی منداڵداری بکات؛ چونکە کۆمەڵگا پێویستە لە بناغەوە بگۆڕدرێ؛ ئەگەر ژنان ئەم دەرفەتەیان بدرێتێ، زۆربەی هەرە زۆریان هەڵدەخەڵەتێندرێن و ئەم ڕێگەیەی هەڵدەبژێرن."[2]

ئەم تاقمە فێمێنیستانە پێیان وایە کە ئەم چەشنە سیاسەت و ڕێگەچارەی وشك و توندڕەوانە بۆ ڕێگریکردن لە ژنان لە هەڵبژاردنی ژیانێکی نەریتی، شتێکی واجب و پێویستە، بەڵام لە مەیدانی پراکتیکیدا، ئەگەر داوایان لێ بکەین چۆن پراکتیزەی دەکەن، هیچ ڕوونکردنەوەیەکی ورد و عەمەلی پێشکەش ناکەن؛ چونکە دەزانن کە هەبوونی کۆمەڵگایەکی یوتۆپیای "تەواو جیاواز"، کە ئامانج و ئایدیاڵی سەرەکییانە، پێوست بەوە دەکات کە ژنانێکی خۆبەخش و فیداکار، لە ڕێگەی بەکارهێنانی زەبروزەنگ و هێز و فشار، بەرامبەر بەو هەموو ژنانە بوەستنەوە کە دەیانەوێ مێرد بکەن و لە ماڵەوە بۆ خۆیان منداڵداری و بنەوانەیی و کابانی بکەن. دەتوانین ئەم دیدگایە بەوە تۆمەتبار بکەین، کە ئەگەر ژنان لە کۆمەڵگا نەریتییەکان و تەنانەت مودێرنەکانیشدا، بە کۆمەڵایەتی بێن و پەروەردە بکرێن، شتانێك داوا دەکەن کە بە بڕوای

1 . Sommers, Christina Hoff (1995), **"Who Stole Feminism?: How Women Have Betrayed Women"**, New York: Simon & Schuster, p. 304.

2 . Ibid.

فێمێنیستەکان بە تایبەتی ڕەوتی ڕادیکاڵ و جێندەر و ئیگزیستانسیالیستەکان، نابێ داوای بکەن؛ چونکە بە بۆچوونی ئەم فێمێنیستانە، خواست و داواکارییەکانی ژنان، هەمان شتە کە بەهۆی پەروەردەیەکی نارێك و ناتەندروست لە کەشوهەواو و سیستەمێکی پیاوسالارانەدا ناچار کراون و لێی ڕاهێنراون؛ بۆیە هەوڵ دەدەن بە شێوەیەکی گشتی هەموو پێوەر و بەهاکانی زۆرینەی ژنانی کۆمەڵگا ڕەت بکەنەوە و دژی بوەستنەوە. ئەوان وا دەزانن ژنانی نەریتی و ئاسایی وەکو ئەو منداڵە خراپکارانەن، کە پەروەردەیەکی مزیر و ناتەندروستیان بینیوە و لەوانەیە بۆ خۆیان شتێك هەڵبژێرن کە بە زەرەر و زیانیان تەواو بێت. پێم وایە ئەمە خۆیلەخۆیدا دژی "ئازادی" و "سەربەستی"یە؛ چونکە فێمێنیستەکان بە هەبوونی ڕوانگەیەکی "نوخبەگەرایانە" و "ئەربابئاسا" دەیانەوێ دیدگای چەند ژنە نوخبەیەك بەسەر هەموو ژنە ئاساییەکانی دیکەی دونیادا بسەپێنن، کە هەرگیز حەز ناکەن وەکو ئەوان بژین و وەك ئەوانیش بیر بکەنەوە؛ بێگومان ئەم ڕێگەچارەیە دیکتاتۆرییەکی ئازادینەخوازە و لە دژی ئازادییەکانی ژنە ئاسایی و نابژاردەکان دەوەستێتەوە و مافە تاکەکەسییەکانیان لێ زەوت دەکات.

•

### 2.4- قەفەسەکان لە ڕوانگەی فێمێنیستە کوردەکانەوە:

لە کۆبەندیی قسەکان و بیروبۆچوونەکانیان و لە میانەی دۆزینەوەی وەڵامەکانیان بۆ دوو پرسیارە سەرەکییەکەمان، دەتوانین مەبەستیان لە ئازادیی ژنان بزانین؛ وەڵامی زۆربەیان بۆ پرسیاری یەکەم ئەوەیە کە ئازادی (لە): بەند و قەفەسی سیستمی پیاوسالاری، ئایین، دابونەریتی کۆمەڵایەتی و کولتووری؛ هەروەك لە ئەنجامی ئەو ڕاپرسییەی کە کوردێکی نیشتەجێی وڵاتی سوید، ساڵی (2010) بە ناونیشانی "ئاستەنگیەکانی پێشکەوتنی ئافرەتی (ژنان و کچان) ڕەوەندی کورد" کردوویەتی و وەك ڕاپۆرتێك بڵاوی کردووەتەوە و دەڵێت: باوکسالاری، دابونەریت و ئایین، وەك دژوارترین بەربەست بەرامبەر پێشکەوتنی ئافرەتی ڕەوەندی کوردە لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا، کە نموونەی لێکۆڵینەوەکە (150) ئافرەتی (15) ساڵ تاکو (65) ساڵ بووە.[1]

ئەم ژنە فێمێنیستەش، کە بەرپرسی کۆمەڵەیەکی ژنانە لە کوردستان، دەڵێت:

---

1 . ئاسۆ بیارەیی (2010)؛ "ئاستەنگیەکانی پێشکەوتنی ئافرەتی (ژنان و کچان) ڕەوەندی کورد": لە ماڵپەڕی:
http://derunnasy.com

"...کۆمەڵگای کوردیش وەك دەزانین دەسەڵاتی دین و پیاوسالاری و عادەت و تەقالیدی چەقبەستووی تێدا زۆرە، بۆیە تەحەممولی ئەوە ناکات کە ژنێك ئازادانە داوای مافی خۆی بکات."[1]

کەواتە بەپێی بۆچوونی ڕۆشنبیرە فێمێنیستەکان، سێگۆشەی پێکەوەگرێدراوی سیستمی پیاوسالاری، ئایین، دابونەریت هۆی کێشەکان و بەدبەختی و ئازارکێشان و چەوسانەوەی ژنە:




هەروەها وەڵامی هەرهەموویان بۆ پرسیاری دووەمیش بریتییە لە: ئازادبوون (بۆ) لای مودێرنیتە، بۆ لای ژیانی وەك ژنە ئەوروپاییەکان! واتە ڕێگەچارە و ئەلترناتیڤی ئەوان نموونەی کۆمەڵگای ڕۆژئاواییە کە گوایە سیستمی پیاوسالاری لەوێ ئاسەواری نەماوە و بووەتە مرۆڤسالاری، ئایین بە تەواوەتی لە ژیانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، خێزانی، ئابووری، کولتووری، پەروەردەیی و ژینگەیی دوور خراوەتەوە و تەنها وەکو هێمایەك لە کەنیسە، ئەویش هەندێ کەنیسە نەك هەموویان، ئازاد کراوە کە ڕۆڵێکی وەك پەککەوتوانی بێسەروبەر دەبینێ، هەروەها نەمانی دابونەریت، بە هاتن و زاڵبوونی مودێرنیتە بە سەر ژیانی کۆمەڵگادا بە تێکڕایی و بە شێوەیەکی زۆر پتەو و بەرفراوان کە هیچ کەس لە ژێر سێبەرەکەی تەنانەت توانای دەربازبوونی نییە!

لێرە باسی یەك‌یەك لەو کۆت و بەندانە دەکەین کە بە بۆچوونی زۆربەی ڕۆشنبیران و فێمێنیستەکان بەربەستی ئازادیی ژنی کوردن و لەمپەری ڕێی گەیشتن بە کاروانی ژنە پێشکەوتوو و بەختەوەرەکانی ئەوروپان، کە دوای کۆی وتارەکانیان تایبەت بە هەر کۆت و قەفەسێك، وەڵامەکان و تێبینییەکان و شیکردنەوەکانمان دەخەینە ڕوو و تاوتوێیان دەکەین:

---

1 . ڕاپورتی هاوڕێ گەرمیانی (2014/5/9): "ژن کوشتن کێی لێی بەرپرسە؟": چاوپێکەوتن لەگەڵ "هاوژین حەمە ڕەشید": بەرپرسی کۆمەڵەی ئافرەتانی کوردستان لە قەزای پشدەر؛ لە ماڵپەڕی ئێستانیوز: http://www.estanews.com

**2.4.1- قەفەسی پیاوسالاری:**

هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێ کرد، ڕەوتی فێمێنیستە ڕادیکاڵەکان سەرچاوە و فاکتەری هەموو جەوساندنەوەکانی ژنان دەگەڕێننەوە بۆ سیستەمی پیاوسالاری. فێمێنیستە ڕادیکاڵەکان، زاڵبوونی ئەم سیستم و دیدگایە بە سەر کۆمەڵگای کوردیدا، بە گەورەترین هۆکاری بناغە و قەوارەی جیاکاری و نایەکسانیی کولتووری و کۆمەڵایەتیی دژ بە ژنان دەزانن. ئەم تێڕوانینە هەندێ جار دەگاتە ئەو ڕادەیە کە یەخەی پیاوان (وەك ڕەگەزی نێر) دەگیرێت لە دروستکردن و سەپاندنی ئەو سیستمە لە ناو کۆمەڵگادا. لە کۆتاییەکانی ساڵی (2008)دا، هەفتەیەك ڕاگەیەندرا بۆ وەستان بەرامبەر توندوتیژی دژ بە ژنان، کە لە زۆربەی کۆڕ و سمینارەکان لە جیاتی وشەی "پیاو"، وشەی "سمێڵزلەکان" بەکار دەهێنرا لە لایەن پێشکەشکار و وتارخوێنەکانەوە![1] فێمێنیستێکی ڕادیکاڵ دەڵێ: "هۆکاری سەرەکیی زۆربوونی کێشە کۆمەڵایەتییەکان پیاوانن".[2] یەکێکیتر، لە مێزگردێکی تەلەفزیۆنیی تایبەت بە بابەتی ژناندا، لە کەناڵێکی ئاسمانیی کوردییەوە، لە ڕقی یاسای فرەژنی بە تەشەردانێك، پێی وابوو سەرچاوەی ئەو جۆرە یاسا و کێشانەی بەرۆکی ژنی کوردیان گرتووە، پیاوی هەوەسبازی کوردە![3] ئەمجۆرە تێڕوانینە ڕەشبینانەیە بەرامبەر بە پیاوی کورد (سەرەڕای نەحەوانەوەیان بێ بوونی ڕەگەزی نێر لە ژیانیاندا)، ئەوەمان بۆ دەردەخات کە بە فریودان و هەڵخەڵەتاندن، سینگی خۆیان بۆ ژنان دەکوتن و خۆیان کردووەتە داژیاری ئەوان، کەچی یاری نەفسێنە و، بۆچوون و قسە و کردەوەیان لەگەڵ ئامانج و مەبەستیان یەك ناگرێتەوە و جۆرێك لە پەتای "دووڕوویی ڕۆشنبیری"یان پێوە دیارە کە نیشانەی گرێی دەروونی ـ فیکرییە.

سیستمی پیاوسالاری، بەپێی پێناسەی فێمێنیستەکان، بریتییە لە:

> "سیستمێکی کۆمەڵایەتی کە ژن لە بنەڕەتدا ژێردەست و پلەنزمترە لە پیاو، دەسەڵاتی ناو خێزان و دەرەوەی ناو ماڵ وەك دیارکردنی نۆرمە کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووری و فەرهەنگییەکان، لە دەست پیاو دایە؛ بەو مانایە کە پیاوان هەم لە بواری تایبەتی و تاکەکەسیدا، هەم لە بواری گشتی، کۆمەڵایەتی و سیاسیشدا دەسەڵاتی باڵایان هەیە و ڕەوت و پێوەر و چوارچێوەکانی کۆمەڵگا دیاری دەکەن."[4]

1 . بڕوانە: بێدار فارس عەزیز و نیگار دلێر ئەحمەد؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 71.
2 . ئەڵماس مستەفا (2010)؛ لە ماڵپەڕی ئەمڕۆی زانکۆ؛ وەرگیراوە لە: فەرمان خەرابەیی؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 58.
3 . کەناڵی ئاسمانیی ڕووداو (2014/1/18)؛ "**بەرنامەی لەگەڵ ڕەنج**"؛ تەوەری بەرنامە: سەبارەت بە پڕۆژەی هاوسەرگیریی مسیار.
4 . چەمکی باوکسالاری لە ماڵپەڕی تریبۆنی فمنیستانی کورد:
http://kurdishfeminists.com/read.php?id=1054

**لایەنی خێزانی و کۆمەڵایەتی:** هەندێکی‌تر پێیان وایە کە ڕۆڵی دایکایەتی، هاوسەرێتی، ئەرکەکانی کابانی و ماڵداری بەرهەمی سیستمی پیاوسالارییە:

"... ژنان بۆ زاوزێ و دەرهێنانی منداڵان و دابینکردنی پێداویستییە سێکسی و عاتیفییەکانی پیاو دروست کراون و پیاویش بۆ کارکردن لە دەرەوەی ماڵ و چاودێری و پاسەوانی لە ژن و منداڵان خەڵقکراوە. یەکەمی بوونەوەرێکە تایبەت بە مەیدانی ناوەکی نێو ماڵ و خێزاندا، دووەمی تایبەتە بە مەیدانی دەرەکی نێو کۆمەڵگا... سیستمی پیاوسالاری، ژن دەکاتە کۆیلەی پیاو... تەنانەت بڕیاری ژیان و مانەوەی بۆ دەردەکات... کێشەکانی ژنان لە جیهاندا بە جیاوازی ئایینی و نەتەوەیی و پلەوپایەی کۆمەڵایەتیشەوە، لە یەك بنەماوە سەرچاوە دەگرن، ئەویش کونترۆڵی دەسەڵاتی پیاوسالارە بە سەر هەموو بوارەکانی ژیاندا... ئەو عەقڵییەت و دەسەڵاتە هیچ ڕێگا بە هاتنە مەیدانی ژن نادات بۆ بەشداریکردن لە سیستمی بەڕێوەبەریدا، ئەگەر بوارێکیشی بۆ بڕەخسێنێت مەرجی مانەوە و خولانەوەیەتی لە چوارچێوەی ئەو دەستوور و یاسایانە کە خودی خۆی دایڕشتووە... لەو جۆرە وڵاتانەدا و لە هەرێمی کوردستانیشدا بۆ نموونە، بوونی ژن لە پەرلەمان و پلەوپایەی بەڕێوەبردندا وەڵامدەرەوەی داخوازییەکانی ژنان نین و ناتوانێت گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ لە باروودۆخی ژنان بهێنێتە ئاراوە."[1]

ئەم خاتوونەش دەڵێت:

"... ئەی لەم سەردەمەی جیهانگیری کە گوتاری تایبەت بە ئازادی و مافی مرۆڤ و دیموکراسی زاڵە و بەو ناوەوە شەڕ هەڵگیرسێندراوە و شۆڕش کراوە، زۆربەی ژنان لە کوێن؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئاسانە: لە ناو ماڵەکانن. ژنان لەناو ماڵ و لە بواری خێزاندا حەسر کراون، دەشێ لەوێدا باڵادەست بن، واتە لەو بوارەی کە ئەقڵییەت و سیستمی پاتریارکی (پیاوسالاری) بە بواری پرایڤێت (تایبەت) و شوێنی ژنی داناوە. بێگومان ئەمڕۆ ژنێکی زۆر لە دەرەوە کار دەکەن، ئەم کارکردنەش زۆربەی جار ڕووداوە مێژووییەکانی وەکو شەڕ و برسیەتی سەپاندوویانە. کەواتە ژن تێکەڵ بە بازاڕی کار بووە و لە ڕووی ئابوورییەوە کارایە، بەڵام لە پایەی نزم و پەراوێز دانراون. جگە لەمەش، ئەم دەرچوونەی ژن لە بواری پرایڤێت و دەستبەکاربوونی لە دەرەوە، نەبۆتە هۆی هەڵکشانی ستاتوی ژن و تێکەڵبوونی حەقیقی بە بواری گشتی و کایە سیاسی و ئابووری و ڕۆشنبیرییەکان، کە تا ئێستا وەکو کایە و شوێنی سەرەکیی پیاو دادەنرێن. کەواتە ژنان تەنها بە ڕواڵەت ئەو کارە پلە نزم و پەراوێزخراوانە دەکەن و بە کردەنی نەیانتوانیوە ئازاد بن و تێکەڵ بە کایەی گشتیی سیاسی و ئابووری و کولتووری بن کە لە ئەنجامدا دەبێتە مایەی گۆڕانکارییەکی گەورە لە کەسایەتی و فیکر و هەڵکەوتەی کۆمەڵایەتییان. یەکێك لەو هۆکارانەی کە

1 . ڕوناك شوانی؛ **"ئەقڵییەتی پیاوسالاری کورد لە سایەی دیموکراتییەتی ڕۆژئاواشدا ژن بە کۆیلەی خۆی دەزانێت"**؛ لە ماڵپەڕی نینا؛ سەنتەری نینا: ڕێکخراوی داکۆکی لە مافی ژنان: http://ikkr.org/print.php?id=395

وادەکات ژنان پۆستی باڵایان نەبێت و لە پەراوێزی کایەی گشتیی سیاسی و ئابووری و ڕۆشنبیریدا بمێننەوە، ئەوەیە کە ئەوان دەبێ سازش بکەن لە نێوان کاری دەرەوە و ناوماڵدا. ئەوە جگە لە ڕوانینی گشتیی خەڵك بۆ ژن و ڕۆڵی چاوەڕوانکراوی ژن کە لە چوارچێوەی خێزان و منداڵنانەوە و بەخێوکردنی زارۆك، بچووك کراوەتەوە. جا لەبەر ئەوەی پۆستی باڵا و بە تایبەتی لە پلەی بەرپرسیاریدا کات و وزەی زۆری دەوێت، ئەوە لە لایەك ژنان کەمتر لە خەمی وەدەستهێنانی پۆستی باڵا و بەرپرسیاری دان و لە لایەکی دیکەش پیاوان ئەو پۆستانەیان پێ ڕەوا نابینن. ڕوانینی گشتیی خەڵکیش کە سەر بە ئەقڵییەتی پیاوسالارییە و کۆمەڵێك بیروباوەڕی باو و نەشازی لەسەر ژن هەڵچنیوە لە بەرژەوەندیی ژندا نییە؛ بۆ نموونە ئەگەر ژن درێژە بە خوێندن بدات و خۆی بۆ پۆستی باڵا بپاڵێوێت، ئەوە پێی دەڵێن ئەنانی و خۆپەرستە و خێزان و منداڵەکانی فەرامۆش دەکات، بەڵام ئەگەر پیاوێك ئەوە بکات، ئەوە هەموو لایەك دەستخۆشی لێدەکەن و هانی دەدەن بەرەو سەرکەوتن. دیارە ئەم هۆکارە دەرهاویشتەی جیاکاریی جێندەری و نەبوونی یەکسانی و نزمی پایەی ژنە لە ئەقڵییەتی گشتی و پیاواندا کە بەرهەمی پیاوسالارییە لە سەرانسەری جیهاندا بە ڕێژەی جیاجیا ڕەنگیان داوەتەوە. ئەوەتا لە ئەمریکا لە گەرمەی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردندا مەسەلەی ژن ئەمریکیەکانی دابەش کردووە، بەڵام دابەشکردن لەمەڕ پرسی ژن کەمتر لە نێوان دیموکرات و کۆمارییەکانە تا لە نێوان دەنگدەرانی ژن و پیاو. مەسەلەی مافەکانی ژن و یەکسانی لە مووچە و پرسی خاوەندارێتیی جەستە و خودی خۆیان و پرسی لەباربردنی سك، جیاوازیی نێوان پیاوانی دیموکرات و کۆماریەکانیان بچووك کردۆتەوە و ئەو دوو بەرەیان لێك نزیك کردۆتەوە. واتە کاتێ مەسەلە دێتە سەر پرسی ژن، جیاوازی لە نێوان دەنگدەرانی ژن و پیاو دروست دەبێ، نەك لە نێوان دیموکرات و کۆمارییەکان. چونکە پیاوان زۆربەیان کۆکن لەسەر ئەوەی کە ژن خاوەنی جەستەی خۆی نەبێت و کات و وزەی بۆ منداڵ بەخێوکردن و ناو خێزان تەرخان بکات، نەك بۆ کایەی گشتی و کارکردن لە دەرەوە. بە ڕای "میت ڕۆمنی" ژن پێویستە زووتر دەوام بەجێبهێڵێت و بچێتە ماڵەوە بۆ ئەوەی نان بۆ منداڵان ئامادە بکات. ئەم دۆخە و ئەو وتارانەی کە من لێرە ئاماژەم پێدان و لە دۆسیەی تایبەت بە جێندەر... گوزارشت لە واقیعێکی جیا لە واقیعی کوردی دەکەن، بەڵام جیاکاریی جێندەری و نەبوونی یەکسانی لە ماف و ئەرکدا بنەمایەکی پیاوسالاریی و جیهانیی هەیە و هەروەکو وتمان لە سەرانسەری جیهان بە شێوازی جیاجیا واقیعی ژن دادەڕێژن... ژن تا ئێستا لە ڕوانینی گشتی پیاواندا بە لەش و لار و شۆخ و شەنگیەکەی هەڵدەسەنگێندرێت، نەك بە کەسایەتی و فیکر و پایەی ڕۆشنبیری، کە بنەمای سەرەکین بۆ دابینکردنی پۆست و پایەی بڕیاردەر. "پێگی ڕێنولدز" ئەوە دەگێڕێتەوە کە لە کاتی هەڵبژاردنی کەسێك بۆ پۆستێك لە زانکۆ، هاوکارێکی پیاو بەوە پاکانەی کردووە کە ژنەکە ڕوخساری جوان و سەرنجڕاکێشە و شایانی ئەوەیە پۆستەکەی بدرێتێ. جەستە و لەش و لاری ژن تاکە بەهایە کە پیاو لە ژندا دەیبینێ، بەڵام

ئەمەش وەکو سەرمایەیەك بۆ خۆی و بەکارهێنانی وەکو ئامرازێك بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی خۆی بەکار دەهێنێ."[1]

بە بۆچوونی فێمێنیستەکان، توندوتیژی دژ بە ژنان بە هەموو جۆرەکانیەوە، باوترین تاوانی کۆمەڵایەتی و دیارترین دیمەنی گەورەیی و دەسەڵاتدارێتیی پیاوسالارییە. ئەوان دەڵێن: توندوتیژی بەشێکە لە ستراتیژییەتی پیاوان بۆ پتەوکردنی هەژموونیی خۆیان و بەدامەزراوەییکردنی پیاوێتی و نێرینەییەکەیان؛ چونکە لە کولتووری پیاوسالاریدا، هێزی جەستە و ماسوولکەی پیاو کەرەستەی سەپاندنی هێزن و ژنانیش باشترین کەسن کە ببنە قوربانیی توندوتیژیی فیزیکی و دەروونی و مەعنەوی.

یەکێك لەو فێمێنیستانە لە وتارێکدا دەڵێت:

"... شێوەکانی توندوتیژی دژی ژنان بریتین لە: لێدان لە هەر شکڵ و شێوەیەکدا، لە قژکێشان و داپلۆسینەوە، بگرە هەتا قەتلی نامووسی... هەروەها هەڕەشە لێکردن، جنێوپێدان، بێحورمەتی کردن، تۆمەت وەپاڵدان... هەروەها بە زۆر تێکەڵبوون لەگەڵ ژن، ئەگەر مێردیشی بێ، هەر جۆرە هەوڵدان بۆ پێوەندی جنسی لەگەڵ ژنان بەبێ ئۆگری و ڕەزامەندی ژن... لە پەراوێزخستن، هەڵسوکەوتی نەشیاو و سارد و سڕی لە پێوەندی دا لە لایەن بنەماڵەوە بەرامبەر بەو کچ و ژنانەی کە لە قسەی نێرینە و ئەندامانی دیکەی بنەماڵە وەك باب، خاڵ، باوەگەورە، دایك، خوشك، پور، برا، مێرد، مام، دایە گەورە و... لایان داوە، یان بە پێی ویست و دڵخوازی ئەوان هەڵسوکەوت ناکەن، چاودێریکردنی توندوتۆڵی کچان و ژنان لە لایەن بنەماڵە و کەس و کارەوە، بەشێکە لە توندوتیژی ژنانە... هەروەها ناچارکردنی کچان و ژنان بە لەبەرکردنی جل و بەرگی تایبەتی و ڕەچاونەکردنی مافی لەبەرکردن و پۆشین بۆ ئەوان توندوتیژییە... گومانی تێدا نیە کۆمەڵی کوردەواری لە لایەك بەهۆی نەبوونی ئازادی، لە ئارادابوونی کولتووری پیاومەزنانە (پیاوسالاری) و زاڵبوونی سیستمێکی کۆنەپەرستانە (نەریتگەرایی) لە ماوەی دەیان ساڵی ڕابردوو بۆتە مەیدانێکی یان و بەرین بۆ بەرهەم هاتنەوەی توندوتیژی دژی ژنان... کولتووری قێزەوەنی پیاومەزنی و بەکەمگرتنی مێینە سەرتاپای جۆمگەکانی کۆمەڵگای گرتۆتەوە و زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵگای کوردستان بە ڕەفتار و هەڵسوکەوتی نەشیاو لە پەرەپێدان و چڕترکردنەوەی دیاردەی توندوتیژی دژ بە ژنان دەوردەبینن و بەداخەوە تێیدا بەشدارن."[2]

---

1. د. نەزەند بەگیخانی؛ "ژن لە پەراوێزدا"؛ لە ماڵپەڕی تریبۆنی فێمێنیستەکانی کورد:

http://kurdishfeminists.com/print.php?id=1289

هەروەها: لە ماڵپەڕی سەنتەری نینا؛ ڕێکخراوی داکۆکی لە مافی ژنان بۆ ڕێنوێنی و پاڵپشتی و دالدەدانی ژنان لە سوید:
http://ikkr.org/print.php?id=1226

2. ڕەحیم ڕەشیدی (2007)؛ "ڕۆژی نێونەتەوەیی خەبات دژ بە توندوتیژی لە هەمبەر ژنان"؛ ماڵپەڕی هەڵۆی کوردستان:

**<u>لایەنی کولتووری و پەروەردەیی</u>:** ئەم ڕۆشنبیرە فێمێنیستانە پێیان وایە لایەنی پەروەردەیی کۆمەڵگای پیاوسالارانەی کوردی زۆر کاریگەرە لەسەر دواکەوتنی ژنی کورد و چەوسانەوەیان. پوختەی قسەکانیان ئەوەیە: شێوازی نادروستی پەروەردە لە سیستمی پەروەردەیی کۆمەڵگای کوردی، گرنگترین سەرچاوەی کێشەکانی ژنانی کوردە کە بووەتە هۆی ژێردەستی و ملکەچیی ژنان بەرامبەر بە پیاوان. جۆری پەروەردە و ڕاهێنانی کوڕان و کچان لە هەمان سەرەتای لەدایکبوونیانەوە، بە شێوازێکە کە کوڕان بە هەبوونی ڕۆحیەت و ورەی دەسەڵاتداری و خوازیاری زاڵبوون و هێز و باڵادەستی و، کچانیش بە ڕۆحیەتی ملکەچی و گوێڕایەڵی و ملشۆڕی و ژێردەستی بار دەهێنێت؛ واتە بەم پێیە: هەر کێشەیەکی ئەوسا و ئێستای ژنی کورد، لە ئەنجامی پرۆسەی پێگەیاندن و بەکۆمەڵایەتیکردنێکی پیاوسالارانەیە!

سەیری ئەم پاراگرافانەی خوارەوە لە نووسینەکانی ئەم فێمێنیستە بکەن:

"... پرسیاری سەرەکی لە ئێستادا ئەوەیە: ئاخۆ کاریگەرییە نەرێکانی پەروەردە کامەیە لەسەر کەسێتی منداڵ و هەرزەکاری کورد کە دواجار مایەی دروستکردنی جیاکاری و زاڵکردنی کەسێتی نێرینەیە و شەرمندەکردن و وابەستەکردنی کەسێتی مێینەشە بە دیوارەکانی ماڵ و مێرد و خێزانەوە؟ من پێم وایە ئەو پرسیارە گوزەرێکی تەواوی دەوێت بە نێو پەرتووک و مەنهەجەکانی خوێندن لە قۆناغ و ئاستە جیاوازەکانی خوێندندا... دەبینین ئەوەی پەیوەندی بە ڕێنمایی و فێرکردنی پەروەردەییەوە هەبێت، هەموو قاڵبێکی نێرسالاری هەیە و بەو بۆنەیەوە کەسێتییەکی پڕ هێز و ئیتاعەکردن دەداتە پیاو... بۆ نموونە دەوترێت: (ئازاد دۆ دەژەنێت) یان (نەسرین نانی ساج دەکات) یان (شێرزاد ئۆتۆمۆبیل لێدەخوڕێت) یان (ئارەزوو ماڵەکەی خاوێن کردەوە) یان (کارزان هەلوکێن دەکات)"... بەمەش هەر لە منداڵییەوە خوێندکاری کچ ڕادەهێنرێت لەسەر ئەوەی ببێتە

http://www.heloykurdistan.com/ku

* با لەو فێمێنیستە بپرسم: 1) ئایا مرۆڤ پێویستی بە خۆراك و خواردن هەیە یان نا؟ دیارە کەس بەبێ خواردن هەڵناکات. 2) ئەو خواردنە نابێ کەسێك ئامادەی بکات؟ خۆ خواردنەکە هەروا لە خۆوە ئامادە نابێ و دەبێ کەسێك هەبێت لێی بنێت. 3) کێ دەبێ ئەو خواردنە ئامادە بکات؟ پیاو یان ژن؟ با بە دڵی ئەم فێمێنیستە وەڵام بدەینەوە: پیاو! ئەگەر پیاو خەریکی دۆژەنین و کفتەلێنان بوو، پێویستە یەکێکیتر بچێتە دەرەوە کار بکات بۆ ئەوەی کەرەستەی دۆ و کفتە دابین بکات، جا بە کڕین بێ (کە پێویستە پارەی هەبێت)، یان بە بەرهەمهێنان بێ لە ڕێگەی کشتوکاڵ و مەڕدارییەوە! 4) کێ دەبێ لە جیاتی پیاو لە دەرەوە کار بکات؟ خۆ پیاو پێراناگات هەم کفتە لێنێ و هەمیش لە دەرەوە کار بکات تاکوکەرەستەی دۆ و کفتە پەیدا بکات؛ کەواتە دەبێ ژن بچێتە دەرەوە بۆ ئەوەی جێگای پیاوەکەی پڕ بکاتەوە. 5) ئەگەر ژن لە دەرەوە خەریکی کار بوو، چ جیاوازییەکی هەیە لەوەی کە لە ماڵەوە کار دەکات؟ ئایا هەر کار ناکات؟ تەنها بەم جیاوازییە کە لە ماڵ خەریکی کاری خۆی و خێزانی دەبێت، لە دەرەوە خەریکی کاری یەکەیەکی کۆمەڵایەتیتر دەبێت؛ وەکو: خێزانێکیتر، یان کارگەیەك، یان فەرمانگەیەك، یان وەزارەتێك، یان کۆمپانییەك و... هتد. کار هەر کارە؛ ئەگەر لە ماڵ بۆ ڕاپەڕاندنی کاری پیاو و منداڵانی خۆی کار دەکات، لە دەرەوە بۆ ڕاپەڕاندنی کاری پیاو و منداڵانی خەڵکانی دیکە کار دەکات! ئەگەر لە ماڵ لە ژێر ئەمری پیاوەکەی کار دەکات، لە دەرەوە لە ژێر ئەمری پیاوێکی دیکەدا کار دەکات.

کەیبانوویەکی بە سەلیقە و ماڵداریکار و خوێندکاری کوڕیش ببێتە کەڵەپیاوێکی هەڵکەوتووی گەل و نیشتیمان!"[1]

یەکێکی‌تر دەڵێت:

"وانەی منداڵ و چۆنێتی هەڵسوکەوتکردنی مامۆستاش لەگەڵ منداڵاندا جارێکی‌تر ئەو جیاوازییە باوانە دەچەسپێنن کە لە کۆمەڵگادا لە نێوان نێر و مێدا هەن. بۆ نموونە هەر لە باخچەی منداڵانەوە کاتێك دەبێت کەرەستەی یارییەکان کۆبکرێنەوە ئەوا مامۆستاکان ئەم کارە بە کچان دەسپێرن نەك بە کوڕان. کتێبی (ئەلف و بێ)ی کوردی لە (*2000*)ـەکان لە کوردستان دەخوێنرا، پڕبوو لە نموونەی لەم جۆرە. دادە خەریکی دۆ ژەنین و کفتەلێنان بوو، لە کاتێکدا بابە داری دەبڕی و لە دەرەوە کاری دەکرد. دارا قارەمانی سەرەکی وانەکان بوو، لەوانەکانی یەکەمەوە کە: (دارا دوو داری دی)، بەشێکی زۆری کتێبەکە باسی موغامەراتی ئەم کوڕە بچکۆلەیە بوو. کچی بچووك هەمیشە جێگەی دووهەمیان هەبوو لەم کتێبەدا. ئەم کتێبە چەندین نەوەی منداڵانی کوردستانی بەم وێنە ستریۆتایپانە پەروەردە کرد."[2]

یان سەبارەت بە پرۆسەی پەروەردە و بەکۆمەڵایەتیبوونی منداڵان دەڵێت:

"لە سەرتاسەری جیهاندا، لە رۆژی لەدایکبوونەوە جیاوازی دەکرێت لە نێوان کوڕ و کچدا. بۆ نموونە منداڵی کوڕ جلی شینی لەبەردەکرێت و منداڵی کچ جلی پەمەیی. منداڵی کوڕ

---

تەنها شوێنەکان دەگۆڕێن و هەمان ئاش و هەمان کاسەیە. 6) چ گەرەنتییەك هەیە کە خۆت وەك فمێنیستێك ئەم بژاردەیە وەك چارەسەرەیێك پێشکەش دەکەی (واللە: پێویستە "شێرزاد دۆ بژەنێت" و "نازدار ئۆتۆمۆبیل لێبخوڕێت" و "کارزان نانی ساج بکات و ماڵ خاوێن بکاتەوە" و "ئارەزووش بچێتە دار و دورهێنان" و...) دوای ماوەیەك گازندە ناکەی کە: شێرزاد و کارزان کە خاوەن ماسوولکەن و بەهێزترن لە ماڵەوە کاری سووك دەکەن لە ژێر سێبەر و هەوای سپلێت پاڵ دەدەنەوە، بەڵام نازدار بۆ نموونە کە تەکسیی هەیە (ئۆتۆمۆبیلی لێدەخوڕێت) و، ئارەزووش لە کارگەیەکدا کار دەکات، لەبەر کاری سەخت و دژوار، نەخۆش و لاواز دەکەون و، شەکەت و هیلاك، دەستیان دەقڵیشێ و دەموچاویان چرچ هەڵدەگەڕێ و، لەبەر بارگرانی تووشی خەمۆکی و دڵەڕاوکێ و سترێس و پەریشانی دەروونیی دەبنەوە؟! 7) بە ستاندەرزانینی کاری پیاوان و ئارەزووکردنی کاری پیاوانە لە لایەن ئەو فمێنیستانەوە (بەو واتایەی کە ئەمڕۆ پیاوان زیاتر ئەو کارەیان بەدەستەوەیە وەك: لێخوڕینی ئۆتۆمۆبیل و هەلوکێن و . تا پۆست و دەسەڵاتی سیاسی و ئیداری و کۆمەڵایەتی، نەك بەو مانایەی کە ئەو کارانە تەنها و تەنها تایبەتن بە پیاوانەوە)، خۆی نیشانەی ڕوانینێکی سەداسەد پیاوانەیە بۆ کار و پیشە؛ واتە بە چاوێکی پیاوانە دەڕواننە کار و پیشەی ئەوان و، کار و پیشەی خۆیان، کە مەبەستم ئەو کارانەیە کە زیاتر ژنان دەیکەن، بە کەم و سووك و شەرم و عەیبە دەزانن و هەست بە بێڕێزی و بێتوانایی و ژێردەستی دەکەن؛ بۆیەش بەها و پێوەرەکان لایان دەگۆڕێت و پیاوبوون و کاری پیاوانەش بە مرۆڤانەتر و بەنرختر و و براوەتر دەزانن؛ ئەمەش نیشانەی لەدەستدانی ناسنامە و متمانەبەخۆبوون، هەروەها ڕازینەبوون بە قەدەری خۆیانە وەك قەدەری ژنبوون، هاوسەربوون، کچبوون و دایکبوون! بۆیەش کاری وەك دووگیانی، دایکایەتی و شیردان، دۆژەنین و کفتەلێنان و بەخێوکردنی منداڵان بە سووکایەتی و بێنرخیی خۆیان دەزانن و ئەمە وایان لێ دەکات کە چاویان لە پیاوان بێت و کار و پیشەی ئەوان لاسایی بکەنەوە، تاکو لەو ڕێگایەوە یەکسانیی خۆیان لەگەڵ پیاوان بسەلمێنن! کەچی پێم وایە چاولێکەری لە پیاوان و حەز و ئارەزووکردنی کاری ئەوان، خۆی لە خۆیدا نیشانەی پاشکۆیی و ژێردەستی و شکست و کەموکورتیی پێگەیشتنی کەسایەتی و گرێی دەروونی و بێناسنامەبوونە! (لە بەشەکانی دیکە بە تێروتەسەلی باسی لێوە دەکەین).

1 . ڤیان مەجید (2007)؛ "ژن.. تاك.. سیاسەت"؛ سلێمانی: بینایی؛ ل 44 و 45.

2 . د. چۆمان هەردی؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 124.

تۆپی دەدرێتێ و منداڵی کچ بووك. منداڵی کوڕ ئۆتۆمبیل و چەکی دەدرێتێ و منداڵی کچ قاپ و قاچاغ. منداڵی کوڕ دەنێردرێ بۆ نان کڕین و بازاڕکردن و منداڵی کچ ماڵی پێپاك دەکرێتەوە.* لەناو ماڵدا تا جارێك کوڕ بانگدەکرێت و کاری پێ دەسپێردرێت، دە جار کچ کاری پێ دەسپێردرێت. هەموو ئەمانەش ئامادەکردنی کچ و کوڕن بۆ جێبەجێکردنی چاوەڕوانییە جیاکانی کۆمەڵگا لەوان. لە کۆمەڵگای کوردیدا کچان لە تەمەنێکی زۆر بچووکەوە ئاگادار دەکرێنەوە کە جەستەی ئەوان جێی شەرمە و دەبێت بشاردرێتەوە. کچان هەر لە زووەوە فێردەکرێن کە کۆشیان داپۆشن. گەرچی منداڵبازەکانی کوردستان زیاتر پەلاماری کوڕان دەدەن (ڕەنگە لەبەر ئەوەی کە کوڕان زیاتر دەچنە دەرەوە)... پەردەی کچێنییە کە یەکەمین کلیلی پەسەندکردنی کچە لە لایەن مێردەوە، خێزانی مێرد و کۆمەڵگەوە بە گشتیی... جەستەی ژن لە کۆمەڵگای کوردیدا جێگەی شەرمە. تەنانەت دەرپێی کوردی لەژێر جلەکانیترەوە هەڵدەواسرێت. ئەم جەستانە دەبێ داپۆشرێن و بپارێزرێن. باسکردنی ئەم جەستانە و ئەو کێشانەی کە ڕەنگە تووشیان بێ (منداڵبوون، نەخۆشکەوتن، سۆڕی مانگانە، دەستدرێژیی کرانە سەر) جێی شەرمە."[1]

لە شوێنێکیتر دەڵێت:

"گەر سەیری پەندی پێشینانی کوردی بکەین کە کۆمەڵێك بەها داکۆکی لێدەکرێت کە ئامانجی کۆنترۆڵکردنی ژن و کەمکردنەوەی دەسەڵاتیتی... پەندێکی پێشینان دەڵێت: (ژنی شەرمن شارێك دێنێ و پیاوی شەرمن شانەیەك)؛ واتە شەرمنی بۆ ژن پێویست و دروستە و بۆ پیاو نەنگییە... پەندێکیتر دەڵێت: (داری بێبەر بۆ بڕین باشە). گەرچی پێدەچێت ئەم پەندە باسی درەخت بکات، بەڵام لە ڕاستیدا ئاماژەیەکی ڕاستەوخۆیە بە توانای منداڵداریی ژن... پەندێکیتر دەڵێت: (پیاو چەتری سەرە)؛ واتە ژن بەبێ پیاو وەك بوونەوەرێکی بێ چەترە لە بەو باراندا."[2]

بۆیە ئەوان دەڵێن:

"... ئەمە خۆیلەخۆیدا زاڵبوونی عەقڵییەتی پیاوسالاری بە سەر کۆمەڵگا نیشان ئەدا و هەروەها بە ڕوونی چەوساندنەوەی ژنانی لێدەبینرێ. بۆیە هەنووکە ئەرکێکی قورس و گران دەکەوێتە ئەستۆی تیمەی ژنان کە بە هەستکردن و ناسینی ئەم هەموو ئازار و

* خۆ ئەگەر منداڵی کچ ـ وەك ئەو ژنە ڕۆشنبیرە داوا دەکات و لێی بەگازندەیە ـ بنێردرێتە دەرەوە بۆ نانکڕین و بازاڕکردن، منداڵی کوڕیش لە ماڵەوە بمێنێ و لەگەڵ باوکی خەریکی گێسکلێدان و قاپشۆردن بێ، لەوانەیە ئەو کاتە بە گلەییەوە بڵێ: سیستمی پیاوسالاری وای کردووە کە بە خۆیان لە ژێر سێبەر و هەوای سپلێت (گەرم یان سارد) پاڵ بدەنەوە و کچان و ژنانیش بەو سەرما و گەرمایە و بەو مەترسییانەی وەك لێدانی سەیارە، پەلاماردران لە لایەن گورگە نێرینەکان (وەك ئەو دەڵێ: منداڵبازان) و... بنێردرێنەوە دەرەوە! بزانن چۆن بێگارییان لێ دەکێشن و پیاوان و کوڕان، وەك کۆیلە و نۆکەر مامەڵەیان لەگەڵ ژنان و کچان دەکەن و هتد، و ئەمجارەش فرمێسکی تیمساح بۆیان برێژێت!

1 . سەرچاوەی پێشوو: ل 122.

2 . سەرچاوەی پێشوو: ل 117-119.

نەهامەتییەی کە لە لایەن عەقڵییەتی پیاوسالارییەوە بە سەر ئێمە دەکرێ، هەوڵێکی بێپسانەوەی خۆپێگەیاندن و وریابوونەوە دەست پێبکەین، تاکو بتوانین بە خوێندنەوە و تێڕوانین و تێبینی و سەرنج، خەباتێکی شێلگیرانە لە پێناوی وەدەستهێنانی مافە زەوتکراوەکانمان دەست پێبکەین؛ چونکە کەڵك وەرگرتن لە ئازادی و ژیان بەسەربردن لە کەش و هەوای ئازاد و بەشداریکردن لە هەموو بوارە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی کۆمەڵگا مافی بێئەم لاو ئەولای ژنانە."[1]

**<u>لایەنی ئابووری</u>:** هەروەها لە نیگای زۆر لەو ڕۆشنبیرە فێمێنیستانەی کوردستان، سیستمی پیاوسالاری کاری کردووەتە سەر لایەنی سیستمی ئابوورییش و، پێیان وایە وابەستەیی ئابووریی ژنان بە پیاوانەوە، زەمینەی زوڵم و چەوساندنەوە و سنووردارکردنیان لە لایەن پیاوانەوە فەراهەم بووە:

"... ژنان لە لایەنی ئابوورییەوە پشت بە ئەندامە نێرەکانی خێزانەکانیان دەبەستن. ئەمە کار لە ناسنامەی مێینەیان دەکات و ژنان ناچار دەکات لە خراپترین باردا بژین."[2]

"... لە کۆمەڵگای خێڵەکیدا مام و خاڵ و ئامۆزا و کەسە دوورەکان و سەرۆکی تیرە و خێڵ دەبنە بڕیاردەری چارەنووسی ئەو کەسەی کە بەرهەمهێن نییە!... کاری ژن دەچێتە چوارچێوەی کاری تایبەتەوە و شوێنی کاریشی ماڵە، بەڵام کاری پیاو لە چوارچێوەی کاری کرێدایە... پێویستە ژن بۆ ئەوەی ئەرك و فەرمانەکانی خێزانەکەی جێبەجێ بکات لە جیاتی ئەوەی خۆی داهاتی هەبێت، داوا لە پیاو بکات... هەر بۆیە ژن هەرچەندێك بەرهەمە مەعنەوییەکانی زیاد بکات،* داواکارییەکانی لە پیاو زیاد دەکات و بەمەش دەسەڵاتی پیاوی زیاتر بەسەردا ئەسەپێت و دەسەڵاتی خۆی دادەبەزێت بۆ نزمترین ئاست، چونکە تا مناڵ زیاد بێت کاری ژن زیاد دەکات ..."[3]

"... لە زۆربەی وڵاتانی دونیا ئەرکی کارکردن و خزمەت بە بنامەڵەیان لەسەر شانە، لێ بەجێگەیاندنی ئەو ئەرکە وەکو کار بۆیان حەساو ناکرێ، هەر بۆیە پتر ژنان لە باری ئابوورییەوە بە مێرد یان پیاوانی بنەماڵەوە بەستراونەتەوە. کچان بەهۆی ئەوەی کە لە زۆر کۆمەڵگادا مافی کارکردنیان لە دەرەوەی ماڵ نییە، دەبێ لە لایەن باب یان برا یارمەتی

---

1 . گوڵستان گوڵکار؛ هەمان سەرچاوە.

2 . چەلەنگ ڕەشاد یەحیا؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 29-30.

* مەبەستی لە زیادبوونی بەرهەمی مەعنەوی، زیادکردنی منداڵە. چەند منداڵی زیاتر بەرهەم بهێنێ، ئەوەندە زیاتر خەریکی کاری ماڵ و بەخێوکردنی منداڵان دەبێت و لەوەشەوە زیاتر دەکەوێتە کۆتی پیاو! واتای ئەوەیە کە ژنان ئەگەر بیانەوێ سەربەستتر و ئازادتر بن، دەبێ هەوڵ بدەن یان نەبنە دایك، یان کەمتر منداڵیان بێت! واتا دایکنەبوون باشترە لە دایکی یەك منداڵ بوون، ئەوەش باشترە لە دوو و سێ و چوار و...، بەم لۆژیکە بوونەدایك یەکسانە لەگەڵ بەندبوون و وابەستەبوون و کەوتنەناو قەفەسی خێزان و ماڵەوە!

3 . ڤیان مەجید؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 23 و 24.

ئابووری وەرگرن، ئەمەش گەلێك جاران مێینە لە بەرانبەر فەرمانبەری و ویستی نێرینەدا ملکەچ دەکات."[1]

**2.4.1.1- تێبینییەکانمان لەبارەی بەکۆتزانینی سیستمی پیاوسالاری:**

**تێبینیی یەکەم)** بەکارهێنانی چەمکی "پیاوسالاری" یان "باوکسالاری" (پاتریارکی) وەکو سیستمێکی زۆردار و چەوسێنەر، ئەو مانایە دەگەیەنێ گوایە وەختی خۆی سیستمێکی باشتر و پێشکەوتووتر و دادپەروەرتر هەبووە کە بریتییە لە "دایکسالاری" یان "ژنسالاری" (ماتریارکی). بەپێی بۆچوونی فێمێنیستەکان، بەتایبەتی چەپەکان و سۆسیالیستەکان، سەرەتای ژیانی مرۆیی بەو سیستمەوە بەڕێوە دەچوو و، ژن سەروەر و پاشای کۆمەڵگا بووە و ژن نەك هەر لەگەڵ پیاو یەکسان بووە، بەڵکو لە زۆر ڕووەوە پلەوپایەی لە پیاو بەرزتر بووە. فەلسەفەی "ماتریالیزمی مێژوویی" کە داڕێژەری ئەم چەمکانە بووە، دەڵێ: لە قۆناغی کۆمۆنی سەرەتاییدا، کە بەپێچەوانەی ئێستایە، ژنسالاری لە کۆمەڵگادا باو بووە؛ چونکە هێشتا موڵکایەتیی تایبەت سەری هەڵنەدابوو، موشاعییەتی جنسی (کۆسێکسی) باو بووە و، ئایین و یاسا و کولتوور و دابونەریتیش هێشتا دانەهاتبوون. تەنانەت ژن لەگەڵ چەند پیاوێك پەیوەندی سێکسی هەبووە و پێویست بەوەش نەبوو کە باوکی منداڵان بناسرێنەوە و ژن ڕێزێکی تایبەتی لێ دەنرا، کە دواتر بەهۆی دەستگرتنی پیاو بەسەر "ئامرازی بەرهەمهێنان" لە قۆناغێکی دواتردا بێبەشکردنی ژن لەو ئامرازانە، هاوسەنگیی هێز و دەسەڵاتەکان بە سوودی پیاو شکایەوە![2] هەرچی ئەفسانە و ئایین و فەلسەفە و یاساش کە سەریان هەڵدا، بەرهەمی پیاوسالاری بووە و هتد. تەنها بەڵگەی ئەم تیۆرە ـ باشترە بڵێین: ئەم گریمانەیە ـ هەندێ وێنە و تابلۆی پەیکەرین کە گوایە پیاو بە ملکەچی لە بەردەم دەسەڵاتی ژن وەستاوە و پەیکەری زڕخواکان ـ کە سیمبۆڵی دەسەڵات و سالارییە ـ لە شێوەی ژن دروست کراوە!

پرسیار لێرە دروست دەبێ: بۆچی پیاو نەك ژن توانیی دەست بەسەر کەرەستەکانی بەرهەمهێناندا بگرێ، کەچی خۆی سەرەتا دەسەڵاتدار بووە؟ هەروەها بۆچی ئەو

1 . ڕەحیم ڕەشیدی، هەمان سەرچاوە.

2 . بڕوانە: وریا قانع؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل 17-32.

دەسەڵاتدارییەی پیاو بە درێژایی مێژوو تا ئەمڕۆش وەك خۆی ماوەتەوە و ژنان نەیانتوانیوە جارێکیتر هەر چۆنێك بێ، دووبارە دەسەڵاتی خۆیان بسەپێننەوە؟

زانست بە تایبەتی "کۆمەڵناسی" و "ئەنترۆپۆلۆژی" ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە ئەم تیۆرە تەنها گریمانەیەکە* کە لە مێشکی چەند کەسێکی وەك "کارل مارکس" و "ئینگێلز" و "لێنین" دروست بووە و تەنها ڕیشەیەکی فەلسەفی و مێژوویی هەیە و بڕیارێکی ئایدیۆلۆژییە تاکو هەقیقەتێکی زانستی. نووسینەکانی ئینگێلز لەبەر بێبەڵگەییەکەی، کەوتووەتە بەر ڕەخنە و هێرشی توندی مرۆڤناسان و دێرینناسان و تەنانەت زۆر لە ڕەوتەکانی فێمێنیزمیش؛ چونکە ئەوانگوتەنی ئەم بیرۆکە نەیتوانیوە ڕەهەندە ئاڵۆزەکانی پرسی چەوساندنەوەی ژنان بە باشی بخاتە ڕوو.[1] هەر لانیکەم، ئەم دیدگایە دەبێ قبووڵ بکات کە ژنانی ئەو وڵاتانەی کە لە ژێر چەتری سۆسیالیزمدا دەژین، نەگەیشتوونەتە پلەی ئاسوودەیی و ڕزگاری؛ دیارە سۆسیالیزم ناتوانێ نابەرابەری و چەوساندنەوەی ڕەگەزی بسڕێتەوە.[2] لە لایەکیترەوە، بەڵگەی نوێ و توێژینەوە نوێیەکانی ئەنترۆپۆلۆژیستەکان و تەنانەت بەشێك لەو بەڵگانەیش ئینگێلز خۆی کۆی کردووەتەوە، دەیسەلمێنن کە تەنانەت لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکانی پێش سەردەمی چینایەتیشدا، ژنان سەرەڕای بەشداری لە کاری دابینکردنی خۆراك، لەگەڵ پیاوان بە تەواوی یەکسان نەبوونە.[3] بەپێی توێژینەوەکانی ئەنترۆپۆلۆژیستەکانی ئەم سەردەمە، ئەگەرچی لە هەندێ کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا ژن دەسەڵاتدار بووە، بەڵام "ژنسالاری"ی ڕاستەقینە ـ ئەوەی سۆسیالیستەکان دەڵێن ـ لە هیچ شوێنێکی دونیا نادۆزرێتەوە، بەڵکو دیسان پیاوان (وەك خاڵ و برا و برازاکان لە بنەماڵەی ژنە دەسەڵاتدارەکە) هێز و دەسەڵاتی زیاتریان هەیە لە ژنانی ئەو کۆمەڵگایانە.[4] هەروەها، بەپێی ئەو ماوە مێژووییەی کە خودی تیۆرەوانانی ئەم بیرۆکەیە بۆ تەمەنی هەرکام لەو قۆناغانەیان داناوە، قۆناغی کۆمۆنی سەرەتایی دەکەوێتە پێش مێژوو (واتە مێژووی نووسراو)، دواتر قۆناغی کۆیلایەتی (3500-3000) ساڵی خایاندووە، دەرەبەگایەتی (2000-1500) ساڵ، سەرمایەداریش

* بۆیە ئێستا لە هیچ کتێبێکی سۆسیۆلۆژیدا ئەم چەمکانەی "پیاوسالاری" یان "ژنسالاری" نادۆزینەوە.

1 . لنگرمن، پاتریشیامدو و برنتلی، ژیل نیبروگ (1995): "**نظریه فمینیستی معاصر**"؛ در جورج ریتزر: "نظریه جامعەشناسی در دوران معاصر"؛ ترجمه: محسن ثلاثی؛ تهران: انتشارات علمی؛ ص 481.

2 . Tong, op.cit., pp. 6-65.

3 . Jaggar, Alison M. (1988), "**Feminist Politics and Human Nature**", Lanham, Maryland: Rowman & Littlefield Publishers, pp. 114-115 & 308-311.

4 . کلاین برگ، اتو (1990): "**روانشناسی اجتماعی**"؛ ترجمه: محمد علی کاردان؛ تهران: نشر اندیشه؛ ج 1؛ صص 318-319.

چەند سەد ساڵێك و هتد؛ بەم پێیە ئەو قۆناغە دەکەوێتە (5000) ساڵ لەمەوبەر! کەواتە ناهەقم مەگرن لەو فێمێنیستانە بپرسم: کوا مێژووی نووسراوتان یان بەڵگەیەکی ڕاستەقینە لەسەر هەبوونی سیستمی دایکسالاری؟

سەبارەت بە مەسەلەی نەبوونی ئایین و یاساش لە کۆمەڵگا مرۆییەکاندا (کە دەڵێن یەکێك لە نیشانەکانی دایکسالاری بووە و دواتر بەهۆی قۆرخکردنی دەسەڵات لە لایەن پیاوانەوە، سەریان هەڵداوە)، بۆچوونێك نییە کە زانست بە بەڵگەی یەکلاکەرەوە و حاشاهەڵنەگر سەلماندبێتی. "هینری بێرگسۆن"* ـ فەیلەسووفی فەرەنسی ـ پێی وایە کە: "هیچ کۆمەڵگایەك نەبووە ئایینی نەبووبێ". فەرهەنگی "لاروس"یش بۆ سەدەی بیستەم دەڵێ:

"بێگومان غەریزەی ئایینی، غەریزەیەکی هاوبەشە لە نێوان هەموو ڕەگەزەکانی مرۆڤایەتیدا، تەنانەت ئەوانەشیان کە زۆر وەحشی و هەمەجین و نزیکن لە ژیانی ئاژەڵی".[1]

دامەزرێنەری فەلسەفەی "پۆزیتیڤیزم"یش کە "ئۆگۆست کۆنت"**ی فەرەنسییە و بە یەکێك لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵناسیش دەژمێردرێ، گومانی هەیە لەسەر هەبوونی سیستمی کۆمۆنی سەرەتایی و چەمکی دایکسالاری و پێی وایە: ژیانی مرۆڤایەتی بە سێ قۆناغی "ئایینی" و "فەلسەفی" و "زانستی"دا تێپەڕیوە؛ کەواتە ئەوەی لەبارەی سیستمی دایکسالاری و موشاعییەتی جنسی و نەبوونی ئایین و یاساوە دەوترێت، تەنها خەیاڵ و وەهمە و، خوێندنەوەیەکی مەزەندەییە کە هەر کەسێك هەقیەتی زۆر شت بە خەیاڵ و گریمانەکانی شی بکاتەوە!

ئەم گریمانەیە کە لەسەر چەند وێنە و تابلۆ یان لێکۆڵینەوەی چەند کۆمەڵگایەکی سەرەتایی دروست بووە، بە هیچ شێوەیەك نابێتە تیۆری و یاسا و مەسەلەیەکی زانستی کە لە هەموو کۆمەڵگاکانی جیهان تاقی بکرێتەوە و یەك دەرئەنجامیش بخاتە ڕوو! چونکە کۆمەڵگای سەرەتایی لە هەموو قۆناغێکی میژوویدا هەبووە، تەنانەت ئێستا لە سەدەی (21)یشدا، کە سەردەمی شارە مێترۆپۆلیسەکانە (دایکەشار)، کۆمەڵگای ئەوەندە سەرەتایی و پاشکەوتوو هەن، کە هەر دەڵێی بە شێوازی هەزاران ساڵ پێش ئێستا دەژین! خودی مارکس و ئینگێلز و لێکۆڵەرانیتر لە شارە هەرە گەورە و پێشکەووەکانی ئەوروپادا ژیاون و چوونەتە ناو کۆمەڵگا سەرەتاییە هەرە

* Henri Bergson (1859-1941).

1 . دراز، محمد عبدالله (1998)؛ "الدين: بحوث ممهدة لدراسة تايخ الأديان"؛ الكويت: دارالقلم؛ صص 80 - 83.

** Auguste Comte (1798-1857).

پاشکەوتووەکان لێیان کۆڵیونەتەوە. ئەوە چ لۆژیکێکە و لەسەر چ پێوەرێکە کە کۆمەڵگایەکی سەرەتایی ـ نە هەمووشیان ـ ببێتە بنەمای هەڵسەنگاندنی هەموو کۆمەڵگاکان، کە ئەویش بە بڕیاری پێشوەختە و لەقاڵبدراو و پێشترئامادەکراو، سەردانی بکرێت و لێی بکۆڵدرێتەوە؟ ئینجا لێکۆڵینەوەکەشی بە ئاراستەیەکدا ببات کە بەپێی حەز و ویست و خواستەکەی بگاتە ئەنجام؟ بۆ نموونە "ئەتڵەسی ئەتنۆگرافیی کۆمەڵگا سەرەتاییەکان" باسی کۆڵینەوە لە (1231) کۆمەڵگای سەرەتایی دەکات کە دەرئەنجامەکەی ئەوە دەردەخات: لە (1041) کۆمەڵگادا "فرەژنی" (Polygamy) باو بووە و تەنها (4) کۆمەڵگا "فرەمێردی" (Polyandry) (واتە: لە یەك شوو زیاتر) باو بووە و، لە (186) کۆمەڵگاشدا "تاکهاوسەری" (Monogamy).[1] ئەی بۆ ناڵێین: مادام لە زۆرینەی هەرە زۆری کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا فرەژنی باو بووە، کەواتە هەموو کۆمەڵگا مرۆییەکان فرەژن بوونە و "سیستمی پیاوسالاری" بنچینەی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و سیاسیی کۆمەڵگاکان بووە؟! ئایا مەعقووڵە کە تەنها بە هەبوونی (4) کۆمەڵگای فرەمێردی، ئەمە بەسەر هەموو کۆمەڵگاکاندا بگشتێنین، لە کاتێکدا کۆمەڵگای فرەژنی (260.25) ئەوەندەی کۆمەڵگای فرەمێردییە!

کەواتە هەروەك ئێستاش کە سەدەی بیستویەکە و پێشکەوتووترین کۆمەڵگامان هەیە کە خاوەن ئاینێکی دیاریکراوە، پاشکەوتووترین و سەرەتاییترین کۆمەڵگای هەمەجی و جەنگەڵیشمان هەیە کە هیچ ئاینێکی نییە. کێ دەڵێت: بۆ نموونە سێهەزار ساڵ بەر لە ئێستاش وا نەبووبێ؟ بە دڵنیاییەوە کۆمەڵگای پێشکەوتوو و پاشکەوتووش لە یەك کاتدا بوونیان هەبووە کە پێوەری کولتوور و شارستانییەت، ڕێژەی پێشکەوتن و پاشکەوتنی دیار دەکات.

لە لایەکیترەوە، توێژینەوەکان دەیسەلمێنن کە لە هیچ قۆناغێکی مێژوویدا، کۆمەڵگاکان ـ پێشکەوتوو یان سەرەتایی ـ لە دابەشکردنی کار لەسەر بنەمای ڕەگەزێتی بێبەش نەبوونە، تەنانەت لەو کۆمەڵگا کۆنانەش کە زڕخواکانی مێینەیان دەپەرست و ئێستا خەڵکێك پێیان وایە کە ژن پێگەیەکی کۆمەڵایەتیی بەهێزی هەبووە، کەچی هیچ بەڵگەیەك نییە لەسەر یەکسانیی ژن و

1 . George P. Murdock (1998), "**Ethnographic Atlas Codebook: Ethnographic Atlas recording the marital composition of 1231 societies from 1960 to 1980**", pp. 1-52. And: Starkweather, Katherine & Raymond, Hames (2012),"**A Survey of Non-Classical Polyandry**", 23 (2): pp.150-179.

پیاو لە کار و ئەرکەکاندا. "ئاندرێ هیوود" (Andrew Heywood)لە کتێبی "ئایدیۆلۆژییە سیاسییەکان"دا دەڵێ:

"ڕێوڕەسمی پەرستنی زڕخوای مێینە لەوانەیە نیشانەی ئەوە بێ کە لە ڕۆژگاری کۆندا، ڕەگەزی مێ ڕێز و بەهای هەبووە، بەڵام هەرگیز ئەوە ناسەلمێنێ کە ژنان بەسەر پیاواندا زاڵ بوونە و یان تەنانەت لەگەڵیان یەکسان بوونە."[1]

هەروەها لە ڕووی کولتووریشەوە، دەتوانین ئاماژە بە لێکۆڵینەوەکانی "جورج پیتەر مۆرداك"* ـ ئەنترۆپۆلۆژیستی ئەمریکی ـ بکەین، کە لە توێژینەوە بەناوبانگەکەیدا سەبارەت بە "دابەشکردنی کار بەپێی ڕەگەز"، کە لە (224) کۆمەڵگای جیاجیادا کردوویەتی، گەیشتووە ئەم دەرئەنجامەی کە: کارەکانی وەك دارتاشی، هەڵکۆڵینی زەوی، دەرهێنانی کانزاکان، پاککردنەوەی عاردەکان، دروستکردنی خانووبەرە و نشینگەکان، ڕاو، ماسیگرتن، شوانی، بازرگانی، دروستکردنی کەشتی و بەلەم، دروستکردنی چەك، هەموو کاری پیاوانەن و تایبەتن بە ڕەگەزی نێرینەوە، بەڵام کارەکانی وەك: چنینی سەوزە و ڕەوەك، ئاوهێنان، چێشتلێنان، دروومان و خەیاتی، ڕستن و چنین، سەبەدچنی، حەسیرچنی و گۆزەکەری، لە زۆربەی کولتوورەکاندا تایبەتن بە ژنان.[2]

سەرباری هەموو ئەم بەڵگانە، خۆ ئەگەر واش دابنێین سیستمی دایکسالاری بە فیعلی هەبووبێ، ئایا بانگەشە و داواکردن بۆ گەڕانەوەی قۆناغی ساوایی مرۆڤ، خۆی‌لەخۆیدا نیشانەی پاشکەوتن و بەرەوپاشچوون نییە؟!

**تێبینیی دووەم)** سەبارەت بە ئازادبوون لە سیستمی پیاوسالاری تەنانەت ڕاکردن لە "پیاو" یان "سمێڵزلەکان" بەپێی قسەی فێمێنیستە ڕادیکاڵەکان،[3] دەبێ بڵێین: هەروەك دەزانین کۆمەڵگا لە ژن و پیاو پێك هاتووە؛ ژن نیوەی کۆمەڵگایە و پیاویش نیوەکەی‌تر. ژن ئەگەر نیوەی کۆمەڵگا بێت و گلەیی لە نیوەی‌تر بکات کە پیاوە و، سەرەڕای ئەوەی بۆی ناحەوێتەوەش (چونکە یان باوکیەتی، یان مێردیەتی، یان کوڕیەتی، یان برایەتی)، بەڵام دژایەتی و ڕکابەرایەتیی لەگەڵ بکات بۆ هێنانەخوارەوەی لە پۆستی سالاریکردن، ئەو مانایە ڕوونە دەبەخشێت کە ژن، دژایەتیی

1 . Heywood, Andrew (2014), "**political ideologies: An introduction**", London: Routledge, 4 edition, p. 196.

* George Peter Murdock (1897-1985).

2 . Ann Oakley, op.cit., p. 166.

3 . بڕوانە: بێدار فارس عەزیز و نیگار دلێر ئەحمەد؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 71.

خودی خۆی دەکات و، شەڕ لەگەڵ خۆی و بەرهەمەکانی خۆی دەکات و یەخەی خۆی دەگرێت؛ چونکە نیوەی کۆمەڵگای پیاوان لە سکی نیوەی کۆمەڵگای ژنان هاتوونەتە سەر دونیا و شیری ئەوانی خواردووە و لە لایەن ئەوانەوە پەروەردە کراون و پێگەیێندراون و گەورە کراون و نێردراونەتە ناو باوشی کۆمەڵگا و، ئێستاش دژایەتیی بەرهەمەکەی خۆی دەکات؛ دژایەتی و ڕکابەرایەتیی ئەو کەسەی کە لە خۆی بووە؛ کەواتە ئازادبوون لە پیاو و پیاوسالاری واتە ئازادبوون لە کۆت و بەندی خودی خۆیان!

ئەگەر قبووڵ بکەین کە سیستمی پیاوسالاری وەك دیدگا و ئاراستەیەکی هەمەلایەنە لەناو کۆمەڵگادا باوە، هەر ئەو ژنانەن کە ئەمجۆرە دیدگایە و ئاراستەیە لەناو کۆمەڵگادا بڵاو دەکەنەوە و دەستیان هەیە لە پەرەپێدان و گشتگیرکردنی؛ چونکە جگە لە خۆیان، منداڵانی خۆیان بەپێی ئەو دیدگایە پەروەردە دەکەن و کوڕەکانیان دەکەنە سمێڵزل و کچەکانیشیان دەکەن ملشۆڕ و گوێڕایەڵی نێرینەکانیان!

لە پێناسەی فێمێنیستان بۆ سیستمی پیاوسالاری، ئەوەشمان بینی کە باسی دەسەڵاتی پیاو و نێرینەکان دەکات لە هەموو دامەزراوە کۆمەڵایەتی سیاسی ئابوورییە بچووك و گەورەکاندا. لێرە ئەو پرسیارانە دروست دەبن و پێویستە وەڵام بدرێنەوە:

- ئایا هەر یەکە و دامەزراوەیەك ـ بچووك یان گەورە ـ بەبێ سەردار و سالارێك بەڕێوە دەچێت و بەردەوام دەبێت؟ ئایا نابێ کەسێك هەبێت کە کاروباری ئەو دامەزراوەیە بەڕێوە ببات؟
- پرسیاری دووەم کە شەڕە لە سەری: ئەو بەڕێوەبەرە دەبێ کێ بێت؟ پیاو یان ژن؟
- ئایا دەکرێت هەر دووکیان ڕۆڵی سالاریی پێکەوە بگێڕن؟ واتە دوو بەڕێوەبەر لە یەك یەکەدا؟

زانایان هەموو لەسەر ئەوە کۆکن کە بەبێ بوونی بەرپرسێك هیچ دامەزراوەیەك تەمەنی درێژ نابێ و لەناو دەچێت. هەروەها ئەزموونی مرۆیی و مێژووش فێرمان دەکات کە هەبوونی دوو بەڕێوەبەر دەبێتە هۆی تێکچوونی ئەو دامەزراوەیە. خوداش دەفەرمێ: ئەگەر دوو خوا هەبان، جیهان تووشی گەندەڵی دەبوو و لەناو دەچوو.[1]

1 . لوكان فيهما ءالهه إلا الله لفسدتا. (الأنبياء: 22)

کەواتە ئەگەر "پیاوسالاری" نەبێ، بە تەئکید دەبێتە "ژنسالاری"! کێ دەڵێ لە ژنسالاریدا ژنان و کچان لە کۆت و بەندەکان ڕزگاریان دەبێ؟ چەند خێزان هەن کە باوکیان نییە، یان ئەگەر هەشیانە، بەڵام دەسەڵاتی گەورە و یەکەم لەدەست دایکیانە و سیستەمی دایکسالاری لەو خێزانەدا باوە و بڕیاری کۆمەڵایەتی و ئابووری تەنها لە دەست دایکە. ئایا کچانی ئەو دایکانە، تەنانەت کوڕەکانیشیان سەربەست و سەربەخۆن؟

توێژینەوەکان دەریدەخەن کە تەنها پیاو نییە لە نانەوەی کێشە و توندوتیژی دژ بە ژنان، بەڵکو زۆر جار ژن توندوتیژی بەرامبەر بە ژن دەیکات و کێشە بۆ یەکتری دروست دەکەن (بۆ نموونە: لە نێوان بووك و خەسوو، دایك و کچ، خوشك و خوشك، کچێك بەرامبەر بە کچێکی دیکە و هتد)، هەروەها لە سنووری خێزان زۆربەی کاتەکان، ژن خۆی توندوتیژی بەسەر خۆی دەهێنێ بەهۆی خراپیی هەڵسوکەوتەکەی و سەرپێچیکاریەکانی.[1]

لەوانەیە ڕۆشنبیران ئێستا بڵێن: مەبەستمان لە نەمانی پیاوسالاری هەوڵدانە بۆ گەیشتن بە سیستەمی "مرۆڤسالاری" بەبێ ڕەگەزسالاری! ئەوە خۆیلەخۆیدا هەڵگری ئیشکالییەتێکیترە؛ مەگەر پیاو مرۆڤ نییە؟ ئایا مرۆڤسالاری بەدەر لەوەیە کە دەبێ "مرۆڤ" حوکم بکات، نەك ڕەگەز؟ ئایا پیاوسالاری بەو مانایەی کە ئێستا زۆرینەی دەسەڵاتی ماددی (نەك مەعنەوی کە لە بەشی سێیەمدا باسی لێوە دەکەین) لە دەست پیاوە، خۆیلەخۆیدا مرۆڤسالاری نییە؟

لە لایەکیترەوە ئایا پیاوان ئامادەن زۆر بە ئاسانی پۆستی سالاریی کە وەك ڕۆشنبیران دەڵێن: ملیۆنەها ساڵە لە دەستیانە، پێشکەشی ژنان بکەن؟ گریمان کە ژنسالاری سەردەکەوێ و ئەوەی فێمێنیستان بۆی دەکۆشن، ڕۆژێك لە ڕۆژان بەدی دێ، ئایا ئەوەش ڕەگەزسالاری نییە؟ چ گەرەنتییەك هەیە کە دەسەڵاتی ژن بە سەر ژندا سەرکەوتوو بێ؟ کێ دەڵێ ژنان بە دەسەڵاتی هاوچەشنی خۆیان ڕازی و ملکەچ دەبن؟ کێ دەڵێ ئەو کات پیاوان شۆڕشێکی جیهانی بەرامبەر ژنان وەك شۆڕشی سپارتاکۆس و ... بەرپا نەکەن؟ بۆیە دەبێ فێمێنیستەکان وتاری خۆیان بگۆڕن و بۆ ئازادیی گشتی تێبکۆشن کە مرۆڤ بە ژن و پیاوەوە لێی سوودمەند و بەهرەمەند بێ؛ نەك ئازادیی ڕەگەزی؛ هەروەك ئەو نووسەرە بەم شێوەیە ڕوون دەکاتەوە:

1 . بروانه: صالح، د. محمد خالد (2008-2007): "**إستخدام العنف ضد المرأة: دراسة تحليلية مقارنة**"؛ مجلة تەرازوو؛ العدد 32-33؛ ص 169. وەرگیراوە لە: بێدار فارس عەزیز و نیگار دلێر ئەحمەد؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 73.

"ژنی ئازاد هەمیشە لەگەڵ پیاوی ئازاد هاوبەرژەوەند و هاوخەبات بوون. بۆیە ئەو کاتەی ئازادیی ڕاستەقینە و ئازادیی گشتی دەبێتە ئامانجی تێکۆشانەکان، ڕەگەز نە دەبێتە پێوەر بۆ مەرجی بەشداربوون و نە دەشبێتە پێوەر بۆ بە قارەمانبوونی ڕەگەزێك و خستنەپەراوێزی ڕەگەزەکەیترەوە، وەك ئەوەی سیستم و کولتووری نێرسالاری کردوویەتی. نابێت ژن پێی خۆش بێت ئەوەی لە مێژووی چەوساندنەوە و سەرکوتانەوە و چەپاندنی خۆیدا بەسەری هاتوە، بەسەر پیاویشدا بێت؛ چونکە ئەم خواستە جگە لە بەرزڕاگرتن و بەپیرۆزکردنی پێکهێنەرێکی نێرایەتی، کە بریتییە لە (تۆڵەکردنەوە) و ئەمەش بەشێکە لەو میکانیزمانەی نێرسالاری بە هۆیانەوە، ژن بەنێرینە دەکات و دەیمژێتە ناو مێژووەکەی خۆیەوە، ئاواش زیانێکی گەورە لە ئامانجی ئەو ئازادییە گشتییە دەدات، کە ژنی ئازاد خەباتی بۆ دەکات و دەیەوێ لەگەڵ خەباتکارانیتری کۆمەڵگاکەیدا بیکاتە فەزایەك بۆ ئازادیی ژن و ئازادیی هەمووان."[1]

**تێبینیی سێیەم)** ئاینی ئیسلام کە فێمێنیستە ڕۆشنبیرەکان پاڵپشتیی پیاوسالاری تاوانباری دەکەن، لەگەڵ چەمکی "ڕەگەزسالاری" و تەنانەت "مرۆڤسالاری"ش کە ئەو دیوی ڕەگەزسالارییە، هیچ کۆك نییە و پیاو لەبەر نێرینییەکەی بەسەر ژندا باڵاتر نازانێ و ژنیش لەبەر ئەوەی مێیە، بەرامبەر بە پیاو ناشکێنێتەوە. دەفەرمێ: ﴿... من ذكر أو أنثى بعضكم من بعض﴾؛[2] واتە: پیاو یان ژن (نێر و مێ) هیچ جیاوازییەکیان نییە و ئەو وەکو (ئەوە) و ئەویش وەکو (ئەو). ئاینی ئیسلام لەگەڵ چەمکی "مرۆڤسالاری"ش تەبا نییە، بەڵکو لەبری ئەم چەمکانە، جەخت لەسەر چەمکی "<u>شایستەسالاری</u>" دەکاتەوە؛ واتە ئەو مرۆڤە ـ چ ژن چ پیاو ـ کە لێهاتووتر و پێگەیشتووتر و تێگەیشتووتر و لەخواترستر بێ، ئەو شایستەی سالاریکردن و بەڕێوەبردنە:

﴿يا أيها الناس إنا خلقناكم من ذكر و أنثى و جعلناكم شعوبا و قبائل لتعارفوا إن أكرمكم عند الله أتقاكم﴾؛[3] واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوەم لە نێر و مێیەك خەڵق کردووە، کردوومەتە گەل و هۆز و خێڵ، بۆ ئەوەی یەکتر بناسن (نەك بۆ ئەوەی خۆتان بەسەر یەکتردا بسەپێنن و گەورەتر بزانن). بزانن کە بە تەقواترینتان لای خوا لە هەموو کەس پلەبەرزترە.

1 . ڕێبوار سیوەیلی (2012)؛ "ئازادیی ژن"؛ لە ماڵپەڕی تریبۆنی فمێنیستانی کورد:
http://kurdishfeminists.com/read.php?id=1265

2. (آلعمران: 195).

3. (الحجرات: 13).

یان دەفەرمێ: ﴿هل یستوی الذین یعلمون و الذین لا یعلمون؟﴾؛[1] واتە: ئایا ئەوانەی کە دەزانن لەگەڵ ئەوانەی نازانن، یەکسانن؟

یان دەفەرمێ: ﴿قل هل یستوی الأعمی و البصیر؟ أفلا تتفکرون؟﴾؛[2] واتە: بڵێ: ئایا کەسێك کە نابینێ و گومڕایە لەگەڵ کەسێك کە چاوی کراوەیە و ئاقڵ و تێگەیشتوویە، یەکسانن؟ ئایا قەت بیرناکەنەوە کە لە یەکتر جیایان بکەنەوە؟

یان دەفەرمێ: ﴿أفمن یهدی إلی الحق أحق أن یتبع أمن لا یهدی إلا أن یهدی؟ فما لکم کیف تحکمون؟﴾؛[3] واتە: ئایا کەسێك کە بەرەو هەق و ڕاستی ئاراستە و ڕێنوێنی دەکات، شایستەترە کە پەیڕەوی بکرێ یان کەسێك ناتوانێ ڕێنوێنی بکات، مەگەر خۆی ڕێنوێنی بکرێ؟ ئەوە چیتانە، چۆن بڕیاری وادەدەن و فەرمانی وا دەردەکەن؟

لە هەموو کۆمەڵگایەکدا، هەر کەسێك ـ ژن یان پیاو ـ دەستپاك، خۆپارێز، ئەمانەتدار و چاکەکار بێ، خەڵك زیاتر متمانەیان پێ دەکات. هەروەها کەسێك ـ ژن یان پیاو ـ خوێندەوارتر، تێگەیشتووتر، لێهاتووتر و پسپۆڕتر بێت، خەڵك زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ لایان بۆ پرس و ڕاوێژپێکردن و ڕێگەچارەخواستن لێیان بۆ کێشەکانیان. هەورەها کەسێك ـ ژن یان پیاو ـ بگاتە ئەو ڕادەیەی کە خەڵك ڕێنماییی لێ وەربگرن، خۆیلەخۆیدا دەبێتە هۆی گوێڕایەڵی و ملکەچیی بەرامبەرەکانی کە نەگەیشتوونەتە ئاستی ڕێنماییکردن، بەڵکو پێویستە خۆیان بەردەوام ڕێنمایی بکرێن.

هەورەك لە قورئاندا دەبینین کە خوا چۆن پەسنی ئەو ژنە پاشایە دەکات کە دەگوترێ ناوی "بلقیس" بووە و سەرۆکی وڵاتی سەبەء (سبأ) بووە و، تەنانەت زۆر پیاوی زانا و ڕاوێژکاریش لە دەوروبەری بوونە و لە خزمەتی ئەو ژنەدا وەك کارگوزار یان خزمەتکار بە سەرکەوتوویی کاریان کردووە:[4]

---

1. (الزمر: 9).
2. (الأنعام: 50).
3. (یونس: 35).
4 . قورئان (لە میانەی 22 ئایەتدا) زۆر بە وردی باس لە شێوازی دیموکراسیی حوکمگێڕانی ئەو ژنە دەکات کە چۆن لەگەڵ پیاوە ڕاوێژکارەکانی ڕاوێژ دەکات و لەکاتێ ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەیەکی گەورە (کە بریتی بوو لە ئامادەبوون بۆ شەڕ لەگەڵ سوپای سلێمان پێغەمبەر د.خ) هەموویان کۆ دەکاتەوە و پێیان دەڵێ: تاکو ئێستا هیچ کارێکم نەکردووە کە ڕاوبۆچوونی ئێوەم وەرنەگرتبێ و... بڕوانە: (النمل: 22-44).

﴿إني وجدت امرأة تملكهم و أوتيت من كل شيء و لها عرش عظيم﴾؛[1] واتە: لەو شوێنە ژنێکم بینی کە حوکمیان دەکات و هەموو شتێکی دراوەتێ و لەبەر دەستیەتی و دەسەڵات و کورسییەکی زۆر گەورەشی هەیە.

کەواتە من پێم وایە پەیامی ئیسلام بۆ چەسپاندنی "شایستەسالاری" لە جیاتی "مرۆڤسالاری" کە لە جەوهەردا هەمان ڕەگەزسالارییە (واتە پیاوسالاری یان ژنسالاری) زۆر گونجاوتر و پەسەندتر و پیرۆزترە و چارەسەری هەموو ئەو کێشانەش دەکات، کە کۆمەڵگاکان بەدەستیەوە دەناڵێنن و پێویستە بۆ چەسپاندنی هەوڵی بۆ بدرێت؛ چونکە کەسێك یان سیستمێك بەسەریاندا حوکم دەکات کە شایستەی حوکم نییە و ڕێگای چارەسەریش تەنها: کەسی شیاو (ژن بێت یان پیاو) لە شوێنی شیاوە (ئەو شوێنەش خێزان بێت، یان کۆمەڵگا و دامەزراوە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی).

**تێبینیی چوارەم)** سەبارەت بە نیشانە و تایبەتمەندییەکانی سیستمی پیاوسالاری، کە زۆر جار ڕۆشنبیران و فێمێنیستان دەڵێن ئایینی ئیسلام پشتگیریی لێ دەکات، پێویستە پێناسەیەکی زۆر وردتر و حاشاهەڵنەگرتر پێشکەش بکرێت، تاکو وەکو ئەو ڕۆشنبیرانە بتوانین ئەو مافە بە خۆمان بدەین و لە شوێنی قازی دابنیشین و لەبارەی ناوەڕۆك و نموونەی دەرەکی کە ڕاستێتیی پیاوسالاری بسەلمێنێ و شایەتی بۆ بدات، داوەری بکەین. بێگومان ژێردەستیی ژن بەرامبەر بە پیاو بەو مانایەی کە ژن لە ڕووی مرۆڤناسی (Anthropology)، ئەخلاقناسی (Ethics) و بەهاناسییەوە (Axiology) پلەنزمتر و بێرێزترە، ئەوە لە کولتوور و ئایینی ئیسلامیدا هیچ قبووڵ نییە و تەنانەت پەیامی سەرەکیی ئیسلام سەرتاپای بریتییە لە: یەکسانیی مرۆڤایەتی بە ژن و پیاوەوە، بەبێ جیاوازیی ڕەگەزی، نەتەوەیی، نەژادی، ئایینی و فەرهەنگی. بەڵام ئەگەر مەبەست ئەوە بێت کە ژن سەرەڕای یەکسانی لەگەڵ پیاو لە ڕووی مرۆڤایەتی و ئەخلاقی و بەهاییەوە، لە هەندێ تایبەتمەندیی دەروونی، هەڵچوون و سۆزدارییەوە بەهێزترە لە پیاوان و لە هەندێ تایبەتمەندیی زەینی، جەستەیی و فیزیۆلۆژی لە پیاو کەمتواناترە (لە بەشی سێیەمدا بە تێروتەسەلی باسی ئەم جیاوازییانە دەکەین)، دیسان بەوەش ناکرێ چەمکی پیاوسالاری بەکار

1. (النمل: 23).

بێنین بۆی. هەروەها ئەگەر لە واقیعی کوردستاندا، لە ڕووی داب‌ونەریتەوە، جیاکاریی ڕەگەزی دەبینرێ، ئەوەش هەرگیز لە دەقە ئایینییەکانی ئیسلامدا جێی نابێتەوە! بەڵام ئەگەر مەبەستیان ئەو جیاوازییانەیە کە لە ڕووی ماف و یاساییەوە لە شەریعەتی ئیسلامدا هەندێ جار دان پێدانراوە و، بەگوێرەی هەندێ تایبەتمەندیی دەروونی و جەستەیی ژن و پیاو دانراون (کە دواتر باسیان دەکەین)، ئەوەش دیسان لەگەڵ بواری مرۆڤناسی و بەهاناسیی ژنانەوە هیچ ناسازگارییەکی نییە و ناکرێ چەمکی پیاوسالاری بۆ ئەم مەبەستەش بەکار ببەین؛ لە کۆتاییدا ئەگەر لەبەر هەبوونی هەندێ کێشەی وەك خۆسووتاندن و کوشتن و توندوتیژی دژ بە ژنان بێت، ئایا پیاوی کوردیش لەو کۆمەڵگایەدا هیچ کێشەیەکی نییە؟ ئایا پیاوانیش ناکوژرێن و توندوتیژییان لێ ناکرێ؟ (لە خاڵی دواتر باسی دەکەین).

بۆیە پێویستە بەر لە هەموو شتێك پێناسەیەکی وردتر و یەکلاکەرەوەتر بۆ پیاوسالاری دابنرێت و "جیاوازی" لە ماف و ئەرکەکان لەگەڵ "جیاکاری" و دەسەڵاتگەرایی و سالاریی ڕەگەزێك وێك نەچوێنین و لەیەکتر جیایان بکەینەوە. هەروەها لە نێوان شەریعەتی ئیسلام و خراپ‌بەکارهێنانی لە کۆمەڵگادا لە لایەن چەند کەسێکەوە کە زۆر بە ئیسلامەوە پابەند نین، جیا بکەینەوە و هەموو شتی لەگەڵ یەکتر تێکەڵ نەکەین؛ ئایا دەکرێ یاساکانی هاتوچۆ بخەینە ژێر پرسیارەوە لەبەر خەمساردی و کەمتەرخەمی و پابەندنەبوونی هەندێ شۆفێر بە یاساکانەوە؟ تەنانەت لە جیهانی ڕۆژئاواشدا سەرەڕای ئەو دروشمانەی کە لەبارەی یەکسانی و بەرابەریی ژن و پیاو دراون و لەناو کۆمەڵگادا زۆر بە بەرفراوانی و پتەوی چەسپاون و، لە ڕواڵەتیشدا هیچ بەربەستێکی مافی و یاساییش لەمبارەیەوە بوونی نییە، بەڵام لەوێش ـ هەروەك لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا بە تێروتەسەلی و بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا باسی دەکەین ـ لە بەرابەری و یەکسانیی نێوان ژنان و پیاوان (بەو ڕادەیەی کە ڕۆشنبیرە فێمێنیستەکانی خۆمان تێر و ڕازی بکات) لە گۆڕەپانی سیاسەت و ئابووریدا هیچ بوونی نییە و زۆر بەربەستی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی دەبینین، سەرەڕای نەمانی سیستمی پیاوسالاری و کۆت و بەندی داب‌ونەریت و ئایینیش!

**تێبینیی پێنجەم)** پێم وایە کە بەشێکی زۆر لە کێشەکانی ژنانی کورد، پیاوانیش دەگرێتەوە؛ بۆ نموونە توێژینەوەکان دەڵێن، ئەو توندوتیژییانەی کە لە کۆمەڵگاکاندا دژ بە پیاوان دەکرێ،

زۆرینەی حاڵەتەکانن، هەروەك ئامارە نێودەوڵەتییەکان ئاماژە پێ دەکەن، کە ڕێژەی قوربانییەکانی توندوتیژی دژ بە پیاوان (14%) و ئەوەی بەرامبەر بە ژنان دەکرێ، تەنها (7%)ە.[1] ئەی ئەو ئامارانەی کە ئاماژە بە توندوتیژیی دەکەن دژی پیاوان لە لایەن ژنەکانیانەوە چی؟ ئامارە ڕەسمییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی ناوخۆ، "بەڕێوەبەرایەتی بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی دژ بە ژنان"، نزیکەی چارەکێکی سکاڵاکەرەکان پیاون کە سکاڵا لەسەر ژنانیان تۆمار دەکەن. بەپێی ئامارەکانی ئەم بەڕێوەبەرایەتییە لە هەولێر، لە ماوەی (10) مانگی ساڵی (2014)دا (2169) کەس لەو بەڕێوەبەرایەتییە سکاڵایان تۆمار کردووە، کە (1638) ژن و (531) پیاون؛ واتە نزیکەی (24.5%)ی توندوتیژییەکان لە لایەن ژنانەوە دژ بە پیاوان ئەنجام دەدرێت. (51) پیاو خۆیان کوشتووە یان خنکاندووە، جگە لەوەش (5) پیاو لە لایەن ژنەکانیانەوە کوژراون، (19) پیاویش لە ماڵ دەرکراون.[2] ئامارەکانی "ڕێکخراوی یەکێتیی پیاوانی کوردستان"* لە ساڵانی ڕابردوو و ئێستاش، ئاماژە بەو ڕاستییە دەکەن، کە پیاوانی کوردستان ساڵبەساڵ زیاتر ڕووبەڕووی توندوتیژی دەبنەوە لە لایەن ژنەکانیانەوە؛ بۆ نموونە: لە ساڵی (2012)دا (163) حاڵەتی توندوتیژیی دژ بە پیاوان و کوشتن و دەرکردنیان لە ماڵەوە تۆمار کراون، کە (27) حاڵەت کوشتنی بە فیشەك بووە! هاوکات لەچاو ساڵانی ڕابردوو، بەپێی ڕاپۆرتی ئەم ڕێکخراوە، ڕێژەی توندوتیژیی دژ بە پیاوان لە بەرزبوونەوەدا بووە.[3] کەچی ئامارەکانی ساڵی (2013)، (261) حاڵەتی تۆمار کردووە، هەروەها لە (9) مانگی ساڵی (2014)دا واتە: (1/1 تاکو 10/1)، ژمارەی (376) حاڵەتی توندوتیژی بەرامبەر پیاوان ئەنجام دراوە، وێڕای (48) حاڵەتی خۆکوشتن و خنکاندنی پیاوان و (5) حاڵەتی کوشتنیان لە لایەن ژنەکانیانەوە،[4] کە لەگەڵ ئامارە ڕەسمییەکانی بەڕێوەبەرایەتیی بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی دژ بە ژنان (10 مانگی ساڵی 2014) یەك

1 . د. خالد محمد صالح؛ المصدر نفسه؛ ص 139؛ وەرگیراوە لە: بێدار فارس عزیز و نیگار دلێر ئەحمەد؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 73.

2. پۆرتاڵی ڕووداو (2014/11/26): "**531 پیاو سکاڵایان لە دژی ژن تۆمار کردووە**"؛ لە ماڵپەڕی:
http://rudaw.net/sorani/kurdistan/251120144

* "یەکێتیی پیاوانی کوردستان" چەند ساڵێکە وەك تاکە ڕێکخراوی داکۆکیکار لە مافەکانی پیاوانی کوردستان دامەزراوە و، مۆڵەتی فەرمیشی لە لایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە پێدراوە.

3 . یەکێتیی پیاوانی کوردستان (2013/1/2): "**ئاماری توندوتیژیی دژ بە پیاوان: ساڵی (2012)**"؛ لە ماڵپەڕی سورێن:
http://surens.com/Direje.aspx?Cor=1&Jimare=7342&Besh=Hewal

4 . پەیمان قەرەداخی (2014/10/14)؛ "**توندوتیژی دژی پیاوان دوو هێندە زیادی کردووە**"؛ لە ماڵپەڕی باس نیوز:
http://basnews.com/so/News/Details/mod/37720

دەگرێتەوە. هەر بەپێی ئامارەکانی ئەم ڕێکخراوە، لە ماوەی (8) ساڵی ڕابردوودا (288) پیاو خۆیان کوشتووە و (27) پیاویش لە لایەن ژنەکانیانەوە کوژراون.[1]

جگە لەم چەشنە توندوتیژییانە، هەروەك ئاشکرایە دەکرێ پیاوانیش وەك ژنان (لە هەندێ بواردا زیاتر لە ژنانیش) لەو کۆمەڵگایەدا بەدەست هەندێ کێشەی جۆراوجۆرەوە بناڵێنن، کە پەیوەندییان بە مافی مرۆڤ و ئازادی و دادپەروەرییەوە هەیە، کە ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوون یان سنوورداربوونی سیستمی دیموکراسی و ئازادیی گشتی و ئاسایشی تاکەکەسی. تەنانەت لە بواری دەرفەتی کۆمەڵایەتی و خۆشگوزەرانیشدا، پیاو وەکو ژن لە زۆرێك لە بوارەکان بێبەشە! ئەگەر ڕۆشنبیران بە ڕاستی خەمخۆری ژنانن، پێویستە چەسپاندنی سیستمی دیموکراسی لەو کۆمەڵگایەدا بە ئەولەوییەتی خۆیان بزانن و زیاتر جەخت بکەنە سەر کارکردن بۆ چەسپاندنی مافی مرۆڤ ـ بە ژن و پیاوەوە ـ کە بەشێکی زۆر لە کێشەکان هەڵقوڵاوی ئەم کەموکورتییەن. بەڵام سەرەڕای ئەو ئەولەوییەتبەندییە کە چی بێت، نابێ ئەوە لەبیر بکەین کە بە شێوەیەکی گشتی ئەم ئازادی و مافانە لەگەڵ مرۆڤناسی و ئاکامناسی (Teleology)*ی هەر کولتوور و جیهانبینییەك گرێ دراوە.

پێگە و شوێنی مرۆڤ، هەروەها ئەرك و بەرپرسیارییەتییەکانی بەرامبەر بە کۆمەڵگا و هاوچەشنەکانی و، ماف و بەرپرسیارییەتییەکانی هەردوو لایەنی ژن و پیاو بەرامبەر بە یەك، بەستراوەتەوە بە نموونە و سەرمەشقی ژیانی ماددی و مەعنەویی هەر کۆمەڵگایەکەوە، کە پێی پابەندە. لە هیچ کۆمەڵگایەك، تەنانەت کۆمەڵگای لیبراڵیی ڕۆژئاواش کە خاوەن ئازادیی کامڵ و هەمەلایەنەیە، ماف و ئازادییەکانیان بەبێ ڕەچاوکردنی بنەماکان و ئامانجەکانی کۆمەڵگاکان و حکومەتەکان پێناسە ناکرێن و لانیکەم لە مەقامی کارپێکردن و جێبەجێکاریدا بە شێوەیەکی نهێنی و شاراوە، جۆرە پلانێك بۆ دادەڕێژن کە چوارچێوەکان و سنوورەکان تێك نەشکێنرێن. ئەوەتا

1 . پۆرتاڵی ڕووداو (2016/1/14)؛ "ساڵی ڕابردوو 526 پیاو لە کوردستان بەرەوڕووی توندوتیژی بوونەتەوە"؛ لە ماڵپەڕی: http://rudaw.net/sorani/kurdistan/1401201620

* غایەتناسی و سەرئەنجامناسی کە بە ئینگلیزی زۆر جار بە (Finality)یش ناو دەبرێت، بریتییە لە: زانست یان تیۆرییەك کە پێی وایە هەر شتێك کە لە سروشتدا دەبینین و هەر شتێك کە دەقەومێ، هەموو بەرەو غایەت و ئامانجێکی دیاریکراو هەنگاو دەنێن؛ واتە هۆکار و پاڵنەری شاراوەی پشت هەموو گۆڕانکارییەکان، تەنانەت ڕەفتارە مرۆییەکانیش، کامیان لە هەموویان ئەقڵانیترە، دەکەونە ژێر کاریگەریی ئەو غایەتە. فەیلەسووفەکان دەڵێن: تەنانەت سروشتیش ملکەچی ئەو غایەتەیە، بەڵام ئەو غایەتە لە ناو ناخیدا چێندراوە، بێ ئەوەی هەستی پێبکات و خۆی هەڵیبژاردبێت، بەڵام هی مرۆڤ، بە شێوەیەکی واعی و هۆشیارانەیە و خۆی غایەت و ئاکامی خۆی دەستنیشان دەکات.

نموونەی ئەو جۆرە پلان و یاسایانە لە پێشکەوتووترین و لیبراڵترین وڵاتانی ڕۆژئاوا زۆرن؛ بە تایبەتی وڵاتە ئەسکەندەنافییەکان و ڕۆژئاوای ئەوروپا.

**تێبینیی شەشەم)** سەبارەت بە دیاردەی توندوتیژی دژ بە ژنان، وا پێدەچێت کە ڕەوتە فێمێنیستەکان لە پرسی توندوتیژی دژ بە ژنان و ڕیشە و هۆکارەکانی، شیکردنەوەیەکی ڕاست و وردیان نییە و لە بابەتە ئاڵۆزە کۆمەڵایەتییەکان، لە جیاتی ڕوونکردنەوەی واقیعبینانە و رئالیستی و کێشەناسیی زانستییانە، بە پێشکەشکردنی چەمکێکی ئاڵۆز و لێڵ و نادیار لەژێر ناونیشانی "پیاوسالاری" خۆیان لە قووڵبوونەوە لە ڕیشەی کێشەکان دەدزنەوە. پرسیارەکە ئەوەیە: ئایا نموونەی ئەو توندوتیژییە جەستەیی، دەروونی، سێکسی، کۆمەڵایەتی و ئابوورییەی کە ئەمڕۆ لە جیهانی ڕۆژئاوا لە ژنان دەکرێ، لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هاوشێوەیمان پێ دەدۆزرێتەوە؟ ئایا لە ڕۆژئاوا سەرباری سڕینەوەی ئەو کۆت و بەندانەی کە ڕۆشنبیرانمان بە چاولێکەری لە ڕۆژئاواییەکان، بە پیاوسالاری و ئایین و داب‌ونەریتەوە ناوی دەبەن، ڕێژە و پانتایی توندوتیژی لەوێ کەمتر بووە؟ ئایا لەناوبردنی خێزان بە پاساوی دەسەڵاتی پیاو و سیستمی پیاوسالاری نەبووەتە هۆی ئەوەی کە ژنان لەوێ زیاتر و بەرفراوانتر بکەونە داوی سوودپەرستان و پیاوە سەوداکەرە سەرمایەدارەکان؟ ئایا دارشتنی یاسا و چوارچێوە کۆمەڵایەتییەکان لەو کۆمەڵگا ماددییانەدا، توانیوێتی کە بێ‌پەنایی و بێ‌متمانەیی و نەبوونی ئاسایشی جەستەیی، دەروونی و کۆمەڵایەتیی ژنان کەم بکاتەوە؟ لە بەشی دووەمدا بە تێروتەسەلی باس لەو واقیعە ترسناکانە دەکەین کە نیشاندەری ئەو ڕاستییەن، سەرەڕای نەهێشتنی چوارچێوە و ئاستەنگە نەریتییەکان و جیاکارییە کۆنەپەرستییەکان لەسەر ڕێگای ژنان، هێشتا جیاکاری بە هەموو چەشنەکانیەوە، بەکاڵازانینی ژنان و بازرگانی پێکردن تەنانەت بە منداڵەکانیشەوە، هەر ماون و بە شێوەیەك کە لەگەڵ سەردەمی نەریت و کۆنی پێشوو (کە ئێمە بە قەفەسی دوێنێ ناومان بردووە) بەراورد ناکرێت.

جگە لەوە، سەبارەت بە کێشەی توندوتیژی دژ بە ژنان، دەبێ ڕۆشنبیران سەرباری پێشکەشکردنی پێناسەیەکی ڕوون لە چەمکی "توندوتیژی"، کە هیچ لێڵی و گۆنگییەکی تێدا نەبێت و لەگەڵ سروشتی ئێمە خۆمانەتر بێ، وەڵامی هەندێ لەو پرسیارە لۆژیکییانە بدەنەوە وەکو:

ئایا دەکرێ بە شێوەیەکی گشتی هەر جۆرە توندوتیژییەك دژ بە ژن یان پیاو بخرێتە ناو قاڵبێکی نەرێنی و نالۆژیکییانەوە؟ ئەگەر وا بێ، ئەو تاوانبارانەی کە تاوانی گەورە و دڕندانە دەکەن لەناو کۆمەڵگادا و تووشی توندترین سزای یاسایی دەبنەوە، سەرەڕای ئەوەی کە بۆ ئاسایشی تاك و کۆمەڵگا پێویستە و زەروریشە، ئایا ئەوەش بە توندوتیژی هەژمار دەکرێ؟

ئایا ئەو ژن و پیاوانەی کە بەهۆی ناپاکی (خیانەت)ی سێکسی تووشی سزای ماددی و مەعنەویی کۆمەڵگا دەبنەوە، ئەوەش توندوتیژی هەژمار دەکرێ؟ هەروەك دەبینین پێناسەی نەتەوەیە کگرتووەکان بۆ توندوتیژی کە تەنها زادە و هەڵقوڵاوی فیکر و جیهانبینی و مرۆڤناسیی ماددی و کولتووری ڕۆژئاواییەکانە (نە هەموو وڵاتانی دونیا بە تایبەتی ڕۆژهەڵاتییەکان)، بە شێوەیەکی وایە کە لە زۆر بواردا لەگەڵ فیکر و جیهانبینی و کولتووری نەتەوەیی و ئایینیی ئێمە سەداسەد دژ و پێچەوانەیە؛ بۆ نموونە بە پێی ڕێککەوتننامەی نەهێشتنی هەموو جیاکارییەك دژ بە ژنان، کە بە سیداو (CEDAW)* ناسراوە، ئەگەر پیاوێك نەهێڵێ ژنەکەی خۆی لەگەڵ پیاوێکی دیکە بنوێ، ئەم کارە بە "توندوتیژیی سێکسی" لەقەڵەم دەدرێت و پیاو مافی ئەم سنووردارکردنەی نییە! بەپێی هەمان پەیماننامە، ئەگەر ژن و پیاوێك ئازادانە و بە ئارەزووی خۆیان داوێنپیسی (زینا) بکەن، یاسا ناتوانێت پێشیان پێ بگرێت و سزایان بدات؛ چونکە ئەوەش دەبێتە توندوتیژیی سێکسی! هەروەها ئەگەر مێردێك بیەوێ بە زۆرەملێ لەگەڵ هاوسەرەکەی خۆی سێکس بکات، کە ژنەکەی ــ لەبەر هەر هۆکارێك بێت ــ نەهێڵێ لێی نزیك ببێتەوە، ئەوەش بە توندوتیژیی سێکسی دەژمێردرێت، بەڵام بێبەشکردنی مێردەکە لە مافێکی شەرعی، یاسایی و مرۆیی (هەروەك گوتمان لەبەر هەر هۆکارێك بێت) بە توندوتیژی ناژمێردرێت! ئایا ئەمە دژایەتی و پارادۆکس نییە؟ ئایا پەیوەندیی نایاسایی و ناشەرعی (بەڕەڵایی و بەدڕەوشتی)،

* پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتییە کە لە (18)ی دسامبری (1979) لە لایەن ڕێکخراوی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، ئیمزا کرا و بەڵێننامەیەکی یاسایی نێوەدەڵەتییە بۆ مافی ژنان لە پێناو نەهێشتنی هەرجۆرە جیاکارییەکی نێوان پیاو و ژن، کە ماددەکەی لە (5) بەش و (30) بەندی یاسایی پێك هاتووە و ئێستاکە لە لایەن فمێنیستانەوە وەك چوارچێوەیەکی ژیدەری دەژمێردرێت بۆ دەستنیشانکردنی ڕەفتاری توندوتیژی دژ بە ژنان. لەو پەیماننامەدا هەرجۆرە بەربەست و ئاستەنگێك بخرێتە بەردەم خواست و ویستی ژنان لە هەموو بوارێکی تاکەکەسی، خێزانی، کۆمەڵایەتی، فرهەنگی، سیاسی، ئابووری و مەدەنی یان هەر کایە و بوارێکیتر، بە توندوتیژی لە قەڵەم دەدرێت. بڕوانە:

United Nation (2003), **"The Convention on the Elimination of All Forms of Discrimination against Women"**, Handbook for Parliamentarians. pp.1-125.

خۆیلەخۆیدا توندوتیژی دژ بە خێزان و ئەخلاق و کۆمەڵگا و ئاسایشی تاکەکەسی و خێزانی و کۆمەڵایەتی نییە؟

پرۆفیسۆر "هێربێرت گرچیڤۆچ" (Pro. Dr. Herbert Grziwotz) ـ یاساناسێکی ئەڵمانییە لە بواری کەسێتیدا ـ لە کتێبی "چەند پرسیارێکی گرنگ لەبارەی مافی هاوسەرێتی" دەڵێ:

"لە یاسای ئەڵماندا، پیاو مافی داواکردنی قەرەبووکردنەوە لە ژنەکەی نییە، کاتێك کە ژنەکەی دۆست (بۆیفرێند)ێك دەگرێ، با هەستەکەیشی بریندار کردبێت و کەرامەتیشی شکاندبێت، تەنانەت ئەگەر لەو بۆیفرێندەش سکپڕ بێت، تەنها بۆی هەیە کە داوای ئەو خەرجی و مەسرەفەی لێ بکات، کە لە کاتی منداڵبوونەکەی کێشاویەتی."[1]

هەروەها دەڵێ:

"پەیوەندیی سێکسی لە ژیانی هاوسەرێتیدا پێویستە بە ڕەزامەندیی هەردوو لایەنەوە بێت. پیاو مافی نییە کە هاوسەرەکەی ناچار بە سێکس بکات و، ئەگەر بە زۆرەملێ لەگەڵی بخەوێت، ئەم کردەوەیە بە دەستدرێژیی سێکسی دەژمێردرێت و ڕووبەڕووی یاسا دەبێتەوە."[2]

سەیری ئەم بەسەرهاتەش بکەن کە هەر لە ئەڵمانیا ڕووی داوە و توێژەری نامەی دوکتۆرای "أحكام الأحوال الشخصيه للمسلمين فى الغرب" بە خۆی وەکو شایەتی ئەم واقیعە دەگێڕێتەوە:

"گەنجێکی ئەڵمانی کە ببووە موسڵمان، تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی: هاوسەرەکەی دۆستێکی گرتووە و هێناویەتەماڵەوە، لە پێش چاوی منداڵەکانیان، کاتێك کە دۆستەکە ویستوویەتی لەناو ماڵەکەیدا بچێتە لای، مێردەکەی تووڕە دەبێت و لەگەڵ ئەو پیاوە (بۆیفرێندی هاوسەرەکەی) دەست بە یەخە دەبن و لێك دەدەن، کە پۆلیس دێت و مێردەکە هۆکاری شەڕ و لێکدانەکەیان بۆ دەگێڕێتەوە و داوای دەرکردنی ئەو پیاوە دەکات، بەڵام پۆلیس پێی دەڵێت: ناتوانین هیچیت بۆ بکەین؛ چونکە ئەم کابرایە میوانی ژنەکەتە و، ناتوانین دەری کەین! پۆلیس دەڕوات، دۆستی ژنەکەش لەگەڵی دەچنە ژوورەوە و، مێردەکەی سەرگەردان دەمێنێتەوە و نازانێ چی بکات. بۆی نییە لە ژنەکەی بدات؛ چونکە بەپێی یاسا دەبێتە دەستدرێژی بۆ سەر مرۆڤایەتیی ژنەکەی. هەروەها ناشتوانێ ڕێگەشی لێ بگرێت، کە لەگەڵ دۆستەکەی ڕابوێرێ و بەزمیان لێ تێك بدات؛ چونکە ئەوەش بەپێی یاسا دەبێتە پێشێلکردنی ئازادیی تاکەکەسی. هەروەها ناشتوانێ لە دۆستی ژنەکەشی بدات و لە ژوور و ماڵەکەی خۆی دەریکات؛ چونکە میوانی ژنەکەیە و

1 . Grziwotz, Herbert (1996), "Wichtige rechtsfragen zur ehe", München: DTV-Beck, pp. 30-31.

2 . Ibid., p. 27.

مادام ژن پێی خۆشە، هیچ کەس بۆی نییە ببێتە ڕێگری؛ تەنها بۆی هەیە یان ماڵەکەی بەجێ بهێڵێ و داوای جیابوونەوە بکات، یان بە سەرشۆڕی لە ماڵەکەیدا بمێنێتەوە."[1]

خاڵێکی‌تر کە دەبێ ڕەچاوی بکەین ئەوەیە کە لە جیهانی ڕۆژئاوا، بابەتی بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی دژ بە ژنان لە پێگەیەکی ململانێتی و ڕووبەڕووبوونەوەی هێزی نێوان ژن و پیاو بۆ بەدەستهێنانی هێز و دەسەڵاتی زیاتر هاتووەتە کایەوە. لەو جۆرە فەزایەدا سروشتییە کە ژنان لەبەر پچڕاندنی وابەستەیی خۆیان بە پیاوان و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات و کورسیی سالاری، زیاتر بەرەوڕووی توندوتیژیی پیاوان ببنەوە. بەڵام لە دیدگای کۆمەڵگای ئێمەوە کە خاوەن فەرهەنگ و ئایینی ئیسلامە، ژن و پیاو دوو ڕکابەر و مونافیسی یەکتر نین بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات و پێگەی ئابووری و کۆمەڵایەتیی جیاواز و سەربەخۆ، بەڵکو ئەو چەمکە نایاب و پیرۆزانە بۆ پەیوەندیی نێویان بەکار هاتووە: (میثاق غلیظ)، (زوج)، (حصن)، (لباس)، (سکن)، (مودة)، (رحمة)؛* بۆیە لە ئیسلامدا ژن و پیاو، بە گرێبەستێکی ئیلاهی و ئاسمانی دەبنە جووت و یار و هاوڕێ و هۆگر و خۆشەویستی یەکتری و پێکەوە لە پێناو گەیشتن بە ژیانێکی پڕ لە مانا و کەماڵ لە مروڤایەتیدا کار دەکەن و ڕۆڵێکی ئاریکار و تەواوکەر بۆ یەکتری دەبینن و هەر یەك، کەموکورتییەکانی ئەوی دی پڕ دەکەنەوە، بە بێرکابەری و خۆبەگەورە زانین بەسەر یەکتریدا.

هەروەها کێ دەڵێت ڕێژەی وابەستەیی ژن بە پیاوەکەیەوە دەبێتە هۆی زیادبوونی توندوتیژی لە لایەن پیاوان و ئاساییبوونەوەی دۆخەکە؟ ئەی ئەوەندە خێزانی کوردستانی دەبینین کە سەرەڕای ئەوەی کە جۆرێك وابەستەیی کۆمەڵایەتی و ئابووریی ژن بە پیاوەوە لە نێویاندا

---

1 . الرافعي، د. سالم بن عبدالغني (2002)؛ **"أحكام الأحوال الشخصيه للمسلمين فى الغرب"**؛ رسالة دوكتوراه؛ بيروت: دار إبن حزم؛ ص 497.

* چەمکی "میثاق" بریتییە لەو پەیمانە بەرزانەی کە خوای گەورە لەگەڵ میللەتانی پێغەمبەرانی بەستووە و بە چەمکی "عقد" ناو نابات؛ چونکە عقد گرێبەستێکی زەمینی و زیاتر ماددییە، کەچی وشەی میثاق، ڕەهەندێکی پیرۆز و ئاسمانیی هەیە؛ بۆیەش خوا ئەوەندە باسی پەیوەندیی نێوان ژن و مێرد دەکات و ناپاکی لەو پەیمانە هاوسەرگیرییەدا، وەك خیانەتی پەیمانە پیرۆزەکان دەزانێ. وشەی "زوج" بە مانای جووتە، کە تاکی نییە و، لە قورئاندا بۆ ژن و پیاو وەکو یەك بەکارهاتووە؛ واتە پیاو زەوجی ژنە هەروەك ژن، زەوجی پیاوە. چەمکی "حصن" بە مانای قەڵا، دیسان بۆ ژن و پیاو (محصن و محصنة) بەکارهاتووە؛ ژن و پیاوێك کە دەبنە هاوسەری یەکتر، دەبنە قەڵا بۆ یەکتر و هەروەك قەڵا، مرۆڤەکان لە زۆر مەترسییەکان دەپارێزێت، ژن و پیاویش بۆ یەکتر وان. "لباس"یش بە هەمان شێوە. جلوبەرگە کە مرۆڤ جوان دەکات، عەیبەکانی دەشارێتەوە، لە گەرما و سەرما، لە خاك و تۆز، لە بەکتریا و مێش و مەگەز و هتد دەیپارێزێ. وشەی "سکن" واتە ئارامی و دڵخۆشی بۆ یەکتر. ژن و پیاو بەهۆی هاوسەرگیرییەوە دەبنە مایەی ئارامی و سوکنایی بۆ یەکتر. "مودة" و "رحمة"ش واتە ئەو پەڕی خۆشەویستی و عەشق و سۆز بۆ یەکتر، کە هەر ئەم سۆز و خۆشەویستییە وا دەکات هاوسەرەکان لە یەکتر تێر نەبن و بەبێ یەکتری نەحەوێنەوە.

بەدی دەکرێت، بەڵام هەرگیز تووشی توندوتیژیی پیاوەکانیشیان نەبوونەتەوە؟ بۆیە ناکرێ بە شێوەیەکی نازانستییانە و نابابەتییانە هۆکاری توندوتیژی بۆ وابەستەیی ژن بە پیاو یان سیستمی پیاوسالاری بگەڕێننەوە. ئامارەکانی توندوتیژی ڕۆژئاوا لەچاو کۆمەڵگەی خۆمان زۆر بە ڕوونی شایەتیمان بۆ دەدەن کە بۆ دۆزینەوەی ڕیشەی کێشەکە دەبێ بەدوای هۆکارگەلێکی دیکە جگە لە سیستمی پیاوسالاری و وابەستەیی ژن بە پیاو بگەڕێین. بە ڕای من گرنگترین هۆکاری توندوتیژی دژ بە ژنان لە کۆمەڵگای خۆمان دەگەڕێتەوە بۆ لاوازیی بونیادی پەروەردەیی و ئەخلاقی و پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوون و پێگەیاندنی کولتووریی ئەو پیاوانە کە توندوتیژی لەگەڵ هاوسەران، کچان، خوشکان و دایکانی خۆیان دەکەن. یان دەتوانین هۆکاری کەمی و بێبەشبوونی چاشنی و بۆن و بەرامەی خۆشەویستی یان پەیوەندیی ناهاوسەنگیی دەروونی و ڕەفتاری لە نێوان هەر دوو لایەنیش زیاد بکەین. زانستی کۆمەڵناسی پێمان دەڵێت کە چوار سیستم و دامەزراوەی کۆمەڵایەتیی زۆر گرنگ هەن لە پێگەیاندن و بەکۆمەڵایەتیکردنی منداڵان، کە پێویستە ئەم چوار سیستمە، کە بریتین لە: خێزان، قوتابخانە، ئایین و ڕاگەیاندن، پێکەوە بە هەماهەنگکردنی پەیامەکانیان، ڕۆڵی پەروەردەکردن و ڕاهێنانی منداڵان ببینن، نەك ئەوەی ئێستا لە کوردستاندا دەبینین، کە جگە لە ناهەماهەنگیی پەیامەکانیان، تەنانەت دژایەتی و ناکۆکییەکی نارێك لە نێویاندا دەبینین کە زۆر مەترسیدارە. ئەوەیە کە دەبینین تاکی کورد، خاوەن کەسایەتییەکی لاواز، پینەگەیشتوو، دووفاق، دووجەمسەر، توندڕەو، توندوتیژ و هەڵچووە، کە توندوتیژییەکانی دژ بە ژنان (دایك، هاوسەر، خوشك، کچ) ڕەنگدانەوەی ئەم جۆرە پێگەیاندنە نارێك و مزیرە؛ کۆمەڵناسی پێی وایە کە سیستمی ئایین، سیستمێکی هەرەگرنگی بەکۆمەڵایەتیکردنی تاکەکانە. ئەوەی ئایین پێی دەکرێ لە کۆنترۆڵکردنی ڕەفتار و هەڵسوکەوتی تاکەکان، هەروەها چاندنی بەها و پێوەرە بەرز و باڵا مەعنەوییەکان لە ناخ و دەروونی تاکەکاندا، بە شێوەیەك کە ببنە بەشێك لە کەسایەتی و منی باڵا (Super Ego)ی تاکەکان، هیچ سیستم و دامەزراوەیەکیتر ناتوانێ وەك ئایین ئەو ڕۆڵە ببینێ. ئەو کەسەی کە دەروون و کەسایەتییەکەی بە پەروەردەیەکی دروست و گونجاو پێگەیێندرابێت، ڕەفتارەکانیشی لەگەڵ دەروونیدا هەماهەنگ دەبێت و زۆر کەمتر لە ناو خێزان و لە دەرەوەی خێزان توندوتیژی دەردەچێت. ڕۆشنبیران دەڵێن: کولتوور و پەروەردەی ئیسلامی، مرۆڤەکان بە گشتی و نێرینەکان بە تایبەتی توندوتیژ باردەهێنێ و دەیکاتە کەسێکی بێحەوسەڵە و کەمتاقەت و پشووکورت و هەڵچوو!

ئەوەتا پەروەردەی ئیسلامی پێمان دەڵێ: لە دوای خوای گەورە، ئەوە دایکە کە شایستەی ڕێز و خۆشەویستی و چاکەکاری و سوپاسە. ئایەتەکانی قورئان بە فراوانی باس لەوە دەکەن، کە تەنانەت مرۆڤ بۆی نییە وشەی "ئۆف" بە دایکی بڵێت؛[1] تەنانەت ئەگەر ئەمر بە شیرك و کوفریش بکات![2] پێغەمبەری ئیسلامیش ـ د.خ ـ لە وەڵامی ئەو پیاوەی کە لێی پرسی:

"ئەی پەیامبەری خوا! لە نێوان خەڵك کێ شایستەترە لە هەموویان بۆ ئەوەی ڕەفتارێکی باش و چاکەی لەگەڵدا بکەم؟ فەرمووی: دایکت! وتی: ئەی دوای ئەو؟ فەرمووی: دایکت! وتی: ئەی پاشان؟ دیسان فەرمووی: دایکت! وتی: پاشان؟ ئەو جارە فەرمووی: باوکت!"[3]

لەبارەی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ هاوسەرانیش دەفەرمێ:

"باوەڕدارترین باوەڕدار ئەو کەسەیە کە خۆشڕەفتارترینیانە و باشترینتان، ئەو کەسەیە کە باشتر بێ بۆ هاوسەرەکەی."[4]

سەبارەت بە شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ کچانیش، کە لەوکاتەدا تەنها لەبەر مێینەبوون زیندەبەگۆڕ دەکران، دەفەرمێ:

"هەر کەسێك کچێکی هەبێت و وەکو سەردەمی نەفامی (جاهلییەت) زیندەبەگۆڕی نەکات و بێڕێزی پێ نەکات و بچووکی نەکاتەوەو و نەیشکێنێتەوە و منداڵی کوڕ لە کچەکەی بە باشتر نەزانێ، خوا دەیباتە ناو بەهەشتەوە."[5]

یان دەفەرمێ:

"هەر کەسێك سێ کچی هەبێت و لە خۆشی و ناخۆشی لەگەڵیان بێ و بە شێوازێکی باش و چاك ڕەفتاریان لەگەڵدا بکات، خوا بەهۆی کچەکانیەوە دەیباتە بەهەشتەوە. پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەی ئەگەر دوو کچم هەبێ؟ فەرمووی: دوو کچیش

---

1 . دەفەرمێ: ﴿وبالوالدين إحسانا إما يبلغن عندك الكبر أحدهما أو كلاهما فلا تقل لهما أف ولا تنهرهما وقل لهما قولا كريما﴾؛ (الإسراء:23-24)

2 . دەفەرمێ: ﴿وإن جاهداك على أن تشرك بي ما ليس لك به علم فلا تطعهما وصاحبهما في الدنيا معروفا واتبع سبيل من أناب إلي ثم إلي مرجعكم فأنبئكم بما كنتم تعملون﴾؛ (لقمان: 15)

3 . عن أبي هريرة ـ رضى الله عنه ـ قال : "جاء رجلٌ إلى رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فقال : يا رسول الله، من أحق الناس بحسن صحابتي؟، قال: (أمك)، قال: ثم من؟ قال: (أمك)، قال: ثم من؟ قال: (أمك)، قال: ثم من؟ قال: (أبوك)"؛ (متفق عليه).

4 . عن أبي هريرة ـ رضى الله عنه ـ قال: "قال رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ أكمل المؤمنين إيمانا أحسنهم خلقا وخياركم خياركم لنسائهم"؛ رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح، تحقيق الألباني: حسن صحيح، الصحيحة (284).

5 . عن إبن عباس ـ رضى الله عنهما ـ قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: "من كانت له أنثى فلم يئدها ولم يهنها، ولم يؤثر ولده عليها - يعنى الذكور - أدخله الله الجنة"؛ (رواه أبو داود).

دەبێ! پیاوێکی‌تر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەی من کە تەنها یەك کچم هەیە؟ فەرمووی: یەك کچیش دەبێ!"[1]

لە هەندێ حەدیسدا ئەو پاداشتە براکانیش دەگرێتەوە کە ڕەفتاری باش و گونجاویان هەبێ لەگەڵ خوشکەکانیان.[2]

ئەوە پەیامی ئایینی ئیسلامە بۆ پیاوان. ئەگەر هەر سێ سیستمی "خێزان" و "قوتابخانە" و "ڕاگەیاندن"یش لەگەڵ ئەم پەیامەدا هەماهەنگ بن و ئامانجی هاوبەشیان هەبێت، ئەو کاتە ڕێژەی دیاردەی توندوتیژی بە شێوەیەکی زۆر بەرچاو کەم دەبێتەوە؛ چونکە کەسێك کە دەروونی بەو فەرموودانە ئاودێر بکات و لەسەر بنەمای ڕاسپاردەکانی ئیسلام لەبارەی هەڵسوکەوتی باش و چاك لەگەڵ ژنان پەروەردە بکرێت، ڕەفتار و کردەوەکانی لەگەڵ دەروونی هەماهەنگ و هاوشێوە دەبێت و دەزانێ کە زوڵم و ستەم و نادادگەری و توندوتیژی ــ کەم یان زۆر ــ لە هەر کات و شوێنێکدا بێ، دەبێ لە ڕۆژی دواییدا لە بەرامبەر خوا، وەڵامی ئەو کردەوانە بداتەوە.

کەواتە ئەو ڕێگەچارەسەرانەی کە فێمێنیستان بۆ نەهێشتنی توندوتیژی پێشکەشی دەکەن، ناوەستێتە سەر کێشەناسییەکی ورد و قووڵی دیاردەی توندوتیژی، کە لە ئاکامیشدا نابێتە هۆی بنبڕبوون یان کەمبوونەوەی ڕێژەکەش، بەڵکو زیاتر لە فەزای سڕینەوە و قەرەبووکردنەوەی شوێنەوارە سلبییەکانی توندوتیژی پێشکەش دەکرێت.

### 2.4.2- قەفەسی کولتوور و داب‌ونەریت:

بە بۆچوونی هەندێ لەو ڕۆشنبیرانە، سەرەڕای پێشکەوتنی کۆمەڵگای کوردی لە ڕووی ماددی و تەکنۆلۆژی و ئامرازەکانی گەیاندن و هاتنی مودێرنیتەش بۆ وڵاتەکەمان، هێشتا ئاراستەی نەریتگەرایی بە سەر ژیانی ڕۆژانەی تاکی کورددا زاڵە؛ هێشتا تێڕوانینی کۆنەپەرستی و داب‌ونەریتی کوردەواری سەبارەت بە ژن زۆر بە توندی و سەرسەختی ماوەتەوە و هیچ گۆڕانکارییەکی بە خۆیەوە نەبینیوە؛ بە واتایەکی‌تر: تێڕوانینی کۆمەڵگا بەرامبەر بە ڕۆڵ و پلەوپایەی ژنان وەکو جاران ــ سەردەمی پێش‌پیشەسازی و مودێرنیتە ــ ماوەتەوە و هاوشان

1 . عن أبي هريرة ــ رضى الله عنه ــ قال : "قال رسول الله ــ صلى الله عليه وسلم ــ من كان له ثلاث بنات فصبر على لأوائهن وسرائهن وضرائهن أدخله الجنة بفضل رحمته إياهن، قال رجل : وابنتان؟ قال: وابنتان، قال رجل: و واحدة؟ قال : و واحدة"؛ (رواه الحاكم و صححه و وافق معه الإمام الذهبي 176:4).

2 . بڕوانە: القرضاوي د. يوسف (2000)؛ "جايگاه زنان در جامعه اسلامى"؛ ترجمه: عمر قادرى؛ سنندج: مترجم؛ ص 77.

ـەگەڵ سیستمی پیاوسالاری و کولتووری ئایینی بووەتە هۆی دروستکردنی زۆر لە کێشە و کۆسپ ـە بەردەم ئازادی و پێشکەوتنی ژنان. لە داب‌ونەریتی کوردیدا، ژنان خاوەن ناسنامە و پێگەیەکی ـایبەت و سەربەخۆ نین، بەڵکو پێگەکەیان بەستراوەتەوە بە پیاوان؛ وەکو دەڵێن: هاوسەرانی ـشوو"ەکانیان، دایکانی "کوڕ"ەکانیان و کچانی "باوك"ـەکانیان؛ واتە پێگەی کۆمەڵایەتیی ژنی کورد بە وابەستەبوون بە پیاوەکانەوە مانای خۆی وەردەگرێت و دەستنیشان دەکرێت. هەورەها پێیان وایە کە داب‌ونەریتی کوردی، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە ناو کۆمەڵگادا سنووردار دەکات، ئەوەش دەبێتە هۆی دابەشکردنی کۆمەڵگا. لە حاڵێکدا کۆمەڵگا لە ژن و پیاو پێك هاتووە و پەیوەندی و کارلێکەری و هەڵسوکەوتی نێوان ئەو دوو ڕەگەزە پێویستە و جیاکردنەوەیان شتێکی مەحاڵە؛ هەروەك جارێك یەکێك لە قوتابییەکانم دەیگوت:

"مامۆستا! ئەگەر پزیشکێکی پیاو لەگەڵ پەرەستارێکی ژن ببینرێ، کە پێکەوە سەبارەت بە تەندروستیی نەخۆشێك قسە دەکەن، یان قوتابییەکی کوڕ خەریکی شەرحکردنی دەرسێك بێت بۆ کچە قوتابییەك، کەس لێی ناپێچێتەوە و بە شتێکی ئاسایی دەزانرێت، بەڵام ئەگەر کچ و کوڕێك لە تەنیشت یەکتر لەسەر مێزێك لە پارکێك یان حەوشەی زانکۆ دابنیشن و لەگەڵ یەکتر قسە بکەن، یەکسەر هەموو بە چاوێکی نەرێنی سەیریان دەکەن و بە خراپیش لێکی دەدەنەوە! بۆچی پیاو هەر ڕەفتارێکی سلبی بکات، زوو لەبیر دەکرێت و بە جۆرێك لە جۆرەکان چاوپۆشیی لێ دەکرێت، بەڵام ئەگەر ژنێك هەمان ڕەفتار بکات، گوناهێکی کردووە کە هەرگیز نابەخشرێت؟! ژنێك ئەگەر بزانێ کە مێردەکەی لەگەڵ ژنێکیتر پەیوەندیی هەیە و کڕ و بێدەنگ بێت و هیچ نەکات، هەموو دەڵێن: بە ڕاستی خاتوونە! ژنێکی پاکداوێن و تەواوە! بەڵام ئەگەر پیاوێك بزانێ کە هاوسەرەکەی لەگەڵ پیاوێکی دیکە پەیوەندیی هەیە، هەموو دەڵێن: بێغیرەت و ناپیاوە!"

لە دیدی ئەو فێمێنیستانە، داب‌ونەریتی کوردی زۆر لە ماف و ئازادییەکانی ژنانی کوردی زەوت کردووە؛ وەکو: پەیوەندیی خۆشەویستی، جۆری پۆشین، مافی چوونەدەرەوە لە هەر کات و ساتێکدا، مافی هەڵبژاردنی شوو، مافی سەربەخۆیی و بە تەنها ژیان و بە تەنها سەفەرکردن، جۆری کار و جۆری خانوو و هتد؛ بۆ نموونە لە وتارەکانیاندا دەخوێنین:

"... بێ پرس و ڕای پیاو، ژن ناتوانێت لەسەر مەسەلە جەوهەری و هەنووکەییەکان هەنگاو بنێ، یان ڕای هەبێت، ئەمە بۆ هەموو بوارەکانی ژیانی ژن ڕاستە، هەر لە مەسەلەی چوونە خوێندنگە و تەواوکردنی خوێندن و خۆئارایشتدانەوە، تا دەگاتە مەسەلەی هەڵبژاردنی کار و پاشەڕۆژ و خێزان و دانی ڕا لە بۆنە و کێشە جیاجیاکاندا، بەتایبەت لە مەسەلە سیاسیەکاندا بووەتە حەقیقەت و کولتوور، چونکە پیاو چ ڕێبازێکی سیاسی یان حزبی لە ژیانیدا هەڵبژێرێ مەحاڵە ژن لێیدەرچێت، خۆ ئەگەر رکابەرایەتی و بەربەرایەتی

بکات یان سەربەخۆیی ڕاکانی خۆی بپارێزێت، ئەوا ئەنجام جیابوونەوە و هەڵوەشاندنەوەی خێزانە. لێرەوە خێزان دەزگایەکی بچووکی ناسکە، بچووکترین کێشە گەورەترین ئەنجام دەدات بە دەستەوە، هەر بۆیە ژن خۆی دەکاتە کۆیلەی پاراستنی خێزان."[1]

ئەوەش دەڵێت:

"گرنگترین ڕێگر لەبەردەم هێنانەدی مافەکانی ژن لە کوردستان و شوێنەکانی دیکەی ناوچەکە بریتین لە ڕێگرە کەلتوورییەکان کە بەهۆی کەلتووری باوکسالاری دروست بوون و داب‌ونەریتەکانیش پاساویان بۆ دەهێننەوە... پیاو دەسەڵاتی ڕەهای هەیە. تاکە ئەرکی ژن ئەوەیە کە شەرەفی خۆی و خێزانەکەی بپارێزێ. بۆ نموونە، ئەگەر کچ پێش شووکردن پەیوەندی سێکسی ببەستێت شەرەفی خۆی و خێزانەکەی لەدەست دەدات. بزاف و خۆبەرەوپێشبردنی ژنان بە ناوی شەرەفەوە بەستراوەتەوە. ئەم کۆدە کەلتوورییانە زۆر ڕێگر دروست دەکەن لەبەردەم هێنانەدی مافی ژنانی کورد. بیرۆکەی نامووس و کۆتکردنی سەربەستییەکانی مێینە ئەنجامی ئەو کۆدە کەلتوورییانەن. بەمەش کچان و ژنانی کورد گرفتیان دێتە ڕێ لە بەستانی پەیوەندی کەسایەتی لەنێو کۆمەڵگەکەیاندا... سەرباری ئەمەش، بوونی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی بەهێز و نەبوونی پەیوەندی لەناو خێزانەکان لەوانەیە کێشەی گرنگ دروست بکەن."[2]

یەکێکی‌تر دەڵێ:

"... کولتوورێك کە هێشتاش یەکسانی ژن و پیاو تیایدا تەنها قسەیەکە و بۆ لای کردەوە هەنگاوێك هەڵناهێنێ... نامەوێ باس لەو نایەکسانییە بکەم کە لە شوێنی کار بەردەوام پیاوان دەسەڵات دەگرنەدەست و بڕیارەکان دەدەن، ناشمەوێ باسی ئەوە بکەم کە لە دەسەڵاتی سیاسیدا ژن تەنیا بۆ بەرژەوەندیی پیاوە باڵادەستەکان بەشداری پێ دەکرێ. نامەوێ باسی ئەوە بکەم لە منداڵییەوە بە گوێماندا دەخوێنن کە ئێمە وەك پیاوان نین و نابین... ئەو تێگەیشتنە لە یەکسانی کە من دەمەوێت باسی بکەم جیاوازە لەمانە... ئەو تێگەیشتنە بۆ یەکسانی دەتوانێ لە کورسی پاسێکەوە دەستپێبکات... کاتێك لە پاسێکدا پیاوێك لەبەر کچێکی وەك من لەسەر کورسییەکەی هەڵدەستێ و دەڵێ: "دانیشە" نە بە یەکسانی دەبینم و نە بە ڕێزیش... ئەو یەکسانییە کە پیاوەکانی کۆمەڵگە پێیانوایە بە ژنیان داوە لە نۆبەتی نان وەرگرتندا دەردەکەوێت کە ریزێك پیاو ڕاوەستاون نان وەربگرن، کەچی هەرکە من گەیشتمە ئەوێ، یەکەم کەسم کە وەریدەگرم و دەڕۆمەوە. ئەوە یەکسانی نییە... باوەڕهەبوون بە یەکسانی ژن و پیاو لە نۆبە سەمۆنێك و لە جێگەدان بۆ

1 . ڤیان مەجید: هەمان سەرچاوە؛ ل 17.

2 . چەلەنگ ڕەشاد یەحیا؛ هەمان سەرچاوە؛ ل26-27. (وەرگیرتوە لە: مەهاباد قەرەداغی (2006)؛ "زەنگی ئاگر و پەیامی جەستە، خوێندنەوەیەکی دەروونناسی بۆ پەیامی خۆسووتان".

دانیشتن لەسەر کورسی پاسێکدا نییە.* ئەو کەسەی باوەڕی بە یەکسانی ژن و پیاوە، دەبێ بتوانێ سوننەت (نەریت) و مودێرنیتە، ڕۆشنبیر و دواکەوتوو لێك جیابکاتەوە و دیاری بکات... باوەڕهەبوون بە یەکسانی ژن و پیاو، بنیاد و سوننەتەکان و باوەڕە دواکەوتووەکان

* خۆ ئەگەر لە داب‌ونەریتی کوردەواریماندا، وەك ئەوەی لە فەردانییەتی مودێرنیتەی ڕۆژئاوادا دەبینین، هەر کەس (ژن یان پیاو) تەنها بەرژەوەندییەکانی خۆیان ڕەچاو بکەن و بۆیەش ئەو پیاوەی کە لەسەر کورسیی پاسەکە دانیشتووە و کارێك بە ژن یان پیرەژنێك نەبێ کە لەبەر نەبوونی جێگا لەسەر پێ ڕاوەستاون، لەوانەیە ئەو کات ئەم فێمێنیستە (بۆمان نییە پێی بڵێین: ئەم خاتوونە یان ئەم ژنە، چونکە پێی ناخۆشە! بڕوانە: ل 281) بگوتایە: کولتوور و داب‌ونەریتی کوردی هەروەك پیاوی سمێڵزلی کورد، سمێڵی خۆی بە دەستی خۆی دەسووڕێنێ، بە دەسەڵاتی نێرسالاریی خۆی کۆمەڵگاش دەسووڕێنێ و بۆیەش قەت کورسیی دەسەڵات بەرنادات، تەنانەت کورسیی پاسەکانیش! پیاوی کورد ئەوەندە خۆویست، دڵڕەق، ئەنانی، خۆسەپێنەر و نەرگیسیستە کە ئامادە نییە جێگای خۆی، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کاتیش بێ، بداتە کچ یان پیرەژنێك یان ژنێکی دووگیان و، ئەگەر خوانەخواستە ئەو پاسە تووشی ڕووداوێکی خۆپێکدادان یان ستاپێکی لەناکاو بێ و ئەو ژنە دووگیانە منداڵی لەبەربچێ یان ئەو پیرەژنە بڕبڕەی پشتی خەوشدار بێ، یان ئەو کچە ڕوخسارە ناسکەکەی تووشی شێواوی ببێ، ئەو کات بە جیهانییەکان بڵێت: پیاوی کورد لە ژێر سایەی سیستمی پیاوسالاری و داب‌ونەریتەکەی، لەگەڵ ژنان توندوتیژی دەنوێنن! یان ئەگەر کچێك بۆ نموونە قوتابییەکی زانکۆ، یان ژنێکی کابان، یان پیرەژنێك لە نۆبەتی نانەوا بۆ ماوەیەکی درێژ بوەستێ و پیاوەکان نۆبەتی خۆیان نەدەنێ، لەوانەیە ئەو کچە لەبەر نۆرەی نانەوا بۆ ئەوەی لە کۆلێژ دوانەکەوێ ئەمجارە بەپێچەوانەی جارانی پێشوو بە خێرایی خۆی ئارایشت بکات و بە کچە هاوڕێیەکەی، کە لێدەپرسێت بۆ ئەم ئارایشتەت کردووە، بڵێت: ئەو پیاوانە چەند خۆویستن! لەبەر نۆبەتی نانەوا دواکەوتم و نەمتوانی بە ویستی خۆم (کە لەوانەیە لانیکەم نیو کاتژمێر پێویست بێ) ئارایشت بکەم! یان ئەو ژنە کابانە بۆ ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵەوە دوا بکەوێ و منداڵەکەی دەست لە ئامێرێکی کارەبایی مەترسیداری دابێ و تووشی ڕووداوێکی نەخوازراو بووبێ، ئەو کات ئەو فێمێنیستە بنووسێ: منداڵێکی ساوا بووە قوربانیی کولتووری نادادپەروەرانەی پیاوانی کورد! یان ئەو پیرەژنە لەبەر ژانی ئەژنۆ و لاق و پشتی، نەحەوێتەوە و هتد، ئەو کات ئەو فێمێنیستە بڵێت: پیاوانی کورد بێڕێزی لەگەڵ دایکانی خۆیان دەکەن! لە لایەکی‌ترەوە لەو فێمێنیستە دەپرسم: ئایا هەموو ژنانی کوردستان وەکو تۆ هەستانی پیاوێك لەسەر کورسیی پاسێك بۆ ئەوەی ئەوان دابنیشن، یان سرەدانی پیاوێك لە نانەواخانەیەك بۆ ئەوەی ئەوان زووتر وەربگرن، ئەمە بە بێڕێزی دەزانن؟ هەر کات هەموو ژنانی کوردستان، یان لانیکەم (51%) وەکو تۆ بیریان کردەوە، ئەوا دان بەوەدا دەنێین کە ئەم جۆرە کارانە بێڕێزین بەرامبەر بە ئافرەت؛ چونکە لە ناوەڕۆکیدا هەڵگری ئەو مانایەیە کە ژن زەعیفەیە و ناتەوانە و لەگەڵ پیاو یەکسان نییە! ئەو کات ئەمە دەبێتە یاسا و بەشێك لە کولتووری کوردەواریمان کە ئەگەر ژنێك لە سرەی نانەوا بشگرێت و لەخۆشی بدات، پیاو پشتی تێدەکات و تەنها سمێڵی خۆی با دەدات و بە خۆی دەڵێت: مادەم وەکو من یەکسانە، کەیفی خۆیەتی! با وەکو من زووتر بهاتایە! جگە لەوە، ئەو فێمێنیستە کە نایەوەێ ڕێزی لێ بگیرێ، بەڵکو یەکسانیی دەوێت وەك پیاوان، ئەگەر باش ورد بێتەوە خۆ ئەو نانەوایە کە نانی لێ دەکڕێت ئێستاکە هەموو پیاون. شۆفێری پاسەکان هەموو پیاون. با سەیری جلوبەرگی خۆی بکات، خۆ زۆربەی خەیاتەکان ئێستاکە پیاون. ئەی ئەو پارەیەی کە دەداتە خاوەن پاس و نانەوا و خەیات و پیاوانی دیکە، دیسان کەسێکی وەك "پۆل بریمەر"، کە پیاوە، دایناوە و چاپی کردووە و هتد. ئەگەر بە ڕاستی یەکسانیت دەوێ پێویستە لەجیاتی نانی پیاوان لە نانەوا و بە پارەی داهێنراوی پیاوان بکڕی و بخۆی، بە خۆت نان بکەی و نانی دەستی خۆت بخۆی، بە خۆت جلی خۆت بدوری و بە خۆت هاتوچۆ بکەی و هتد! ئایا ئەمە باشترین نموونەی یەکسانی نییە؟ ئایا ئەم یەکسانییەت قبووڵە؟ ئەوەی ئەم فێمێنیستە دەڵێ و داوای دەکات، دەکەوێتە خانەی داواکاری و دروشمەکانی فێمێنیزمی ڕادیکاڵ لە دەیەی شەستەکان، کە زۆر بە توندی دژی "ئایدیۆلۆژیای ڤیکتۆریا" دەوەستانەوە، کە جەخت دەکاتە سەر پێویستیی ڕێز و حورمەتی پیاوان بەرامبەر بە ژنان (وەکو: کردنەوەی دەرگا بۆ ژنان، یارمەتیدانیان بۆ سواربوون یان هاتنەخوارە، بە پێش خۆخستنەوەیان لەکاتی ڕۆیشتن، دانەنیشتن تا ئەو کاتەی کە ژن وەستاوە و...)، کە ئەم تاقمە فێمێنیستانە بە بێڕێزی و سووکایەتی بۆ ژن دەزانن. فێمێنیستە ڕادیکاڵەکان بەرەنگاری هەموو ئەو نموونە سیمبۆلیکانە دەبنەوە، کە ژن وەك بوونەوەرێکی ناسك و نەرم، پیاویش بە بوونەوەرێکی توند و پتەو دەناسێنن، وەك "زمان" و بەکارهێنانی هەندێ وشەی تایبەت بۆ ژنان؛ وەك "خاتوو"، "کچێ"، "ژنێ" دەوەستنەوە! هەروەك فێمێنیستانی بریتانیا، کاتێ خۆی هەوڵیاندا کە پێشگرێکی دیکەی وەك (Ms.) بۆ ژنان بەکار بێت، لەبری بەکارهێنانی (Mrs.، Miss) تاکو هەرجۆرە جیاوازییەکی ڕەگەزی نەمێنێ. بڕوانە:

**Yates, Gayle G. (1975), "What Women Want: The Ideas of the Movement"**, Cambridge, MA: Harvard University Press, p. 135.

لێژ دەکات، کە لەسەر بنەمای کۆن و دوور لە زانستی، ژنیان بە نەزان و بێتوانا و زەعیفە پێناسە کردووە."[1]

**2.4.2.1- تێبینییەکانمان لەسەر بەکۆتزانینی کولتوور و داب‌ونەریت:**

**تێبینی یەکەم)** سەبارەت بە کولتوور و داب‌ونەریتیش (وەك تێبینییەکانمان لەسەر بەکۆتزانینی پیاوسالاری) بە هەمان شێوە. ڕاستە کە لەناو کۆمەڵگاکەماندا، داب‌ونەریتی زۆر سلبی و سەقەت نە تەنها لەبواری ژناندا هەن، بەڵکو بە گشتی هەندێ داب‌ونەریتی کۆن و نوێ هەیە کە هیچ سوودێکی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ئابووری و ژینگەیی نییە بۆ کۆمەڵگامان و تەنانەت هەندێکیان لە لایەن هەمان ڕۆشنبیران و فێمێنیستان لە میدیاکانەوە پشتیوانی دەکرێن و بوونەتە بەشێك لە کولتووری کۆمەڵگا؛ وەکو: "ئاگری نەورۆز و هەڵپەڕکێی هەڕەمەکی"، "شەڕەپەڕۆ"، "گەمەی حیزب‌حیزبانێ و سیاسەتبازی"، یان هەندێ ڕەفتاری سلبی، کەوا دەبێتە بەشێکی جیانەکراوی کەسایەتیی تاکی کورد؛ وەك: "بیرنەکردنەوە و مەنتیقنەبوون"، "ڕەشوسپیبینین"، "کەللەڕەقی و وشکایەتی"، "بڕیاری پێشوەختە"، "ڕواڵەتپەرستی و ڕووکەشبینی"، "نەبوونی هێزی هەڵسەنگاندنی (چی خۆشە) و (چی باش و بەسوودە)"، "نەبوونی بڕوا و متمانەبەخۆبوون و گرنگیدان بە ڕوانینی خەڵکی بێگانە بەرامبەر بە خۆمان (بێگانەپەرستی)"، "هاوڕەنگی و تەبایی لەگەڵ زۆرینەی خەڵك"، "وەرگرتنی ئیحاء و تەڵقین لە دەوروبەر"، "وەرگرتنی فەرهەنگ و کولتووری دەرەوەی خۆمان بێ‌چەندوچۆنکردن"، "چاولێکەری"، "بەندایەتی و کەسایەتیپەرستی"، "زیادەڕەوی و ئەمپەڕ و ئەوپەڕ (ئیفرات و تەفریت)"، "دەمارگیریی هەمەلایەنە"، "بێباکی و خەمساردی لە ژیان"، "پەند و ئەزموونوەرنەگرتن لە مێژوو و ڕابردوو"، "مەسرەفگەرایی و بەرهەمخۆری"، "تەمبەڵی و بەکەم‌وسووکزانینی کار"، "مشەخۆری"، "سکپەرستی"، "بڕوانەبوون بە خۆڕاگری و ریازەت و ڕەنج و ماندووبوون" و، ئێستاش نەریتێکی نوێ سەری هەڵداوە و بەسەر دەروون و کەسایەتیی زۆرینەی خەڵکی کوردستاندا زاڵ بووەتەوە و خەریکە دەبێتە کولتووری چەقاوی ئەم کۆمەڵگایەش، کە بریتییە لە: "ماڵپەرستی"، "ماددیگەری"، "مودێلپەرستی" و "بەرژەوەندیگەرایی"!*

1 . شلێر باپیری (2013)؛ **"یەکسانیم دەوێت، نەك بە بەزەییەوە ڕێزم بگرن"**؛ سەردەمی ژن: هەمان سەرچاوە؛ ل 281 - 283.

* توێژەر وتارێکی نووسیوە (2013) لە ژێر ناونیشانی: **"دەروازەیەك بۆ دەروونناسیی دواکەوتنی کۆمەڵگای کوردی"** و بە وردی باسی هەموو ئەو ڕەفتار و نەریت و تایبەتمەندییە نەرێنیانەی کردووە و، بەنیازە پەرەی پێ بدات و وەك کتێبێك بڵاوی بکاتەوە.

هەروەها ئەو داب‌ونەریتە نەرێنی و ناپەسەندانەی تایبەت بە ژنان کە لای هەندێ کەسی دیاریکراو، نەك هەموویان پراکتیزە دەکرێن، بریتین لە: "بەکەمزانینی ژنان وەك ڕەگەزی پلەدوو"، "قەتیسکردنەوەی چەمکی شەرەف و ئابروو تەنها بۆ ژنان"، "کوشتن لەبەر ناموس و پاککردنەوەی شەرمەزاری"، "حەسرکردنی ژنان لە ماڵەوە و ڕێگریکردن لە خوێندن و کارکردنیان"، "ژن‌بەژنە"، "بەرخوێن"، "گەورەبەبچووك"، "شیربایی"، "بێبەشکردن لە میرات و نەفەقە"، "وەبەرکەوتنی ژنان بەر تەڵاق لەبەر سوێندی پیاوان"، "خەتەنەکردنیان"[1] و هتد! هەموو ئەوانە، ڕەفتار و داب‌ونەریتی ناپەسەند و نامرۆیی و ناشەرعین، کە هێشتا لە ناو کۆمەڵگای ئێمەدا باون و بە شوورەیی لەقەڵەم دەدرێن و پێویستە هەموو لایەنە ڕەسمی و ناڕەسمییەکانی کۆمەڵگا هەوڵێکی شێلگیرانە و بەرفراوان و بەردەوام بدەن بۆ سڕینەوەی ئەم دیاردە ناپەسەندانەی کە زۆر جاریش بە هەڵە لەگەڵ ئایین تێکەڵ دەکرێن و وا دەزانرێ کە ئایین پاڵپشتیانە، کەچی ئایین لە جەوهەر و ڕواڵەتەوە لێی دوور و بێزارە![2]

---

1 . بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر "خەتەنەکردنی مێینەکان" بڕواننە کتێبەکانی: "ختان الإناث: أضراره و تحريمه في القرآن" نووسینی د. مستەفا زەلمی (مامۆستای شەریعە و یاسا) و "ئافرەت لە شارستانێتی ئیسلامدا" نووسینی: د. علی جمعه محمد (موفتیی وڵاتی میسر)، کە ئەم دیاردەیە بەدوور دەزانن لە ئایینی ئیسلام و بە داب‌ونەریتی کۆن دادەنێن، کە بەرلە هاتنی ئیسلام لە ناو زۆرێك لە کۆمەڵگاکاندا باو بووە و بۆ شاری مەدینەش گوازراوەتەوە، بەڵام لە شاری مەککەدا باو نەبووە، هەر بۆیە کاتێك کە پێغەمبەر ـ د.خ ـ ڕۆیشتە مەدینە و بینی کە ئەم عادەتە لەوێ هەیە و بڵاویشە، یەکسەر هەستا بە ئامۆژگاریکردنی ئەو کەسانەی کە کاری خەتەنەکردنی مێینەیان دەکرد، بەوەی مادەم هەر عادەتتانە کە دەیکەن، زیادەڕەوی نەکەن لەو کارەیەدا، وەك ئەو فەرموودەیەی کە "ئوممو عەتیە" دەگێڕێتەوە کە: "ئافرەتێك لە شاری مەدینە کاری خەتەنەکردنی دەکرد، پێغەمبەریش ـ د.خ ـ پێی فەرموو: زیادەڕەوی تێدا مەکە و زۆری لێ مەبڕە؛ چونکە بۆ چێژی ئافرەتەکە وەها باشترە، و مێردەکەشی وای پێ خۆشترە". (رواه أبوداود و الحاكم و الطبراني و البيهقي). گەورەترین بەڵگە ئەوەیە کە خودی پێغەمبەر ـ د.خ ـ هیچکام لە کچەکانی خۆی خەتەنە نەکردووە؛ بۆیەش مەزهەبەکانی ئیسلامی (وەك حەنبەلی و شافیعی) خەتەنەکردن تەنها بۆ کوڕەکان بە واجب دەزانن و هەندێکی‌تریش (مالیکی و حەنەفی) بۆ کوڕانیش بە سوننەت دەزانن:

محمد، د. علی جمعه (مفتي مصر) (2010)؛ **"ئافرەت لە شارستانێتی ئیسلامیدا، لە نێوان دەقە شەرعییەکان و بەرهەمی فیقهی و واقیعی ژیاندا"**؛ وەرگێڕانی: أمجد محمد زاهد؛ هەولێر: نووسینگەی تەفسیر؛ ل 111-117. هەروەها: الزلمي، البروفيسور الدكتور مصطفى (2012)؛ **"ختان الإناث: أضراره و تحريمه في القرآن"**؛ أربيل: مطبعة شهاب؛ ل 7-89.

2 . بۆ نموونە هەر سەبارەت بە خەتەنەکردنی ژنان: ڕۆژنامەی "ئشپیگل" (spiegel)ی ئەڵمانی ڕاپۆرتێك سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان "خەتەنەی ژنان" لەگەڵ "ئایین" کە لە زۆر وڵاتی ئیسلامیدا ئەنجام دەدرێت، بڵاو دەکاتەوە و باسی هەوڵەکانی پیاوێکی چالاکڤانی مافی مرۆڤی ئەڵمانی بە ناوی "ڕۆدیگر نێبرگ" (Rüdiger Nehberg) دەکات، کە لە ساڵی (2000)دا سەنتەرێکی مافی مرۆڤی بە ناوی "تارگێت" (Target) دادەمەزرێنێت، کە ئامانجی سەرەکیی دژایەتی لەگەڵ خەتەنەکردنی ژنان بووە. دەڵێت: لە دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر بۆ ئەم چالاکڤانە دەرکەوتووە کە ئەم کارە دژ بە بنەماکانی ئیسلامە و پێویستە بە خودی ئیسلامیش بەرەنگاری بکرێتەوە. دەڵێت: "ئەم نەریتە تەنها دەکرێ بە هێزی خودی ئیسلام کۆتایی پێ بێت". ڕاپۆرتەکە ئاماژە بە کۆنفرانسێکی تایبەت بەو بابەتە دەکات کە لە دیسەمبەری (2006) بە بەشداریی ئیسلامناسانی گەورەی وەك "د. عەلی جومعە" ـ موفتیی گەورەی میسر ـ و "د. یوسف القرضاوي" ـ سەرۆکی یەکێتیی زانایانی ئیسلامیی جیهان ـ بەستراوە، کە بەشداربووەکان لە کۆتاییدا ئەم بڕیار و دەرئەنجامە بڵاوە دەکەنەوە: "کاری خەتەنەکردنی ژنان هیچ سازگارییەك لەگەڵ ئایینی ئیسلامی نییە و بەڵکو نەریتێکی کۆمەڵایەتیی کۆنی دژ بە بنەماکانی ئیسلامە". بڕوانە:

بەڵام سەرەڕای هەبوونی ئەم نەریتە سلبییانە، کۆمەڵگای کوردی بە دڵنیاییەوە خاوەن نەریت و بەهایەکی زۆر جوان و بەرزە کە لە کۆمەڵگاکانی دیکە جیا دەکرێتەوە. بە درێژایی مێژوو کۆمەڵگای کوردی ڕێز و حورمەتێکی تایبەتی لە ژنان ناوە و ژن چەند بە تەمەنتر بێت، ئەم ڕێزگرتنە زیاتر و واجبتر دەبێت، بە پێچەوانەی دابونەریت و کولتووری ڕۆژئاوا، کە زۆر جار بەهای ژن تەنها بە توانایی و کردەوەی سێکسی دەپێورێت و، ئەگەر جەستەی گەنج بوو و ئامادەباشی و وزەی سێکسیی هەبێت (کوردگوتەنی "هەتا تەڕایی تێدا مابێت")، ڕێزی لێ دەگیرێ؛ چونکە کاریان پێیەتی و کاتێکیش دەبێتە پیر و بەساڵاچوو، کەس نابێتە خاوەنی و دەخەنە ناو خانەی بەساڵاچووانەوە! (ئاماری پیرەژنانی هەندێ وڵاتی ڕۆژئاوایی لە خانەی بەساڵاچووان لە بەشی دووەمدا هاتووە). یان ئەو دابونەریتە کوردەوارییە، کە بەر لە مارەبڕینی کچ و کوڕێك، وا باوە کۆمەڵێك پیاوی گەورە و ڕیشسپی و کەسایەتیی پەسەندکراو و ڕێزداری کۆمەڵگا بەو پەڕی ڕێزەوە پێکەوە دەچنە ماڵی کچەکە بۆ خوازبێنی و داخوازی و ڕازیکردنی کچەکە! دیارە ئەمە نیشانەی ڕێزلێنان و گەورەزانینی کچان و ژنانە. هەبوونی ئەم چەند دابونەریت و ڕەفتارە سلبییانە، کە بە شێوەیەکی باش مامەڵە لەگەڵ ژنی کورد ناکەن، ئەوا نە پیاو تاوانبارە، نە کولتووریش وەکو گشتێك؛ بۆیە نابێ بە یەکجاری هێرش بکرێتە سەر کولتوور؛ چونکە ئەم کولتوورە بە ساڵێك و دوو ساڵ دروست نەبووە، تاکو بە یەك قسە و دوو تانەلێدان لە کۆمەڵگادا بسڕدرێتەوە. ڕەتکردنەوەی کولتووری نەتەوەیی و ئایینیی کۆمەڵگایەك، دەبێتە هۆی فەنابوونی ئەو کۆمەڵگایە و نەمانی پێوەر و بەها کۆمەڵایەتییەکان و هەروەك تیۆرەوانە بەناوبانگەکانی وەك "دۆرکایم" و "میرتۆن" دەڵێن: کۆمەڵگا تووشی "ئەنۆمیی کۆمەڵایەتی" دەبێتەوە؛ بەو مانایەی کە بونیادی کۆمەڵگا بە گشتی تووشی قەیرانێکی ئاڵۆز بە ناوی "بێپێوەریی کۆمەڵایەتی" دەبێتەوە، کە کێشەیەکی زۆر ڕیشەدار و ترسناکە و جۆرەها کێشە و تاوانی کۆمەڵایەتیی مەترسیداری لێ دەکەوێتەوە.[1]

---

El Ahl, Amira (Desamber 6, 2006), "**Theologians Battle Female Circumcision**", From:
http://www.spiegel.de/international/spiegel/a-small-revolution-in-cairo-theologians-battle-female-circumcision-a-452790.html

1 . بڕوانە: فائیز ئیبراهیم محەممەد (2013): "**کۆمەڵناسیی خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان**"؛ هەولێر: خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە؛ ل 122-128.

هیچ گومانێکمان نییە کە لە کۆمەڵگای ئێمەدا هەندێ جار ناراستە و تێڕوانینی سەلیقەیی و نابابەتییانەی هەندێ کەس، کە لە داب‌ونەریتی سلبییەوە سەرچاوەیان گرتووە، دەبێتە هۆی سنووردارکردن و قاڵبڕێژکردنی نابەجێ و ناپێویست و، نەك هەر ماف و ئاسایشی هەندێ کەس عەیبدار دەکات، بەڵکو دەبێتە هۆی جۆرێك لە بەدبینی و بێزاری بەرامبەر بە بەها کۆمەڵایەتی، کولتووری و ئایینییەکانی کۆمەڵگا؛ بۆ نموونە وەك ئەو دیدگا کلێشەییانەی خەڵك سەبارەت بە پێکەوەبوونی کچ و کوڕێك لە پارکێك، یاخود نموونەکانی دیکە کە باس کران و باس دەکرێن. بەڵام ئەوە نابێ بگاتە ئەو ڕادەیەی کە بڕیارێکی گشتی و ناڕوون و ئاڵۆز بدرێ کە تەڕ و وشك پێکەوە بسووتێنێ و سنوورەکان ببەزێنرێن و تەنانەت هێڵەسوورە ئەخلاقییەکانیش بکەونە ژێر پرسیارەوە، کە لەگەڵ بەها و بیروباوەڕە ئایینییەکانمان ناهاوسەنگە و زەمینەی هەرزەیی و بەڕەڵایی و بێپێوەری و ئانۆمیی ئەخلاقی و فەرهەنگی لە کۆمەڵگادا خۆش دەکات و نۆقرەیی و ئاسایشی مەعنەوی لە گەنجەکان و خێزانەکان زەوت دەکات. سەیر ئەوەیە کە زۆربەی ڕۆشنبیرە فێمێنیستەکان ـ هی خۆمان و هی دەرەوەش ـ لە گەندەڵی و لەناوچوونی بنەما ئەخلاقییەکان لە ڕۆژئاوا و ئاکامە سلبییەکانی لەسەر منداڵان، ژنان و گەنجان گلەیی دەکەن و داوا لە کۆڕبەند و مەکۆی گشتی و دامەزراوە یاسایی و نێودەوڵەتییەکان دەکەن بۆ نەهێشتنی ئەم دیاردانە یاسا دابنێن و بڕیاری پێویست بدەن![1] بەڵام هێشتا ڕیشە و هۆکار و پاڵنەری سەرەکیی ئەم کێشە و بێپێوەری و بێسەروبەرییانەیان نەدۆزیتەوە. ڕاستە نکۆڵی ناکرێ کە ئەم کێشە کۆمەڵایەتییانە لە کۆمەڵگاماندا هەن، بەڵام پێویستە زۆر بە وردی بکەونە بەر لێکۆڵینەوە و چوارچێوەیەکی دروست، کە نە مافی تاکەکان و ئاسایشی کۆمەڵگا لەکەدار بێ و، نە پێوەرەکان و بەها کۆمەڵایەتییە کولتوورییە ئایینییەکانیش بکەونە بەر هەڕەشەوە.

کەواتە ئەگەر بڵێین هەموو "داب‌ونەریت"ی کوردی بەرامبەر بە "مودێرنیتە"ی ڕۆژئاوا دەبێ جارانی سفر بکەینەوە، هەڵەیەکی گەورەیە و دیسان هەمان یاسای ڕاکردن (لە) کۆتێکی کۆن، (بۆ) کۆتێکی نوێیە؛ واتە: ئازادبوون (لە) کۆتی نەریت، (بۆ) کۆتی مودێرنیتە!

**تێبینیی دووەم)** هەروەك بینیمان، لە ئەندێشەی ڕۆشنبیراندا، مودێرنیتە بە شتێکی هێژا و پیرۆز دادەنرێت و ئەگەر بمانەوێ کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوو و مودێرنمان هەبێت، تەنها یەك ڕێگا

1 . بۆ نموونە بڕوانە وتاری د. نەزەند بەگیخانی: **"ئاراستەیەك بۆ وزەی سێکسی لە کوردستان"**؛ هەمان سەرچاوە.

و بژاردەمان لە پێشە و ئەویش هەمان ڕێگایە کە ڕۆژئاوا پێیدا تێپەڕیوە. ئەم جۆرە تێگەیشتنە لە کۆمەڵگای مودێرن، پڕئاشکرایە کە هەموو بەها و پێوەرە ئیسلامی و کوردەوارییەکان بە کۆنەپەرستی و نەریتێکی بۆگەنی و زەمکراو لەقەڵەم دەدرێت و لەو کەشوهەوایەی کە لە ئەنجامی ململانێ و پێکدادانی نەریت و مودێرنیتە دروست دەبێت، هەندێ لە ئەرك و بەرپرسیارییەتەکان تووشی دەستێوەردان و تێکچەڕین دەبن و، دەبێتە هۆی ئەوەی ژنان بەردەوام خەریکی دۆزینەوەی خاڵێکی گونجاو و ئاوێتەکراو بن لە نێوان ئەنجامدانی ئەرکە نەریتییەکان و بەشداری لە کۆمەڵگادا. لە حاڵێکدا ئەگەر بۆ گۆڕان و پێشکەوتنی کۆمەڵگاکەمان نموونە و سەرمەشقێکی دی جگە لە ڕۆژئاوا دەستنیشان بکەین، دەتوانین ئەرکەکانی هاوسەرێتی، دایکایەتی لەگەڵ ئەرکە کۆمەڵایەتییە سیاسییەکانی دیکەی دەرەوەی ماڵ سازان و گونجانێك دروست بکەین؛ هەروەك زۆر ئافرەتی کوردی موسڵمان دەبینین کە جگە لەوەی هاوسەری شووەکەیان و دایکی منداڵەکانیانن، کاری ئیداری، سیاسی، بازرگانی و خزمەتگوزارییش دەکەن و زۆربەشیان لە کارەکەیاندا پسپۆڕ و سەرکەوتوون.

کاتێك کە نموونە و سەرمەشقی بێگانە دەبنە ئامانج و، بەگەورەنوێنیی هەندێ لە خاڵە لاوازەکان و کێشە کۆمەڵایەتییەکانی ژنانی خۆمان و گرێدانەوەی ئەو کێشەیانە بە ئایین و شەریعەت، ئەویش بە شێوەیەکی سانسۆرکراو و چەواشە و بە تێگەیشتن و شیکردنەوەیەکی خودییانە و لاگیرانە، ئەو تێگەیشتنە تاریك و ناهاوسەنگە لە دۆخی خێزانی بۆ ژن پێشکەش دەکرێت و ڕۆشنبیریش ئەو مافە دەداتە خۆ کە چەمکەکان و ئەدەبیاتی ئایینی و نەتەوەیی لە شوێنی تایبەتی خۆیان دەربێنێ (کە تەنها لەو شوێنە تایبەتانە مسداقییەتی خۆیان دەپارێزن و مانا دەکرێن) و بە بەراوردێکی زۆر ساکارانە و ڕووکەشییانە سەبارەت بە بارودۆخی ژنانی کوردی موسڵمان، شینگێڕی و دولکەبێژی بکات، وەك ئەو کەسانەی کە بە سروود و گۆرانی لە ماتەمێنیدا بە مردووەکانیان هەڵدەڵێنەوە! وەك بڵێین کە "خێزان" و "هاوسەرێتی" و "دایکایەتی" و "خوشکایەتی" و "کچێتی" و "مێینەیی"* ناوی چەند بەکتریایەکی مەترسیدارن، کە گوایە دەبنە هۆی گۆڕانکاری لە "دی ئێن ئەی" خانەکانی ژن و لە کۆتاییشدا شێرپەنجەیەکی کوشندە و مردنێکی دراماتیکی ژنی کوردا!

* فێمینیستان دەڵێن هەموو ئەو چەمکانە بە وابەستەیی ژن بە ڕەگەزی نێر و پیاوەکان مانا دەکرێن و دەبنە ناسنامەی ژنان.

پرسیار ئەوەیە: لەسەر بنەمای چ پێوەرێکە ئەوەی دوێنێ باش و پەسەند و گونجاو بووە، ئەمڕۆ ناڕەوا و ناپەسەندە؟ لەسەر چ بنەمایەك چەمکە مودێرنەکان باشترن لە نەریتییەکان؟ کێ قازی و دادوەرە و لە کام دادگاشدا؟ بۆچی دەبێ لەو شەڕ و ململانێیەدا نەریت ببێتە قوربانی؟ بۆچی دەبێ ئێمە وەکو ئەوانمان لێبێ تاکو پێمان بڵێن پێشکەوتوو، ئەویش تەنها لە ڕواڵەتدا نەك لە جەوهەردا؟ ئەگەر وایە بۆچی ژنانی ئەوروپی ڕۆژبەڕۆژ هەمان ژیانی وەکو ژنانی ئێمە هەڵدەبژێرنەوە؟ (لە بەشی دووەمدا باس لە ئاماری ئیسلامهێنانی ژنانی ڕۆژئاوایی لە هەندێ وڵاتدا دەکەین). ئایا بە ڕاستی ژنانی ئەوروپا کە لە سایەی مودێرنیتەدا کەسایەتییان دروست بووە ڕووبەڕووی ئەو کێشە و پرسانەی کە ژنانی کۆمەڵگەی خۆمان تووش دەبن، نابنەوە؟ ئایا گەیشتوونەتە ئەو ڕادەیەی کە لە ڕووی پێگە و پایەی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئیداریدا هاوشان و هاوتای پیاوان بن؟ لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا بە پشتبەستن بە توێژینەوە و ئاماری زۆر ڕەسمی و حاشاهەڵنەگر دەیسەلمێنین کە بەشداریی ژنان لە کۆمەڵگای ئەوروپاییدا تەنها لە خزمەتی پیاوانی سیستمی کاپیتالیزمی لیبراڵیدایە و بوونەتە سووتەمەنیی مەکینەی سیستمی سەرمایەداری و ڕەونەقی بازاڕی پیاوان و، ئەمجارە بە ناوی مودێرنیتە و بە شێوەیەکی زۆر نوێ و ڕەنگاوڕەنگەوە، تووشی قەفەسی دووەم و کۆیلایەتی و ژێردەستی بوونەتەوە، کە ئێمە بە "قەفەسی ئەمڕۆ" ناومان بردووە.

خاتوو "کێیت فیگز" (Kate Figes) لە کتێبی "لەبەر ڕەگەزەکەی: ئەفسانەی یەکسانی و هەلی بەرابەر بۆ ژنان لە بریتانیا"دا بە وردی باس لەو نایەکسانییە دەکات و لە دووتوێی حەوت بەشی جیادا، دەیسەلمێنێ کە ژن لە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکاندا، تەنها لە ڕووی تیۆرییەوە گەیشتووەتە ماف و بەرابەریی ڕەگەزی لەگەڵ پیاو، بەم مانایە کە تەنها زەینییەتی خەڵك بەرامبەر بە ژنان گۆڕاوە، بەڵام لە کایەی پراکتیکیدا وەکو جاران جیاکاریی ڕەگەزی لە هەموو ڕوویەکەوە دژ بە ژنان دەکرێت، هەم لە هەلی کار، هەم لە پۆست و پلەی ئیداری و سیاسیدا، هەم لە ڕووی مووچە و مافی کرێکاری و هتد، کە هەندێ جار لە سەردەمی نەریت زۆر خراپترە؛ ناونیشانەکانی بەشەکانی بریتین لە:

(جیاکاریی ڕەگەزی دژ بە ژنان): لەو بەشەدا دەیسەلمێنێت: جیاکاریی دژ بە ژنان تەنها لەبەر ڕەگەزیان، لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانی ئەوروپا نە تەنها هێشتا هەرماوە، بەڵکو لە جاران خراپترە.

(ژنان و بازاڕی کار): ژن بۆ ئەوەی بگاتە پلەی وەزیفی و ئیداری لە دامەزراوە حکومییەکاندا، پێویستە دوو ئەوەندەی پیاوان کار بکات، بەڵام نووسەر دەیسەلمێنێ کە ژنان بە بەراورد لەگەڵ پیاوان، هێشتا لە ئاستێکی نزم و خوارتردان. سەرەڕای ئەوەش لە ژینگەی کاریدا بەردەوام تووشی ئازاری جنسی و دەستدرێژیی سێکسیش دەبنەوە.

(سەقفی شووشەیی چییە؟): نووسەر لەو بەشەدا ئاماژە بەو وڵاتانە دەکات کە ژنێك ئەگەر بیەوێ ئاستی پیشەییی خۆی بەرز بکاتەوە، دەبێ وەکو پیاوێك ڕەفتار بکات و واز لە ژنێتیی خۆی بهێنێ. لە هەندێ پیشەدا وەکو پزیشکی، ئەگەر ژنێك مێرد بکات و ببێتە خاوەن منداڵ، ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ژێر سترێس و فشار و بارگرانیی کارەکەیەوە، تا ڕادەیەك کە نەخۆشەکان بە چاوێکی نزم سەیری ژنێك دەکەن کە لەسەر سەریان وەستاوە و خزمەتی پزیشکییان پێ دەکات، واتە وەك دوکتۆرێك سەیری ناکەن، بەڵکو وەك پەرستارێك مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن.

(ژنان و سزای بوونبەدایك): لەو بەشەدا باس لە کێشەکانی دووگیانی و یاسا توند و سەختەکانی دەکات، کە دەرکردن لە کار سزایەکە بۆ زۆربەی ئەو ژنانەی کە دەیانەوێ ببنە دایك. لە لایەکی دیکەوە کێشەی دایەنگەی منداڵان و خەرجی گرانی ئەو ناوەندانە بۆ بەخێوکردنی منداڵەکەیان. هەروەها دۆخی لێکترازانی خێزانی و بەرزبوونەوەی ڕێژەی تەڵاق و هەژاری و گرفتە ماڵییەکانی ژنانی بێسەرپەرشت و بابەتەکانی دیکە.

(ژنان وەك هێزی کاری هەرزان): لە بەشی پێنجەمدا ئاماژە بەوە دەکات کە لە دۆخە سەختەکانی کارکردندا، نزیکەی نیوەی ژنانی کارکەر ناچارن دان (شیفت)ێك زیاتر کار بکەن، بەڵام ڕێژەی ئەو ژنانەی کە ناچاران یەك شیفت کار بکەن دوو ئەوەندەیە. ژنان نە تەنها لەبەر دووگیانی مووچەی کەمتر وەردەگرن، بەڵکو لەو دەرماڵە و سەرمووچانەش بێبەشن کە بۆ پیاوان تەرخان دەکرێت و، لە مافی مۆڵەتی تەندروستی، مانگانەی بێکاری، یان مووچەی خانەنشینی، کەمتر سوودمەند دەبن و دووبارە ناچارن وابەستەی پیاوان ببنەوە.

(جیاکاریی ڕەگەزی و ئەفسانەی هەلی یەکسان): لەو بەشەدا بابەتی یاسای کرێی کار و مووچەی بەرابەر و جیاکاریی ڕەگەزی دەخاتە بەر لێکۆڵینەوە. هەروەها یەکسانیی مافەکان لە دادگاکان نیشان دەدات، کە لە هەموو قۆناغێکدا بۆ ژنان دابین ناکرێت.

(فێمێنیزم و ئەفسانەی شەڕی نێوان ژن و پیاو): لە بەشی کۆتاییدا، لە دوای پێناسەکردنی چەمکی فێمێنیزم، ئاماژە بە ئەفسانەی شەڕی نێوان ژن و پیاو دەکات و نیشان دەدات کە لە

وڵاتانی پێشکەوتووی ئەوروپادا ژمارەی ئەو ژنانەی دەکەونە بەر توندوتیژی، ئەوەندە زیادە، بۆ گروپە خزمەتگوزارە کۆمەڵایەتییەکانی ژنان سەختە لە بنکە تایبەتییەکان و پەناگاکاندا داڵدەیان بدەن.[1]

**تێبینیی سێیەم)** سەبارەت بە لایەنی کولتووری و پەروەردەیی، هیچ گومانمان نییە کە پەروەردەی منداڵان کاریگەرییەکی زۆری لەسەر دروستبوونی کەسایەتیی ئەوان لە ئایندەدا هەیە، بەڵام بەوەی کە هەموو تایبەتمەندی و سیفاتە فیزیۆلۆژی و سایکۆلۆژییەکانی ژنان بە تێکڕایی بگەڕێننەوە بۆ شێوازی پەروەردەکردن و بەکۆمەڵایەتیکردنیان، لەگەڵ توێژینەوە زانستییەکان و تاقیکردنەوە نوێیە بابەتییەکان هاودژە و یەکتر ناگرنەوە:

"توێژینەوەیەکی زۆر بەرفراوان (لە ماوەی *10* ساڵدا)* لە لایەن زانکۆی "هارڤارد"ەوە ئەنجام دراوە، کە گەیشتووەتە ئەم دەرئەنجامە: ئێمە نە تەنیا لەگەڵ کوڕان بە شێوازێکی جیاواز لە کچان مامەڵە و ڕەفتار دەکەین، بەڵکو لە قسەکردنیشمان لەگەڵیان وشەی جیاواز بەکار دەهێنین؛ بۆ نموونە لەگەڵ کچاندا بە دەنگێکی ناسک و نەرم دەڵێین: (وای! چەند شیرینە!)، (وای! بووکەشووشەکەم!)، (ناسکۆڵەکەم!)؛ لە حاڵێکدا لەگەڵ کوڕاندا بە دەنگی بەرزتر قسە دەکەین و ڕستەی دیکە وەکو: (ها، کوڕە گەورە!)، (هەی کوڕە! تۆ زۆر بەهێزی و بوویتە پیاو!) بەکار دەهێنین؛ هەروەها بۆ گەمەی منداڵان بووکەشووشەی باربی دەدەینە کچەکانمان و لەیزۆکی کەسایەتیی فیلمە ئەکشێنەکان دەدەینە کوڕەکانمان. ئەم توێژینەوەیە لە خستنەڕووی دەرئەنجامەکەیدا دەڵێت: ئێمە بەو مامەڵە و ڕەفتارانە، نابینە هۆی دەستنیشانکردنی کەسایەتیی کوڕ و کچەکان، بەڵکو ئێمە تەنها بەرجەستەتری دەکەین. ڕەفتاری گەورەکان بەرامبەر بە کچ و کوڕەکان دەگەڕێتەوە بۆ هەمان جیاوازیی ڕاستەقینە و نکۆڵینەکراویان. کاتێك سۆنەیەك دەخەینە ناو گۆمەئاوێکدا، یەکسەر دەست دەکاتە مەلەکردن و ئەگەر لە خوارەوە سەیری بکەین، دەبینین کە لە نێو پەنجەکانی هەردوو پێیەکانیدا پەردە پێستێکی تەنك هەیە کە بۆ مەلەکردن دروست بووە. ئەگەر سەیری مێشکی سۆنە بکەین و شی بکەینەوە، دەبینین کە سۆنە بە (شیان و توانستی مەلەکردن)ـەوە لەدایك بووە، کە بەشی جێگیر و نەگۆڕی مێشکەکەیە. گۆمەئاو تەنها هۆیەکە بۆ دەرخستنی ئەو توانستە خۆتەنە، کە بە شێوەیەکی بێپلان فرێ دراوەتە ناوی و هۆکاری فێربوونی مەلەکردنی نییە. توێژینەوەکە دەردەخات کە ئێمە زۆرتر لەوەی کە

1 . Figes, Kate (1995), **"Because of Her Sex: Myth of Equality for Women in Britain"**, London: Pan Books, pp. 1-272.

* لە (1990) تاکو (2000)ەوە.

قوربانیی کلێشە کۆمەڵایەتییەکانی دەوروبەری خۆمان بین، بەرهەمی سیستمی بایۆلۆژیی خۆمانین. ئێمە جیاوازین؛ چونکە مێشکی ئێمە (واتە ژن و پیاو) جیاواز دروست کراوە؛ بۆیەشە ڕوانگەی جیاوازمان هەیە لە یەکتر و بەها و ئەولەوییەتبەندیی جیاوازیشمان هەیە؛ نە باشتر لە یەکترین و نە خراپتر، بەڵکو جیاوازین."[1]

سەبارەت بە کتێبەکانی خوێندنیش پێویستە لەوە ورد بینەوە کە ئەم تێگەیشتنە لە جیاکاریی ڕەگەزی لە شێوازی باو لە سیستمی خوێندن و کولتووری ئێمەدا وەك ئەوان دەڵێن، لە بنەمایەکی مرۆڤناسانە سەرچاوە دەگرێت؛ ئەویش لەبەر جیاوازیی زەین و ڕەفتاری ژن و پیاو لە ژێر کاریگەریی سیستمی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیدا و ڕەچاونەکردن و چاوپۆشی لە تایبەتمەندیی ڕسکانی، فیتری، ژینێتیکی و سروشتیی ژنان هەڵەیەکی گەورەیە. فەرهەنگ و ئایینی ئیسلامی (کە بەشێکی گەورەی کولتووری کۆمەڵگامان پێك دەهێنێ)، بە پشتبەستن بە سروشت و ڕسکان، تایبەتمەندی و توانست و ڕادە و لەباربوونی ژن و پیاو دەکاتە سەرچاوەی ماف و ئەرکەکانیان؛ هەروەك توێژینەوە زانستییە نوێیەکان دەسەلمێنن:

"کۆتایی هەشتاکان، سەرەتای دەستپێکردنی زۆر لەو توێژینەوە زانستییانە بوو کە لە لایەن زانایانەوە سەبارەت بە جیاوازییەکانی نێوان هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ و هەروەها شێوازی جیاوازیی کردەوەکانی مێشکی هەردوو لایەن. بۆ یەکەمجار لە مێژووی مرۆڤایەتی، مرۆڤ توانیی بە هۆی ئامێری سکان و کۆمپیوتەری زۆر پێشکەوتووەوە، چالاکی و کردەوەکانی مێشکی مرۆڤ بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و زیندوو ببینێت. دیتنی وێنەی مێشکی مرۆڤ، وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەی دۆزییەوە کە سەردەمێکی زۆر زانایان سەریان لێ دەرنەدەچوو، کە بووە هۆی گۆڕانکاریی ریشەیی لە ڕاوبۆچوونی زانایانی پزیشکی، مرۆڤناسان، دەروونناسان و کۆمەڵناسان و هەروەها دانپێدانی هەموویان بە جیاوازیی ڕوون و ئاشکرای نێوان ژن و پیاو. پێشتر زۆر لەو زانایانە، بەشی هەرە گەورەی ئەو جیاوازییەیان دەگەڕاندەوە بۆ ژینگەی کۆمەڵایەتی؛ بەم واتایە ئێمە هەمان کەسین کە دەبێ ببین؛ چونکە ئێمە هەمان شت فێر دەبین کە باوکان، دایکان و مامۆستایان و ڕاهێنەرانمان فێری بوونە. هەمان شت کە بە شکڵی داب‌ونەریتی ئەو کۆمەڵگایەی کە تێیدا دەژین و پەروەردە دەبین، دەردەکەون. جلوبەرگی کچان پەمەیە و دیارییەکانیشیان بوکەشووشەیە. جلوبەرگی کوڕان شینە و دیارییەکانیشیان بریتییە لە تۆپ و لەیزۆکی جەنگی. کچەکان لە باوەش دەگرین و دەگووشین و ماچیان دەکەین، لە حاڵێکدا کوڕەکان لە پشتە ملیان دەدەین و کاتێ دەگریێن، بە تووڕەیی قسەیان لەگەڵ

1 . Pease, B. and Allan, (2001) "Why Men Don't Listen and Women Can't Read Maps" London: HarperCollins, Pp. 27-28.

دەکەین. هەتا ماوەیەك پێش وایان دەزانی کە منداڵ وەکو لەوحەیەکی سپییە کە مامۆستا و ڕاهێنەر دەتوانێ بە کەیفی خۆی ڕەفتار و ئارەزووکانی خۆی لە سەری بنووسێ. بەڵام ئێستا زانست پێمان دەڵێت کە قەبارەی هۆرمۆنەکان و دەمارەکانی مێشك کە لە منداڵدانی دایکدا دروست دەبن، ئەفکار و ڕەفتارەکانیشمان لە کاتێ گەورەییدا دەستنیشان دەکەن. ئەو هۆکارە بایۆلۆژییانەی کە ئەمڕۆ دەیانناسین، نیشان دەدەن کە بۆچی ئێمە ئێستا وا بیر دەکەینەوە. توێژینەوەکان بە وردی دەسەلمێنن کە لە بنەڕەتدا هۆرمۆنەکان و شانە و دەمارەکانی مێشك، حەز و ئارەزووەکان، بیروبۆچوون، سەلیقە و ڕەفتارەکانمان دروست دەکەن. هەروەك لە توێژینەوەیەکی مرۆڤناسی دەرکەوت کە ئەو کچ و کوڕانەی کە جیا لە دایك و باوکیان، هەروەها دوور لە هەر دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی، لە دورگەیەکی دوور لە هەموو خزمەتگوزارییەك گەورە بوونە، دیسان لە هەمان نموونە و چوارچێوەی ناسراو پەیڕەوی دەکەن. کچەکان دەست بە پڕیێژی دەکەن و یاریی بووکبووکانێ دەکەن و زۆر هەوڵ دەدەن بۆ خڕبوونەوە لەگەڵ یەکتری و دروستکردنی پەیوەندیی نێو خۆیان. بەڵام کوڕەکان بە پێچەوانەی ئەوانەوە، لە ڕووی جەستەیی و دەروونییەوە خۆیان لەگەڵ یەکتر بەراورد دەکەن و هەڵدەسەنگێنن و بە ڕەچاوکردنی پلەبەندیی نێوخۆیی، گروپی جیاواز دروست دەکەن؛ واتە یەك دەبێتە پێشەنگ و ئەوانیتر دەبنە پاشکۆ... کەواتە دەمارەکانی شانەکانی مێشك و هۆرمۆنەکان کە بەسەر هەموو جەستەی مرۆڤدا زاڵن، دوو هۆکاری دەستنیشانکەری ڕەفتار و ئەفکارمانن، تەنانەت لە پێش لە دایکبوونمان. غەریزەکانمان شتێك نین مەگەر ئەو جیناتانەی کە کارەکانی جەستەی ئێمە لە بارودۆخی دیاریکراو، دەستنیشان دەکەن. لە دەیەی شەستەوە تا ئێستا زۆر گروپ کە لە بواری ژناندا چالاکی دەکەن، ئیددیعا دەکەن کە حکومەتەکان، ئایینەکان و سیستمی خوێندن و پەروەردە، هەرهەموویان پیلان و تەگبیری ئەو پیاوانەیە کە ئامانجیان سەپاندنی هێز و دەسەڵاتە بەسەر ژناندا. ئاوسکردن و بەسکپڕکردنی ژنان لە لایەن پیاوانەوە شێوازێکە بۆ باشتر کۆنترۆڵکردنیان. لەوانەیە ئەمە لە ڕووی مێژووییەوە ڕاست بێت، بەڵام لێرە ئەو پرسیارە دروست دەبێ کە: ئەگەر ژن و پیاو یەکسانن، وەك ئەو گروپانە ئیددیعا دەکەن، ئەی بۆچی پیاوان لە سەرتاسەری جیهان حوکم دەکەن؟ بۆچی لە هەموو شوێنێکی دونیا هەر پیاو دەسەڵات دەگرێ؟ توێژینەوە زانستییەکانی: شوێنەوارناسان (*Archeologists*)، دێرینەناسان (*Paleontologists*)، ڕەچەڵەکناسان (*Ethnologists*)، مرۆڤناسان (*Anthropologists*)، دەروونناسان (*Psychologists*)، بایۆلۆژیستەکان (*Biologists*)، دەمارناسان (*Neuroscientists*) و پزیشکان (*Physicians*) سەبارەت بە شێوازی چالاکی و کردەوەی مێشکی مرۆڤ وەڵامی ئەو پرسیارە دەدەنەوە کە بریتییە لە: ژن و پیاو یەکسان نین... جیاوازیی ژن و پیاو، زانستیانەیە، بەرابەری و

یەکسانیی ژن و پیاو زیاتر دۆزێکی ئەخلاقی و مەسلەحەتییە؛ واتە بەرژەوەندیی کۆمەڵگاکان وادەخوازێ کە بڵێین: ژن و پیاو بەرابەرن!؟[1]

یان ئەو توێژینە ورد و جۆراوجۆرانەی کە لە ئوردوگاکانی "کیبوتز"* (Kibbutz)ی ئیسرائیل ئەنجام دراون، کە هەر هەموویان ئەم بیرۆکەی فێمێنیزم لەبارەی پەروەردەی یەکسان و هاوبەشی کوڕان و کچان بەهەڵە دەردەخەن و دەسەلمێنن، کە ڕاستە پەروەردە و بەکۆمەڵایەتیکردنی منداڵان پرۆسەیەکی زۆر گرنگ و پڕەنگە لە دروستکردنی ڕۆڵ و کەسایەتیی منداڵان و، هیچ نکۆڵیی لێ ناکرێ، بەڵام لایەنی بایۆلۆژی و زاتیی ڕەگەزەکان (بە تایبەتی مێشك و ڕژێن و هۆرمۆنەکان) هۆکاری یەکلاکەرەوەی جیاوازییەکانی نێوان هەر دوو ڕەگەزەکەن. ئەوەتا نزیکەی (90) ساڵە کە لە ئوردوگاکانی "کیبوتز" هەوڵ دەدەن کە ڕۆڵی تایبەتی ڕەگەزێتی لە ژیانی کچان و کوڕان بە تەواوەتی بسڕنەوە. زانایان و کاربەدەستانی ئەم کۆمەڵگەیانە بە پشتبەستن بە بیرۆکەی کومۆنیزم، منداڵانی مەلۆتکە و تازە لەدایکبوو لە دایك و باوکەکانیان وەردەگرن و لە ماڵ و خزم و کەسیان جیا دەکەنەوە و لە شوێنێکی تایبەتی دوور لە ئایین، داب‌ونەریت، کولتوور، پێوەر و یاسا و هەموو پەیوەندییە خزمایەتییەکان، ڕایان دەگرن و بەخێویان دەکەن. دایك و باوك هیچ ڕۆڵێکیان نییە لە پەروەردە و خزمەت و فێرکردنیاندا. مافی سەردانیشیان نییە، مەگەر بە مۆڵەتی بەرپرسانەوە نەبێت، ئەویش نابێ لە دوو کاتژمێر تێپەڕێ. بەم شێوەیە فێری ئایدیۆلۆژیای تایبەت بە خۆیان دەکەن، کە بە تەواوەتی لە دژی هەر شتێك کە بۆن و ڕەنگی ڕەگەزێتیی هەبێت، دەوەستێتەوە و بڕوای بە "ڕەگەزێتی" نییە؛ بۆیەش پۆشاك،

---

1 . Ibid., pp. 22-24.

* "کیبوتز" بریتییە لە جۆرێك لە کۆمەڵگای لادێیی سۆسیالیستی، کە تا ڕادەیەکی زۆر لە دەوڵەتی ئیسرائیل سەربەخۆیە و پەیڕەوی لە ئایدیۆلۆژیی "سایۆنیزم" و "کومۆنیزم" ـ پێکەوە ـ دەکات. لە کیبوتز مولکایەتیی تایبەت نییە و هەموو شت لە نێوان ئەندامانی هاوبەشە و هی هەموویانە وەکو گشت و، هی هیچ کەسێکیش نییە وەکو تاك. یەکەمین کیبوتز لە ساڵی (1909) لە کەناری دەریاچەی "کینرت"ی فەڵەستین دروست بوو؛ واتە (39) ساڵ بەر لە دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیل. بەشداری و ئەندامەتی لەو کۆمەڵگایەدا خوازیارانەیە. کیبوتز دابینکردنی هەموو پێداویستییەکانی ژیانی ئەندامانی خۆی بە درێژایی ژیانیان لە ئەستۆ دەگرێت. یاسای "کارل مارکس" بە تەواوەتی لەوێ جێبەجێ دەبێت، کە دەیگوت: "هەر کەسێك بە ئەندازەی توانستەکانی کار دەکات و، بە ئەندازەی پێداویستییەکانیشی بەشی خۆی دەبات". نوێترین ئامارەکان دەڵێن: ئێستا (250) ئوردوگای کیبوتز هەیە، (106) هەزار دانیشتووی هەیە، کە (20) هەزار منداڵی خوارووی (18) ساڵی گرتووەتەخۆ و بەپێی ئایدیۆلۆژیای تایبەتی خۆی بەخێویان دەکات. بۆ زانیاریی زیاتر بڕواننە ماڵپەڕی "کیبوتز" و "بی.بی.سی":

Kibbutzim sait (2014), **"The Kibbutz Movement - Facts and figures"**, from: http://www.kibbutz.org.il/eng/

سایت BBC فارسی (22 مه 2007): **"سوسیالیزم دهقانی اسرائیل"**؛ از سایت:

http://www.bbc.com/persian/worldnews/story/2007/05/070522_mp_kibuts.shtml

پێڵاو، سەرتاشین و ئارایشتی قژ، خۆراك و هەموو شێوازی ژیان لەو کۆمەڵگایەدا بەپێی مودێلی "نەژنونەمێرد/نێرەمووکی" (خنثى) و بێڕەگەزێتی بەشێوەیەکی ڕێکخراو و بەرنامەڕێژیکراو دانراوە. کوڕەکانیان وا ڕاهێناون کە یاریی بووکەشووشە (لەیزۆك) بکەن، دوورمان بکەن، کاری ڕستن و چنین بکەن، چێشت لێنن و ماڵ پاك بکەنەوە. هەروەها کچەکانیان فێر کردووە کە تۆپانێ بکەن، بەسەر درەخت بکەون، تیر بهاوێژن، پاسەوانی بکەن و جۆرەها کاری قورس و گران ئەنجام بدەن. بیرۆکە و مەبەستی ئەم پرۆژەیە ئەوە بووە کە کۆمەڵگایەکی نەژنونەمێرد و یەکسانی ڕەها دروست بکەن، کە تیایدا هیچ نموونەیەکی نەگۆڕی ڕەفتاری نەبێت و هەموو ئەندامەکانی، ببنە خاوەن ماف و دەرفەت و شانسی یەکسان، هەروەها بەرپرسیارییەتی و ئەرکی یەکسانیش. ڕستەی ڕەگەزێتیی وەك: "پیاو خۆ ناگرێ!" و "کچ خۆ یاری بە خۆڵ ناکات!" لە فەرهەنگی زمان و وشەیاندا نییە. هەموو کارەکان تایبەتە هەم بە کوڕان، هەمیش بە کچانەوە. وشەی کوڕ و کچ یان ژن و مێرد لەوێ سڕاوەتەوە. کچان وەکو کوڕان سینگی خۆیان ڕووت دەکەنەوە.[1] زانایان و بەرپرسانی ئەو کۆمەڵگایە دەیانویست بیسەلمێنن کە دەتوانن ڕۆڵی ڕەگەزێتیی تاکەکان بگۆڕن! بەڵام بە ڕاست چی ڕووی دا؟

"توێژینەوەکان لە دوای (*90*) ساڵ ئەزموونی ژیانی کیبوتزی ئیسرائیل بەم شێوەیە دەردەخەن، کە کوڕەکان لەو ئوردوگایانە ڕۆژەکانی خۆیان بە ڕەفتاری توندوتیژ و سەرکێشانە و دژبەکۆمەڵ دەبەنە سەر. گروپی بچووك و باندی تایبەت دروست دەکەن و هەر باندێك بە ناوی سەرۆکەکەیان دەکرێت. زنجیرەیەك لە پلەکانی نێوخۆیی بەپێی هێز و توانستەکانیان، دروست دەکرێت و دەسەڵاتەکان پۆلێنبەندی دەکرێت. ئەم گروپ و باندانە لەگەڵ گروپ و باندەکانی دیکە بە بەردەوامی لە شەڕ و ململانێدان. بازرگانی بە مادده هۆشبەرەکانەوە دەکەن. لە حاڵێکدا کچان بە پێچەوانەی ئەوانەوە، هاوکاری و دۆستایەتیی یەکتر دەکەن، خۆیان لە کێشەکان دەپارێزن، لەگەڵ یەکتر بەهەستتر مامەڵە دەکەن و پێکەوە هاوسۆز و هاودەردن و ڕەحمیان هەیە بۆ یەکتر. کاتێك کە ویستیان ئەو کوڕ و کچانە بەشی زانکۆ و جۆری خوێندنیان دەستنیشان بکەن، سەرەڕای پەروەردە و ڕاهێنانی یەکسان و هاوبەش، هەر یەك بەشی تایبەت و گونجاو بە تایبەتمەندیی ڕەگەزیی خۆیان هەڵبژارد. کوڕان بەشی فیزیا، ئەندازیاری، ئەفسەری و وەرزشیان هەڵبژارد، کەچی کچان مامۆستایەتی، ڕاوێژکاری و پەرستارییان هەڵبژارد؛ کەواتە ئەوە سیستمی بایۆلۆژییە نەك کۆمەڵایەتی و کولتووری و سیاسی، کە ئەوان دەباتە لای چالاکی و سەرگەرمییەکانی

1 . Bettelheim, Bruno (2001), "**The Children of the Dream: Communal Child-Rearing and American Education**", New York: Simon & Schuster, pp. 240-243.

گونجاو بە بونیاد و پێکهاتەی تایبەت بە مێشکیان. لێکۆڵینەوەکان لەسەر منداڵانی ئەم نوردوگایانە کە بەپێی بێرەگەزێتی و نەژنونەمێردایەتی پەروەردە کراون، نیشان دەدات کە دابڕانی پەیوەندیی "منداڵ ـ دایك" بە هیچ شێوەیەك لە تایبەتمەندییە ڕەگەزییەکان، یان حەز و ئارەزوویە ڕەگەزییە تایبەتییەکانی منداڵان کەم ناکاتەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە، دەبێتە هۆی دروستبوونی نەوەیەك لە منداڵان کە هەست بە سەرگەردانی و بێبایەخی بکەن، کە لە تەمەنی گەورەییشدا دەبنە تاکێکی شەڕانی و توندوتیژ و لادەر."[1]

بۆیە ئەم شێوازە شیکارییە و تێگەیشتنە لە لایەن ئەو نووسەر و ڕۆشنبیرانەوە سەبارەت بە شێوازی باوی سیستمی پەروەردەیی بەهەند وەرناگیرێ. ئەگەرچی بە هیچ شێوەیەك ئەو جیاوازییە لە ڕۆڵەکانی ناو کۆمەڵگادا، نابێ بگاتە ئەو ڕادەیەی کە زوڵم و ناعەدالەتی و جیاکاری لە بەرپرسیارییەتی و ئەرك و مافەکاندا دروست ببێت. ئەزموونی فێمێنیزم لە ڕۆژئاوا نیشان دەدات کە وێکچوواندن و یەکسانی لە ڕۆڵ و ئەرکەکانی ژنان و پیاوان لە هیچ ڕوویەکەوە، نەك کۆتایی بە زوڵم و چەوساندنەوە و جیاکاری و نادادپەروەری و توندوتیژی دژ بە ژنان نەهێناوە، بەڵکو بووەتە هۆی زیادبوونی خێراتر و بەرفراوانتر و ڕیشەدارتربوونیان. (لە بەشی دووەم ئامارە ڕەسمییەکان شایەتیمان بۆ دەدەن).

**تێبینیی چوارەم)** لە لایەکیترەوە، بەپێی بۆچوونی فێمێنیستان، دژایەتی نێوان ڕۆڵ و ئەرکی نەریتی و مودێرن، بووەتە کێشەیەکی هەرە گرنگی ژنانی کورد. ئەگەرچی ناکرێ نکۆڵی لە دەستکەوتەکان و هێما و نیشانەکانی کولتووری مودێرن بکرێت و بە تەواوەتی ڕەت بکرێتەوە، هەروەها ناشبێ نموونەکان و چوارچێوەکانی هەڵقوڵاو لە داب‌ونەریتی خۆمان بە تێکڕایی قبووڵ و پاڵپشتی بکرێن؛ کەواتە چارەسەر چییە؟ پێم وایە سەرنجدان بە خاڵێکی گرنگ ڕێنماییمان دەکات بۆ دۆزینەوەی نموونە و چوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتیی باش و گونجاو.

گرنگیدان بە بناغە و ژێرخانی جیهانبینی و بوونناسی (Ontology) و مرۆڤناسی (Anthropology)ی هەر کولتوورێك، سەرەکیترین خاڵە بۆ سوودوەرگرتن لە ئەزموونی کۆمەڵگاکانی دیکە؛ واتە پرۆسەی بەسەرمەشقزانینی کۆمەڵگایەك و چاولێکردنی کۆمەڵایەتی بۆ وەرگرتنی نموونەکەیان، پێویستە بە وردی لەگەڵ جیهانبینی و بنەمایە تیۆرییەکانی هەر

1 . Pease, op.cit., p. 289; And: Rothman, Paul, dir (1995), " **Full Circle: The Ideal of A Sexually Egalitarian Society on the Kibbutz**", Filmakers Library, Videocassete.

کولتوورێك بگونجێت. کێشەی گەورەی کۆمەڵگای ئێمە ئەوەیە کە لە لایەك کولتووری مودێرن دەخرێتە ناو مێشك و زەینی تاکەکان و ژیانی کۆمەڵگا، نموونەیەکی هەڵقوڵاوە لە بنەمایە فیکری و تیۆرییەکان و جیهانبینیی کۆمەڵگای ڕۆژئاوا و لە لایەن ڕۆشنبیران و لیبراڵیستەکانی خۆمانەوە بانگەشەی بۆ دەکرێت و وردەوردە لە ناو کۆمەڵگادا دەسەپێندرێت و، لە لایەکی دیکەوە زۆر لە بەرپرسان و کاربەدەستانی کۆمەڵگاکەمان، بەتایبەتی بەرپرسانی بواری کولتووری، ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن (کە زۆربەشیان باکگراوندێکی چەپی و مارکسیزمیان هەیە)، بەبێ ڕەچاوکردنی بناغە و ژێرخانی گەورەی کولتووریی خۆمان، تەنها بە چاولێکەری و کۆپیکردنی نموونەی بێگانەکان بە شێوەیەکی زۆر ساکارانە و ڕووکەشییانە کار دەکەن، کە لە ئاکامدا بەهۆی ئەم کۆپیکردنە کۆمەڵایەتییە لە پاڕادایم و نموونەی ڕۆژئاوایی، دژایەتی و پارادۆکسی نێوان پێوەر و بەهاکانی هەر دوو توخمی "نەریت" و "مودێرن"دا دروست دەبێت و لە کۆتاییدا، هەروەك کۆمەڵناسان دەڵێن: بێپێوەری و ئانۆمیی کۆمەڵایەتی و قەیرانی ناسنامەیی و سەرلێشێواوی لە ئاکامی بەریەککەوتنی دوو پێوەری ناکۆك و دژبەیەك دروست دەبێت: تاکی کورد (ژن و پیاو)، لە لایەکەوە نەریتەکەی پێی دەڵێت: تۆ کوردی! تۆ موسڵمانی! لە لایەکیترەوە کولتووری ڕۆژئاوایی پێی دەڵێت: تۆ ئازاد و سەربەخۆی لە هەر چوارچێوەیەکی ئایینی، نەریتی، کۆمەڵایەتی، نەتەوەیی، خزمایەتی و هتد! لەو جۆرە فەزایەدایە کە خۆکوژی و خۆسووتاندن و کوشتن و برین و توندوتیژی و گەندەڵی و دزی و ماددە هۆشبەرەکان و تەڵاق و تاوان و کێشە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە و جۆرەها نەخۆشیی دەروونیی وەك خەمۆکی و دڵەڕاوکێ سەرهەڵدەدەن و ڕێژەکەی ڕۆژبەڕۆژ بەرەو زیادبوون دەڕوات.[1]

لە لایەکیترەوە، دەبێ ئاگاداری ئەوەش بین بەرلەوەی ئەوەندە بانگەشە بۆ نموونەی ڕۆژئاوایی بکەین و هەوڵ بدەین بۆ بڵاوبوونە و سەپاندنی بەسەر کۆمەڵگای کوردیدا، پێویستە چۆنیەتی گۆڕانی سیستمی خێزانی لە ڕۆژئاوا لەدوای سەردەمی پیشەسازی و مودێرنیتە، بە وردی شی بکەینەوە و لە ئاکامەکانی بکۆڵینەوە. بە پێی پەیامی زانایان، بە تایبەتی کۆمەڵناسان و هەروەها تێبینییەکانی توێژەر لەکاتی سەردانی وڵاتانی ئەوروپا و قسەوباس لەگەڵ چەند مامۆستایەکی زانکۆکانی ئەو وڵاتانەدا، بەپێچەوانەی ئەوەیە کە لە سیستمە فیکری و مەعریفییەکەی فێمێنیستەکانی خۆمان دەگوزەرێ! شەپۆلی گەڕانەوە بۆ کۆڵەکەی خێزان لە

1 . بڕوانە بابەتی "ئانۆمیی کۆمەڵایەتی" لە: فائیز ئیبراهیم محەممەد؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 122-128.

ڕۆژئاوا دەستی پێ کردووە و وا پەرە دەستێنێ. ئەی ئەو ژن و پیاوانەی ڕوو لە ئیسلام دەکەن و دەبنە موسڵمان نیشانەی چییە؟ توێژینەوەکان (کە دواتر لە بەشی دووەمدا باسی دەکەین) دەردەخەن کە هۆی سەرەکی ئیسلامهێنانی ژنە ڕۆژئاواییەکان، بەنرخزانین و پیرۆزدانانی خێزان و ژیانی هاوسەرایەتییە لە ئایینی ئیسلامدا، کە ئامادەن ملکەچی ئەمر و نەهیەکانی بن و تەنانەت سەرەڕای بێزاریی کۆمەڵایەتی لە لایەن کۆمەڵگاکەیانەوە، حیجاب بکەن!

"لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، ژنان ئازادییەکانیان یەك لە دوای یەك دۆزییەوە، پیاویان بە دوژمن زانی و، لە ناکامدا پەیوەندییەکانی نێوان ژنان و پیاوان بە سەختی کێشەی تێ کەوت. ژنان تووڕە بوون و پیاوانیش گێژ و سەرگەردان. لە نەوەکانی پێشوو، ڕۆڵ و ئەرکەکان بە ڕوونی پێناسە و دابەش کرابوون... پیاو دەیزانی بەرپرسیارییەتەکانی چین و ژنیش بە هەمان شێوە. ژیان سادە بوو. بەڵام لەناکاو هەموو شت گۆڕا. پرۆگرامە تەلەڤزیۆنییەکان و ڕیکلامە بازرگانییەکان دەستیان پێکرد بە نیشاندانی فیلم و بەرنامە و ئەو وێنانەی کە پیاویان لەچاو ژنان بە کەمتر دادەنا و ژنان ڕۆژبەڕۆژ داوای ماف و یەکسانییەکی زیاتریان دەکرد. ژنان دەیانزانی کە چییان دەوێت و بۆ کوێ دەڕۆن، بەڵام زۆر لە پیاوان هەستیان بە پاشکۆیی و دواکەوتوویی دەکرد... بۆ نموونە: ئەگەر ژنێك لەبارەی نابەرابەری و نایەکسانییەکان قسە بکات، هەموو گوێی لێ دەگرن و هاوسۆزی و هاودەردیی خۆیان بۆ دەردەبڕن، بەڵام ئەگەر پیاوێك ئەو کارە بکات، وەکو پیاوێکی بێزار و دژەژن پێناسە دەکرێت. (ئەگەر ژنێك لە پێش چاوی خەڵك زللەیەك لە ڕوومەتی پیاوێك بدات، هەموو دەڵێن: گومان لەوەدا نییە کە ئەو پیاوە خەتابارە!)... فێمێنیستەکان لە پێناو بڕینەوەی نابەرابەرییەکانی نێوان ژنان و پیاوان دەستبەکار بوون. ئەم بزووتنەوەیە بەڵێنی بە ژنان دا کە ئەوان لە کۆت و بەندی شۆڕگەی قاپشۆریی مەتبەخەکان قوتار دەکات... لە بریتانیا، لە هەر (*5*) خێزان، یەکێکیان لە ژێر سەرپەرشتیی ژنە، لە حاڵێکدا لە هەر (*50*) خێزان تەنها یەك خێزان لە ژێر سەرپەرشتیی پیاوێکە کە بێهاوسەرە. ژنانی ئێستا زۆر تووشی قورحەی گەدە دەبن، سەکتە لێیان دەدا و کێشەی دڵیان تووش دەبێ و لەگەڵ زۆر لە نەخۆشییە جەستەیی و دەروونییەکان کە لەبەر سترێس و خەم و خەفەت دروست دەبن، دەستەویەخەن. ڕۆژگارێك هەموو ئەو نەخۆشیانە تەنها تایبەت بوو بە پیاوان... وا مەزەندە دەکرێت تا ساڵی (*2020*)، ڕێژەی (*25%*)ی ژنان لە جیهانی ڕۆژئاوا بە بەردەوامی بەبێ شوو ژیان دەبەنە سەر. ئەوە دۆخێکی زۆر نائاسایی و ناسروشتییە و لەگەڵ خواست و سیستمی بایۆلۆژیی مرۆڤدا ناگونجێت و دەبێتە هۆی لێکترازانی کۆمەڵگا. ژنان ئێستاکە وەکو پیاوان کار دەکەن، زۆربەیان تووڕە، قەڵس، تووشی گوشاری دەروونی، هەروەها

دڵەڕاوکێ و بێئۆقرەیی دەبن و ڕۆژبەڕۆژیش تەنهاتر دەبن... بە ڕاستی هەمووومان گێژ و سەرگەردان بووین؟"[1]

لە ڕاستیدا کۆمەڵگای ڕۆژئاوا لە دوای ئەزموونی قەیرانە ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییەکان و ئاکامە ناخۆشەکانی، کە دەرهاوێشتەی بێسەروبەری و ئانۆمیی خێزان و ڕاکردنی ژنانە لە ماڵ و ڕووتێکردنی لەڕادەبەر و بێسنووری ئەوان لە کاری دەرەوەی ماڵ و پەیوەندییە سێکسییەکانی دەرەوەی سنووری خێزانە کە ئێستا هەست بەو مەترسییەی کردووە کە لەناوچوونی خێزان دەبێتە هۆی تێکچوونی شیرازەی کۆمەڵگا؛ بۆیە ئەمڕۆ "خێزانتەوەری" و جەخت لەسەر ڕۆڵی دایکایەتی بۆ تەندروستی و گەشەکردنی کۆمەڵگا بووەتە دروشمێکی جیهانی و نێودەوڵەتی و، وڵاتانی پێشکەوتووی ڕۆژئاواییش وا تێدەگەن کە بوونی خێزانێك پێویستە، کە دایك و هاوسەرێکی تێدا بێت و کاروباری بەڕێوە ببات و، ببێتە هۆی پتەوکردنی بونیادی خێزان و کۆمەڵگا. بێهۆ نییە کە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، بەتایبەتی ڕێکخراوی یونسکۆ* (UNESCO)،** ساڵێکی ناو ناوە "ساڵی خێزان" و بەم دواییە خێزان ڕێزی لێ دەگیرێتەوە؛ چونکە ڕۆڵی خێزانداری و پتەوکردنی بونیادی خێزان، کارامەترین و گرنگترین جۆری بەشداری و چالاکیی کۆمەڵایەتییە، کە لەبەر لێهاتوویی و شیانیان، زیاتر چاوەڕوانی لە ژنان دەکرێت.

"ساموئل سمایلز"*** ـ زانایەکی ئینگلیزی و یەکێك لە کۆڵەکەکانی شۆڕشی ئینگلترایە ـ لە کتێبی "خودیارمەتی" (Self-Help)ـەکەیدا دەڵێ:

"دەزگاکانی حکومەت کە ژنی بە کارکردن لە کارگەکان خەریك کردووە، ڕاستە کە دەبێتە هۆی دەستکەوت و سامانێکی گەورە بۆ وڵات، بەڵام لە لایەکی دیکەوە دەبێتە هۆی وێرانکردنی بونیادی خێزان؛ چونکە هەڕەشەیە لە خێزان و ستوونەکانی خێزان دەڕووخێنێت و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی هەڵدەوەشێنێتەوە و ژن لە شوو و منداڵ و کەسوکاری دوور دەخاتەوە و لێیانی دەدزێت. ئەم حکومەتە، جگە لەناوبردنی ئەخلاق، هیچ دەستکەوتی دیکەی نییە. ئەرکی ژن زیاتر لەوەی کە لە دەرەوەی ماڵ کار بکات، ئەوەیە کە لە ماڵەوە منداڵان پەروەردە بکات، بەڵام کارگەکان ناچاری دەکەن ئەو ئەرکەی

---

1 . Pease, B. and Allan (2003), "Why Men lie and Women cry", London: Orion House, pp. 3-5.

* ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پەروەردە و زانست و فەرهەنگ کە سەربە نەتەوەیەکگرتووەکانە و لە ساڵی (1945) دامەزراوە.

** United Nations Educational, Scientific and Cultural Organization

*** Samuel Smiles (1812-1904).

لەبیر بکات تا ئەو ڕادەیەی کە چیتر ماڵەوە بە ماڵ نەزانێ و منداڵەکانیش باش پەروەردە نەبن!"[1]

هەموو ساڵێك توێژینەوە و ڕاپرسییەك لە لایەن "دەزگای گالۆپ"ی ئەمریکی (The Gallup Organization)* بۆ زانینی ڕای گشتیی ژنان لەبارەی "پیشەی دەرەوەی ماڵ" یان "مانەوە لە ماڵ و کابانیکردن" ئەنجام دەدرێت، کە ئەنجامەکەی لە ساڵی (2005) ڕێژەی (53%)ی ژنانی ئەمریکی خۆزگە دەخوازن کە بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان و لە ماڵەوە بنەوانەیی بکەن. ئەم ڕێژەیە لە ساڵی (2007) دەگاتە (45%).[2] ئایا ئەوە نیشانەی ماندووبوون و بێتاقەتیی ژنان نییە لە کاری دەرەوە، کە نزیکەی نیوەی ژنانی کۆمەڵگای ئەمریکی خوازیاری بەجێهێشتنی کاری دەرەوەی ماڵن؟

توێژینەوەیەکی گەورە و بەرفراوانیش لە ڕووی دیموگرافی و کۆمەڵایەتییەوە لە لایەن سەنتەری بەناوبانگی "پیو" (Pew Research Center)** لە ساڵی (2012) ئەنجام دراوە، کە بەشێك لەو توێژینەوەیە بە ناونیشانی "دوای چەند دەهە لە داکشان، ڕێژەی مانەوەی ژنان لە ماڵەوە لە هەڵکشاندایە" بڵاو کراوەتەوە؛ بەشێك لە دەرئەنجامەکانی بریتین:

"هەرچەندە زۆر بە کەمی لە میدیاکان تیشك دەخرێتە سەر ئەو ژنانەی کە لە ماڵەوە دەمێننەوە و تەنها شووەکانیان لە دەرەوە کار دەکەن و، وادەردەخەن کە ئەمە نیشانەی ناڕۆشنبیری و ناتوانایی و بێکەڵکیی ئەو ژنانەیە کە لە دەرەوە کار ناکەن، بەڵام بەپێچەوانەوە ڕێژەیەکی زۆری ئەم ژنانە ئاستی خوێندەوارییان زۆر بەرزە و، لە ڕووی ماددیشەوە زۆر دەوڵەمەندن. لە (*2012*) نزیکەی (*370*) هەزار ژنی بەمێرد کە لە ماڵێ دەمێننەوە و پیاوەکانیان لە دەرەوە کار دەکەن، کەمترین بڕوانامەی زانستییان ماستەر بووە. لە ڕووی داهاتیشەوە (داهاتی خێزانی)، ساڵانە زیاتر لە (*75*) هەزار دۆلاریان هەیە، کە ئەمانە (*5%*)ی ژنانی شووکردویلەماڵدانیشتووی ژنانی ئەمریکان. (*19%*)ی ئەم

1 . Tyrrell, Alex (Apr., 2000), **Samuel Smiles and the Woman Question in Early Victorian Britain**, Journal of British Studies,Vol. 39, No. 2, London: Cambridge University Press,. pp. 185-216.

* کۆمپانیایەکی لێکۆڵینەوە و ڕاپرسی و ڕاوێژکاریی نێودەوڵەتیی ئەمریکییە، کە لە ساڵی (1935) لە لایەن "جۆرج گالۆپ"ـەوە دامەزراوە و ناوبانگی لە بواری ڕاپرسی گشتیی خەڵك دەرکرد و لە ئەمریکا و چەندین وڵاتیتر بە پشتبەستن بە لێکۆڵینەوەکانی ئەم دەزگایە کاردەکرێت. بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ئەم کۆمپانیایە لە شاری واشنتۆنە.

2 . Gallup Organization (August 31, 2007); **Women Slightly More Likely to Prefer Working to Homemaking**; http://www.gallup.com/poll/28567/women-slightly-more-likely-prefer-working-homemaking.aspx

** سەنتەرێکی بەناوبانگی لێکۆڵینەوە و ڕاپرسی و ڕاوێژکاریی نێودەوڵەتیی ئەمریکییە، کە لە ساڵی (2004) دامەزراوە و بەڕێوەبەرایەتی گشتییەکەی لە شاری واشنتۆنە. سەرۆکی ئەم سەنتەرە لە (2013)ەوە "ئالن مۆری"یە، کە جێگری بەڕێوەبەری پێشووی "والستریتژورنال" بووە. ئامانجی سەرەکیی ئەم سەنتەرە، توێژینەوە و زانینی ئاراستە و ڕاوبۆچوونی هەموو وڵاتانی دونیایە لەبارەی بابەتە جۆراوجۆرەکانەوە، کە توێژینەوە و ڕاپرسییەکانی بۆ زۆرێك لە توێژەران و سیاسەتمەداران و دەوڵەتەکان گرنگە و لە پلانەکانیان سوودی لێ وەردەگرن.

ڕێژەش، تەمەنیان لە خوارووی (35)ساڵە. (53%)یش بە لایەنی کەم منداڵێکی تەمەن (5) ساڵ یان بچووکتریان هەیە. ئەم ڕێژەیە زۆر زەق و بەرچاوە بە بەراورد بە ژنانی دیکە لەو ڕوویەی کە (70%)یان ژنی سپیپێستی ئەمریکایی ڕەسەنن (نەك ژنە پەنابەر و بیانییەکانی دانیشتووی ئەمریکا)، کە دەکاتە حەوت دەهەك (واتە: 7 لەسەر 10 کەس). (3.5%)یان ڕەشپێستەکانن و، (7.5%)یش ژنە هیسپانییەکانن (مکزیکی و بۆلیڤی و شیلی و...). (19%)یشیان ئاسیایین (چینی و کوری و یابانی و...). ساڵی (1999) ڕێژەی (23%)ی ژنە ئەمریکییەکان کاری کابانی و بەخێوکردنی منداڵیان کردووە لە جیاتی ئەوەی کار لە دەرەوە بکەن، کەچی لە ساڵی (2012)دا ئەم ڕێژەیە بەرز بووەتەوە و دەگاتە (29%)ی هەموو ژنانی ئەمریکا، کە دەکاتە (10.4) ملیۆن ژن، کە خاوەن مێرد و خێزانی ڕەسمین. ئەمە جگە لەو ژنانەیە کە سەڵتن، یان بۆیفرێندیان هەیە".[1]

(واتە ئەم ئامارە تەنها باس لە ژنانی بەمێرد دەکەن کە بە شێوەیەکی ڕەسمی مێردیان کردووە).

ڕاپرسییەکی گەورەش لە لایەن ڕۆژنامەی "گاردییەن" (Guardian)ی بریتانی لە ساڵی (1991) لە نێوان (11) هەزار ژنی بریتانی کە سێیەکیان تەمەنیان لە (35) ساڵ کەمتر بووە، ئەنجام دراوە، کە ڕێژەی (68%)یان دەڵێن: مانەوە لە ماڵەوە باشترە لە کاری دەرەوە.[2] هاوشێوەی ئەمە، توێژینەوەیەکی ئاکادیمی لە لایەن "سکۆڵی ئیکۆنۆمیی لەندەن"ـەوە (London School of Economy)، لە ساڵی (2011) سەبارەت بە کاری ژنان لە دەرەوە و مانەوەیان لە ماڵەوە ئەنجام دراوە، کە ڕۆژنامەی "دێیلی‌مێل" (Daily Mail)ی بریتانی، لە ژێر ناونیشانی "ژنان بە ڕاستی چییان دەوێت: شووکردن بە پیاوێکی دەوڵەمەند و مانەوە لە ماڵ لەگەڵ منداڵانی" بڵاوی دەکاتەوە کە نیشان دەدات: ڕێژەی (69%)ی ژنان ئامەزرووی ئەوە دەکەن کە لە ماڵەوە دانیشن و ببنە خاوەن منداڵ و بەخێویان بکەن، بەو مەرجەی کێشەی خەرجییان نەبێت. (19%)ی ئەو ژنانەش بڕوانامەی زانستییان بەرزترە لە بڕوانامەی پیاوەکانیان، بەڵام ئەوەی گرنگە بۆیان لە ئەستۆگرتنی نەفەقە و خەرجییەکانە، کە ناچارن کاری دەرەوەی ماڵ بکەن.[3]

1 . Cohn, D., Livingston, G. And Wang, W. (April 8, 2014), "**After Decades of Decline, A Rise in Stay-at-Home Mothers**", Pew Research, From: <http://www.pewsocialtrends.org/2014/04/08/after-decades-of-decline-a-rise-in-stay-at-home-mothers>

2 . TheGuardian (March 7, 1991): http://www.theguardian.com/uk

3 . Daily Mail (January 10, 2011), "**What women REALLY want: To marry a rich man and stay at home with the children**", From: <http://www.dailymail.co.uk/femail/article-1345520/What-women-REALLY-want-To-marry-rich-man-stay-home-children.html>

ئایا ئارەزووکردنی ئەم ڕێژە زۆرانەی ژنانی کارکەر لە دەرەوەی ماڵ بۆ گەڕانەوە بۆ کاری ماڵ و بەخێوکردنی منداڵانی خۆیان، فاکتەرێکی بەهێز نییە کە شایانی ڕەچاوکردن بێت؟

خاتوو "د. ئیدا ئلیین" دەڵێ:

"ژن وا دەزانێ کە گەیشتووەتە ئاسایشی پیشەیی، بەڵام ئەمڕۆ کە لەبەر هەورازونشێوی زۆر، لاقی خوێناوی بووە و هێز و تاقەتی لێ براوە، ئاوات دەخوازێ بۆ لەباوەشکردنی منداڵانی بگەڕێتەوە ماڵەوە... هۆی قەیرانی خێزانی لە ئەمریکا و فاکتەری زیادبوونی تاوانە کۆمەڵایەتییەکان ئەوەیە کە ژن خێزانەکەی بەجێ هێشتووە لە پێناو وەرگرتنی مووچە، ڕاستە کە ڕێژەی داهات زۆر بووە، بەڵام ئاستی ئەخلاق نزم بووەتەوە... ئەزموونەکان دەسەلمێنن کە گەڕانەوەی دایکان بۆ هەرێمی ماڵ تاکە ڕێگای ڕزگاریی ئەوەی نوێیە لەو چارەنووسەی کە هەنگاوی بۆ دەنێت."[1]

سەیر ئەوەیە کە زۆر لەو ژنانەی کە لە دەرەوە کار دەکەن، ناچار دەبن بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری ناوماڵ و چاودێریکردنی منداڵانی خۆیان، ژنێکی دیکە بەکرێ بگرن! هەروەك لە کۆمەڵگای کوردستانیشدا دەبینین کە زۆر لەو ژنانەی کە پیشەیەکی ئیداری و سیاسییان هەیە، ژنێکی بەنگلادشی، فیلیپینی و نیپالی و... لە کۆمپانیا تایبەتەکان بەکرێیان گرتووە و ئامادە نین "پیاو"ێك بۆ کاری ناوماڵ تەرخان بکەن؛ چونکە خۆیان بڕوایان بەوە نییە کە کاری ناو ماڵ کاری پیاوانە! ئایا جۆرێك لە پارادۆکس و دژایەتی لە نێوان وتە و کرداریان نییە؟ ئایا ژنی فیلیپینی و بەنگلادشی و ئەوانیتر وەکو ئەوان ژن نین؟ ئەگەر دەڵێن ئەوان لە دەرەوەی ماڵەکانیان کار دەکەن، ڕاستە، بەڵام لە ناوماڵی کەسانی دیکە خەریکی کارکردنن!

"دۆنا جەکسۆن" (Donna Jackson) لە کتێبەکەی خۆیدا "چۆن دەتوانین بە پێنج خولەك لە ڕۆژێکدا دونیایەکی باشتر بۆ ژنان دروست بکەین؟" ئاماژە بەو ڕاستییە دەکات کە: (38) ملیۆن کەس لە ئەمریکا لە ناو ماڵی خەڵکدا کار دەکەن، کە ڕێژەی (26.6) ملیۆن لەوانە ژنن،[2] کە ئەگەر لە ماڵی خۆیان کار نەکەن، لە ماڵی خەڵکانی دیکەدا کار دەکەن؛ کاری ناو ماڵ چ لە ماڵی خۆت بێ، چ هی کەسێکی دیکە بێ، هەر یەکە و هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێ.

هەڵبەت ئەوە بەو مانایە نییە کە ڕۆڵی ژنان لە خولگەیەکی تەسکدا کورت بکرێتەوە و سنووردار بکرێت، هەروەها نابێتە ڕێگر لە بەردەمیان تاکو لە بوارە جیاجیاکانی کۆمەڵایەتیدا

1 . زیدان، عبدالکریم (2008)؛ "حقوق و تکالیف زن در اسلام"؛ ترجمه: سهیلا رستمی؛ تهران: نشر احسان؛ ص 183.

2 . Jackson, Donna (1992), "How to Make the World Better for Women in Five Minutes a Day", New York: Hyperion Books, p. 58.

توانا و بەهرەکانیان بەرجەستە بکەن و ڕۆڵی کارا و کاریگەری خۆیان بگێڕن، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە کاربەدەستانی کۆمەڵگا بە تایبەتی بەرپرسانی بواری کولتووری و فەرهەنگی، کە زۆر کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ڕۆشنبیرانەوە، بە دیدێکی چاکسازانە و ڕێفورمخوازانە بڕواننە دابونەریتە کۆنەکانمان و دوای لێکۆڵینەوە و دیراسەکردن، سوود لە ئەزموونی کولتووری کۆمەڵگاکانی دیکە بە کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکانیشەوە وەربگرن و قاڵب و چوارچێوەیەکی نوێ و ڕۆڵ و ئەرکی تەواوکەر (لە تەنیشت ڕۆڵی دایکایەتی و هاوسەرێتی) دەستنیشان بکەن، کە لەگەڵ بنەمایە کولتوورییەکانمان بگونجێت و نموونە نادروست و ناپەسەندەکانی کولتووری خۆمان و بێگانەکان کە بوونەتە کێشە بۆ کۆمەڵگاکەمان، بەلاوە بنێن.

**تێبینیی پێنجەم)** هەندێ لە ڕۆشنبیران و فێمێنیستان دان بەوەدا دەنێن کە بەشداریی ژنان لە کۆمەڵگادا لەچاو سەردەمی ڕژێمی بەعس زیاتر بووە، بەڵام پێیان وایە هێشتا زۆری ماوە کە ژنی کورد بگاتە مافەکانی.[1]

هەڵبەت ئەوە نابێ لە بیر بکرێ کە تەنها ڕۆشنبیران و فێمێنیستان نین کە باسی ئەو کێشە و جیاکارییانە دەکەن، بەڵکو زۆر لە زانایانی کوردی موسڵمانیش، چ پێشتر و چ ئێستاش، لەو ڕووەوە گازندەیان هەیە، بەڵام ئەوەی کە کاری ڕۆشنبیران و فێمێنیستان بەرجەستەتر دەکات، دەرخستنی ئازار و کێشە و کەموکوڕییەکان نییە، بەڵکو ئەو ڕێگەچارانەیە کە بە ئاشکرا و پەنهانی بۆ چارەسەریی ئەو جیاوازیخستنە پێشکەشی دەکەن؛ ئەوان بە پێناساندنی "یەکسانی و بەرابەری" بە "وێکچوونی و یەکبوون"، هەروەها ڕەچاونەکردنی جیاوازییەکان لە دابەشکردنی ڕۆڵ و ئەرك و بەرپرسیارییەتەکان، بەدوای وێکچوواندنی ڕۆڵ و ئەرکی ژنان و پیاوانن.

ڕاستە نایەکسانی لە بواری بەشداریی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتی لە نێوان ژنان و پیاوان لە هەموو کۆمەڵگایەکدا هەیە، تەنانەت لە ڕۆژئاواش، کە دواتر باسی ئامارەکانی دەکەین، هەوروەها هەروەك گوتمان، تەنها لە لایەن ڕۆشنبیران و فێمێنیستەکانەوە ئەم کێشانە دەستنیشان

1 . مەهاباد قەرەداغی (2011): "ڕۆڵی ئافرەتی کورد لە سیاسەتدا بە نەبوو حیساب دەکرێت"؛ لە ماڵپەڕی دەزگای هەرمان: http://d-herman.com/ku

ناکرێن و باسیشیان لێوە ناکرێت،* بەڵکو پیاوانی ئایینی، زانایان، کۆمەڵناسان، دەروونناسان و یاساناسانیش هەستیان بە زەقبوونی ئەم کێشانە کردووە و بەردەوام باسی لێوە دەکەن، بەڵام ڕێگەی چارەسەریی ئەوان لەگەڵ ڕۆشنبیرە فێمێنیستەکان جیاوازە.

سەبارەت بە دەرفەتە سیاسییەکان، ڕاستە کە کولتوور و دابونەریتی کوردی لەمپەرێك بۆ ژنان دروست دەکات، بەڵام لایەنە گرنگەکەی ئەم کولتوورە کە ئایینی ئیسلامە، قەت ڕێگر نییە و تەنها مەرجی "شایستەسالاری" ڕەچاو و جێبەجێ دەکات. لە ڕوانگەی ئایینی ئیسلامەوە، هەروەك ئاماژەمان پێ کرد، بەرپرسیارییەتییە سیاسییە گەورەکانی کۆمەڵگا هەروەکچۆن لە ئەستۆی پیاوانە، دەکرێ بدرێتە دەست ژنانیش. ئەمە ڕای زۆرێك لە گەورە زانایانی کۆن و ئێستای ئیسلامە، کە دوایی باسیان دەکەین. ئەوەتا لە مێژووی ئیسلامدا، ژنانی زۆر ناوداری کورد دەبینین، کە پۆستگەلێکی باڵا و بەرزی سیاسی و ئیداری (ماددی و مەعنەوی)یان هەبووە کە لە زۆر لە پیاوانی ئەوکات، لەپێشتر و کارامەتر بوونە؛ وەك: "ست ئەلشامی کچی ئەیووب"، "باباخاتوونی کچی ئەسەد ئەددین شێرکۆ"، "خەدیجەی کچی مەلیك موعەزەم"، "ڕەبیعەی کچی ئەیووب"، "زوهرەی کچی مەلیك عادل"، "زەیفەی کچی مەلیك عادل"، "عەزرای کچی نورئەلدەولەی ئەییووبی"، "مونیسەی کچی محەممەدی ئەیووبی" و هتد.[1] کەواتە فەرهەنگی ئیسلامی ـ کوردی لاریی نییە لە بەشداریی ژنانی شایستە و لێهاتوو و شارەزا لە بوارە گرنگەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا.[2]

* دەستنیشانکردنی کێشەکانی ژنان و وتنەوەی دووبارە و چەندبارەیان، هونەر نییە؛ چونکە خەڵکی ئاسایی و عەوامیش دەزانن کە ژن لەو کۆمەڵگایەدا کێشەیان هەیە. گرنگ ئەوەیە کە چی بکرێت و چۆن ڕووبەڕووی ئەم کێشانە ببینەوە و ڕێگەچارە چییە و چۆن ئەولەوییەتبەندییان بکەین.

1 . چیرۆکی ژیانی هەر یەك لەو میرژنە کوردانە لە کتێبێك بەناونیشانی "المرأة الکردیة فی التاریخ الإسلامی: تراجم لأمیرات کردیات ومحدثات عالمات" لە لایەن توێژەرەوە لە عەرەبییەوە وەرگێڕدراوە بۆ زمانی فارسی و لە ئێران لە چاپدراوە. بڕوانە: رمضان، محمد خیر (2005)؛ "**زنان کرد در تاریخ اسلامی: (شرح حال أمرای زن کرد. و زنان محدث و دانشمند)**"؛ ترجمە: فائز ابراهیم محمد؛ نشر احسان: تهران؛ صص 15-57. ئەم کتێبە لەسەر ئینتەرنێتیش دانراوە و دەکرێ لەو ماڵپەڕەی خوارەوە دابەزێنن:

http://www.aqeedeh.com/book_files/view/zanane-kord-dar-tarikh-islami-PDF.pdf

2 . د. علی جمعە لە کتێبەکەیدا "ئافرەت لە شارستانێتی ئیسلامدا" لە دەروازەی سێیەمیدا، کە پێنج بەش دەگرێتەخۆ کە بریتین لە: (ئافرەتگەلێکی حوکمڕان)، (ئافرەتگەلێکی دادوەر)، (ئافرەتگەلێکی جەنگاوەر)، (ئافرەتگەلێکی موفتی و زانا)، (ئافرەتگەلێك کە دەسەڵاتی جێبەجێکردن گرتۆتە دەست)، باس لەو ژنانە دەکات کە لە سایەی ئیسلامدا لە بوارە گشتییەکانی کۆمەڵگادا بەشدارییان پێکراوە و زۆر ژنی لێهاتوو بۆنەتە حاکم و فەرمانڕەوا لە وڵاتانی ئیسلامی، یان قازی و دادوەر، یان جەنگاوەر و سەرکردەی سوپا، یان موفتی و زانا، یان ئەوانەی بۆنەتە وەزیر و دەسەڵاتی تەنفیزییان بەدەستەوە بووە. بڕوانە: د. علی جمعە؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 141-192.

لە بواری ئابووریشدا، تایبەتمەندییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی ڕۆژئاوا بە شێوەیەکە کە ژنان ناچارن کار بکەن؛ چونکە لەوێ هەرکەس لە ڕووی ئابوورییەوە سەربەخۆیە و ئەمە بووەتە بەشێکی جیانەکراوەی کولتوورەکەیان؛ بۆ نموونە: خەرجی کرێی خانوو، کارەبا، ئاو، خۆراک، پۆشاک، تەندروستی، هاتوچۆ، سەیران و گەشتوگوزار و ڕابواردن، تەنانەت خەرجیی منداڵانیش لە ئەستۆی هەردووکیان (دایبابەکان)ـە، کە هاوبەشی ژیانن، بەڵام لە گیرفاندا لە یەکتر جودان؛ واتە ئەگەر ژنان کار نەکەن، شووەکان و باوکان (ئەگەر کچەکەیان لە 18 ساڵ گەورەتر بێ) هیچ بەرپرسیار نینە لێیان! بۆیە ژنان بۆ بەخێوکردن و دابینکردنی بژێوی ژیانی خۆیان ناچارن وەکو پیاوان کار بکەن؛ لەبەر ئەوەشە کە فێمێنیزم و بزووتنەوەی ژنان لە ڕۆژئاوا هەمیشە لەگەڵ کێشەی کار و پیشە تێک گرێدراون و تەنانەت هۆی سەرەکیی سەرهەڵدان و دەستبەکاربوونیان بووە و دروشمی سەرەکی و یەکەمینیان هەر لە سەرەتاوە تاکو ئێستاش، بریتی بووە لە بەرابەری و یەکسانی لە دەرفەت و مووچەی کار؛ کەچی لە کۆمەڵگە کوردی و ئیسلامییەکەی خۆماندا، بابەتی پیشە و کار سەرەڕای ئەوەی کە لە بنەڕەتدا لە ئەولەوییەتەکانی ژنانی ئێمە نەبووە و نییەش و، تەنانەت نەبوونی ئەو بەربەست و نادادگەرییانەی کە لە ڕۆژئاوا لە نێوان ژن و پیاودا هەیە و ئێستاش بەردەوامە لە ڕووی کرێی کار و مووچەی مانگانەوە، ڕۆشنبیران و فێمێنیستەکانمان بەردەوام ئەوە بە گەورەترین کێشەی ژنانی کورد لەقەڵەم دەدەن. توێژینەوەکان و ئامارە ڕەسمییەکانی وڵاتانی ئەورووپی (کە لە بەشی دووەمدا ئاماژەیان پێدەکەین)، بە ڕوونی جیاکاری لە دەرفەتی کار بۆ ژنانی ڕۆژئاوایی و کرێی مانگانەیان دەخەنە ڕوو، کە توێژەران بیرۆکەی یەکسانیی ژنان لەگەڵ پیاوان بە "ئەفسانە" ناو دەبەن؛[1] بەپێی نوێترین ئاماری "ئۆفیسی ئامارە نیشتمانییەکانی بریتانیا" (ONS)* ژمارەی ژنانی بێکار لە ساڵی (2013) بریتی بووە لە (17.9%)، واتە (1.9) ملیۆن ژن، کە بۆ ساڵی (2014)، ڕێژەی (70) هەزار ژنی بێکاریتر زیاد بووە.[2] کەچی بە پێی ئاماری ڕەسمیی حکومەتی هەرێمی کوردستان (ساڵی 2013)، تەنها ڕێژەی

---

1 . بۆ نموونە: توێژینەوەی "لەبەر ڕەگەزەکەی: ئەفسانەی یەکسانی و هەلی بەرابەر بۆ ژنان لە بریتانیا"، کە توێژینەوەیەکی تیۆری و مەیدانییە لە وڵاتی بریتانیا ئەنجام دراوە؛ بڕوانە:

Figes, Kate, op.cit., pp. 1-272.

* Office for National Statistics.

2 . ONS (Mar 19, 2014), "Labour Market Statistics, March2014", pp. 1-37:
http://www.ons.gov.uk/ons/dcp171778_354442.pdf

(22.1%)ی ژنانی تەمەن (15) ساڵ تا سەرووی (+65) ساڵ بێکارن، کە دەکاتە (370,382) کەس،* لە بەرامبەردا ڕێژەی (77.9%)ی ژنان لە دەرەوەی ماڵ کار دەکەن و مووچەیان هەیە؛[1] واتە لە هەر (100) ژنی تەمەن (15) ساڵ و سەرووی (15) ساڵ، نزیکەی (78) ژن لە دەرەوەی ماڵ کاردەکەن و داهاتیان هەیە! تەنها (22) ژن لە ماڵەوە کار دەکەن،[2] کە لەوانەیە ڕێژەیەکی زۆریشیان حەزیان لە کارکردنی دەرەوە نەبێت، ئەگەر دەرفەتی کاریشیان بۆ بڕەخسێت! هەروەها ئەو ڕاپۆرتە ئاماژە بەوەش دەکات کە ڕێژەی سەدیی کاری فەرمیی ژنان لە هەرێمی کوردستان بریتییە لە (83%) و، کاری نافەرمیش (17%).[3]

گرنگترین بەڵگە لەو بارەیەوە، ڕاوبۆچوونی خودی ژنانی کوردستانە، کە بەپێی ئەو ڕاپرسییە بەرفراوانەی کە لە لایەن سەنتەری نێودەوڵەتیی "WVS" (ڕووپێوی بەها جیهانییەکان) لە ساڵی (2013) لە هەرێمی کوردستان کراوە، کۆمەڵێك پرسیار سەبارەت بە "کار و پیشەی ژن" لە ژنان کراوە، کە وەڵامەکانیان ڕێك پێچەوانەی دروشم و بانگەشە و چاوەڕوانییەکانی فێمێنیستان و ڕۆشنبیرانی کوردستانە. ئەوەتا لە پرسیاری "ژنی ماڵەوە سەرکەوتووە"، وەڵامەکانیان بەم شێوەیە بووە: [لەگەڵیدام: (85.6%)] و، [لەگەڵیدا نیم: (14.4%)]. هەروەها لە پرسیاری "کاری ژن لە دەرەوەی ماڵ و بەجێهێشتنی منداڵان، کاریگەریی خراپ دەخاتە سەریان"، بەم شێوەیە وەڵامیان داوەتەوە: [لەگەڵیدام: (68.22%)] و، [لەگەڵیدا نیم: (31.78%)]. هەروەها لە پرسیاری "ڕەزامەندیی ژن وەك کابانی ماڵ باشترە لەوەی کە لە دەرەوەی ماڵ، بەرامبەر بە کارێك مووچەیەك وەربگرێ"، وەڵامەکانیان بەم شێوەیە بووە: [لەگەڵیدام: (30.8%)] و، [لەگەڵیدا نیم: (69.2%)]. هەروەها لە پرسیاری "ئەگەر دەرفەتی کار کەم بێت، پێویستە پیاو مافی زیاتری هەبێت بۆ کار، نەك ژن"، بەم شێوەیە وەڵامیان داوەتەوە: [لەگەڵیدام: (78.5%)] و، [لەگەڵیدا نیم: (21.5%)]. هەروەها لە پرسیاری "هەبوونی کار بۆ ژن، باشترین ڕێگایە بۆ سەربەخۆیی ژن لە پیاوان" ڕێژەکان بەم شێوەیە دابەشکراون: [لەگەڵیدام: (11.21%)]، [لەگەڵیدا نیم:

---

* ژمارەی کۆی گشتیی ژنانی تەمەنی (15) ساڵ بۆ سەرەوەی کوردستان، بەپێی ئاماری ساڵی (2013)ی وەزارەتی پلاندانان، دەستەی ئاماری هەرێم، بریتییە لە: (1,675,940) کەس.

1 . وەزارەتی پلاندانان: دەستەی ئاماری هەرێمی کوردستان (2014)؛ "**کورتەی ڕاپۆرتی هەرێمی کوردستان: لە ڕووپێوی تۆڕی زانیاریی عێراق (کۆتایی 2013)**"؛ ل 1-120.

2 . وەزارەتی پلاندانان: دەستەی ئاماری هەرێمی کوردستان (2014)؛ "**ڕاپۆرتی هێزی کار لە هەرێمی کوردستان (2012)**"؛ ل31.

3. سەرچاوەی پێشوو، ل 18.

(%88.79)]؛ کەواتە زۆرینەی ژنە کوردەکان حەزیان لە کاری ماڵ و خزمەتکردنی منداڵانیانە و، ماڵدارییان پێ باشترە لە کاری دەرەوەی ماڵ، با مووچەیەکی باشیشیان هەبێت.[1]

سەیر ئەوەیە کە ڕۆشنبیران و فێمێنیستان سەبارەت بە "بابەتی کاری ژنان" لە پێناو نەهێشتنی وابەستەیی بە پیاو و خێزان و، ئازادبوون لە چوارچێوە و کۆتی ناوماڵ، تووشی گەورەترین پێکناکۆکی و پارادۆکس دەبنەوە! هەندێ لەوان، بە تایبەتی چەپەکان و سۆسیالیستەکان زۆر باس لەوە دەکەن کە چۆن سیستمی سەرمایەداریی ڕۆژئاوا بە هێنانەدەرەوەی ژنان بۆ بازاڕی کار و کارگەی بەرهەمە پیشەسازییەکان، سوود و قازانج دەخاتە ناو گیرفانی پیاوانی خاوەن پیشە و کارگەکان!

ئەم جۆرە شیکردنەوە و دادوەریکردنانە، هەمووی بەرهەمی تێڕوانین و ئاراستەی "تاکتەوەری" (Individualism)یە، کە بە شێوەیەکی تاکگەرایانەوە دەڕوانێتە ژن و پیاو، بەبێ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندیی خێزانی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت غافڵبوونە لە دووربینی و هەمەلایەنەڕوانینی بەرژەوەندییەکانی ژنان. تێڕوانینێکی گشتی و هەمەلایەنە بۆ بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی ژنان نیشان دەدات کە تێڕوانینی ئیسلام بۆ ئابووریی خێزان، باشترین ڕێگەچارەیە بۆ پشتیوانیی دارایی ژنان و دابینکردنی بوار و دەرفەتی پێویست بۆ بەشداریی کۆمەڵایەتیی گونجاو و بەجێ. ئایینی ئیسلام نەفەقەی خێزان لەسەر پیاوان بە فەرز و واجب دەزانێ: (ئەگەر هاوسەرە لەسەر مێردە و، ئەگەر کچە لەسەر باوکە، ئەگەر دایکە لەسەر کوڕە، ئەگەر خوشکە لەسەر برایە) و ژنیش بە فەرموودەی قورئان مافی کارکردن و ئاڵوێرکردن و بازرگانیکردنی هەیە، ئەگەر بیەوێ بیکات، هەروەها بڕی مارەیی و میرات و موڵك و دیاری و بەخشینەکان کە وەریدەگرێت، بەپێچەوانەی ژنی ڕۆژئاوایی هیچ ئەرك و بەرپرسیارییەتییەکی ماڵیی بەرامبەر بە خێزانەکەی نییە؛ بۆیە ژنان نە تەنها ئازادانە دەتوانن ڕوو لە پیشە و کاری گونجاوی خۆیان بکەن، بەڵکو هەندێ کار هەن کە ئەگەر بە ژنان بکرێت، بەرهەم و ئاکامێکی باشتر و زیاتری دەبێت. جگە لەوەش دەتوانێ لەو ڕێگایەوە ئەزموون و زانست و مەعریفەی زیاتر وەربگرێ و پێداویستییە زەینی و مەعنەوی و دەروونی و کەسایەتییەکانیشی تێر بکات؛ ئەوەش دەبێتە هۆی

1 . WVS (7/11/2014), "Online Analysis: wave 6 (2010-2014), Iraq 2013", From: http://www.worldvaluessurvey.org/WVSOnline.jsp

کەماڵ و پێشکەوتنی خۆی و خێزان و کۆمەڵگا و پڕکردنی بۆشاییەکان و نەهێشتنی خاڵە لاوازەکانی کۆمەڵگا.

دەکرێ بە کورتی بڵێین: بابەتی کاری ژنان دەبێ بە دیدێکی خۆجێیی و ڕەچاوکردنی پەیوەندیيە کۆمەڵایەتییەکانی خۆمان هەڵسەنگێندرێ و ڕێگەچارەی گونجاو کە لەگەڵ فەرهەنگی ئیسلامی و کوردەواریمان بسازێت، پێشکەش بکرێت.

سەبارەت بە نایەکسانی لە بواری دەرفەتە کۆمەڵایەتییەکانیش، ئەوەش دیسان بووەتە دروشمێکی دیکە بۆ ڕۆشنبیران و فێمێنیستان، کە بەردەوام دووبارەی دەکەنەوە و، هەر جۆرە نابەرابەری و نایەکسانییەك بە زوڵم و چەوساندنەوە و جیاکاری دەزانن. لە حاڵێکدا کە لەجیاتی ئەوەی کە زۆر پێویستە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە، خۆیان دەدزنەوە: بە کام پێوەر و لۆژیك و زانستێك داکۆکی لە بەرابەری و یەکسانی دەکەن؟ ئایا هەمیشە و لە هەموو شوێنەکان، بەرابەری بە واتای عەداڵەت و دادگەرییە؟ ئایا هەر جیاوازی و نایەکسانییەك واتای زوڵم و جیاکاری و چەوساندنەوەیە؟ ئەگەر وایە بۆچی مامۆستاکان ـ ئەگەر دادگەر بن! ـ قوتابییەکانیان تاقی دەکەنەوە و هەریەك نمرەیەك دەهێنێ کە مافی خۆیەتی؟ یەکسانی لێرە واتە هەموو قوتابییەکان یەك نمرەی هاوبەشیان بدرێتێ بەبێ جیاوازی و جیاکاری!

"جۆن لویس ئسپۆزیتۆ" ـ مامۆستای زانکۆی "جۆرجتاوان" و دامەزرێنەری "سەنتەری لێکتێگەیشتنی ئیسلامی مەسیحی"ی هەمان زانکۆ ـ لە کتێبی "چ کەسێك لە لایەن ئیسلامەوە قسە دەکات؟" دەڵێ:

"لە لێکۆڵینەوەکەماندا* بۆمان دەرکەوت کە ژنە موسڵمانەکان لەگەڵ ئەوە کۆك نین کە ژن و پیاو لە مافە یاساییەکاندا بە "یەکسان"ی سەیر بکرێن. سەیرتر ئەوەیە کە ئەو ژنانەی خوازیاری "دادگەری"ن، نە "یەکسانی" لەگەڵ پیاوان، لە ڕووی ئاستی خوێندەواری باڵاتر و سەرووترن لەوانەی کە خوازیاری یەکسانیی هەمەڕەهەندن لە نێوان ژن و پیاودا... چونکە زۆرینەی ژنە موسڵمانەکان بڕوایان وایە کە مافی یاسایی "یەکسان" هەمیشە بە مانای مامەڵەی دادگەرانە لەگەڵ ژنان نییە؛ چونکە بە بۆچوونی ئەوان ژن و پیاو ڕۆڵی جیاوازیان هەیە لە خێزان و کۆمەڵگادا. هەروەك ژنە موسڵمانێکی میسری پێی وتین: "پێدانی

* ئەم لێکۆڵینەوەیە لە لایەن دەزگای گالۆپی ئەمریکییەوە لە ماوەی (7) ساڵ (2007-2001) لە (130) وڵاتدا ئەنجام دراوە، کە ئسپۆزیتۆ شیکردنەوەکانی لە کتێبێکدا بە ناوی "چ کەسێك لە لایەن ئیسلامەوە قسە دەکات؟" بڵاو دەکاتەوە.

چەکوشێك بە جووتیار و دارتاشێك وەکو کەرەستەیەکی یارمەتیدەر بۆ پیشەکەیان، مامەڵەیەکی یەکسانانەیە، بەڵام مامەڵەیەکی دادگەرانە و مونسیفانە نییە؟"[1]

یەکێك لەو دەرفەتە کۆمەڵایەتییە گرنگانەی کە فێمێنیستەکان زۆر باسی دەکەن، مافی خوێندنە. ئامارە فەرمییەکانی "وەزارەتی پلاندانانی حکومەتی هەرێمی کوردستان"، ئاماژە بەوە دەکەن کە ڕێژەی یەکسانیی جۆری کۆمەڵایەتی و ڕەگەزی لە بواری پەروەردە و خوێندا زۆر بەرزە بە بەراورد لەگەڵ وڵاتانی دیکە؛ بە شێوەیەك کە ساڵانە (99%)ی کچان لە قوتابخانە سەرەتاییەکان ناویان تۆمار دەکەن، (98%)یش لە قوتابخانە ناوەندییەکان و (91%)یش لە قوتابخانە دواناوەندییەکان.[2] بەپێی ئاماری وەزارەتی خوێندنی باڵا، ژمارەی قوتابیانی وەرگیراو لە گشت زانکۆکانی هەرێمی کوردستان بۆ ساڵی خوێندنی (2013-2014)، بریتییە لە: (106,168) قوتابی کە ژمارەی قوتابیانی کچ زیاترە لە کوڕان؛ بەم شێوەیە: کوڕان (51,166) کەسن، کە دەکاتە (48%)، لە بەرامبەردا کچان (55,002) کەسن، کە دەکاتە (52%).[3] کەچی بەپێی نوێترین ئامارە ڕەسمییەکانی "وەزارەتی خوێندنی باڵای بریتانیا" ساڵی (2013)، کە بریکاری دەستەی توێژینەوەی وەزارەتی خوێندنی باڵای بریتانی "چارلی بۆل" (Charlie Ball)، لە ڕۆژنامەی "گاردییەن"ی بریتانی ئەم ڕاپۆرتەی بڵاو کردووەتەوە، تەنها (27.2%)ی خەڵکی بریتانیایی سەرووی تەمەنی (17) ساڵ ـ بە ژن و پیاوەوە ـ توانایی چوونە زانکۆیان هەیە، ئەم دەرفەتەش تەنها بۆ ئەو کەسانە دەرەخسێ کە توانایی ماددییان هەیە.[4]

هەروەك دەزانین و ناکرێ نکۆڵی بکرێت، لە فەرهەنگی ئیسلامەتیدا بەپێچەوانەی سەدەکانی ناوەڕاستی مسیحییەت، ژنان وەك پیاوان نە تەنها مافی خوێندن و گەشەی زانستییان

1 . Esposito, John L. & Mogahed, Dalia (2007), "**Who Speaks For Islam?: What a Billion Muslims Really Think** ", New York: Gallup Press, p. 118.

2 . بڕوانە: حکومەتی هەرێمی کوردستان؛ وەزراەتی پلاندانان (2014)؛ دەستەی ئاماری هەرێمی کوردستان؛ "**ڕاپۆرتی بەدواداچوونی باردۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری لە هەرێمی کوردستان ساڵی (2012)**"؛ ل 12-14.

3 . بڕوانە: وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی؛ فەرمانگەی خوێندن و پلاندانان و بەدواداچوون (2014)؛ بەڕێوەبەرایەتی پلاندانان و ئامار؛ "**ژمارەی قوتابیان بە پێی بەش و کۆلێژ و ڕەگەز، لە گشت زانکۆکانی هەرێمی کوردستان بۆ ساڵی خوێندنی (2104-2013)**". بەپێی هەمان ئامار، ژمارەی قوتابییە دەرچووەکانی قۆناغە کۆتاییەکان بۆ ساڵی (2013-2012) بە هەمان شێوەیە؛ واتە لە کۆی گشتیی دەرچووان کە (27,873) قوتابین، ژمارەی کوڕەکان (13,516) کەسە، کە دەکاتە نزیکەی (48%) و ژمارەی کچەکانیش بریتییە لە: (14,357) کەس، کە دەکاتە نزیکەی (52%).

4 . Ball, Charlie (June 4, 2013), "**Most people in the UK do not go to university – and maybe never will**", The guardian: http://www.theguardian.com/higher-education-network/blog/2013/jun/04/higher-education-participation-data-analysis

هەبووە، بەڵکو خوێندن و فێربوونی زانست بە فەرز و ئەرکی سەرشانیان دەزانێت.[1] لە مێژووی ئیسلامیدا چەندین ژنی بەناوبانگی کورد هەن، کە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە بەهۆی خوێندن و زانستەوە لە پیاوانی سەردەمی خۆیان، ناودارتر و لەپێشتر بوونە و، ناویان چووەتە ناو مێژووی ئیسلامدا؛ وەکو: "فەخرونیسای شوهرەی دینەوەری"، "ئەسمای کچی ئەحمەدی هەکاری"، "جوەیرییەی کچی عەبدولرەحیمی عێراقی"، "زەینەبی کچی سلێمان ئەسعوردی"، "زەینەبی کچی عەبدولرەحیمی عێراقی"، "فاتیمە کچی ئیبراهیمی هەکاری"، "فاتیمەی کچی ئەحمەدی ئەیووبی"، "قەتلۆمکی کچی محەممەدی ئەیووبی"، "ئوم محەممەدی کچی یوسفی هەکاری" و هتد.[2] زانایان لە ئاینی ئیسلامدا پلەوپایەی بەرزیان هەیە؛ هەم لە دونیا و هەمیش لە دواڕۆژدا؛ ﴿والذين أوتوا العلم درجات﴾.[3] واتە: ئەوانەی زانستیان پێ دراوە، چەندەها پلەوپایە بەرزیان دەکاتەوە. ئەوەش بۆ ژن و پیاوانە؛ چونکە ئاینی ئیسلام تەنها بریتی نییە لە پەرستن و ڕێوڕەسمی خواپەرستی، بەڵکو ژیانی دونیا و دواڕۆژ دەگرێتەوە، کە ژن و پیاو پێکەوە لێی بەرپرسیارن و بۆ گەیشتن بەو پلە و پایانە دەکۆشن؛ هەروەك "ئابراهام نۆیمان"* ـ وێنەکێشێکی یەهوودی پۆڵەندییە ـ لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی "گەورەترین ئاینی جیهانی ئێستا" دەڵێت:

> "ئاینی ئیسلام تەنها لە بابەتە لاهووتییەکاندا کورت ناکرێتەوە، بەڵکو ژیانی کۆمەڵایەتیشی دەگرێتەوە. چۆن ئاینە، فەرهەنگ و کولتووریشە و باس لە هەموو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی ئێستای مرۆڤی ئەو سەردەمەیە دەکات، هەروەك لە ژیانی جیهانی دواڕۆژیش غافڵ نابێت. ئەم ئاینە ئاوێتەیەکە لە لاهووت و سیستمی ئابووری و کۆمەڵایەتی."[4]

مافە کۆمەڵایەتییەکانی تریش بە هەمان شێوە؛ وەکو: مافی هەڵبژاردنی شوو و هاوبەشی ژیانی خۆی، مافی کارکردن و هەڵبژاردنی پیشە، وەك لایەنە کۆمەڵایەتییەکەی، مافی بەشداریی کۆمەڵایەتی لە بوارە سیاسییەکانی وەك دەنگدان و هەڵبژاردن و ئینتیما بۆ پارتێك یان گرووپێك،

---

1 . طلب العلم فريضة على كل مسلم. (رواه إبن ماجه و صححه الألباني).

2 . رمضان، محمد خير؛ همان منبع: ص 61 - 89.

3 . (المجادلة: 11).

* Abraham Aron Neuman (1873-1942).

4 . Neuman, Abraham A. (1953), "**The great religion of the modern world**". ed. Edward J.Jurji, Princeton University. W.S. p.229.

مافی هاتوچۆ و گەشت و سەیران و هتد، هەر هەموویان لە لایەن ئیسلامەوە دراونەتە ژن بە ڕەچاوکردنی هەلومەرج و واقیعی کۆمەڵگا.[1] (دوایی باسیان دەکەین).

**تێبینیی شەشەم)** سەبارەت بە وابەستەیی ژن بە پیاو، خێزان، منداڵ و کاری ماڵەوە کە بەپێی بۆچوونی فێمێنیستەکان و ڕۆشنبیران دەبێتە هۆی بەربەست لە ڕێی پێشکەوتن و ئازادی و سەربەستییان و، دەڵێن: ئەوە کەسایەتی و فەردییەتی ژن دەتاوێنێتەوە لە پێناو منداڵبوون و خزمەتی پیاو و کاروباری ناو ماڵدا! ئەم تاکایەتییە، کە لە بنەڕەتدا بەرهەمی مرۆڤناسیی ماددیگەرایی و جیهانبینیی مودێرنیتەی ڕۆژئاوایە، پەیوەندیی سۆزداری و خۆشەویستی، کە بنەما و زەرورەتی سەرەکیی شوو و هاوسەرە لە ناو خێزاندا، ڕێ پێ نادات و پێشنیازیش ناکات، بەڵکو هەوڵ دەدات لە کۆمەڵگادا ژن بکاتە بوونەوەرێکی خۆبەزلزان و بەدەعیە و ڕکابەرخواز و بەرهەڵستکار لە بەرامبەر پیاودا. ئەم جۆرە تێڕوانینە مسۆگەر لەگەڵ هەندێ چەمکی مەعنەوی و مرۆیی بێگانەیە؛ وەکو: لەخۆبوردەیی و خۆبەخشی، فیداکاری و گیانبەخشینی دایکانە، تاقەت و خۆڕاگری و بەرگەهێنانی ڕەنج و سەختی لە پێناو بەخێوکردن و گەورەکردنی منداڵان، کە دەبنە ئایندەی کۆمەڵگا، بێدەماری و خاکەڕایی (تواضع) لە بەرامبەر شوو و هاوبەشی ژیان و خۆشەویستەکەی، کە تەواوکەری ناسنامە مرۆییەکەی ژنە، چاوپۆشین لە خواست و ویستی خۆی بۆ دابینکردنی خواست و پێداویستیی خێزان و منداڵان، بەقوربانکردنی سوود و بەرژەوەندییەکانی خۆی بەرامبەر بە بەرژەوەندییە خێزانی و کۆمەڵایەتییەکان و هتد؛ بۆیە ڕۆشنبیرە فێمێنیستەکان بەهاکانی وەك: فیداکاری، گوێڕایەڵیی ژن بەرامبەر بە بەرپرسیار و سەرپەرشتیاری خێزانەکەی، کە هاوبەشی ژیانیەتی، هەموو ئەوانە دژ بەو فەردانییەت و تاکگەرێتیی ژن دەزانن کە بەرهەمی بەهاکانی سەردەمی ڕۆشنگەری و مودێرنیتەیە، کە زەمینەسازی سەربەخۆیی و ئازادیی ژنان بووە لە ڕۆژئاوادا.

مخابن فێمێنیستان بابەتی خێزان ئاوەها شی دەکەنەوە، لەجیاتی واقیعبینی و وردبینی و تێفکرینی قووڵ و هەمەلایەنە، بە ڕەشوسپی‌نیشاندانی دۆخەکە، بونیادی خێزان لە بنەڕەتدا دەبەنە ژێر پرسیارەوە و، زۆر بە ئاسایی وا بیردەکەنەوە کە ئەرکی دایکایەتی و هاوسەرێتی لەگەڵ بەشداریی کۆمەڵایەتی و سیاسیی ژنان ناگونجێت و خێزانیش بە زیندان و قەفەسێك بۆ

1 . ئەم بابەتانە بە تێروتەسەلی لە زۆر کتێبەکاندا هاتوونە؛ بڕوانە: زیدان، عبدالکریم؛ هەمان سەرچاوە؛ صص 1-241.

ژنان لەقەڵەم بدەن، لە میانەی قسە نووسراو و زارەکییەکانیاندا و لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی ئەو فیلم و درامایانەدا کە لە میدیاکاندا پەخش دەکرێن؛ کەچی یەکەم: هەرێم و چوارچێوەی خێزان لە فەرهەنگی ئیسلامەتیدا کە فەرهەنگی زاڵ و باوە لە کۆمەڵگای کوردیدا، هیچ ڕێگر نییە لە بەردەم بەشداریی ژنان بەبێ دروستکردنی بەربەست و فشار و چەوساندنەوە. دووەم: بەدابەشکردنی ئەرکەکان و بەرپرسیارییەتەکان، بەو پێیەی لە ئایینی ئیسلامدا هاتووە، تەنانەت دەرفەتی چالاکی و تێکەڵبوونی ژنان لە پرس و بابەتە کۆمەڵایەتییەکان بە تەواوەتی ڕەخساوە. هەڵبەت ئەو وێنەیەی فێمێنیستان لەبارەی یەکسانیی ژن و پیاو لە هەموو بوارەکان و دۆخەکان پێشکەشی دەکەن، هیچ لەگەڵ سروشتی ژنانەدا ناگونجێت و نەك تەنیا گۆڕەپانی هێز و دەسەڵاتی ناو خێزان لە دەست ژنان دەردەهێنێ، بەڵکو وایان لێ دەکات کە لە گۆڕەپانی ڕکابەرایەتی لەگەڵ پیاوانیش لەو بوارانەی پیاو تێدا بەهێزتر و بەئەزموونترە، سەرئەنجام بدۆڕێنێ و ئەویش و ئەمیشی لەدەست بچێ!

**تێبینیی حەوتەم)** لە فەرهەنگی ئیسلامەتیدا جیاکردنەوەی نێوان ئەرکەکانی خێزان و کۆمەڵگا و دابەشکردنی لۆژیکییانەیان، بۆ سەر توانایی تەکوینی و پێکهاتەی سروشتیی هەریەك لە ژن و پیاو دەگەڕێتەوە و، سیستمێکی هاوسەنگ و هاوکێش لە پەیوەندییە مرۆییەکان دروست دەکات. لەو کولتوورە، ئەگەرچی ئەرکەکانی ژنان تەنها لە چوارچێوەی خێزان و ناوماڵدا کورت ناکرێنەوە، بەڵام ڕۆڵی ژنان لە بواری خێزاندا زۆر بە گرنگ دەزانێت بە مەبەستی گەیشتن بە بەختەوەری و کەمال و ڕاگرتنی هاوسەنگی لە ژیانی مرۆییدا.

بەڵام لە ئاراستەی فێمێنیستە لیبراڵییەکانەوە، جیاوازیی نێوان ڕۆڵ و ئەرکەکانی ژن و پیاو تەنها بەرهەمی سیستمێکە کە پێی دەگوترێ پیاوسالاری، کە بنەمای جیاکارییە. بەم پێیە ئەگەرچی بوونی ئەرك و ڕۆڵی سروشتی ژن لای هەندێ لەو فێمێنیستانە وەك ئەرکی منداڵهێنان (وەك ئەو ژنە ڕادیکاڵەی کە بە ناوی بەرهەمی مەعنەوی ناودەبات)، شیردان و دایکایەتی و کابانی هیچ نکۆڵییەکی لێ ناکرێت، بەڵام پێیان وایە ئەرکەکان بە شێوەیەکی ناهاوسەنگ دابەش کراون کە دەبێتە هۆی جیاکاری و زیادبوونی مەودای نێوان هەر دوو ڕەگەز. پێم وایە یەکێك لە هۆکارەکانی نکۆڵیکردنی جیاوازیی نێوان ئەرکی ژن و پیاو، ئەوەیە کە کاری ناوماڵ (واتە بواری تایبەتی و پرایڤێت) لە کاری دەرەوەی ماڵ (واتە بواری گشتی) جیادەکەنەوە و خێزان وەکو

هەرێمێکی تایبەت بۆ ژنان لەقەڵەم دەدەن و پێیان وایە کە دەبێتە هۆی پاشکەوتن لە ژیانی بواری گشتی و دەرەوەی خێزان و، ئەوە بە هۆکاری سەرەکیی ژێردەستبوون و پلەنزمیی ژنان دەزانن و پاڵنەری سەرەکیی دروستکردنی ئەم مەودایە لە نێوان ژن و پیاویش هەمان سیستمی پیاوسالاری و داب‌ونەریتی کۆمەڵگا و ئایین ناودەبەن و ئەرکەکان و ڕۆڵەکانی ژنان و پیاوان وەکو کلێشەیەکی کولتووری بە هۆیانەوە دیاری کراوە.

بەم شێوەیە، فێمێنیستان و ڕۆشنبیران بە پێشکەشکردنی نموونەی مودێرنیتە بۆ ئەرك و ڕۆڵی ژنان و پیاوان، بڕوایان وایە کە کۆمەڵگای نوێ ئەم جیاوازی و لێکجیاکردنەوەیە قبووڵ ناکات؛ کەچی بەپێی فەرهەنگی ئیسلام و ڕێنماییەکانی، "خێزان" و "کۆمەڵگا" دوو هەرێمی پێکەوەگرێدراو و وابەستەن. وەك پەیوەندیی نێوان خشتە و خانوو. بەبێ خێزان، کۆمەڵگا دروست نابێ و خێزانیش جیا لە کۆمەڵگا، مانایەکی ئەوتۆی نییە و ناسنامەی خۆی لە کۆمەڵگا وەردەگرێت. هیچ کام لە ژن و پیاویش بە تەنهایی وابەستە و گرێدراوی یەکێك لەو هەرێمانە نین؛ هەم پیاو وابەستەیە بە خێزان و کۆمەڵگاوە و خەمی هەردووکیان دەخوات و، هەمیش ژن. ئەوەی کە هەیە تەنها دابەشکردنی هەندێ ئەرکە بۆ گەیشتن بە باشترین ڕێژەی خوازراو و چاوەڕوانکراوی ژیانی کۆمەڵگا کە ئامانجێکی خواییە بۆ ژیانی مرۆیی. لەو میانەیەدا ژنان سەرەڕای ئەوەی کە لە ناوەندی خێزان، بەرپرسیارییەتیی هەستیار و گرنگی دایکایەتی و هاوسەرێتی و پەروەردەکردنی نەوەیەکی وریا و وشیار و بیناکەری ئایندەیان لە ئەستۆیە، بەڵام هەرگیز لە خەم و نیگەرانییە کۆمەڵایەتییەکان و ئارمان و ئامانجە بەرز و پیرۆزەکانی کۆمەڵگای مرۆیی دوور ناخرێنەوە و پەراوێز ناخرێن، بەڵکو کردەوە و ئەرکە خێزانییەکانیشیان لە ڕاستا و گۆشەنیگای ئەم ئامانجە بەرزەوە پێناسە دەبێت. ڕاستە کە ڕۆڵ و ئەرکی هاوسەرێتی، منداڵداری و دایکایەتی وا دەخوازێت ژن لە ماڵدا بوونی هەبێت، بەڵام ئەوە خۆی‌لەخۆیدا بەشدارییەکی کۆمەڵایەتیی بەنرخە، کە گەشەکردن و پتەوکردنی توخمی ڕۆحی و دەروونیی کۆمەڵگا و پەروەردە و پێگەیاندنی تواناکان و بەهرەکانی خۆی بەدی دەهێنێ. ئەمە جیایە لەوەی کە لە زۆر بوارە کۆمەڵایەتییەکانیشدا، ئامادەبوون و بەشداریی ژنان لە ئایینی ئیسلامدا، نە وەکو ماف، بەڵکو بە ئەرك و واجب زانراوە و لە قورئاندا بە وردی و بەرفراوانی داوا کراوە و بە هەند وەرگیراوە.

کار و چالاکیی مرۆیی، خۆی دوو جۆرە: کاری جەستەیی (ماسوولکەیی) و کاری هزری (مێشکی)، کە هەردووکیان دەشێ لەناو خێزاندا ئەنجام بدرێن. مەگەر ئەوەی "کار" بە پێناسەیەکی مارکسیزمانە بناسێنێت، کە پێی وایە بریتییە لە: "ئەو ئەندازە هێز و وزەی کە پێویستە بەکار ببرێت بۆ ئەوەی لە ماددەیەکی خاو، کاڵا و بەرەهەمێك دروست ببێت، کە بەکەڵك بێت و بەکاری ببەین!". ئایا دەبێ مسۆگەر کاڵایەکی ماددی بەرهەم بهێنرێت تاکو ناوی لێ بنێین "کار"؟ یان دەبێ مسۆگەر مووچەیەك دابین بکات؟ سروشتییە کە لە ڕوانگەی ماددیگەرایانەوە، وەك قسەی ئەو ژنە فێمێنیستە کە پێشتر ئاماژەمان پێ کرد،[1] دەرهێنانی منداڵ و بەرهەمهێنانی، بە بەرهەمی مەعنەوی بزانرێ؛ چونکە بیرکردنەوەی ماددی، مرۆڤ لەگەڵ کەرەستە و ماددە هەڵدەسەنگێنێت و هەتا ڕیزی کاڵا و شتومەکی ماددی و ئامرازی بەرهەمهێنانی بچووك دەکاتەوە. ئەگەر وا بێ، زۆر ئاژەڵ هەن کە کاریان دەبێتە هۆی بەرهەمی ماددی، کە دەخۆرێ و دەفرۆشرێ (وەك کاری مانگا لە کێڵگە و، مەڕوماڵات لە کارگەی بەرهەمهێنانی شیر و ماست، یان کاری ئەسپ لە ئاشەکان و کاری مشك و مارەکان لە تاقیگە پزیشکییەکان). هەروەها زۆر ئامێری میکانیکی و کارەباییش هەن کە کاڵای ماددی بەرهەم دەهێنن! بۆیە نابێ چالاکی و کاری مرۆڤ تەنها لە کارگە و پیشەی دەرەوەی ماڵ سنووردار بکرێت، تەنها لەبەر ئەوەی بەرهەمی ماددی و مووچەی مانگانەی هەیە!

هەروەك دەزانین، لە ئەدەبیاتی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، بە تایبەتی کۆمەڵناسی، بەشداریی کۆمەڵایەتی بە مانای ڕۆڵنواندنی کاریگەرانەی تاکەکانە لە پرۆسەی ژیانی کۆمەڵایەتیدا؛ جا ئەم ڕۆڵە لە ناو فەزای خێزان و ماڵدا بێت، یان لە دەرەوەی؛ بۆیەش کە ڕۆڵەکان و بەرپرسیارییەتییە خێزانییەکان لە ڕوانگەی هەندێ لە کۆمەڵناسانەوە بە سەرەکیترین ڕۆڵی کۆمەڵایەتی دادەنرێن. لە لایەکیترەوە، پیاوانیش لەگەڵ نواندنی ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکان، بەرپرسیارییەتی و پێگەیەکی گرنگ و کاریگەریان هەیە لە ناو خێزاندا؛ لەبەر ئەوە ناولێنانی فەزا و ژیانی خێزانی بە "ژیانی پرایڤێت و تایبەت" هیچ شیاو و ڕاست نییە؛ چونکە ئەو هەرێمە لە پەیوندی لەگەڵ "هەرێمی کۆمەڵگا" پێناسە دەبێت و تەنها تایبەت نییە بە بەشداریی ژنانیشەوە. خێزان لە ڕوانگەی کۆمەڵناسییەوە بریتییە لە یەکەیەکی کۆمەڵایەتی هەروەك ئیدارە و کارگە و سەندیکا و وەزارەت و دەزگاکانی دیکە لە ناو کۆمەڵگادا، یەکەیەکی کۆمەڵایەتین؛ لەسەر چ پێوەرێك کاری ناو خێزان

1 . ڤیان مەجید؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 23 و 24.

بۆ ژنان، کاری کۆمەڵایەتی ناژمێردرێت، بەڵام هەمان کار لە یەکەیەکی دیکەی کۆمەڵگا بە بەشداری و کاری کۆمەڵایەتیی حیساب دەکرێت؟!

هەروەها تێکەڵبوونی ژیانی گشتی و تایبەت، کە فێمێنیستان وا دەڵێن، تێکەڵبوونێکی تەنها فیزیکی نییە، کە ئەگەر ئەرکەکانی ژنان زیاتر ڕوو لە خێزان و، ئەرکەکانی پیاویش زیاتر ڕوو لە کۆمەڵگا بێت، ببێتە هۆی پچڕاندن و جیاکردنەوەی ئەو دوو هەرێمە لە یەکتری، یان بە زیادبوونی ڕێژەی بەشداریی فیزیکیی ژنان لەناو کۆمەڵگادا، ئەم مەودا و پچڕانە نەمێنێ، بەڵکو ئەم پەیوەندییە، پەیوەندییەکی فەرهەنگی و کولتوورییە، کە لە پێناو گەیشتنە بە ئامانجە پیرۆزەکانی کۆمەڵگا، کە دەوەستێتە سەر ڕۆڵی تەواوکەریی ژن و پیاوەوە، کە بەبێ ئەرکی هەریەك لەوان، کۆمەڵگا پەکی دەکەوێت و تووشی کەموکورتی و وەستان دەبێتەوە.

دابەشکردنی ئەرکەکان و بەرپرسیارییەتەکان لە نێوان ژن و پیاودا، نەریتێکی ئەقڵانی و لۆژیکییە، کە نە تەنها لە فەرهەنگی ئیسلامەتیدا، کە لەسەر بنەمای "مرۆڤناسیی ئایینی" (Anthropology of Relegion) جەختی لەسەر دەکاتەوە، بەڵکو لە کۆمەڵگاکانی دیکەی جیهانیش، بەتایبەتی لە سیستمی کۆمەڵایەتیی وڵاتانی پێشکەوتوو و مودێرنیش، بە شێوەیەکی سروشتی و ئاسایی لە بوارە جیاجیاکاندا باوە و کاری پێ دەکرێت؛ بۆیە بە قبووڵکردن و دانان بە جیاوازییە دەروونی و جەستەیی و سۆزدارییەکانی نێوان ژن و پیاو، کە هەموو زانستەکان، بە تایبەتی دەروونناسی و بایۆلۆژی واژوویان کردووە، ڕەچاونەکردنی جیاوازییەکان لە پرۆسەی دابەشکردنی ئەرکەکان، کارێکی نائەقڵانی و ناتەندروست و نابەجێ دەبێت!

هەڵبەت، هەروەك ئاماژەمان پێ کرد، ئەم دابەشکردنە لۆژیکییە لە هیچ ڕوویەکەوە نابێتە دابەشکردن و جیاکردنەوەی ژیانی مرۆیی بەسەر دوو هەرێمی گشتی و تایبەتدا؛ چونکە ژن و پیاو وەك یەك پەیکەرن، کە بە ئەستۆگرتنی بەرپرسیارییەتەکان، ڕۆحی ژیان و هێز و چالاکی و وزە دەخەنە ناو ڕەگ و دەمارەکانی کۆمەڵگای مرۆیی. بەم پێیە سەرەڕای جیاوازیی ڕۆڵ و ئەرکەکان، پێکەوە ڕۆڵ و ئەرکی هاوبەشیش دەنوێنن؛ ئەویش ڕۆڵی پاراستن و بەردەوامی و زیندووهێشتنەوەی کۆمەڵگایە؛ ئەوەش هەرگیز ئەو مانایەی ناگەیەنێت کە هەر کامیان لە چ شوێنێك و لە چ هەرێمێکدا دەبێ ڕکابەرایەتیی ئەویتر بکات، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە هەرکامەیان لە کام بوار و هەرێمدا، دەتوانێ پێشکەوتن و گەشەکردنی زیاتر ببینێ و ئامانجی خۆی باشتر بەدی بهێنێ.

### 2.4.3- قەفەسی ئایین:

ئەو تاقمە لە ڕۆشنبیران و فێمێنیستان، کە باسمان کردن، ئایین بە گشتی* و ئایینی ئیسلامیش بە تایبەتی بە ڕێگری ئازادیی ژن دادەنێن لە کۆمەڵگای کوردیدا، کە پاڵپشتی لە سیستمی پیاوسالاری و نێرسالاری، هەروەها دابونەریتی کۆنەپەرست دەکات. دەڵێن: بە پێی ڕێنماییەکانی ئایینی ئیسلام، خێزان و کۆمەڵگا دوو یەکەی پێکەوەگرێدراون، کە پێکەوە تاکەکان ـ بە ژن و پیاوەوە ـ لە ناو خۆیاندا دەتاوێننەوە و هەموو ئازادی و مافەکانی مرۆڤ پێشێل دەکات؛ بە تایبەتی ژن، کە دەیکاتە پاشکۆ و کۆیلەی پیاو. با سەیری چەند بەشێك لە وتارەکانیان بکەین:

"ئایین پاڵپشتیی لە ملکەچی و ژێردەستەیی و بێ مافی ژن دەکات، هەر سێ ئایینەکە (یەهوودی، مەسیحیەت، ئیسلام) ستروکتورێکی پتەوی پیاوسالارییان هەیە، هەموویان هەوڵی کۆنترۆڵکردنی جەستە و سێکچوالیتیی ژنیان داوە، جیاوازیی ئایینی ئیسلام لەگەڵ ئایینەکانی دیکە، ئەوەیە دەست دەخاتە ناو وردەکارییەکانی ڕۆژانەی خەڵك و کۆمەڵگەوە. ئایین ڕۆڵی زۆرە لەو پێشێلکاریانەی لە کۆمەڵگەدا بەرامبەر بە ئافرەت دەکرێت... ئایین بۆتە هۆکاری سەرەکیی بۆ پێشێلکردنی ماف و ئازادی. دیارە لە ڕووی مێژووییەوە هەموو ئایینەکان ئەو ڕۆڵەیان بینیوە... من یەکێك بووم لەو کەسانەی لەو خۆپیشاندانانەی کە چەند ڕێکخراوێکی ئافرەتان بۆ بەردەم پەرلەمانی کوردستان سازیان کردبوو، بۆ پشتگیریکردنی ریفۆرمی یاسای باری کەسێتی، ئەوانەی لەوێ بووین چەند کەسێکی کەم بووین، دواتریش کە یاسای فرەژنی پەسەندکرا، کەس ئامادە نەبوو بێتە سەر شەقام و ناڕەزایی لە دژی بڕیارەکەی پەرلەمان دەربڕێت... کەچی سەیر دەکرێت لەسەر کاریکاتۆرێکی دانیمارکی کە لەسەر کەسایەتیی پێغەمبەر کرابوو، نیوەی خەڵکی هەولێر ڕژانە سەر شەقام بۆ خۆپیشاندان لەدژی ئەو وێنانە، کە هیچ پەیوەندییان بە ژیانی ڕۆژانەی ئێمەوە نییە**."[1]

* هەڵبەت هەروەك بینیمان، هەندێك لەوان، ئایینی ئێزدی و ئایینی مەسیحییەتیان پێ باشتر و پەسندتر بوو لە ئیسلام!

** ئەگەر ئەو وێنانە هیچ پەیوەندییەکی بە ژیانی ئەو فێمێنیستە و هاوڕاکانییەوە نەبێ ـ کە نییە ـ پەیوەندییەکی زۆر پتەوی بە ژیانی ئەو کەسانەوە هەیە کە ڕژاونەتە سەر شەقام. سروشتییە کە ناهێنە سەر شەقام بۆ ئەو شتانەی کە بە ویستی ئەو فێمێنیستانە نەبێت؛ چونکە بەشی هەرە زۆری ئەو خەڵکەی کە ئەو فێمێنیستە لێی بەگازندەیە، وەکو ئەو بیرناکەنەوە. چۆن دەکرێت بەرامبەر بە دەرکردنی یاسایەك کە هەڵقوڵاوی ئایینی زیاتر لە (90%)ی دانیشتووانی هەرێمی کوردستانە، بێنە سەر شەقام تەنها لە پێناو تێرکردنی ئارەزووەکانی چەند کەسێك بە ژمارەی پەنجەکانی دەست؟ (وەك خۆی دەڵێت: چەند کەسێك بووین...) . ئەگەر دەیانەوێ گوێیەك هەبێت پەیام و هاواری ئەوان ببیستێ، کڕیارێك هەبێت کاڵا و بەرهەمە دەرەکییە هاوردەکراوەکانی ئەو دیوی جیهانیان لێ بکڕێ، بە دڵنیاییەوە ئەم گوێیانە و ئەم کڕیارانە لێرە نادۆزنەوە! کاری ئەوان وەك ئەو بازرگانە وایە کە قووتی و کۆنسیرڤی "قالۆنچە و سیسرکە"، کە خواردنێکە بەتامە بۆ چینییەکان و کۆرییەکان هاوردە دەکات بۆ شوێنێکی دیکە کە هەر بە بیستنی وشەی "سیسرکە" بێز دەکەن و ڕشانەوەیان دێ، با هەر لە میدیاکانی بینراو، نووسراو و بیستراویش ڕیکلامی بۆ بکات! (دواتر لە تەوەری: "ژنانی کوردستان، تا چەند ڕۆشنبیرە فێمێنیستەکان بە نوێنەری خۆیان دەزانن؟" هەر لەم بەشەدا، ئاماژە بە هەندێ ئامار و ڕاپرسیی نوێ دەکەین، کە شایەتیمان بۆ دەدەن؛ بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندیی بە ئایین و یاساکانییەوە هەیە).

"ئاساییە زۆرینەی بەها کولتوورییەکان لە ئاینەوە سەرچاوەیان گرتبێت، ئاینەکانیش... ئاستەنگی بەردەم پێشکەوتنی ژنان بوون و کۆمەڵگا و پێشەوایانی ئاین لە کۆمەڵگادا بە شێوەیەك ئاینیان بەکارهێناوە کە دەقاودەق کردۆیانەتە هەوێنی دروستکردنی پیاوسالاری و ڕەهاکردنی دەسەڵاتی پیاو... هاوکات ڕەهبەران و نماینده‌کارانی ئاینەکان و ئاراستەی ئاینزاکانیان بە شێوەیەك لێکدانەوە و شیکردنەوەیان بۆ کردووە کە پێشێلی زۆر لە مافەکانی پیاوانیان کردووە چ جای ژنان کە بە تەواوی لە مرۆڤایەتییان داتاشیون و کردۆیانەتە کاڵایەك بۆ خۆشگوزەرانی پیاو. هەر بۆیە بە درێژایی مێژوو ژنان بوونەتە دیلی دەقێك لە هەموو هەنگاوێکی ڕزگاربووندا تیرەباران کراون... بە هەر حاڵ پەیدابوونی خواوەند و ئاینەکان بە درێژایی مێژوو تا دەهات لە خزمەتی ڕژێمی باوکسالاریدا بووە."[2]

"لە بڕواکانی ئایینیشدا هەر پیاو باڵادەستە و سەرکردایەتی ژنان لە ناو کۆمەڵ بۆ ئەو پاوان کراوە. هێزی سەرەکی کۆمەڵ هەر ئەو هێزەیە کە لە سەرەتای مێژووی بنیادەمەوە هەبوو؛ سەرروەری بۆ خاوەن هێزی مادییە، بۆ ئەو بەشەی کۆمەڵە کە ئەهرومەکانی کاری بەدەستەوەیە... لە هیچکام لە دینەکاندا باسی بەرابەری پیاو و ئافرەت نەکراوە."[3]

"ئایین یەکێکی‌تر بووە لەو میکانیزمانەی کە لەو ڕێگەیەوە پیاو ناوەندبوونی خۆی و پلەدوویی ژنانی دووپاتکردۆتەوە و لەم ڕێگایەوە بڕیار و دەسەڵاتی خۆی بەسەر ژندا سەپاندووە."[4]

زۆربەی فێمێنیستە کوردەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە شەریعەت و یاساکانی ئیسلام بنەمای جیاکارین لە نێوان مافی ژنان و پیاوان، کە پێچەوانەی "جاڕنامەی مافی مرۆڤ" و "بەیاننامەی سیداو"ە؛ بۆیە بە پشتبەستن بەو بنەمایە تیۆری و جیهانبینی و ئەقڵانییەتی مودێرنیتەی ڕۆژئاوایی، دەقەکانی ئایینی ئیسلام هەڵدەسەنگێنن:

"لە سەدەی بیست‌ویەك و لە کۆمەڵگەیەکی مۆدێرندا، ئێمە ئەو شتە نەگۆڕ و جێگیرانە... بە ریسواکردنی شکۆمەندیی مرۆڤی کوردی دەزانین: دانانی دوو ژن بەرامبەر بە یەك پیاو لە شایەتییدان، فرەژنیی و مافی تەمبێکردنی ژن لە لایەن پیاو و قەدەغەکردنی گەشتی هاتووچۆ بۆ دەرەوە بە بێ‌ڕێپێدانی نیگادار (وەلی ئەمر)ێك کە پیاوە و... زۆری دیکە، شتگەلێکی نەگۆڕ و جێگیر نین کە جێگەی ڕێز بن..."[5]

---

1 . چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەی "ڕۆژنامە" لەگەڵ د. نەزەند بەگیخانی؛ وەرگیراوە لە: فەرمان خەرابەیی؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 69 - 70.

2 . ڤیان مەجید؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 29.

3 . سەرۆ قادر؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 24.

4 . د. چۆمان هەردی؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 128.

5 . نەزەند بەگیخانی، نەجیبە مەحمود، هۆزان مەحمود، ئەڤین ئیبراهیم فەتاح، ڕۆزا حوسێن، رووناك فەرەج، چۆمان هەردی، ڤینۆس فایەق (2013/10/7)؛ **"یادداشتنامەیەك ڕووەو بزووتنەوەی گۆڕان و ڕای گشتی: پلەدوویی ژن لە شتە نەگۆڕ و جێگیرەکانی هێزێك نییە کە ڕێزی بۆ مرۆڤ هەبێ"**: لە ماڵپەڕی ئەمڕۆ:

http://www.emrro.com/pileduyijin.htm

"... شەرعەکانی ئایینی ئیسلام، پەرە نادەن بە مافی ژنان لە کۆمەڵگەی کوردیی. بەپێی ئەم شەرعانە، ژنان پایەیێکی نزمتریان هەیە لە پیاوان لە بواری یاسا خێزانییەکان، میراتگری و بابەتە پەیوەندیدارەکان بە شەرەف... هەرچەندە زۆر هەنگاو لە لایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان نراوە بۆ گۆڕینی هەندێك یاسا بۆ بەرژەوەندی ژنان، هێنانەدی پاراستنی یاسایی ژنان هێشتا گرفتدارە. زۆر جار، وا پێدەچێ ڕەفتاری ئایینی و دابونەریتەکان زۆر بەهێزتر بن لە پیادەکرنی یاسانوێکان."[1]

"... لە قورئان و کردار و ڕەفتار و گوفتاری پێغەمبەر و هاوەڵەکانی پێغەمبەر و ڕا و قسەی مەزهەبی ئیمامی شافیعی بۆمان ڕوون بۆوە کە ژن یەکسان نییە لەگەڵ پیاو لە مافدا و پیاو سەرداری ژنە و لە ژن گەورەترە و خوا ژنی بۆ هەوەس و ئارەزووی پیاو دروست کردووە و تەڵاق و مارەیی بەدەست پیاوە و باوك دەتوانێ کچی سەر لانکە بە شوو بدا و مارە بکات و کچی خۆناس و عازەبیش بەبێ پرس بەمێرد بدا و مارە بکا. پیاو دەتوانێ چوار ژنی هەبێ پێکەوە... بەڵام ژن ناتوانێ... ئەگەر مافی ژن و پیاو وەکو یەك بان دەبوو ژنیش بتوانێ چوار مێردی هەبێ و لەگەڵیاندا ڕابوێرێ و کەیف بکا."[2]

"لەبارەی شایەتی و میرات و خوێن، ژن بە کەمتر لە پیاو تەماشا دەکرێ."[3]

"پیاو سەردار و گەورەی ژنە لەبەر ئەوەی خوا بە گەورەتر دایناوە و لەبەر ئەویش کە پیاو لە ماڵی خۆیان خەرجییان داوە بە ژنان."[4]

"چیرۆکی خوڵقاندن کە لە هەر سێ ئایینی جوولەکە و مەسیحی و ئیسلامدا باسکراوە. بەپێێ ئەم چیرۆکە ئادەم و حەوا سەرەتا و ئەسڵی مرۆڤایەتین لەسەر زەوی. خودا لە پێشدا ئادەمی دروستکرد و دواتر حەوای دروستکرد تا ئادەم هەست بە تەنهایی نەکات. بەم شێوەیە حەوا لەبەر خاتری ئادەم دروستکرا. نەك هەر ئەمە، بەڵکو حەوا لە پەراسووی ئادەم دروستکرا، واتە گەر ئادەم نموونەی سەرەکیی ئینسان بێت کە خودا دروستیکردووە ئەوا حەوا تەنها کۆپی مرۆڤە سەرەکییەکەیە. ئەم چیرۆکە بۆ کەمکردنەوەی دەسەڵاتی ژن سوودی لێوەردەگیرێت... و ڕێگەخۆشکەرە بۆ ئەو تێڕوانینە باوەی کە ڕازیکردنی مێرد و تێرکردنی پێویستییە جنسی و جەستەییەکانی ئەرکی پیرۆزی ژنی بە ئیمانە. ئەمجۆرە تێڕوانینە لە ئایینی ئیسلامدا بە چەند ئایەت و فەرموودە پاڵپشتیلێکراوە و دووپاتکراوەتەوە و من لێرەدا باسی هەندێکیان دەکەم: ئایەتی نساءکم حرث لکم فأتوا حرثکم أنی شئتم ... واتە ژنەکانتان کێڵگەی ئێوەن... بەم پێیە خودا ژنی بۆ پیاو خوڵقاندووە تا بە دڵی خۆی لەززەتی لێ ببینێ، بە مەرجێك زێ بۆ ئەم مەبەستە بەکار بێنێت نەك کۆم (کێڵگە ئەو شوێنەیە کە تۆوی تیا دەڕوێنرێت، کەواتە کێڵگە هێمایە بۆ

1 . چەلەنگ ڕەشید یەحیا؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 31.

2 . عەبدولخالیق مەعرووف (2008): "**ئادەمزاد لە کۆمەڵی کوردەواریدا**"؛ هەولێر: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس؛ چاپی دووەم؛ ل 100.

3 . سەرچاوەی پێشوو؛ ل 83.

4 . سەرچاوەی پێشوو؛ ل 85.

زێ). لێرەدا پیاو ئەکتەر و کەسی سەرەکییە و ژن ئەو بوونەوەرەیە کە لە پەیوەندی لەگەڵ ئەودا باسدەکرێت... لە سوورەتی النساءدا هاتووە کە: الرجال قوامون علی النساء ... لێرەدا نەك هەر پیاو لە پێش ژنەوەیە (قوام)... بەڵکو ئەگەر ژن گوێڕایەڵ و ملکەچی مێردەکەی نەبوو (نشوز) ئەوا مێرد بۆی هەیە سەرەتا ئامۆژگاری بکات (فعظوهن) دواتر جێگەی لێ جیابکاتەوە (واهجروهن فی المضاجع) و گەر ئەمەش سوودی نەبوو، ئەوا دەتوانێت لێی بدات (واضربوهن). تەفسیرە لیبراڵەکان لە کوردستاندا بۆ لێدانی ژن ئەوەیە کە وەك تەمێکردن، هەروەك تەمێکردنی منداڵ، پیاو بۆی هەیە لەکاتی وادا بە هێواشی بە ژنەکەیدا بکێشێت، بێ ئەوەی هیچ شوێنێکی بریندار بێت، شین بێتەوە یان بشکێت... بێگومان نابێت ئەم مافە لەژێر هیچ پەردە و تەفسیرێکدا بە پیاو بدرێت... بە شێوەیەکی گشتی لە ئیسلامدا پیاو مافەکانی ژنەکەی بەسەر ئەوەوە. پیاو لە ئایەتەکاندا موخاتیبی یەکەمە و گەرچی پێی دەگوترێ کە بە نەرمی و بە میهرەبانی لەگەڵ ژنەکەی رەفتار بکات، بەڵام ئەو خاوەن دەسەڵات و مافدار و بڕیاردەرە و شوێنگەی لە ژنەکەی بەرزترە، وەك لە سورەتی البقرةدا هاتووە: للرجال علیهن درجة... ئەمە لە کاتێکدا کە ژن داوای لێدەکرێت ملکەچی بڕیار و خواستەکانی مێردەکەی بێت دەنا مێردەکەی بۆی هەیە تەمێی بکات... پیاو دەتوانێت بە کەیفی خۆی لەگەڵ ژنەکەی بخەوێت، دەتوانێت ژنە ناشزەکەی تەمێ بکات، مافی میراتی زیاتری هەیە، شەهادەتی ئەو یەکسانە بە شەهادەتی دوو ژن (فإن لم یکونا رجلین فرجل وامرأتان ممن ترضون من الشهداء "سورة البقرة")، مافی بڕیاردانی هەیە لەسەرجەم کاروباری خێزاندا و دەشتوانێت چوار ژن بهێنێت. لەبەرامبەر ئەمەدا مافی ژن بەسەر پیاوەوە پێکهاتووە لە مافی بەخێوکردن و ڕێزگرتن و خۆشەویستی و نەفەقە..."[1]

"حیجاب" دیاردەیەکی هەرە بەرجەستەی ئایینی ئیسلامە کە بە بڕوای ئەم ڕۆشنبیرە فێمێنیستانە، نەریتێکی کۆنەپەرستانەیە و بەرهەمی سیستمی پیاوسالارییە و بۆ کۆنترۆڵی ژنان و بەندکردن و سنووردارکردنیان دانراوە:

"جگە لەوەی کە ئەرکی ژنە باڵاپۆشی بکات تا پیاو زەوقی هەڵنەستێت و نەزەری حەرامی تێنەکات و کاری ناشایستە ئەنجام نەدات. کەواتە بەشێکی زۆری بەرپرسیارێتی لەم بوارەدا لە ئەستۆی ژندایە."[2]

"بەپێی دینی ئیسلام پێویستە ژن خۆی داپۆشێ و جوانیی خۆی و لەشی لەبەر چاوی پیاوی بیانی (نامەحرەم) وەدەر نەخا، واتە لەشی ژن لە خودی خۆی شەرمە (عەورەتە)."[3]

1 . د. چۆمان هەردی: هەمان سەرچاوە: ل 128 - 130.

2 . سەرچاوەی پێشوو، ل 130.

3 . عەبدولخالیق مەعرووف: هەمان سەرچاوە: ل 87.

"حیجاب، نەریتێکی قورس و ناشیرین بوو بە سەر ژناندا سەپێندرا و، لەسەر ڕیشە کۆمەڵایەتییەکەی ئەو نەریتە، تێروانینێکی ئایینی داڕێژرا و، ئیدی حیجاب بوو بە نەریتێکی ئایینی بۆ جیاکردنەوەی باوەڕدار لە بێباوەڕ، یان ژنانی بەڕەوشت لە بێڕەوشت، بە مانا ئایینییەکەی."[1]

"... ژمارەی لەچك بەسەر زۆر بووە، ئەمە نیشانەی ئەوەیە بەرەو دواوە دەچین."[2]

"... بە گوێرەی هەواڵی ماڵپەڕێکی کوردی، ڕێژەی ژنانی بالاپۆش لە پایتەختی ڕۆشنبیری ڕوو لەزیادبوونە... لە پێنجەمین فێستیڤاڵدا کە لە سلێمانی بەڕێوەچووە، *400* کچی ئەم شارە حیجابیان لەسەر نراوە و باسی ئەوەیان بۆ کراوە کە دەبێ هەموو کچ و ژنێکی کورد وەك ئەوان بکەن و جەستەی خۆیان بشارنەوە..."[3]

"... تا ئەو کاتەی ژنان لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکان کۆنترۆڵ دەکرێن، کۆمەڵگەی پیاوانەی ئیسلامە هەست بە ئەمنییەت دەکا. بەم هۆیە هەموو هەوڵی دەسەلاتدارنی کۆمەڵگە ئیسلامییەکان ئەوەیە کە حیجابی ژنان بپارێزرێ. لەبەر ئەوەی حیجاب بۆ پیاوانی موسڵمان تەنیا هێمای خۆسەپاندن نییە بەسەر ژناندا، بەڵکو لە ڕەهەندە مێژووییەکەی خۆیدا بە واتای پاراستن و درێژەدانی پیاوسالاری واتە پاراستنی پێگەی مێژوویی پیاوانە. حیجابی ژن بۆ پیاوی موسڵمان نیشانەی باڵادەستی ڕەگەزی پیاوە بەسەر ڕەگەزی ژندا. واتە بڕیارەکان چ لە بیاڤی گشتیدا چ لە بیاڤی تایبەتدا لە لایەن پیاوانەوە دەردەچن. جیهانی ئیسلام بەهۆی فشاری هەلومەرجی جیهانی و نێوخۆیی ئامادەیە ژنان لە کاروباری ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتیدا بەشدار بکات، بەڵام بە مەرجی پاراستنی حیجاب. بە زۆرێك لە وڵاتانی ئیسلامی ئەوە دەبینین: ئەندونزی، مالزی، کوەیت، میسر و ...هتد. بە دەربڕینێکی دیکە جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان توندڕەوترین ڕەوتە ئیسلامییەکان وەك تاڵەبان و ئەلقاعیدە و لیبرالترین ڕەوتە ئیسلامییەکان وەك ئەردوغان و خاتەمی دا نییە. لەبەر ئەوەی حیجاب بۆ هەموویان، بنەمایەکی هاوبەشە بۆ درێژەدانی پیاوسالاری لە ڕەهەندە مێژووییەکەیدا."[4]

### 2.4.3.1- تێبینییەکانمان لەسەر بەکۆتزانینی ئایین:

**تێبینی یەکەم)** بەکۆتزانینی ئایین، بەو مانایەی کە ئایین بریتییە لە چوارچێوەیەکی ژێدەری بۆ هەموو ڕەفتارەکان و دابەشکردنیان بەسەر حەڵاڵ و حەرام و قەدەغەکردن و سنووردارکردنی

1 . مەهاباد قەرەداغی (2012)؛ "**دەسەلاتی شەرەف و کلتووری شەرەفناميز**"؛ گۆڤاری شیکار: ساڵی یەکەم؛ ژمارە سفر؛ ل 155-156.

2 . چاوپێکەوتن لەگەڵ روناك فەرەج؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 337.

3 . تامان شاکر(2014/1/9)؛ "**پایتەختی ڕۆشنبیری و فێستیڤاڵی حیجاب**"؛ لە ماڵپەڕی ڕووداو:
http://rudaw.net/sorani

4 . ڕەحمان سەلیمی (2010/12/7)؛ "**ژن و قەیرانی جیهانی ئیسلام**"؛ لە ماڵپەڕی کوردستان و کورد:
http://www2.kurdistanukurd.com

هەندێ ڕەفتار و هەڵسوکەوتدا، کە ڕۆشنبیرە فێمێنیستەکان بۆ ئەنجامدانی هەمان ئەو ڕەفتارانە خەبات دەکەن و بە ئازادیی ناو دەبەن (بۆ نموونە وەکو حیجاب)، دیسان بە پشتبەستن بە بنەمای (ئازادی لە چی؟) و (ئازادی بۆ چی؟)، پێم وایە ئازادبوون (لە) کۆتی ئایین واتە ئازادبوون (بۆ) کۆتی ئایینێکی دیکە! مەرج نییە ئەو ئایینەش ئایینێکی ئاسمانی بێت؛ چونکە هەر سیستمێك کە پەیوەندییەکانی مرۆڤ دەستنیشان و چوارچێوەکانی دیاری دەکات، ئایینە، با خاوەن کتێب و پێغەمبەر و مەزهەبیش نەبێت! خوا لە قورئاندا بە پێغەمبەرەکەی ـ د.خ ـ دەفەرمێ: ﴿قل یا أیها الکافرون!... لکم دینکم و لی دین!﴾؛[1] واتە: بڵێ: ئەی بێباوەڕان!... ئایینی خۆتان بۆ خۆتان و ئایینی خۆمیش بۆ خۆم! کەچی ئەو کافرانە بتپەرست بوون و خاوەن ئایین نەبوون.

کەسێك کە دەیەوێ لە کۆتی ئایین هەڵبێت بەو پاساوەی کە ئایین ڕێنماییەکان و یاساکانی بەسەر ژیانی ئەودا دەسەپێنێ و دەیبەستێتەوە بە چوارچێوەی "بکە" و "نەکە" و لەبەر ئەوەش دەیەوێ (لە)و چوارچێوانە ڕەها و ئازاد بێت، ئەمە خۆیلەخۆیدا بریتییە لە پەنابردن (بۆ) ئایینێکی دیکە و نوێ، با ئاسمانییش نەبێ! چونکە بەکۆتزانینی ڕێنمایی و ئەمر و نەهی و فەرزەکانی ئایین و، پەنابردن بۆ بیرۆکە و سیستمێکیتر وەکو جێگرەوەی ئایین، خۆیلەخۆیدا بریتییە لە چوونە ژێر ڕکێفی دەسەڵات و ملکەچی بۆ ئەمر و نەهیی جێگرەوە و بەدیلەکەی! واتە ئایین دەڵێ: (أ) بکەن و (ب) مەکەن! بەڵام ڕوشنبیران بە پشتبەستن بە بیرۆکەکەیان دەڵێن: (أ) مەکەن و (ب) بکەن! ئایا هیچ جیاوازییەك هەیە لە نێوان ناوەڕۆك و جەوهەری هەردوو لایەندا؟ تەنها ـ هەروەك لۆژیکی فەلسەفی پێمان دەڵێت ـ شوێنی گوزارەکان دەگۆڕێت و بە تەئکید فەرمان و چوارچێوە ژێدەرییەکانی (بکەن و نەکەن) و (دەبێ و نابێ) هەر دەمێنێ! بۆ نموونە: ئایین دەڵێ: حیجاب پێویستە و خۆتان داپۆشن! ئەوە ئەمرێکە بە کردنی کارێك و نەکردنی کارێك کە خۆڕووتکردنەوەیە. بەڵام ڕۆشنبیرە فێمێنیستەکان دەڵێن: حیجاب مەکەن و خۆتان دامەپۆشن! ئەوەش ئەمرێکە بە کردنی کارێك و نەکردنی کارێك کە خۆپۆشتەکردنە! ئەگەر ئەمری یەکەم بە کۆت بزانرێ ـ کە لە لایەن ڕۆشنبیران دەزانرێ ـ ئەمری دووەمیش لای موسڵمانێکی پابەند بە ئایینەکەی بە کۆت دەزانرێ!

1. (الکافرون: 1- 6).

**تێبینیی دووەم)** وەك پێشتریش گوتمان: زۆر لە کێشەکانی ژنان، سەرچاوەی سەرەکییان دەگەڕێتەوە بۆ لادان لە شەریعەت و پابەندنەبوونیان؛ بۆ نموونە: ئەگەر سەرنج بدەینە هەندێك لەو کێشانە، کە بوونەتە مەترسی لەسەر ژنان و هەروەها پاساو و بیانوویەکی بەهێزیش بۆ دروستبوون و پەیدابوونی ڕەوتەکانی فێمێنیزم و سەنتەر و ڕێکخراو و کۆمەڵەکانی تایبەت بە بواری ژنان، هەموویان بەهۆی لادان بووە لە ئایین و شەریعەتی ئیسلام؛ وەك: (کوشتنی ژنان بە تۆمەتی زینا، بەبێ بەڵگە و ئیسپاتی شەرعی)، (خۆکوژیی ژنان)، (زینا و داوێنپیسی)، (توندوتیژی دژ بە ژنان بەبێ هیچ پاساوێك)، (ئیستغلالکردنی هەندێ لە ژنانی دوور لە پەروەردەی ئیسلامی، لە لایەن کەسانی بێئەخلاق و خوانەناس)، (بە کەم و پلەدووزانینی ژنان لە بواری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریدا)، (بەکاڵاکردنی ژنان لە ڕێگەی بەکارهێنانی وێنە و دیمەن و فیلمی ورووژێنەریان، لە لایەن میدیاکانەوە، وەك: ڕۆژنامە و گۆڤار و فیلم و کلیپی گۆرانی، بە مەبەستی ڕیکلام و بازرگانی و زۆرکردنی ژمارەی خوێنەر و بینەر و بیسەر)، (ڕەواجدانی جلوبەرگ و پۆشاکی ورووژێنەر و، هاندانی ژنان بۆ لاسایکردنەوەی مۆدێلی سەیر و نابەجێ لەگەڵ ئایین و دژ بە کولتووری کوردی). هەموو ئەم ڕەفتار و دیاردانە لە ڕووی شەرعی ئیسلامەوە، بە بێدینی و لادان و گوناه دێنەهەژمار، کەچی زۆر لەو کێشانە وەکو ناوونیتکەلێدان لە لایەن ئەم فێمێنیستانەوە بە ئایینی ئیسلام هەڵدەبەستن.

دەرئەنجامەکانی توێژینەوە و ڕاپرسییە بەرفراوانەکەی سەنتەری نێودەوڵەتیی "WVS"* (ڕووپێوی بەها جیهانییەکان)، کە ساڵی (2013) لە هەرێمی کوردستاندا کردوویەتی، بە تەواوەتی چاوەڕوانییەکانی فێمێنیستان و ڕۆشنبیران لەبارەی ئایینەوە بە هەڵە دەخاتەوە. ئەوەتا وەڵامی ژنانی کوردستان لە پرسیاری "گرنگیی ئایین لە ژیاندا" بەم شێوەیە بووە: [زۆر گرنگە: (92.52%)]، [تا ڕادەیەك گرنگە: (6.54%)]، [گرنگ نییە: (0.94%)]. هەروەها لە پرسیاری "بۆ ئەوەی ژن لە ژیانیدا سەرکەوتوو بێ، پێویستە بە ئایینەوە پابەند بێت"، وەڵامەکانیان بەم شێوەیە بووە: [لەگەڵیدام: (82.24%)]، [لەگەڵیدا نیم: (17.76%)]. هەروەها وەڵامەکانیان بەرامبەر بە پرسیاری "ئەگەر لە نێوان "ئایین" و "زانست" ناکۆکی هەبێت، هەمیشە ئایین ڕاستتر و دروستترە"، بەم شێوەیە بووە: [لەگەڵیدام: (81.31%)]، [لەگەڵیدا نیم: (18.69%)]. هەروەها لە پرسیاری

* دواتر هەندێ لەو دەرئەنجامانەی کە پەیوەندی بە ڕاوبۆچوونی ژنانی کوردستانەوە هەیە، لە باسە جیاجیاکانی ئەم کتێبەدا دەخەینە ڕوو.

"دەستێوەردانی سیستمی ئایین لە یاساکان"یش، وەڵامەکانیان بەم شێوەیە بووە: [لە هەموو یاساکان: (81%)]، [لە هەندێ یاسا: (18.07%)]، [لە هیچ یاسایەك: (0.93%)]. کەواتە ئەگەر ئایینی ئیسلام یەکێك لە ئاستەنگەکان و لەمپەرەکان بەردەم پێشکەوتن و پێگەیاندنی ژنان بوایە، ڕاوبۆچوونی ژنانی کوردستان سەبارەت بە ئایین، ئەوەندە ئیجابی و پۆزەتیڤ نەدەبوو![1]

"ئسپۆزیتۆ"ش لە توێژینەوە بەرفراوانەکەیدا، کە بە یارمەتیی "دەزگای گالۆپ"ـەوە لە (130) وڵاتدا کردوویەتی، لە شیکردنەوە و خستنەڕووی دەرئەنجامەکانی توێژینەوەکەیدا، لە وەڵامی ئەو پرسیارەی: "ئایا دواکەوتنی ژنە موسڵمانەکان، لەبەر ئیسلامە؟" دەڵێت:

"لەبەر ئەوەی زۆربەی تیمەی ڕۆژئاواییەکان وای دادەنێین کە بۆچوونی دژ بە ژنان لە ئەنجامی هەستە ئایینییەکان دروست دەبن، پرسیاری زۆر گرنگ کە دەبێ بپرسرێن، لەوان: "ئایا دەمارگیریە ئایینییەکانی پیاوە موسڵمانەکان پەیوەندیی بە بۆچوونەکانی دژ بە ژنان و جیاکاریی ڕەگەزیەوە هەیە؟". هەروەها "ئایا قسەی ئەو کەسانەی کە دەڵێن پێگەی پاشکەوتووی ژنان لە زۆربەی شوێنەکانی جیهانی ئیسلامدا لەبەر بنەماکانی ئیسلامە، دروستە؟". بەپێی شیکردنەوەی داتاکانی خۆمان، گەیشتینە ئەم دەرئەنجامە کە وەڵامی هەردوو پرسیارەکە "نەخێر"ە. کاتێك ئەو پیاوانەی کە بڕوایان وایە ژنان و پیاوان پێویستە مافی یەکسانیان هەبێت، لەگەڵ ئەو پیاوانەی کە دژ بە بۆچوونی ئەوانن بەراوردمان کرد، بۆمان دەرکەوت کە لە زۆربەی هەڵوێستەکاندا جیاوازییەك لە نێوان ئەم دوو گروپەدا لە ڕووی ڕێژەی پابەندییان بە ئایینەوە نییە. لە وڵاتانی: لوبنان، مەغریب، ئێران، پاکستان، سعوودیا، میسر، ئەردەن و تورکیا، پیاوی وامان بینی کە دیدگایەکی فێمێنیستییان هەیە و بە جیددی داکۆکی لە مافی ژنان دەکەن، زۆر پابەندتر و دیندارترن لەوانەی کە گرنگی بە مافی ژنان نادەن... بە هەمان شێوە لە نێوان ئەو پیاوانەی کە تۆمەتبارن بە کوشتنی ناموسیی ژن یان خوشك یان کچەکانیان، بینیمان کە ئەم گریمانەیە ڕاست نییە کە پێشتر هەمانبوو، کە ئەم کوشتنانە بەهۆی دەمارگیریە ئایینییەکان ئەنجام دەبن؛ چونکە توێژینەوەکەمان دەردەخات کە (*69.4%*)ی ئەو پیاوە مرۆڤکوژانەی کە لەو وڵاتانە تووشی کوشتنی ناموسی بوونەتەوە، نوێژ ناکەن و (*55.5%*)یش ڕۆژوو ناگرن. ئەم ڕاستییەی کە ئەم پیاوانە عیبادات و فەرزەکانی ئیسلام بەجێ ناهێنن، نیشانەی ئەوەیە کە هۆکاری ئەم چەشنە کوشتنانە هەرگیز بەهۆی باوەڕ و پابەندییە ئایینییەکانەوە نین، بەڵکو هۆکاری دیکەی پەیوەست بە ڕەفتارە

1 . WVS, op.cit., From: http://www.worldvaluessurvey.org/WVSOnline.jsp

تاوانکارییەکانیان لە پشتەوەیە؛ بە تایبەتی لە دوای ئەوەی کە بۆمان دەرکەوت زۆربەی ئەو پیاوانە پێشینەی ڕەفتاری توندوتیژانەیان هەبووە. (*35.1%*)یشیان بەهۆی تاوانی دیکەوە پێشتر کەوتوونەتە زیندانەوە. هەروەها (*32.4%*)یشیان نەخوێندەوار بوون، تەنها (*3.7%*)یان چوونەتە زانکۆ و (*1.24%*)یش لە خێزانی تەڵاقدا گەشەیان کردووە."[1]

**تێبینیی سێیەم)** پێگە و پایەی ژنان لە شەرع و یاساکانی ئایینی ئیسلامدا لە لایەن ڕەوتەکانی فێمێنیزمەوە، بە هاشوهووشی بێبنەما و گەورەکردنەوەی هەندێ ڕا و تەفسیر و ئیجتیهاداتی حاشاهەڵگر و فەرموودە و ریوایەتی گوماناوی، لەگەڵ جاڕنامەی مافی مرۆڤ و یاسا نێودەوڵەتییەکان بەراورد دەکرێت، کە لە کۆبەندییەکی گشتیدا دەتوانین بڵێین: ئەوان بڕوایان وایە کە لە ئایینی ئیسلامدا جیاکارییەکی زۆر قووڵ و ڕیشەدار لە نێوان ماف و ئەرکەکانی ژنان و پیاواندا هەیە، کە لەگەڵ ماف و یاساکانی ڕۆژئاوا ناگونجێت؛ وەکو: (پلەنزمی لە ریزبەندیی مرۆڤی)، (بەکێڵگەزانینی ژن)، (بابەتی میرات)، (شایەتی)، (خوێنبایی یان دیە)، (تەڵاق و مارەیی)، (لێدان لە ژن)، (سەرپەرشتبوونی پیاو یان قەوامە)، (فرەژنی) و (حیجاب).

بەرلەوەی وەڵامی ئەو تۆمەت و گومانانە بدەینەوە کە بە شێوەیەکی لەڕادەبەدەر دووبارە دەبنەوە، ئەگەرچی ئەو لێکۆڵینەوەیە نە تایبەتە بەو بابەتانەوە، نە لێرە ئەو دەرفەتە هەیە کە بە تێروتەسەلی باس بکرێت، بەڵام توێژەر ناچارە زۆر بە کورتی یەك بە یەك وەڵام بداتەوە، تەنها بۆ دەرخستنی نیەت و پیلانی ئەو ڕۆشنبیر و نووسەرانەی کە بە هەڵفریواندن و چەواشەکاری و بوختانهەڵبەستن و گوماندروستکردن، بە توندی ڕەخنە لە ئیسلام دەگرن، کەچی لە ڕوانگەی زانستی "هێرمنیۆتیك"* و فەلسەفەی "ئۆبژکتیڤیزم"،** هەموو ئەم ڕەخنە و بۆچوونانە، نابابەتی و نازانستی لەقەڵەم دەدرێن؛ چونکە:

---

1 . Esposito, op.cit., pp. 123-124.

* هێرمنیۆتیك (Hermeneutic): بریتییە لە زانستی لێکدانەوە و تەئویل و تەفسیری دەقەکان، بەتایبەتی دەقە پیرۆزەکان و ئایینییەکان. تەئویل لە زمانی عەرەبیدا لە وشەی (أول)ـەوە هاتووە، واتە گەڕانەوە بۆ سەرەتای شتەکە. ئەو زانستە دەڵێ: بۆ هەر دەقێك و تێکستێك، چەندین تەفسیر و لێکدانەوەی جۆراوجۆر و هەندێ جار دژبەیەکیش هەیە کە ئەو جیاوازی و جۆراوجۆری و دژایەتییە، دەگەڕێتەوە بۆ سۆبژکتیڤیزمی شیکەرەوە و لێکدەر و شرۆڤەکار. تاکی ماددیگەرا تەفسرێکی ماددیانە بۆ بابەتەکە دەکات، تاکی سۆفیش تەفسرێکی عیرفانی و سۆفییانە بۆ هەمان بابەت، تاکی چەپگەرا، ڕاستگەرا، دیکتاتۆر، دموکرات و ... هەریەك بەپێی ویست و بۆچونی خۆی دەڕوانێتە بابەتەکە؛ بۆیە هێرمنیۆتیك دەڵێ: بۆ زانین و گەیشتن بە تەفسیرێکی ڕاستەقینە، هەروەك نووسەری یەکەمی ئەو دەقە یان تێکستە مەبەستی بووە، پێویستە یەکەمجار تاکی شیکارکەر خۆی لە هەموو دەروونییاتی خۆی

یەك) لەگەڵ زمانی تێکست (دەقی قورئان و فەرموودە) ئاشنا نین و نەگەیشتوونەتە ئەو ڕادەیە کە ئایەت و حەدیس تەفسیر و ڕاڤە بکەن.

دوو) ڕەخنەگر یان لێکدەر و شیکەرەوە، پێویستە بەر لە شیکردنەوە و ڕەخنەگرتن، خۆی لە هەموو دەروونییات و سۆبژێکتیڤییەتێك دوور بخاتەوە؛ وەك: پێشگریمانەکان، حەز و ئارەزووەکان، مەیل و ئینتیماکان، پێگە فیکری و سیاسی و ئایدیۆلۆژییەکان، کلێشە زەینییەکان و بیروڕاکان و، خۆی لە هەموویان دابماڵێ و داڕووتێنێ و ئەبستراکانە تێکست و دەقەکان بخوێنێتەوە کە پێشتر شارەزای زمانەکەی بووە! ئینجا هەوڵ بدات ـ دوور لە کۆتی کات و شوێن ـ وەکو کاتی هاتنەخوارەوە و دابەزینی ئەو تێکستانە بیر بکاتەوە، تاکو وەکو خۆی لێی تێبگات! ناکرێ لە سەدەی بیست و یەکدا، حەدیسێك یان ڕووداوێکی هەزار و پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر بە دیدێکی ئەمڕۆیی، بە لێکدانەوەیەکی زاتی، بە سەلیقە و ئاراستەیەکی تایبەتی، بە باکگراوندێکی فیکری و ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراو، لەخۆیەوە و بە دڵی خۆی شیی بکاتەوە و لێکی بداتەوە و، ئینجا بیداتە بەر تیری ڕەخنە، ئەویش بێ ئەوەی دەرفەتی ئەوەی هەبێت بەرگری لە خۆی بکات؛ واتە ئەم ڕۆشنبیرانە لە میدیاکاندا دادگایەکی خۆداناو و خۆگەڕێن

---

دوور بخاتەوە و وەکو سەردەمی نووسەری دەق، یان ئەو کاتەی کە ئەو دقە دابەزیوە بیر بکاتەوە. بە کورتی ئەو زانستە دەڵێ: "بگەڕێوە بۆ خودی شتەکە"! هێرمنیۆتیك زۆر نزیکە لە فەلسەفەی "فینۆمێنۆلۆژی" (Phenomenology) کە هەمان زانستی دیاردەناسییە. ئەو زانستەیە لە دیاردەکان دەکۆڵێتەوە وەکو خۆیان. نەك وەك ئەوەی لێکۆڵەر پێی خۆشە و پێی پەسەندە. واتە دیسان دەبێ تاکی شیکەر و لێکۆڵەر خۆی لە هەموو زاتییات و بابەتە دەروونی و سۆبژێکتیڤانەی خۆی دوور بخاتەوە و ڕێك وەك خۆی بڕوانێتە دیاردەکە، نەك وەك زات و سەلیقە و قوتابخانەی خۆی! بە کورتی ئەو زانستە دەڵێ: "لە شتەکە بگەڕێ با خۆی باسی خۆی بکات و خۆی بۆمان دەربخات"!

** ئۆبژێکتیڤیزم (Objectivism): دژی سۆبژێکتیڤیزم (Subjectivism)ـە. بۆ زانینی ئۆبژێکتیڤیزم سەرەتا دەبێ لە سۆبژێکتیڤیزم تێبگەین، کە بریتییە لەوەی تاك بۆ شیکردنەوە و لێکدانەوەی بابەتێك، تێکستێك، دیاردەیەك، پرسیارێك، ڕووداوێك، کەسێك و... زات و دەروونییات و سەلیقە و ڕاوبۆچوون و حەز و ئارەزوو و ئینتیماکانی خۆی بکاتە تەوەر، بە شێوەیەك کە نەتوانێت لە لایەنگیریی لایەنێك قوتار بێت. سۆبژێکتیڤیست واتە: تاکی خودگەرا و دەروونتەوەر کە بەپێی ویست و حەز و مەیلی خۆی شتەکان لێك دەداتەوە؛ بۆ نموونە یەکێك دەڵێت: ڕەنگی سپی جوانترین ڕەنگی دونیایە! یان بڵێت: خۆشترین و باشترین وەرزش فوتباڵە! و... ئەمە گوزارشتێکە لە دەروونییاتی خودی تاك، ئەگەرچی بە شێوەیەك قسە دەکات گوایە باسی هەقیقەتێکی ڕەها دەکات، کە هەم زانست هەم پێوەرەکان، هەمیش هەموو تاکەکانی دونیا لەگەڵ ئەم بۆچوونەی کۆکن! بەڵام ئۆبژێکتیڤیزم مانای ئەوەیە کە تاك خۆی لە هەموو دەروونییات، حەز، ئارەزوو، ئینتماکان و لایەنگیرییە زاتی و خودگەراییەکانی ئازاد دەکات و بابەتییانە و بێلایەنانە دەڕوانێتە شتەکان، تەنانەت ئەگەر لە دژی خۆی بێت. لە ڕووی ئاکادیمییەوە هەر تەفسیر و شیکردنەوەیەك ئەگەر بابەتییانە و ئۆبژێکتیڤیانە نەبێت، قبووڵ ناکرێت و تەنها دەبێتە ڕای شەخسی و سەلیقە و حەز و ئارەزووی تاك، کە ئەویش تایبەتە بۆ خودی خۆی؛ بۆ نموونە: ئەو کە دەڵێت ڕەنگی سپی جوانترین ڕەنگی دونیایە، یان تۆپتۆپێنە باشترین وەرزشە، لەوانەیە بۆ یەکێکی دیکە، تەنانەت برا یان خوشکە جمکەکەی، ڕەنگێکی دی و وەرزشێکی دی پەسەندتر بێت و لەگەڵ دیتنی هەمان ڕەنگ یان هەمان وەرزش هەست بە ناخۆشی و دڵتوندی بکات!

دادەنێن، بە پیلانێکی پێشوەختە خۆیان دەبنە قازی، سکاڵاکەر، داواکاری گشتی، شایەت و هەروەها هەڵسەنگێنەریش، ئەی لایەنی بەرامبەر کە تۆمەتبار کراوە؟!

سێ) ئینجا هەموو لێکدانەوەکانی دیکە بخوێنێتەوە و لەگەڵ لێکدانەوەکەی خۆیدا بەراوردی بکات.

چوار) لە کۆتاییدا دوای هەڵسەنگاندن و دەستەبەندیکردنیان لە ڕووی جیاوازیی ڕاوبۆچوونەکانەوە، بەبێ سانسۆر و ڕووتوشکردن، هەموویان باس بکات؛ نەك تەنها ئەو ڕاوبۆچوون و تەفسیرە باس بکات کە لە پرۆسەی ڕەخنەگەرییەکەیدا بە سوودی ئەو بێ، ئینجا ئەو ڕاوبۆچوونەش بگشتێنێتە سەر هەموو بوارەکانی دیکە.

کە سەیری میتۆدۆلۆژیی ڕەخنەگەریی ئەو تاقمە ڕۆشنبیرانە لەبارەی ئایینەوە دەکەین، ئەم مەرجانەی سەرەوە لایان نابینرێن و لە ڕاستیدا باسی دەروونییاتی خۆیان دەکەن و بە بابەتییانەشی لەقەڵەم دەدەن و، بۆ ئەوەی ڕای گشتی دروست بکەن، لە میدیاکاندا دووبارە و چەندبارەی دەکەنەوە و، سوود لە تاکتیکی هیتلەر وەردەگرن، کە دەیگوت: دووبارەکردنەوەی درۆی گەورە لە ناو کۆمەڵگادا، قەناعەت بە خەڵك دێنێ و، درۆش چەند گەورەتر بێ، خەڵك زووتر بڕوای پێ دەکەن!

1) **سەبارەت بە کەسایەتی و پلەنزمیی ژن**: ڕۆشنبیران و فێمێنیستان دەڵێن ئیسلام لە ریزبەندیی مرۆڤیدا، ژن بە پلەدوو دادەنێت. ژن کۆپیی پیاوە لەبەر ئەوەی یەکەمجار ئادەم خەڵق کراوە، ئینجا حەوا لە پەراسووی چەپی دروست کراوە؛ بۆیە ژن لە ئیسلامدا خاوەن کەسایەتییەکی لاواز و وابەستەیە بە پیاو. حەوا بووە هۆی فریودانی ئادەم و خواردنی درەختەکە و لە کۆتاییشدا دەرکردنی لە بەهەشتەوە و بکەری یەکەمین گوناهە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا!

کەچی ئیسلام بە پێچەوانەی ئایینی مەسیحییەت و یەهوودییەت، کە ڕۆشنبیران لەگەڵ ئیسلام تێکەڵیان کردووە، وێنەیەکی زۆر ڕوون و دیار بۆ ژن وێنا دەکات و پێی وایە کە ژن مرۆڤە، بەڵام پیاو نییە، هەروەك پیاویش مرۆڤە بەڵام ژن نییە؛ کەواتە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ژن لە ڕووی مرۆڤناسی و بەهاناسی و ئەخلاقناسییەوە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ پیاو نییە، تەنها لە ڕووی

بایۆلۆژییەوە لە یەکتر جیایان دەکاتەوە.[1] قورئان، کە گەورەترین و سەرەکیترین سەرچاوەی ئایینناسیی ئیسلامە کە هیچ دەستکاری نەکراوە، بەم شێوەیە هەموو ئەو تۆمەتانە ڕەت دەکاتەوە و دەڵێ: مرۆڤەکان لە نێر و مێ پێك هاتوون و پیاو لە چی خەڵق کراوە، ژنیش بە هەمان شێوە لە هەمان توخم دروست کراوە؛ واتە ماددەی ئافراندنی ژن و پیاو یەك شتە:

﴿یا أیها الناس اتقوا ربکم الذی خلقکم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا کثیرا ونساءا﴾؛[2] واتە: ئەی خەڵکینە! لە پەروەردەگاری خۆتان بترسن، کە ئێوەی لە تاکە نەفسێك (توخمێك) خەڵق کردووە، هەر لەو نەفسەش هاوسەرەکەی دروست کردووە و لەو دووانە، پیاوان و ژنانێکی زۆری خستۆتەوە و بڵاوی کردوونەتەوە.

بەپێی ئەم ئایەتە ـ و ئایەتەکانی دیکە ـ ژن لە پیاو دروست نەکراوە، کە ببێتە هۆی سووکایەتی و بە کەمزانینی، هەروەك دەفەرمێ: ﴿هو الذی خلقکم من نفس واحدة و جعل منها زوجها﴾؛[3] واتە: ئەو کەسێکە کە ئێوەی لە یەك توخم (نەفس) خەڵق کردووە و هاوسەرەکەیشی لە هەمان شت دروست کردووە. ڕاڤەکەرە ناودارەکانی قورئان دەڵێن کە مەبەست لە (جعل منها: لە هەمان نەفس) دەگەڕێتەوە بۆ "نفس واحدة" و ئەگەر ئاماژە بە پیاو بوایە، دەبوایە بیگوتبایە: (و جعل منه)! وشەی "نەفس"یش بە پێی تەفسیری زانایان، وەکو "محەممەد عەبدە" لە تەفسیری ئەلمەنار، ئاماژەیە بە ماهییەت و هەقیقەتێك کە مرۆڤ لە گیانلەبەرانی دیکە جیا دەکاتەوە؛ واتە ئێوەم خەڵق کردووە لە یەك ماهییەت و توخمێکی هاوبەش.[4] "د. وهبة الزحیلي" ـ لە تەفسیرە بەناوبانگەکەیدا ـ دەڵێ:

---

1 . قورئان چەمکی (ژن و پیاو) لەگەڵ چەمکی (نێر و مێ) جیا دەکاتەوە. کاتێك کە باس لە لایەنی مرۆڤناسی و بەهاناسی و ئەخلاقناسیی مرۆڤەکان دەکات، بە چەمکی (ژن و پیاو) ناویان دەبات؛ بەڵام کە باسی لایەنی بایۆلۆژیی مرۆڤ دەکات بە وشەی (نێر و مێ) ناویان دەبات؛ ژن و پیاو واتە ئەو نێر و مێیانەی کە پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوونیان تێپەڕاندووە و لە بوونەوەری زیندووی ڕەها دەرچوونە و بوونەتە مرۆڤێکی کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی و سیاسی؛ واتە ئادەمیزاد [(نێر و مێ وەکو لایەنی بایۆلۆژی)+(فێربوونی کولتور و ئایین و لایەنی کۆمەڵایەتی و سیاسی)= مرۆڤ (ژن و پیاو)]؛ بۆ نموونە: دەفەرمێ: (المؤمنون و المؤمنات بعضهم أولیاء بعض: پیاوان و ژنانی ئیماندار هەریەك دۆستدار و پشتگیری یەکترن) یان (إن المسلمین و المسلمات و المؤمنین و المؤمنات و...: پیاوانی موسڵمان و ژنانی موسڵمان، پیاوانی ئیماندار و ژنانی ئیماندار و...) ئەوانە و دەیان ئایەتیتر ئاماژە بە لایەنی مرۆیی ژن و پیاوەکان دەکات کە بە یەکسانی و بێجیاوازی ناویان دەبات. بەڵام لە ڕووی بایۆلۆژییەوە دەڵێ: (ولیس الذکر کالأنثی) نافەرمێ: (ولیس الرجل کالنساء!) یان (ولیس المؤمن کالمؤمنة!) و...

2 . (النساء: 1).

3 . (الأعراف: 189).

4 . الغنوشي، راشد (2011)؛ **"المرأة بین القرآن و واقع المسلمین"**؛ تونس: دار المجتهد للنشر و التوزیع؛ ص 10.

"لەو ئایەتە بە ڕای زانایانی تەفسیر وەکو ئیمام فەخری ڕازی، مەبەست لە خولْقاندنی ژن لە هەمان توخمە کە پیاویش لێی خەڵق کراوە، واتە دەفەرمێ هاوسەرانێك لە توخمی خۆتان ڕێك وەکو خۆتانم دروست کردووە؛ نەك ئەوەی کە ژن لە جەستەی پیاو خولْقێنرا بێت."[1]

لە هیچ حەدیسێکی سەحیحی پێغەمبەریشدا ـ د.خ ـ نەهاتووە کە ژن لە پەراسووی پیاو دروست کرابێ[2] و ئەگەر لە حەدیسێکیشدا باسی پەراسووی کراوە، تەنها دەڵێ: ژن وەك ئێسکی پەراسوو ناسکە، ئەگەر بتانەوێ ڕاستی بکەنەوە دەشکێت؛ بۆیە دەبێ لەگەڵیدا مودارا و نەرم و نیانی بکەن و توندوتیژی نەنوێنن!* لە سەحیحی بوخاری و ئەوانیتریشدا، لە بابی مداراة النساء (بەشی نەرم و نیانی لەگەڵ ژنان) هاتووە کە پێغەمبەر دەفەرمێ: ﴿المرأة كالضلع إن أقمتها كسرتها...﴾؛ واتە: ژن وەکو پەراسوویە، ئەگەر بتەوێ ڕاستی بکەیتەوە دەشکێنییەوە" و نەیفەرمووە کە ژن لە پەراسوو خەڵق کراوە، بەڵکو دەفەرمێ ژنان وەك ئێسکی پەراسوو ناسکن، ئەگەر بتانەوێ لە هەموو شتێکدا بە دڵتان ڕەفتار بکەن، کەواتە دەتانەوێ بیانشکێنن؛ چونکە سروشتی ژنان لەگەڵ پیاوان جیاوازە (دواتر لە بەشەکانی دیکەدا بە تێروتەسەلی ئاماژەی پێ دەکەین) و ناکرێ هەرچی پیاو بیەوێ لە ژن داوا بکرێت.[3] هەرگیز باس لە پەراسووی پیاو یان ئادەمی نەکردووە. لە شوێنێکیتردا لەجیاتی پەراسوو، بە شووشەی دەشوبهێنێت و دەفەرمێ: ﴿رفقاً بالقوارير﴾؛[4] واتە: لەگەڵ ژنان کە وەکو شووشە ناسکن، بە نەرمی و نیانی ڕەفتار بکەن نەکا نەشکێن! فەرموودەیەکیتر وشەی "کسر: شکاندن"ی بەم شێوەیە تەفسیر کردووە: ﴿و کسرها طلاقها﴾؛[5] واتە: شکاندنی ژن بریتییە لە تەڵاقدانی؛ واتە پێویستە پیاو هەموو تایبەتمەندییەکانی ژن لە بەرچاو بگرێ، کە بەپێی ڕوانین و لۆژیکی پیاوانە، لار و خوارە وەك ئێسکی پەراسوو، کەچی لە

1 . الزحيلي، د. وهبة (1997): "تفسير المنير"؛ دمشق: دار الفكر؛ الطبعة الأولى؛ المجلد 1؛ صص 139 – 140.

2 . بڕوانە: الإمام الألباني (2010): "لم يثبت حديث في خلق حواء من ضلع آدم"؛ بحث علمي؛ مجلة معرفة السنن و الآثار (الأحاديث الضعيفة و الموضوعة)؛ من الموقع السنن: http://www.al-sunan.org

* هەندێ زانایانی ئایینی شوبهاندنی ژن بە پەراسوو لەو حەدیسەدا وا لێك دەدەنەوە کە پەراسوو دوو شتی هەموو مرۆڤێك دەپارێزێ کە ئەگەر یەکیان نەبێ، مرۆڤ دەمرێ کە بریتین لە دڵ (کە لێدانی دڵە) و سییەکان (کە هەناسەی مرۆڤە). بەو دەربڕینە ژن پارێزەری دڵ و هەناسەی پیاوانە! (ئەم نموونەیە لە وتارێکی ئایینی لە لایەن مامۆستا "فاتح شارستێنی"یەوە گوێم لێ بووە.

3 . أخرجه البخاري (5184)، مسلم (178/4)، أحمد (428/2 و 449 و 530) وغيرهم من طرق عن أبي هريرة، وصححه إبن‌حبان (4168/189/6 - الإحسان). (سەرچاوەی پێشوو).

4 . متفق عليه.

5 . رواه المسلم؛ باب الوصية بالنساء؛ رقم الحديث 2662.

ڕاستیدا بۆ خۆیان شتێکی پێویست و فیتری و ڕاست و دروستە. هەندێ لە زانایان تەفسیری ئەم حەدیسانە بە حەدیسە ئیسرائیلییاتییەکانی یەهوودی و مەسیحییەکان دەزانن و پێیان وایە لەگەڵ قورئان یەکانگیر نین؛ چونکە قورئان دەفەرموێ: ﴿الذی أحسن کل شیء خلقه و بدأ خلق الإنسان من طین ثم جعل نسله من سلاله من ماء مهین﴾؛[1] واتە: ئەو خوایە زاتێکە هەموو شتێکی بە چاکی و ڕێکوپێکی بەدی هێناوە و لەسەرەتاوە مرۆڤی لە قوڕ دروست کردووە و پاشان نەوەکانی لە ئاوێکی سادە و بێنرخ بەدی هێناوە. سەید قوتب ـ ر.خ ـ سەبارەت بەو حەدیسانە لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ:

> "هەموو ئەو ریوایەتانەی کە باس لە خوڵقاندنی ژن لە پەراسوو دەکەن، بە ئیسرائیلییات دەچن و ناتوانین پشتیان پێ ببەستین. ئەوەتا دەقی قورئانیمان هەیە کە هەرگیز باس لەو شتە غەیبییاتەی نەکردووە، بەڵکو پێمان دەڵێت کە ئادەم و حەوا لە یەك ڕەگەز و توخم دروست کراون، ئینجا بووەتەوە جووت. یاسا و سوننەتی خوا فێرمان دەکات کە هەموو بوونەوەرێك کە خوا خوڵقاندوویەتی، بە جووت و دووانە خەڵقی کردووە: ﴿و من کل شیء خلقنا زوجین﴾؛[2] واتە: هەموو شتێکمان بە جووت دروست کردووە. ئەوەش سوننەتێکی بەردەوام و یاسا و ڕێسایەکە کە بۆ هەموو مەخلووقاتی خوایە. بە گوێرەی ئەم ڕێسا و یاسایە حەواش بە هەمان شێواز کە ئادەم خەڵق کراوە، ئەویش خوڵقێنراوە."[3]

- سەبارەت بە فەلسەفەی خەڵقی ژن، کە ڕۆشنبیرە فێمێنیستەکان دەڵێن: تەنها بۆ پیاو خوڵقێنراوە، تاکو ببێتە هۆی ئارامی و حەوانەوە و تێرکردنی پێداویستییەکانی، قورئان بەم شێوەیە ڕوون دەکاتەوە:

﴿و من آیاته أن خلق لکم من أنفسکم أزواجا لتسکنوا إلیها و جعل بینکم مودة و رحمة﴾؛[4] واتە: یەکێك لە نیشانەکانی ئەوەیە کە بۆتان لە هەمان نەفسی خۆتان هاوسەرانێکی خەڵق کردووە، تاکو ببێتە مایەی ئارامی و خوا لە نێوانتان خۆشەویستی و میهرەبانیی داناوە، تاکو بەبێ یەکتر نەحەوێنەوە.

لە زمانی عەرەبیدا وشەی (زوج) واتە جووت (Pair)، کە (تاك) نییە و کۆیەکەی دەبێتە (أزواج)؛ بەم پێیە دوو ڕەگەزی نێر و مێ پێکەوە دەبنە زەوج، کە هیچکامیان بەبێ ئەوی دیکە بوون و مانایەکی نابێ. وشەناسە بەناوبانگەکانی ئیسلامی وەك "راغبی ئەسفەهانی" دەڵێن: ئەم

1 . (السجدة: 7 - 8).
2 . (الذاریات: 49).
3 . قطب، سید (1986)؛ "فی ظلال القرآن"؛ المجلد الثالث؛ بیروت: دارالشروق؛ الطبعة 12؛ ص 1268.
4 . (الروم: 21).

وشەیەش هەم بۆ پیاو و هەم بۆ ژن ـ وەکو یەك ـ بەکار دێت. ئەگەر لێرە مەبەستی تەنها "ژن" بایە، دەبوایە بە "تأنیث" (زوجة: ژنی هاوسەر) هاتبایە کە کۆیەکەی دەبێتە (زوجات)، بەڵام قورئان هەرگیز لە هیچ ئایەتێکدا بە زەوجەی نەهێناوە؛ چونکە جووت هەم پیاوە و هەم ژن؛[1] هەروەك بە ئادەم ـ د.خ ـ دەفەرمێ: ﴿و قلنا يا آدم اسكن أنت و زوجك...﴾؛[2] واتە: گوتمان: ئەی ئادەم! تۆ و هاوسەرەکەت نیشتەجێ بن...! نافەرمێ: أنت و زوجتك! هەر بۆیەش دەکرێ هەم بۆ پیاو و هەمیش بۆ ژن، لە زمانی کوردیدا چەمکی "هاوسەر" بۆ بەکار بێت؛ کەواتە ئەمە پەیوەندییەکی دوو لایەنەیە و پیاو بۆ ژن و ژنیش بۆ پیاو خەڵق کراوە و هەر یەك دەبێتە مایەی ئارامیی و حەوانەوەی ئەویتر. پێغەمبەریش ـ د.خ ـ دەفەرمێ: ﴿إنما النساء شقائق الرجال﴾؛[3] واتە: ژنان لەتکی پیاوانن یان وەکو ئەوانن؛ واتە: لە جووتەکەدا، ژن لەتکی پیاوە. هەروەك لە شوێنێکیتر هەردووکی بە وشەی "لباس" ناو دەبات:

﴿هن لباس لكم و أنتم لباس لهن﴾؛[4] واتە: ژنان پۆشاکتانن و ئێوەش پۆشاکیانن. هەروەك دەزانین پۆشاك مرۆڤ دەپارێزێ لە گەرما و سەرما، لە مێش و مەگەز، لە تۆز و خۆڵ، هەروەها عەیبەکانی مرۆڤ دەشارێتەوە. نزیکترین شت لە مرۆڤ، جل و بەرگێتی. مرۆڤ بە جلوبەرگ جوانە و خۆی دەڕازێنێتەوە و...! کەواتە وشەی "سکن: ئارامی" ـ بەپێی تەفسیرەکانی قورئان ـ پەیوەندییەکی دوو لایەنەیە کە ئەم ئارامییە لە پەیوەندیی هاوسەرێتیدا هەم بۆ پیاو دەست دەدات و هەمیش بۆ ژن.[5]

- لە ئەوروپا ڕۆژێك لە ڕۆژان گەورەترین دەمەتەقێ ئەوە بووە کە ئایا ژن ڕۆحی لەبەرە یان نا، (دواتر لە بەشەکانی دیکە باسی دەکەین) کە قورئان بەم شێوەیە وەڵامیان دەداتەوە و دەڵێ: مرۆڤ (ژن و پیاو) خاوەن ڕۆحی ئیلاهییە و بەهۆی ئەو ڕۆحەوە لە گیانلەبەرانی دیکە سەرتر و بەڕێزترە:

---

1 . الراغب الأصفهاني، أبوالقاسم (1992)؛ "**مفردات فی غريب القرآن**"؛ تحقيق: صفوان عدنان داودي؛ بيروت: دار العلم؛ ص 384 ـ أيضا: إبن منظور، محمد بن مكرم (1988)؛ "**لسان العرب**"؛ بيروت: دار إحياء التراث العربي؛ الطبعة الأولى؛ المجلد 6؛ ص 108.

2 . (البقرة: 35).

3 . رواه أبوداود و الترمذي و الدارمي و الإمام أحمد.

4 . (البقرة: 187).

5 . القرطبي، محمد بن أحمد (2006)؛ "**الجامع لأحكام القرآن**"؛ المجلد 1؛ دمشق: مؤسسه الرسالة؛ صص 204 و 301.

﴿لقد خلقنا الإنسان فی أحسن تقویم﴾؛[1] واتە: بە ڕاستی مرۆڤمان لە هەموو ڕوویەکەوە، بە باشترین شێوە و جوانترین شێواز دروست کردووە.

- ئامانج لە خوڵقاندنی مرۆڤیش (بە ژن و پیاوەوە) بەندایەتی و پەرستنی خوایە و هیچ جیاوازییەك لە نێوان هەر دوو ڕەگەزەکەدا دانانێت: ﴿و ما خلقت الجن و الإنس إلا لیعبدون﴾؛[2] واتە: جنۆکە و مرۆڤم دروست نەکردووە مەگەر بۆ بەندەگی و پەرستش نەبێت.

- هەبوونی دوژمنی هاوبەش: ﴿إن الشیطان للإنسان عدو مبین﴾؛[3] واتە: شەیتان دوژمنێکی ئاشکرای مرۆڤە بە ژن و پیاوەوە. لە ئیسلامدا بەپێچەوانەی ئایینەکانی دیکە، ئادەم و حەوا پێکەوە بە تاوانبار دەزانێ لەو هەڵەی کە کردوویانە، کە نابێ لەو دارەیان بخواردبایە کە شەیتان هەردووکیانی هەڵخەڵەتاند و هەرگیز بڕوای بەوە نییە کە یەکەمجار حەوا سەرپێچی و نافەرمانیی کردبێت، بەڵکو زۆر بە ڕوونی هەڵەکەی دەخاتە ئەستۆی ئادەمەوە:

لە نیشتەجێکردن و فەرمانپێکردنیان: ﴿یا آدم اسکن انت و زوجك الجنة و لا تقربا هذه الشجرة﴾؛[4] واتە: ئەی ئادەم! تۆ و هاوسەرت پێکەوە لەو بەهەشتە نیشتەجێ بن و نزیکی ئەم درەختەش مەکەون!

هەروەها لە ترساندن و هۆشیارکردنەوەیان لە شەیتان: ﴿فقلنا یا آدم إن هذا عدو لك و لزوجك فلا یخرجنکما من الجنة﴾؛[5] واتە: گوتمان ئەی ئادەم! ئەم شەیتانە دوژمنی تۆ و هاسەرەکەتە، با دەرتان نەکات لەو بەهەشتە!

هەروەها لە بەلاڕێبردنی هەردووکیان پێکەوە: ﴿فأزلهما الشیطان عنها فأخرجهما مما کانا فیه﴾؛[6] واتە: شەیتان هەردووکی هەڵخەڵەتاند و بووە هۆی دەرکرانی هەردووکیان لەو بەهەشتە. تەنانەت قورئان ئادەم بە تاوانباری سەرەکی و یەکەمین ناودەبات، نەك حەوا: ﴿فوسوس إلیه الشیطان قال یا آدم هل أدلك...﴾؛[7] واتە: شەیتان وەسوەسەی ئادەمی کرد و پێی وت: ئەی ئادەم ئایا

1 . (التین: 4).
2 . (الذاریات: 56).
3 . (یوسف: 5).
4 . (البقرة: 35).
5 . (طه: 117).
6 . (البقرة: 36).
7 . (طه: 12).

پیشانت بدەم...؟ ﴿ولقد عهدنا إلى آدم من قبل فنسي و لم نجد له عزما﴾؛[1] واتە: پێشتر پەیمانمان لە ئادەم وەرگرتبوو کە بە گوێی شەیتان نەکات، بەڵام لەبیری کرد و خۆی پێڕانەگیرا و ئیرادەیەکمان لێ نەبینی. ﴿و عصى آدم ربه فغوى﴾؛[2] واتە: ئادەم سەرپێچیی پەروەردگاری کرد و لای دا. ئادەم و حەوا پێکەوە تۆبە دەکەنەوە: ﴿قالا ربنا ظلمنا أنفسنا و إن لم تغفر لنا...﴾؛[3] واتە: هەردووکیان وتیان: ئەی پەروەردگارمان! ئێمە بەو گوناهەوە زوڵممان لە خۆمان کرد و ئەگەر نەمانبەخشی...!

لە ئیسلامدا ـ بەپێچەوانەی مەسیحییەتەوە ـ هیچ کەسێك باری گوناهی کەسێکیتر هەڵناگرێ و هەریەك دەبێ وەڵامی کردەوەکانی خۆی بداتەوە و ئەگەر ئادەم یان حەوا گوناهێکیشیان کردبێ، منداڵەکانیان گوناهبار نین و هیچ بەرپرسیارییەتییەکیان نییە بەرامبەر بە کردەوەکانی ئەوان:

﴿تلك أمه قد خلت لها ما كسبت و لكم ما كسبتم و لا تسئلون عما كانوا يعملون﴾؛[4] واتە: ئەوانە ئوممەتێك بوون ڕۆیشتن بە خۆیان و کردەوەکانیانەوە. ئێوەش هەرچی دەیکەن بۆ خۆتانە و بەرپرس نابن لە کار و کردەوەی ئەوان. یان دەفەرمێ: ﴿ألا تزر وازرة وزر أخرى و أن ليس للإنسان إلا ما سعى﴾؛[5] واتە: هیچ کەسێك باری گوناهی کەسێکیتر هەڵناگرێ و مرۆڤ خاوەنی هیچ شتێك نییە تەنها ئەوە نەبێ کە خۆی کردوویەتی.

- هەروەها لە ئیمان و کردەوەدا هەردووك وەك یەکن و کامیان زیاتر چاکەکار بێت، ئەو بەرزتر و لە پێشترە: ﴿من عمل صالحا من ذكر أو أنثى و هو مؤمن فلنحيينه حياة طيبة و لنجزينهم أجرهم بأحسن ما كانوا يعملون﴾؛[6] واتە: ئەوەی کار و کردەوەی چاك بکات، پیاو بێت یان ژن، لەکاتێکدا بڕواداریش بێت (واتە ئەگەر کردەوەی چاك بکات و ئیمانی نەبێ، قبووڵ ناکرێت)، بێشك بە ژیانێکی کامەران و ئاسوودە لە دونیادا دەیژیێنین، لە قیامەتیشدا پاداشتیان بە جوانتر دەدەینەوە لەوەی کە ئەوان دەیانکرد.

1 . (طه: 115).
2 . (طه: 122).
3 . (الأعراف: 23).
4 . (البقرة: 134).
5 . (النجم: 38 - 39).
6 . (النحل: 97).

- هەروەها لە علم و زانستدا: ﴿یرفع الله الذین آمنوا منکم و الذین أوتوا العلم درجات﴾؛[1] واتە: خوا پلەوپایەی ئەو کەسانەتان کە ئیمانیان هێناوە و هەروەها ئەوانەی کە زانان و زانستیان دراوەتێ (ژن بێ یان پیاو)، بەرز دەکاتەوە.

- لە تەقوا (پارێزگاری) و ڕێز و پلەبەرزی لە لایەن خوایەوە: ﴿یا أیها الناس إنا خلقناکم من ذکر و أنثی و جعلناکم شعوبا و قبائل لتعارفوا إن أکرمکم عند الله أتقاکم﴾؛[2] واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوەم لە نێر و مێ دروست کردووە و کردوومانن بە گەل و هۆزی جیاواز کە یەکتر بناسنەوە (نەك شەڕی یەکتر بکەن بەو پاساوە کە نەتەوەیەك لە نەتەوەیەکیتر بە باشتر بزانن. لای خوا کەس باشتر نییە مەگەر ئەوەتان کە تەقوای زیاتر بێت.

- لە پێشکەوتن لە ئیمان و هەورەها جیهاد و هیجرەتدا بەبێ جیاوازی: ﴿والسابقون السابقون أولئك المقربون﴾؛[3] واتە: پێشکەوتووەکان، ئەوانەی کە پێشکەوتوون لە ئیمانهێنان، ئەوانە نزیککراوەی بارەگای پەروەردگارن. هەروەها دەفەرمێ: ﴿فضل الله المجاهدین علی القاعدین أجرا عظیما﴾؛[4] واتە: خوا ئەوانەی شەڕ دەکەن لە پێناویدا (ژن بێ یان پیاو) لەسەر ئەوانەی دانیشتوون و شەڕ ناکەن بە پاداشتێکی گەورە سەرتر و بە پایەبەرزتر دەنرخێنێ. یان دەفەرموێ: ﴿أنی لا أضیع عمل عامل منکم من ذکر أو أنثی بعضکم من بعض فالذین هاجروا و أخرجوا من دیارهم و أوذوا فی سبیلی...﴾؛[5] واتە: بەڕاستی من هەرگیز هەوڵ و کۆشش و کردەوەی هیچ کام لە ئێوە بە زایە نادەم، چ پیاو بێ چ ژن؛ چونکە هەردووکتان وەکو یەکن و لەیەکن. ئەوانەی کە کۆچیان کرد و لە شار و شوێنەواری خۆیان دەربەدەر کران و ئازار و ئەشکنجە دران لە پێناوی مندا...

- لەم دوو ئایەتەشدا یەکسانی لە مرۆڤایەتی و کەسایەتی دەگەیەنێتە لووتکە (لە ئەرك و واجبات و پاداشتدا):

﴿إن المسلمین والمسلمات والمؤمنین والمؤمنات والقانتین والقانتات والصادقین والصادقات والصابرین والصابرات والخاشعین والخاشعات والمتصدقین والمتصدقات والصائمین والصائمات والحافظین فروجهم والحافظات

1 . (المجادلة: 11).
2 . (الحجرات: 13).
3 . (الواقعة: 10 - 11).
4 . (النساء: 95).
5 . (آل عمران: 195).

والذاكرين الله كثيرا والذاكرات أعد الله لهم مغفرة وأجرا عظيما ﴾؛[1] واتە: بە ڕاستی پیاوان و ژنانی موسڵمان، پیاوان و ژنانی ئیماندار، پیاوان و ژنانی ملکەچ و فەرمانبەردار، پیاوان و ژنانی ڕاستگۆ، پیاوان و ژنانی خۆگر، پیاوان و ژنانی لە خواترس، پیاوان و ژنانی بەخشندە، پیاوان و ژنانی ڕۆژووان، پیاوان و ژنانی داوێن پاك، ئەو پیاو و ژنانەی کە زۆر یادی خوا دەکەن، بەخشین و لێبوردەیی و پاداشتی زۆر مەزن و بێ سنووریان لە لایەن خوای گەورەوە بۆ ئامادە کراوە.

﴿ والمؤمنون والمؤمنات بعضهم أولياء بعض يأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر ويقيمون الصلاة ويؤتون الزكاة ويطيعون الله ورسوله أولئك سيرحمهم الله إن الله عزيز حكيم﴾؛[2] واتە: پیاوان و ژنانی ئیماندار، یاوەر و پشتگیری یەکترن، کە فەرمان بە چاکەکاری دەکەن و نەهی لە خراپە دەکەن و نوێژەکانیان ئەنجام دەدەن و زەکاتی ماڵیشیان دەبەخشن و گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن. خوا ڕەحمیان پێ دەکات. بە ڕاستی خوا باڵادەست و دانایە. وشەکانی "المعروف" و "المنكر" لەو ئایەتەدا ئاماژە بە هەموو جۆرەکانی کاری چاك و خراپە، لە هەموو بوارێکی فیکری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووری و هتددا؛ بۆیە ژن نە تەنها مافی هەیە کە لەو بوارانەدا بەشداری بکات، بەڵکو بە واجب و ئەرکی دەزانرێ و لەگەڵ وشەی "ئیمان" و "نوێژ" و "زەکات" و "پەیڕەوی لە خوا و پێغەمبەرەکەی" پێکەوە بەستراوەتەوە.

بەپێی ئەم ئایەتە و ئایەتەکانی دیکەش، هەروەها ڕاوبۆچوونی گەورە زانایانی کۆن و ئێستای ئیسلامی وەك: "أبوحنيفة بن النعمان"، "إبن القاسم المالكي" (جگە لە ئیمامەتی ئایینی)،[3] "إبن حزم الظاهري"،[4] "أبي ثور"، "أبي الفرج بن طرار"، "الإمام المزني" و "الإمام الطبري" (بە ئیمامەتی ئایینییەوەش، تەنانەت لە پێشنوێژیدا)،[5] هەروەها زانایانی ئێستا وەك: "د. مصطفى السباعي"[6] و

1 . (الأحزاب: 35).

2 . (التوبة: 71).

3 . الخولي، الدكتورة هند (2011)؛ "**تولى المرأة المنصب العليا فى الدولة فى الفقه الإسلامي**"؛ جامعه دمشق: مجلة جامعة دمشق للعلوم الإقتصادية و القانونية؛ المجلد 27؛ العدد 1؛ صص 279-280.

4 . إبن حزم الأندلسي (1988)؛ "**المحلى**"؛ كتاب القضاء؛ تحقيق: لجنة إحياء التراث العربي؛ بيروت: دار الآفاق الجديدة؛ مسألة (1800)؛ الجزء 9؛ ص 430.

5 . إبن قدامة المقدسي (1985)؛ "**المغني**"؛ كتاب القضاء؛ الرياض: مكتبة الرياض الحديثة؛ الجزء 9؛ ص 39. أيضا: إبن رشد القرطبي (1988)؛ "**بداية المجتهد نهاية المقتصد**"؛ كتاب الأقضية؛ دمشق: دار المعرفة؛ الجزء 2؛ ص 460. هەروەها: محمد، د. على جمعه؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 107.

6 . السباعي، د. مصطفى (2010)؛ "**المرأة بين الفقه و القانون**"؛ بيروت: دار إبن حزم؛ صص 183-187.

"د. محمد سعيد رمضان البوطي"[1] و "د. مصطفى الزلمي"،[2] ژن بۆی هەیە باڵاترین پۆستی سیاسی و کۆمەڵایەتی و دادگەریی کۆمەڵگای وەربگرێ و کاروباری دەوڵەت و کۆمەڵگا و دادگاکانیشی پێ بسپێردرێ، بەڵام نابێ ئەو مەرجە سەرەکی و پێویستە لەبیر بکرێ، هەم بۆ پیاوان، هەمیش بۆ ژنان، کە بریتییە لە شایستە و شایانبوونی ئەو کەسە بۆ ئەو پۆستە؛ واتە هەر کەسێك کە بۆ هەر پۆستێك هەڵدەبژێردرێت، پێویستە بە پاڵێن و بێژنگی "شایستەسالاری"دا تێپەڕێت. ئەوکات هەروەك قورئان دەفەرموێ بۆی هەیە ئەمر و نەهی لە هەموو کۆمەڵگا بکات و لەوانەشە زۆر لە پیاوە ناودارەکانیش بێنە ژێر دەسەڵاتی و ببنە فەرمانبەری ئەو. هەروەك نموونەی "مەلیکە بلقیس"مان هێنایەوە کە چۆن کۆمەڵگای سەبەئی بەڕێوە دەبرد و خواش لە قورئاندا بە ستایشەوە باسی حوکمڕانیی ئەو دەکات.

زۆر سەیرە کە ئەم ڕۆشنبیرە فێمێنیستانە، ئەم هەموو ئایەتە لەبیر دەکەن، یان خۆیانی لێ گێل دەکەن و تەنها باس لە هەندێ ئەفسانە و چیرۆکی تەورات و ئینجیل دەکەن و بەسەر ئایینی ئیسلامیشدا دەشکێننەوە! قورئان ـ هەروەك خۆی دەڵێ: ـ بۆ ڕاستکردنەوەی تەورات و ئینجیل و چیرۆکەکانی دابەزیوە و یەكبەیەکی لادانەکانیان لە عەقیدە و بیروباوەڕ، لە عیبادەت و شەریعەت ڕاست دەکاتەوە. نادیدەگرتنی ئەم هەموو ئایەتە و ئایاتیتریش، نیشانەی نەزانین و ئاشنانەبوونیانە بە قورئان و ئیسلام. تەنها ئایەتێك یان فەرموودەیەك بەهەڵە دەهێننەوە و هەر یەکە لە لای خۆیەوە وەك بنیشت دەجوێت و ئەم لەو وەردەگرێ و ئەویش لەویتر و لەسەر یەکتری کۆپی دەکەن و دووبارە و چەندبارەی دەکەنەوە، بەبێ ئەوەی ئاماژە بەو هەموو فەرموودانە بکەن! ئەوە نیشانەی بڕیاردانی ئایدیۆلۆژیکی و سیاسی و شیکردنەوەی نابابەتی و سۆبژێکتیڤییانەیە، کە ئێستاکە لە هیچ کایەیەکی زانستی و ئاکادیمی کەمترین نرخیش بۆ دانانرێت!

سەرەڕای هەموو ئەو بەڵگانە کە باسمان کرد، وای دادەنێین کە ئایینی ئیسلامیش وەکو مەسیحییەت و یەهوودییەت دەڵێ حەوا لە پەراسووی ئادەم خوڵقێنراوە، هەروەها یەکەمین گوناه حەوا کردوویەتی و ئادەمی هەڵخەڵەتاندووە و بووە هۆی دەرکردنی ئادەم لە بەهەشت!

---

1 . البوطي، د. محمد سعيد رمضان (2010): "المرأة بين طغيان النظام الغربي و لطائف التشريع الرباني": دمشق: دار الفكر المعاصر؛ ص 63 و 82-92.

2 . الزلمي، د. مصطفى إبراهيم (2008): "فلسفة القانون": أربيل: مؤسسه O.P.I.C للطباعة و النشر؛ صص 57-58.

لێرە ئەو پرسیارە دروست دەبێ: ئایا ئەو هەموو توندوتیژییەی کە لە لایەن پیاوانەوە دژ بە ژنان دەکرێ، یان ئەو ژنانەی کە خۆیان دەسووتێنن، لەبەر ئەوەیە کە حەوا لە پەراسووی ئادەم دروست کراوە و ژن کۆپیی پیاوە؟ کێ دەڵێ پیاو لەبەر ئەو ریوایەتانە لە ژنانی خۆیان دەدەن و لە سەریان بە زەبروزەنگن؟ چەند لەو پیاوانە ئەو حەدیسانە دەزانن کە هەر بوونیان هەیە؟! چەند لەو ژنانە، کە خۆیان دەسووتێنن لەبەر گوناهی یەکەمینیی حەوا خۆیان دەکوژن؟! چەند لەو پیاوانەی کە دەسەڵاتی ئیداری و سیاسییان لە دەستە و ئامادە نین شوێنی خۆیان بدەنە ژنان، هۆکارەکەی دەگەڕێننەوە بۆ پەراسووی ئادەم و خواردنی درەختەکە لە لایەن حەواوە؟!

بۆ پەنا بۆ گریمانە ببەین؟ ئەوەتا لە ئینجیلی مەسیحییەکاندا هاتووە کە حەوا لە پەراسووی ئادەم دروست کراوە و حەوا بەهۆی یەکەمین گوناهیەوە بووە هۆی دەرکرنی مرۆڤ لە بەهەشت و...، ئایا ئەو هەموو توندوتیژی و کوشتن و خۆکوژی و دەستدرێژییە سێکسییەی دژ بە ژنە ڕۆژئاواییەکان دەکرێت، بۆ ئەو دەقە پیرۆزانەی ئینجیل دەگەڕێتەوە؟!

ئایا ئەو میللەتانەی کە ئایینی زەمینی و دەستکردیان هەیە و هەر ئادەم و حەواش ناناسن، بۆچی ئەو هەموو توندوتیژییانە دژی ژنان ئەنجام دەدەن؟ خۆ ئەوانیش بڕوایان بەو چیرۆکە نییە کە حەوا لە پەراسووی ئادەم دروست کراوە!

ئەگەر سەیری وتەکانی ڕۆشنبیرە ئەورووپییەکان بکەین سەبارەت بە ژنە موسڵمانەکان و لەگەڵ وتەکانی ڕۆشنبیرە کوردەکانی خۆمان بەراورد بکەین، ئینساف و هەقبێژیی و دادگەری و قووڵایی تێیدا بەرجەستە دەبێت و لە بەرامبەردا، ڕق و کینە و چەواشەکاری و نادادپەروەریی ئەم تاقمە لە ڕۆشنبیرە خۆمانییەکان بەدەردەکەوێ؛ بۆ نموونە:

"گۆستاڤ لوبۆن"* دەڵێ:

"ئیسلام لە جیاتی ئەوەی لە پلەوپایەی ژن کەم بکاتەوە و بە کەم و سووکی بزانێ، هەروەك لەم سەردەمەدا بێلێکۆڵینەوە و هەڕەمەکی لەسەر زاران دەم بە دەم دەگوترێتەوە، پێگەی ژنی لە ناو کۆمەڵگادا زۆر بەرز نرخاندووە و بۆ گەشەکردن و پێشکەوتنی هەوڵی داوە... کەواتە سەلماندمان کە ڕای ئێمە دروستە کە دەڵێین ئیسلام لەجیاتی ئەوەی لە پلەوپێگەی ژن کەم بکاتەوە، دەیگەیەنێتە بەرزترین پلە، ئەم ڕاوبۆچوونەش تەنها هی ئێمە نییە و ئێمەش یەکەم کەس نین کە بماندۆزیبێتەوە، بەڵکو "کۆسن دو پرسواڵ" و "بارتلمی سەنت هیلەر" بەر لە ئێمەش باسیان کردووە و لەگەڵ

* Gustave Le Bon (1841 - 1931).

ئێمە هاوڕان. ئیسلام یەکەم ئایینە کە لە چاکسازیی دۆخی ژنان و پێشکەوتنی ئەوان هەنگاوی زۆر گەورەی ناوە؛ چونکە زۆر ئاشکرایە کە لە نێوان ئایین و نەتەوەکانی دیکە جگە لە ئیسلام، حاڵ و دۆخی ژنان بە شێوەیەکی لەڕادەبەدەر خراپتر و وێرانتر بووە."[1]

"مارسێل ئاندرێ بۆواسار" ـ ڕۆشنبیر و سیاسەتمەداری سویسری ـ دەڵێت:

"لە ڕوانگەی قورئانەوە، ژن لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا لە هەموو ئەو مافانەی کە دراوەتە پیاو، ژنیش لێی بەهرەمەندە و لە بنەڕەتدا هیچ جۆرێك لە جیاوازیی نێوانیان نادۆزینەوە. قورئان پیاو و ژن ـ پێکەوە ـ دەکاتە دوێنەر و بەردەنگ و، وەکو یەك مامەڵەیان لەگەڵ دەکات. ڕێنماییەکانی ئیسلام پێناسەیەکی وردی هەیە بۆ ژن و گرنگییەکی زۆری دەداتێ و ژیانی ژن بە تەواوەتی گەرەنتی دەکات... ژن ـ بەپێی بۆچوونی قورئان ـ لە هەمان جەوهەر دروست کراوە کە پیاو لێی ئەفرێندراوە، بە پێچەوانەی ئینجیل و تەورات لە پەراسووی پیاو خەڵق نەکراوە، بەڵکو لەتکی پیاوە، هەروەك لە وتەی محەممەددا هاتووە: ژنان لەتك و نیوەی پیاوانن. ئەمەش زۆر گونجاوە لەگەڵ ڕێنماییەکانی قورئان کە دەڵێ: هەموو شتەکان بە جووت (زەوج) دروست کراون. قورئان هەرگیز بڕوای بەوە نییە کە پیاو لەبەر گوناه و هەڵەی ژن لە بەهەشتەوە دەرکرابێت، هەروەك لە بەشی ئافران (سفری تەکوین)ی تەوراتدا هاتووە. هەرچەند قورئان دەخوێنمەوە، هیچ وشەیەك کە نیشانەی ئیهانە و کەمکردن و سووککردنەوەی ڕێز و کەسایەتیی ژنان بێت ـ وەك ئەو سووکایەتییانەی کە پاپاکانی کەنیسە لەگەڵ ژن دەکەن ـ نادۆزمەوە... لە ئیسلامدا ژن شاگردی شەیتان نییە... قورئان باسی پلەی بەرزی هەندێ ژنان دەکاتەوە کە پیاوان لێی بێبەشن؛ وەکو: ژنی فیرعەون و مەریەمی کچی عیمران، دایکی مەسیح... لە ڕێنماییەکانی قورئاندا، ناتوانین بۆ دۆخی ئێستای ژن لە جیهانی ئیسلامدا پاساو بهێنینەوە؛ بە تایبەتی لە بواری نەفامی و نەزانین و نەخوێندەواریدا، نەزانینی ئەو هەموو مافانەی کە قورئان بە شێوەیەکی تایبەت داوەتێ... هەوڵەکانی ژنە موسڵمانەکان بۆ بەدەستهێنانی ماف و ئازادییەکانیان کە ماوەیەکە دەستی پێ کراوە، لە کۆششەکانی ژنە ئەوروپی و ئەمریکییەکان ـ سەرەڕای هەموو دژوارییەکانی ـ زۆر ئاسانترە؛ چونکە ژنە موسڵمانەکان ئەوەندەیان بۆ بەسە کە ویژدانی گشتیی کۆمەڵگا بەهۆی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەریان بێدار بکەنەوە، تاکو پێگەی سیاسی و ئایینیی خۆیان لە دونیای ئەمڕۆدا وکو جارانی پتەو بکەنەوە. ژنە موسڵمانەکان بەپێچەوانەی ژنە ڕۆژئاواییەکان دژی ئەو یاسا زاڵمانەی کە مافی ژنانی لە بیر کردووە، شۆڕش ناکات و بەتەمای گۆڕینی یاسا مەدەنییەکانی وڵاتی خۆشی نییە، بەڵکو تەنها بەرامبەر ئەو بیروڕایە تەسك و وشك و دەمارگیرییە جاهیلییەکان خەبات دەکەن، کە ڕێگرن لە گەیشتنی ژنان بەو ماف و ئازادییانەی کە ئیسلام بۆیانی هێناوە و بە ڕەسمیی زانیوە. ئایینی ئیسلام زیاتر لە هەموو یاسا ئایینی و مەدەنییەکانی ئەوروپا، لەبارەی ماف و ئازادییەکانی ژن قسە دەکات: موڵکایەتیی تایبەتی ژن، مافی مارەیی، میرات، وەرگرتنی نەفەقە و خەرجیی ژیان لە مێردە پێشوویەکەی کە تەڵاقیداوە و بگرە زۆر شتی دیکە کە لەو کتێبەدا مەجالی باسکردنمان

1 . Le Bon, Gustave (1974), **"The world of Islamic civilization"**, Tudor Pub. Co; First Edition edition. pp. 513-517.

نییە... کارە سەختەکەی ژنی موسڵمان، تەنها بەرگریکردنە لە خۆی بەرامبەر ئەو پیاوانە کە ئامادە نین ئەحکامەکانی خوایی جێبەجێ بکەن، کە لەبارەی ژنەکانیانەوە دابەزیون."[1]

"ئمیل دێرمێنگێم"* ـ زانای بەناوبانگی فەرەنسی ـ لە کتێبی "ژیانی محەممەد"دا دەڵێ:

"قسەیەکی بێبنەما و پووچە کە دەگوترێ ژن لە ئایینی ئیسلامدا ڕێزی لێ نەگیراوە و بە پلەدوو دانراوە. ئیسلام شایانی ئەوە نییە وەك مەسیحییەت زەم بکرێت، کە بڕوای وایە ژن سەرچاوەی هەموو گوناه و نەفرینەکانە. هەرکەس باوەڕ ناکات، با سەردانێکی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی بکات، تاکو ببینێ کە ئەدەبی خێزانی چەندە بەهێزە و ژنی موسڵمان قەت ئیرەیی بە ژنانی ئێمەی خاوەن تەنوورەی کورت و لاقی ڕووت نابەن، هەرگیز ئیرەیی بە ژنانی کرێکار و کارکەرمان نابەن، کە ناچارن بۆ تێرکردنی سکیان لە کارگەکاندا کار بکەن. جیهانی ئیسلام هێشتا خۆشەویستیی خێزانی و سۆزی ناوماڵ و ڕۆحی و دەروونییان لەبیر نەکردووە و وەکو جیهانی ئێمەی بەسەر نەهاتووە."[2]

"هێنری دی کاستری"** ـ زانای فەرەنسی و شارەزای بواری عەسکەری ـ لە کتێبی "ئیسلام، هەڵێنجانەکان و خوێندنەوەکان"دا دەڵێ:

"ژنی موسڵمان لە زۆر ڕووەوە قەرزداری پێغەمبەری خۆیانن. قورئانیش لە زۆر ئایەتی بەنرخدا باسی ماف و ئەرکەکانی ژنان دەکات... خوێنەر لە هەموو ئەم ئایەتانەوە دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە ئەندازەی گرنگی پێدانی ئیسلام، نەهێشتنی هۆکارەکانی گەندەڵی و بەدڕەوشتییە، کە لە پەیوەندیی بێسنووری ژنان و پیاواندا دروست دەبێت، هەموو بۆ ئەوەیە کە خێزان تووشی شڵەژان نەبێت و هاوسەرەکان لە ڕاحەتی و خۆشیدا بژین... بۆیە دەبینین کە موسڵمانان خاوەن ئەخلاقێکی تایبەتن؛ چونکە ملکەچی فەرمانەکانی قورئان و محەممەدن. ئەوان خاوەن شکۆ و سەنگن، کە زۆر جیاوازە لەو ئادابانەی کە لە میللەتە پێشکەوتووەکانی ئەمڕۆدا دەبینین. جیاوازیی کەرامەت و حەشمەت و شکۆداری لە نێوان موسڵمانان و مەسیحییەکان، وەکو جیاوازیی نێوان زەوی و ئەسمانە."[3]

"ویل دیۆرانت"*** ـ مێژووناسی بەناوبانگی ئەمریکی ـ دەڵێ:

"ئیسلام پلەوپایەی ژن، لە کۆمەڵگا عەرەبییەکاندا بەرز کردەوە... زیندەبەچاڵکردنی کچەکانی بە یەکجاری لەناو برد و یەکسانیی لە نێوان ژن و پیاودا لە هەموو ڕوویەکەوە بە تایبەتی لە ئیجرائاتی دادوەری و سەربەخۆیی ماڵی لەناو کۆمەڵگادا بەرقەرار کرد. مافی دایە ژن کە بۆ خۆی هەموو کارێکی بکات، بە مەرجێك حەڵاڵ بێت و، هەموو داهاتەکەش

1 . Boisard, op.cit., pp. 108-114.

* Émile Dermenghem (1892-1971).

2 . Demenghem, Emile (2006), "**The Life of Mahomet**", Montana: Kessinger Publishing, p. 331.

** Henry De Castries (1850-1927).

3 . De Castries, Henry (2013), "**L'islam, Impression Et E'tudes**", Charleston: Nabu Press, pp.57-59.

*** Will Durant (1885 - 1981).

هی خۆی بێت، میراتی پێی دا و هەر چۆنێك پێی خۆش بێت ئاوا دەتوانێت لەسەر ماڵ و سامانی خۆی بڕیار بدات. ژنی لە کاڵابوون ڕزگار کرد و ڕێگریی لەو هاوسەرگیرییانەی کرد کە بە ویستی ژنان نەبێت".[1] هەروەها دەڵێت: "لە مێژووی ئیسلامدا کچەکان وەك کوڕان دەچوونە قوتابخانە، تا ڕادەیەك کە زۆر لە ژنە موسڵمانەکان لە ئەدەب و هونەردا بوونەتە بلیمەت."[2]

خاتوو "لۆرا ڤیشیا ڤاگلیری"* ـ ڕۆژهەڵاتناسی ئیتالیایی ـ لە کتێبی "داوای لێبوردن لە ئیسلام"دا دەڵێ:

"ئەگەر ژن ئەمڕۆ لە ئەوروپا، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە بووەتە خاوەن پلەوپایەیەکی بەرز، ئەویش تەنها لە ڕووی تیۆری و یاساییەوە، لەمێژ نییە و تەنها چەند ساڵێکە کە گەیشتووەتێ، تەنانەت هێشتا لە زۆر وڵاتە ئەوروپاییەکان، بەراورد بە ژنی موسڵمان لە جیهانی ئیسلامدا سەربەخۆییەکی کەمتری هەیە، بەتایبەتی لە ڕووی مافی ئابوورییەوە".[3]

خاتوو "لێیدی ئیڤلین کۆبۆڵد"** ـ ڕۆژهەڵاتناسی سکۆتڵەندی کە ئاخری ئیسلامیشی هێنا ـ لە کتێبی "حەجێك بۆ مەککە"دا دەڵێ:

"ژنە موسڵمانەکان لەچاو پیاوەکان لە مەیدانی زانست و مەعریفەدا پاشکۆ و پاشتر لەوان نەبوونە، لە نێوان ژناندا زۆر لە زانایان لە بواری فەلسفە، مێژوو، ئەدەب، شیعر و هونەر و هتد، سەریان هەڵداوە".[4]

2) <u>سەبارەت بە کێڵگەبوونی ژن:</u> هەموو ئەو فێمێنیستانەمان بینی کە لە بەکێڵگەزانینی ژنان لە ئایەتێکی قورئانییەوە بەگازندەن و هەندێکیان زۆر بە توندی بە تەفسیر و لێکدانەوەیەکی نادرێك باسی دەکەن، وەك بڵێن: مادام خوا وشەی کێڵگە (حرث)ی بۆ ژن بەکارهێناوە، دیارە پیاوی بە باشتر و کاراتر و بکەرتر داناوە و، ژن تەنها مەفعوول و ئۆبژێکتێکە کە پیاو چۆن حەزی لێیە، ئاوا لەگەڵ ژن دەجووڵێتەوە، وەك جووتیارێك چۆن دەیەوێ لەگەڵ کێڵگەکەی مامەڵە دەکات! بەرلە هەموو شتێك دەبێ بزانین کە نێرینەبوون و مێینەبوون تەنها تایبەت نییە بە مرۆڤەوە،

1 . دورانت، ویل (2012)؛ "تاریخ تمدن"؛ جلد 4 (عصر ایمان: بخش اول)؛ ترجمە: ابوطالب صارمی و دیگران؛ تهران: انتشارات علمی و فرهنگی؛ چاپ پانزدهم؛ ص 231.
2 . منبع پیشین؛ ص 302.

* Laura Veccia Vaglieri (1893-1989).
3 . Vaglieri, L. Veccia (1925), "**Apologia dell' islamismo**", Rome: A. F. Formiggini, p. 106.
** Lady Evelyn Cobbold (1867-1963).
4 . Cobbold, L. Evelyn (2009), "**Pilgrimage to Mecca**", London: Arabian Publishing Ltd, p. 28.

بەڵکو هۆیەکە بۆ مانەوەی وەچەی هەموو گیانلەبەران: ﴿وما خلق الذكر و الأنثى﴾؛[1] واتە: سوێند بە هەموو ئەو بوونەوەرانەی کە خوا بە نێر و مێ دروستی کردوون. یان دەفەرمێ: ﴿جعل لكم من أنفسكم أزواجا و من الأنعام أزواجا يذرؤكم فيه﴾؛[2] واتە: خوا هەر لە توخمی خۆتان هاوسەر (ژن یان پیاو)ێکی بۆتان داناوە و لە چوارپێ و ئاژەڵیش جووت (نێر و مێ)ی بۆ فەراهەم هێناون لەو ڕێگایەوە زاوزێ دەکەن و زۆر دەبن. ئەگەر لە جیهانی مرۆڤدا نێر و مێ نەبوایەن، هەرگیز نەوەی مرۆڤ دروست نەدەبوو و وەچەی ئادەمیزاد بنبڕ دەبوو. بۆ وەچەهێنانیش خوا مرۆڤی بە شێوازی پیاو و ژن ئافراندووە، تاکو بەهۆی پرۆسەی پیتاندنەوە ـ لە ڕێگەی جووتبوونەوە ـ تۆوی مرۆڤ (هی ژن و پیاو) لە شوێنی مەبەست جێگیر بێتەوە و لەوێ بمێنێتەوە تاکو ئەوەندە گەشە بکات، کە شایانی هاتنە سەر دونیا بێت و لەو شوێنە ـ کە نۆ مانگە ـ بێتە دەر. خوا ئەم پرۆسەیە بەم شێوازە وێنا دەکات:

﴿نساؤكم حرث لكم فأتوا حرثكم أنى شئتم﴾؛[3] واتە: ژنە هاوسەرەکانتان کێڵگەن بۆ ئێوە و شوێنی چاندنی وەچەن، جا بە هەر شێوەیەك دەتانەوێ تۆو بوەشێننە ناو کێڵگەکەتانەوە.

ئەم ئایەتە بۆ ئێمە ڕوون دەکاتەوە کە ژن تەنها بۆ تێرکردنی حەزی سێکسیی پیاو نییە هەروەك تێڕوانینی ڕۆژئاوایی دەڕوانێتە ژن و بە کاڵایەکی چێژبەخش دەزانرێ، بەڵکو دەڵێ: سێکس و سەرجێیی تەنها بریتی نییە لە ئاڵۆش و چێژی جنسی و لەوەشدا کورت نابێتەوە، بەڵکو فەلسەفەی سەرەکیی سێکس بریتییە لە وەچەهێنان و دروستکردنی نەوە. بۆ ئەم مەبەستەش خوا جەستەی ژن و کۆئەندامی زاوزێیی وا دروست کردووە کە تۆوی پیاوەکەی وەردەگرێ و سروشتی وایە کە ئەم تۆوە تەنها لەو شوێنەش نەبێت ناپیتێتەوە و نابێتە کۆرپەڵە. هەروەك کێڵگەی خاکی سروشتی وایە کە تۆوی ڕووەك تێیدا گەشە دەکات و دەبێتە ڕووەکێکی دیاریکراو. ئەگەر ئەم تۆوە لە شوێنێکی دیکە وەك هەوا، یان بەردەڵان، یان هەر شوێنێکی دیکە جگە لە خاك جێگیر بکرێت، قەت ناهێتە پیتاندن و، نابێتە گوڵ و شتڵ و درەخت و میوە و سەوزە. زێ و منداڵدانی ژنیشی بە کێڵگە چواندووە، کە شوێنی تایبەتی وەچەهێنانە. تەنها ئەو شوێنەیە کە تۆوی پیاو تێدا دەبێتە کۆرپەڵە. خۆ ئەگەر پیاو تۆوەکەی لە هەر شوێنێکی دیکە جگە لە

1 . (الليل: 3).
2 . (الشورى: 11).
3 . (البقرة: 223).

ئەندامی زاوزێی ژن بەتاڵ بکاتەوە، قەت نابێتە منداڵ، هەرچەند ئەو تۆوەش زیاد و ڕێژەکەیشی زۆر بێت! کەواتە بەکێڵگەزانینی ئەندامی زاوزێی ژن، نە تەنها بێڕێزی و سووکایەتی نییە بە ژن، بەڵکو لووتکەی کەماڵ و پێگەیینە بۆ ژن؛ بۆیە ئەگەر ژنێك منداڵی نەبێت، لەخۆیدا هەست بە خەوش و کەموکووڕی دەکات و ئامادەیە هەموو دارایی و سەرمایەی خۆی خەرج بکات بۆ ئەوەی ببێتە "کێڵگە"یەك کە تۆوی پیاوەکەی تێدا بەرهەم بێت. بەکێڵگەزانینی منداڵدانی ژن، ئەوە بیردەخاتەوە کە ژن کاڵا و شتومەکێکی سێکسی و گۆشتێکی ئاڵۆشاوی نییە کە پیاو بۆ تێرکردنی حەز و ئارەزووە سێکسییەکانی کونەکەی بەکار بێنێ. هەروەها بە بیری خودی ژنیش دەخاتەوە کە نابێ خۆی تا ئاستی "کون"ێك کەم بکاتەوە، بەڵکو ئەگەر تەنها وەك کونێك سەیر بکرێ، ئەوەتا لە ئاژەڵەکانیش ــ کە قورئان باسی دەکات ــ خوارتر و نزمتر دادەنرێت؛ چونکە هیچ ئاژەڵێك نییە کە تەنها بۆ حەزی سێکسی، جووت ببێت. ئەگەر قورئان منداڵدانی ژنی بە کێڵگە شوبهاندبێت، ئەوا لیبراڵیزمی ڕۆژئاوایی منداڵدانەکەی بە کاڵا دادەنێت. کێڵگە، ژیان بەرهەم دەهێنێ، بەڵام کاڵا بەکار دەهێنرێت؛ ئەوەتا بەکاڵابوونی ژن وەك کەرەستەیەك بۆ چێژبەخشینی سێکسی و دامرکێنەری ئاڵۆشی پیاوان لە هەندێ وڵاتانی ئەوروپا وەك هوڵەندا (شاری ئەمستردام، گەڕەکی ڕێدلاین)* دەبینین کە ژن لە پشت جام و ڤیترینی دوکان و شوێنە تایبەتەکان، بە ڕووتی وەستاوە و خۆی عەرز دەکات، تاکو پیاوە کڕیار و داواکارەکان، جەستەکەی بۆ ماوەیەکی کاتی بکڕن و چێژی لێ بکەن.

3) <u>سەبارەت بە میرات</u>: گەورەترین تۆمەت کە لە لایەن ڕۆشنبیرانی فێمێنیست و ڕەخنەگرانی دیکەوە دەدرێتە پاڵ ئیسلام، بابەتی میراتە، کە پێیان وایە شەرعی ئیسلام لەبەر ئەوەی نیوەی بەشی پیاو لە میرات دەداتە ژن، زوڵمێکی گەورە و جیاکارییەکی ڕەگەزی لە نێویاندا دەکات، کە نیشانەی پلەنزمیی ژنە لە ئایینی ئیسلامدا!

* دەتوانن سەیری فیلم و ڕاپۆرتی تایبەت بە (Red Line District) لە سایتی یوتیوب بکەن؛ بۆ نموونە:
Youtube (Jun 12, 2014), **"Inside Amsterdam's Red Light District Tour 2014 Part 1/2"**, from: https://www.youtube.com/watch?v=bmeRsNkKBu0

بەوەڕا دیارە ئەوان لە ئیسلام تێنەگەیشتوون و بە ڕق و قینەوە لێکی دەدەنەوە. تانە و تەشەر لە ئایینێك دەدەن، کە بۆ یەکەمجار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا مافی میرات[1] (و بابەتە ئابوورییەکانی دیکە)ی[2] لە لایەن ئەوەوە دراوەتە ژن؛ نە لە ئایینی یەهوود، نە مەسیحییەت و نە لە نەتەوە و شارستانییەتە کۆنەکانی وەك: یۆنان، ڕۆم، تووران، کلدان، سریان، فینیقی و

---

1. خوا لە قورئاندا مافی میرات بۆ ژن و پیاو بە یەکسانی داناوە و بەشی ژن لە میرات بە فەرزێکی ئایینی دادەنێت؛ دەفەرمێ: ﴿للرجال نصيب مما ترك الوالدان والأقربون وللنساء نصيب مما ترك الوالدان والأقربون مما قل منه أو كثر نصيبا مفروضا﴾؛ (النساء:7). مافە ئابوورییەکانی ژنان بریتین لە: 1) مافی کارکردن و هەبوونی مووچە و داهات: ﴿ولا تتمنوا ما فضل الله به بعضكم على بعض للرجال نصيب مما اكتسبوا وللنساء نصيب مما اكتسبن واسألوا الله من فضله إن الله كان بكل شيء عليما﴾؛ (النساء: 32)؛ واتە: ئاواتەخوازی شتێك مەکەن کە خوا بەخشیویەتی بە هەندێکتان و نەیبەخشیوە بە هەندێکیتر (پیاوان لە هەندێ بوار وەکو شەڕ و جیهاد لە ژنان سەرتر و بەتواناتری داناوە و ژنان لە هەندێ تایبەتمەندیتر لە پیاوان بەتواناتر و لێهاتووتری خەڵقکردووە). پیاوان بەشیان هەیە لەوەی کە لە ڕێگای کارەوە بەدەستی دەهێنن و ژنانیش بە هەمان شێوە بەشیان هەیە لەوەی کە بەدەستی دەهێنن. بەردەوامیش بن لە داواکردن لە فەزل و بەخشینی خوا (واتە بەردەوام بن لەکارکردن و داوا لە خوا بکەن کە خوا بۆتان ئاسان بکات). 2) بڕی مارەیی: خوا بڕی مارەیی لەسەر پیاو فەرز کردووە و بە ناوی (نحله) واتە بەخشین و دیاریی پڕبەدڵ ناودەبات و نیشانەی ڕەزامەندیی ژنە بۆ شووکردن. نابێ هەرگیز فشار بۆ ژن بێنێ و کێشەی بۆ دروست بکات (وەك قورئان دەفەرمێ: و لا تعضلوهن لتذهبوا ببعض ما آتيتموهن!) تاکو لە هەندێ لەو پارانەی کە دەیدەنێ، چ وەکو مارەیی و چ وەك میرات و هتد، لێی خۆش بن و بە سوودی پیاوەکان لێی چاوپۆشی بکەن: ﴿وآتوا النساء صدقاتهن نحلة فإن طبن لكم عن شيء منه نفسا فكلوه هنيئا مريئا﴾؛ (النساء:4)؛ واتە: مارەیی ژنان بدەن بەو پەڕی دڵفراوانی و ئاسوودەییەوە، خۆ ئەگەر بە ئارەزوو و ویستی خۆیان دەستیان هەڵگرت لە هەندێك مارەیی و بەخشییان بە ئێوە، بۆتان هەیە بیخۆن و بەکاری بهێنن و بە بێدوودڵی سوودی لێەربگرن. 3) مافی نەفەقە و خەرجیکێشان: پێغەمبەر ـ د.خ ـ دەفەرمێ: ﴿ولهن عليكم رزقهن وكسوتهن بالمعروف﴾؛ (رواه أبوداود، إبن ماجه، الدارمي و أحمدبن حنبل)؛ واتە: لەسەرتانە کە خۆراك و پۆشاکی ژنان بدەن بە شێوەیەکی شایستە نە زیادەڕەوی بکەن و نە چنۆکی. وشەی (معروف) زانایان دەڵێن واتە بەپێی عورفی ئەوکاتەی کۆمەلگا. هەموو ئەو بڕە پارەیەی چ وەکو مووچەی کاردن، بڕی مارەیی و ئەو بەخشین و دیارییانەی کە لە هەر کەسێك وەردەگرێت، تەنها و تەنها بۆ خۆی دەبێت. لە شەرعی ئیسلامدا لەسەر ژن نییە کە خەرجیی خێزان و منداڵەکانی بکات؛ واتە ئەگەر یەك دیناریش خەرج بکات بۆی بە خێر و صەدەقە دەنووسرێت و ئەگەر نەیکات گوناهبار نییە؛ هەروەك پێغەمبەر ـ د.خ ـ بە ژنێك کە لێی دەپرسێت ئەگەر بۆ منداڵەکانم لە مالی خۆم خەرج بکەم، ئایا پاداشتم دەبێ، دەفەرمێت: ﴿لك أجر ما أنفقت عليهم﴾؛ (النووي: رياض الصالحين؛ ص 152)؛ واتە: پاداشتت هەیە بەرامبەر بەوەی کە بۆیان خەرج دەکەی؛ بە پێچەوانەی پیاو، کە ئەگەر بەگوێرە توانایی خۆی خەرجیی ماڵ نەکات، گوناهبارە و ئەگەر بیشکات، ئەرکی خۆی جێبەجێ دەکات و ئەگەر ڕەزامەندیی خوای ڕەچاو بکات، خێر و چاکەش بۆ دەنووسرێ: هەروەك لە بانگەشە و دەعوەتنامەیەکدا لە پێغەمبەرەوە ـ د.خ ـ بۆ تەواوی پیاوان سەبارەت بە چاکەکردن لەگەڵ خێزانەکانیان، لە ڕووی نەفەقە و خەرجی کێشان و ڕەفتار و مامەڵە لەگەڵ کردنیان، دەفەرمێت: "خەرجییەك بکەیت و مەبەستت پێی ڕەزامەندیی خوا بێت، ئەوا بە خێر بۆت دەنووس ێت، هەتاوەکو ئەو پاروو و تیکەیەش کە بەرزی دەکەیتەوە بۆ دەمی هاوسەرەکەت". (متفق عليه: البخاري؛ كتاب النفقات: باب فضل النفقة على الأهل؛ رقم الحديث 5039، و مسلم؛ كتاب الوصية: باب الوصية بالثلث؛ رقم الحديث 1628). "ویل دیۆرانت" دەڵێ: "پێگەی ژنی موسڵمان لە ژنی هەندێك لە وڵاتە ئەورووپییەکان بە خاڵێکی زۆر گرنگ جیادەکرێتەوە، کە ئەویش بریتییە لەوەی ژنی موسڵمان ئازاد و سەربەستە لە چۆنیەتی دەستێوەردانی سامانی خۆی، کە پیاوەکەی بە هیچ شێوەیەك مافی ئەوە نییە دەستی تێوەربدات، یان شتێکی کەمیش لێی بستێنێتەوە، یان ناچاری بکات بە سوودی ئەو لە سامانەکەی چاوپۆشی بکات". (دورانت؛ همان منبع: ص 331).

1 . عورتاني، ورود عادل إبراهيم (1998): "ميراث المرأة في الفقه الإسلامي"؛ نابلس: فلسطين: جامعة النجاح الوطنية: رسالة ماجستير؛ صص 1 -11.

ئاشوورییەکاندا وەها مافێکیان پێ نەدراوە، بەڵکو ژن چ وەکو دایك، چ هاوسەر، چ کچ و خوشك، بە یەکجاری لەو مافە بێبەش بووە.[1]

پێم وایە، هۆکاری ئەم تێنەگەیشتن و لێکدانەوە سلبییە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ڕۆشنبیران ئایەتەکانی میرات بە تەواوی نەخوێننەوە، کە زۆر بە وردی لە سوورەتی (النساء)دا هاتوون، یان لێیان تێناگەن، یانیش خۆیان لە گێلی دەدەن و بەشی پێشەوە و پاشەوەی لێ دەبڕن و بێ ئەوەی ئاماژەی پێ بکەن، تەنها ئەو ڕستەیە لە ئایەتەکە دەهێنن کە مەبەستیانە؛ واتە تەنها ئاماژە بەوەندە دەکەن: (للذکر مثل حظ الأنثیین: بۆ کوڕ وەکو بەشی دوو کچانە)، بەڵام پێشەوەی کە دەفەرمێت: ﴿یوصیکم الله فی أولادکم للذکر مثل حظ الأنثیین﴾ کە ئاماژە بەو کچ و کوڕانەیە کاتێك کە دایك یان باوکیان بمرێت کە لەو حاڵەتەدا کچ نیوەی کوڕەکە میرات دەبات. بەڵام ئەوە یاسا و ڕێسایەکی گشتگیر و هەمیشەیی و نەگۆڕ نییە کە لە هەموو حاڵەتەکانی میراتدا ڕەگەزی مێ نیوەی نێر وەربگرێت؛ ئەگەر وابوایە، دەبووایە بفەرموێت: (یوصیکم الله فی عموم الوارثین!). بۆ نموونە لە درێژەی هەمان ئایەتدا (النساء: 7) دەخوێنینەوە: ﴿... و لأبویه لکل واحد منهما السدس مما ترك إن کان له ولد﴾؛ واتە: شەشیەکی دەدرێتە هەر یەك لە دایك و باوکی، ئەگەر مردووەکە منداڵی هەبوو. ئەگەر ئەوە یاسایەکی گشتی بێ، بۆچی لێرە باوك (کە نێرە) و دایك (کە مێیە) وەکو یەك بە یەکسانی میرات وەردەگرن؟ کەواتە ئەو حاڵەتە، ڕێسایەکی گشتی نییە کە لە هەموو حاڵەتەکانی میراتدا جێبەجێ بکرێت، بەڵکو ئەگەر بێت و سەیری ئەحکام و یاسا شەرعییەکانی ئیسلام لە هەموو حاڵەتەکانی میراتدا بکەین، واتە هەموو ئەوانە لێك بدەینەوە، ئەگەر فڵان خزم (پلەی یەك و دوو و سێ و ...)، بمرێ چ دەبێ، لە کۆتاییدا دەبینین کە:

- تەنها (4) حاڵەت هەیە کە ژن (مێ) نیوەی پیاو (نێر) وەردەگرێت.
- لە (11) حاڵەتدا ژن و پیاو وەکو یەك بە یەکسانی وەردەگرن.
- لە (14) حاڵەتدا ژن زیاتر لە پیاو وەردەگرێ.
- لە (5) حاڵەتدا تەنها ژن وەردەگرێ و پیاو هیچی وەبەر ناکەوێ.[2]

2 . سلطان، د. صلاح الدین (1999)؛ "میراث المرأة و قضیة المساواة"؛ القاهرة: دار نهضة مصر؛ صص 10-46. هەروەها: د. علی جمعه محمد؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 51-67.

کەواتە: لە (19) و هەندێ زانایتر دەڵێن لە (22) حاڵەتدا[1] ژن یان زیاتر لە پیاو وەردەگرێت، یان بێ ئەوەی پیاو هیچ بەشێکی میرات ببات، تەنها ژن میرات دەبات؛ لەبەرامبەردا تەنها (4) حاڵەت هەیە کە ژن کەمتر (واتە نیوەی) پیاو وەردەگرێت!

ئەگەر بە لۆژیکی ئەم ڕۆشنبیر و فێمێنیستانە قسە بکەین، دەکرێ بڵێین: ـ پەنا بە خوا ـ زوڵم لە پیاو کراوە؛ چونکە لە (19) یان (22) حاڵەتدا ژن زیاتر لە پیاو وەردەگرێ، هەروەها پیاو تەنها لە (4) حاڵەتدا زیاتر وەردەگرێ؛ واتە دەکاتە (4.25) یان (5.5) ئەوەندەی بەشی پیاو!

قورئان کاتێك کە باسی خاوەن مافەکانی میرات دەکات، واتە ئەوانەی کە میراتیان وەربەر دەکەوێ، ناوی (12) کەس دەبات، کە (8) کەس مێینەن و (4) کەسیش نێرینەن: مێیەکان بریتین لە: دایك، داپیرە، هاوسەر، کچ، کچی برا، خوشك (لە دایك و باوکەوە)، خوشك (لە باوکەوە)، خوشك (لە دایکەوە)؛ بەڵام نێرینەکان بریتین لە: باوك، باپیر، شوو، برای دایك.[2] واتە ژمارەی پیاوان نیوەی ژمارەی ژنانە، بەپێچەوانەی تێڕوانینی هەڵەی فێمێنیستان و ناحەزانی ئیسلام، کە پێیان وایە لە ئایینی ئیسلامدا ژن لە وەرگرتنی میراتدا نیوەی پیاو ژمێردراوە.

لە ئیسلامدا ئەم دابەشکردنە لەسەر بنەمای توخمی ڕەگەزی ئەنجام نادرێت، بەڵکو لەسەر بنەمای ئەرك و بەرپرسیارییەتیی ماڵی و ئابووریی هەریەك لە ژن و پیاو دەوەستێت. ژن هیچ ئەرکێکی ماڵی وەکو دابینکردنی خەرجیی ماڵ و منداڵ لە ئەستۆدا نییە؛ واتە پێداویستییەکانی خۆی و منداڵەکانی، وەك: نەفەقە، خۆراك، پۆشاك، خانوو، کارەبا، ئاو، هاتوچۆ، خوێندن، تەندروستی، جوانکاری (کەمالیات) و هتد، هەمووی لە ئەستۆی پیاودایە. هۆکارەکانی دیکەش هەن کە لێرە دەرفەتی درێژەدانی ئەم باسەمان نییە و دەکرێ خوێنەر بۆ سەرچاوەکانی پێویست لەسەر ئەم بابەتە بگەڕێتەوە.[3]

هەروەك "جۆن لویس نسپۆزیتۆ" لە کتێبی "چ کەسێك لە لایەن ئیسلامەوە قسە دەکات؟"دا دەڵێ:

"ئەو بەشەی لە شەریعەت، کە ئێمەی ڕۆژئاوایی بەهۆی جیاکاریی ڕەگەزی زۆر بە توندی ڕەخنەی لێدەگرین، لە ڕاستیدا ژن و پیاو بە شێوەیەکی هاوبەش خاوەن مافی "تەواوکار"ی

1 . بۆ زانینی ڕای ئەم زانایانە بڕوانە: أمین، نشأت (2014/2/28)؛ "**الإسلام أنصف المرأة فی المیراث**"؛ من الموقع: جریدة الرایة: http://www.raya.com

2 . رضوان، د. زینب (2004)؛ "**المرأة بین الموروث و التحدیث**"؛ القاهرة: الهیئة المصریة العامة للکتاب؛ ص 156.

3 . بڕوانە: د. علی جمعه محمد؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 41-50. الصابونی، محمد علی (2013)؛ "**المواریث فی الشریعة الإسلامیة فی ضوء الکتاب و السنة**"؛ عمان: دارالمعارف؛ صص 18-20. هەروەها: القرضاوي، د. یوسف؛ همان منبع؛ صص 28-31.

یەکترن، کە مەرج نییە بە سوودی پیاو بێت؛ بۆ نموونە: بەپێی ڕای هەموو مافناس و شەرعناسە موسڵمانەکان، ژن هیچ بەرپرسیارییەتییەکی ماڵی بەرامبەر بە خێزان لە ئەستۆدا نییە. ئەو مافی هەیە کە داهاتەکەی و هەموو سامان و دارابیەکانی خۆی بە ناوی خۆی و بە تەنهایی بۆ خۆی هەڵگرێت؛ نە وەك "دارایی هاوبەش". هەروەها ئەو و منداڵەکانیشی لە هەبوونی دارایی و داهاتەکانی شووەکەی مافی یاساییان هەیە. ئەرکی پیاوانە کە خەرجیی مارەیی و هاوسەرگیری، نیشتەجێبوون، خۆراك و پۆشاك، تەندروستی و خوێندن و بژێوی ژیانی ڕۆژانە دابین بکەن. تەنانەت ئەگەر ژن زۆر دەوڵەمەندیش بێت، هەرگیز بۆ پشتیوانیی لە تاکێکی دیکە، تەنانەت خودی خۆی، هیچ بەرپرسیارییەتییەکی ماڵی لە ئەستۆدا نییە. تەواوکەری ئەم ئیمتیازە ئەوەیە کە بەشی میراتەکەی ژن بە بەراورد لەگەڵ "برا"یەکەی (نەك شوو، باوك، دایك، کوڕ، کچ و ئەوانی دیکە) یەك بە دوو دەبێت (واتە نیوەی بەشی براکەی)؛ کەواتە لۆژیکی ئەم یاسایە ئەوەیە: سەرەڕای ئەوەی کە ژن بۆی هەیە لە دەرەوەی ماڵ کار بکات، هەرگیز نابێ ناچار بەکارکردن بکرێت و لە ئەنجامیشدا بەرپرسیارییەتی بەخێوکردنی خۆی و منداڵەکانیشی لە ئەستۆی نزیکترین پیاوی خانەوادەکەیەتی. لێرەشەوەیە کە بەپێی بنەماکان، بەرپرسیارییەتی ماڵیی ژن سفرە، براکەی بەرپرسیارییەتی خێزانی خۆی و دایك و خوشکەکانی لە ئەستۆ دەگرێت؛ بەو مەرجەی کە هێشتا هاوسەرگیرییان نەکردبێ، کە لەو کاتە دەکەوێتە ئەستۆی شووەکانیان. پێدانی نیوەی میرات بە خوشکی ئەم پیاوە لەوانەیە بە بۆچوونی هەندێ کەسان بە شێوەیەکی زۆر نادادگەرانە لە بەرژەوەندیی ئەو خوشکە دابێت؛ کەواتە بە قایلبوونی مافی یاسایی "یەکسان" بۆ ژنان و پیاوان، ئەو ئیمتیازەیە کە ژنە موسڵمانەکان بە درێژایی مێژوودا لێی سوودمەندن، کە ئێمەی ڕۆژئاوایی نادیدەی دەگرین."[1]

"مارسێل بۆواسار"یش دەڵێ:

"فەرموودەکانی قورئان و محەممەد بە تەواوەتی پشتی ژن دەگرن و مافەکانی ژنان دەپارێزن و ناهێڵن مافیان بخورێت."[2]

"گۆستاڤ لۆبۆن"یش دەڵێ:

"بنەماکانی میرات کە قورئان بە دەق هێناویەتی، زۆر دادگەرانە و هەقانی و بە ئینسافە. لەبەرامبەردا سەیری یاساکانی فەرەنسا و ئینگلیز دەکەین ئەم ماف و ڕێزلێنانە تێیاندا نادۆزینەوە."[3]

1 . Esposito, op.cit., pp. 118-119.

2 . Boisard, op.cit., p. 140.

3 . Le Bon, op.cit., p.389.

"ڕۆم لاندۆ"*ش ـ پەیکەرتاش و هونەرمەندی بریتانی بە ڕەچەڵەك پۆڵۆنیایی ـ لە کتێبی "ئیسلام و عەرەبەکان"دا دەنووسێ:

"ئەو ڕۆژەی کە ژنان لە جیهانی ڕۆژئاوادا تەنها کاڵایەك دەژمێردران، ئەو ڕۆژەی کە شکی جددییان هەبوو کە ئایا بە ڕاستی ژن مرۆڤە و ڕۆحی لەبەردایە یان نا، ئایینی ئیسلام ژنی وەك مرۆڤێکی خاوەن پلە و ماف ناساند، کە مافی موڵکایەتی هەیە، ژن لە مێردەکەی میرات دەبات، بەڵام کچەکان پێویستە لە سەریان تەنها بە نیوەی پشکی براکانیان ڕازی بن، بەڵام نابێ لەبیر بکەین کە منداڵە نێرینەکانیشمان، تەنانەت ئێستاش بە شێوەیەکی ڕێژەیی، لە میرات بێبەش دەبن."[1]

4) **سەبارەت بە شایەتی**: تۆمەتێکی‌تری ڕۆشنبیران لە هەڵوێستی شەرعی ئیسلام بەرامبەر بە شایەتیی ژنانە کە دەڵێن: شایەتیی ژنانیش نیوەی پیاوان ژمێردراوە و بە ڕستەیەك لە ئایەتێك (کە دیسان سانسۆر کراوە و لە بەشی پێشەوە و پاشەوەی ئەبستراك کراوەتەوە) کە درێژترین ئایەتی قورئانە و بە ئایەتی (دەین: قەرز) بەناوبانگە، ئەویش تەنها ئەوەندە دەهێننەوە: (...واستشهدوا شهيدين من رجالكم فإن لم يكونا رجلين فرجل و امرأتان...)؛ واتە: دوو پیاو بە شایەتی بگرن، ئەگەر دوو نەبوون پیاوێك لەگەڵ دوو ژن بگرن!

گەورەترین هەڵە لێرە، ئەو تێکەڵکردنەیە کە لە نێوان دوو چەمکی (الشهادە: شایەتیدان) و (الإشهاد يان الإستشهاد: بە شایەتیگرتن) دەکرێت. ئایەتی سەرەوە کە مەبەستیانە باس لە إشهاد و شایەتیگرتن دەکات؛ نەك شهادە و شایەتیدان. شهادە بریتییە لەو شایەتیدانەی کە لە دادگاکان، بەردەم قازی و دادوەرەکان ئەنجام دەدرێت کە ئەوە زۆر جار ئیختیاری نییە؛ واتە زیاتر ئەرکە تاکو ماف؛ بەو مانایەی کە زیاتر بۆ ڕوونکردنەوە و دۆزینەوەی خەتابار و تاوانباری ڕاستەقینە یان پاکانە و سڕینەوەی تاوانێك لەسەر کەسێك ئەنجام دەدرێت، کە ئەوەش هیچ پەیوەندییەکی بە نێرینەیی و مێینەیی مرۆڤەوە نییە و، ژن و پیاو وەکو یەك لە دادگاکان شایەتییان لێ وەردەگیرێت بەبێجیاوازی. نە مێینەبوون و نە نێرینەبوون هۆکاری ڕاستی یان درۆبوون، قبووڵ یان ڕەتکردنەوەی شایەتی بە حیساب نایەت، بەڵکو حاکم بەبێ ڕەچاوکردنی ڕەگەزی گەواهیدەر (الشاهد) و بێ ڕەچاوکردنی ژمارەیان، تەنها متمانەی خۆی بە شایەتییەکە و ڕوونکردنەوەی

---

* Rom Landau (1899-1971).

1 . Landau, Rom (2007), "Islam and the Arabs", London: Routeledge, p. 203.

بەڵگەکان بە پێویست دەزانێ. لە ئیسلامدا هیچ ئایەت و حەدیسێك نییە کە شایەتیی ژن لەو بوارەدا ــ بواری مەدەنی و دادوەری ــ بە نیوەی پیاو لەقەڵەم درابێت، بەڵکو ئایەت هەیە کە شایەتیی ژن، جگە لەوەی کە یەکسانە لەگەڵ پیاو، بەرامبەر بە چوار شایەتی دانراوە؛ بەم واتایە: هەروەك چۆن ژنێك بە شایەتیی چوار کەس، ئەویش بە هەندێ مەرجی زۆر دژوار، دەتوانرێ بە زینا و داوێنپیسی تاوانبار بکرێت، لە هەڵویستێکی دیکەدا بە تەنهایی شایەتی بۆ خۆی دەدات و لە جیاتی چوار کەس، چوار جار سوێند دەخوات بۆ سەلماندنی پاکانەکەی، کە لە دوای پێنجەم سوێندی، پاکانەکەی قبووڵ دەکرێت. ئەوەتا لە ئایەتێکدا کە بە ئایەتی (لعان) ناسراوە، ژن ئەگەر لە لایەن مێردەکەیەوە بە زینا تۆمەتبار بکرێ و چوار شایەتیشی نەبێ، پیاو دەبێ لەبەردەم قازی چوار جار شایەتی بدات و پێنجەمینەکەی لەعنەتی خوای بەسەردا دەبارێ، ئەگەر درۆی کردبێت. بە هەمان شێوەش ژنەکەی چوار جار شایەتی دەدات، کە پاکە و هیچی نەکردووە، شایەتی پێنجەمینی ئەوەیە کە لەعنەتی خوا بەسەریدا دەڕژێ، ئەگەر درۆی کردبێ و پیاوەکەی ڕاستگۆ بێ. کە لەو حاڵەتەدا ژن پاکانەکەی دەسەلمێنێ و قورتار دەبێ. ئایا ئەوە بەرامبەر بە چوار شایەت نییە؟

﴿والذين يرمون أزواجهم ولم يكن لهم شهداء إلا أنفسهم فشهادة أحدهم أربع شهادات بالله إنه لمن الصادقين والخامسه أن لعنت الله عليه إن كان من الكاذبين ويدرأ عنها العذاب أن تشهد أربع شهادات بالله إنه لمن الكاذبين والخامسة أن غضب الله عليها إن كان من الصادقين﴾؛[1] واتە: ئەوانەی کە تۆمەتی زینا دەدەنە پاڵ هاوسەرەکانیان و هیچ شایەتێکیشیان نییە جگە لە خۆیان، شایەتیی ئەو جۆرە کەسانە بەوە دەبێت کە چوار جار سوێند بە خوا بخوات کە بێگومان لە ڕاستگۆیانە و درۆ ناکات. پێنجەم جاریش بڵێت بە ڕاستی نەفرینی خوای لەسەرە ئەگەر بۆختانچی بێت و لە درۆزنان بێ. لە لایەکیتریشەوە سزا لەسەر ژنەکە لا دەبرێت کاتێ کە ئەویش چوار جار سوێند بە خوا بخوات کە مێردەکەی درۆ دەکات و بوختانی بۆ هەڵدەبەستێت. پێنجەم جاریش دەڵێت: غەزەب و نەفرینی خوای لەسەرە ئەگەر مێردەکەی ڕاست بکات.

لە حەدیسی پێغەمبەریش ــ د.خ ــ هاتووە: ﴿البينة على المدعي، و اليمين على المدعى عليه﴾؛[2] واتە: لەسەر ئەو کەسەی ئیددیعای شتێك دەکات بەرامبەر بە کەسێك، پێویستە بەڵگەی ڕوونی

1 . (النور: 6 - 9).

2 . (رواه البخاري و الترمذي و إبن ماجه).

هەبێت. ئەوەی ئیددیعا لە دژی دەکرێت بۆ پاکانەبوون سوێندی دەخوات. (البینة: بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا) لە شەرعی ئیسلامدا بریتییە لە شایەتیدان کە لە هەندێ شوێندا (وەکو زینا) پێویستە چوار شایەتی هەبێ تا ببێتە بەڵگەی حاشاهەڵنەگر. بەڵام ئەگەر سێ شایەتی هەبێت ئەوا نابێتە بەڵگە و دەبێتە "البینة المفلس"*. هەندێ جاریش دوو شایەت دەبێتە بەڵگەی پێویست، کە ئەگەر یەك شایەت بێ، ژن یان پیاو، ئەوەش نابێتە بەڵگە، بەڵکو بە "نکول"** دەژمێردرێت.[1]

کەواتە لە شهادە (شایەتیدان) ژن و پیاو وەکو یەکن؛ چ وەکو ئەرك بێ (شایەتیدانی ڕووداوێك کە تایبەت نەبێت بە خۆیەوە و، تەنها ئەو ڕووداوەی بینیووە وەکو شایەتێك) کە پێویستە بۆ ڕوونکردنەوە لە دادگا ئامادە بێ و بێ ترس و درۆ و گۆڕانکاری (کە قورئان بە شهادة الزور ناو دەبات)، شایەتی بدات. هەروەها چ وەکو ماف، کە تایبەتە بە خۆی و بۆی هەیە بە بەڵگەهێناوە (بینة) بگاتە مافی خۆی، یاخود وەکو سوێندخواردن (یمین) تۆمەتەکە لەسەر خۆی پاك بکاتەوە.

تەنانەت لە هەندێ هەڵوێستدا تەنها شایەتیی ژن وەردەگیرێ نەك هی پیاو؛ وەکو: ڕووداوێك کە لە حەمام دەقەومێ، شایەتی شیردان (رضاع)، پەردەی کچێنی (بکارة)، بێوەکەوتن، سوڕی مانگانە (حیض)، مامایی بۆ زاياندن یان لەبارچوونی منداڵ (قابلة)، تەنانەت ئەگەر ژنە شایەتیدەرەکە یەهوودی و مەسیحیش بێ، شایەتییەکەی بە تەنهایی وەردەگیرێت.[2]

بەڵام لە حاڵەتی (إستشهاد: بەشایەتیگرتن) کە شایەتییەکی ئیختیارییە، ئەگەر ژن بیەوێ دەبێتە شایەد و ئەگەر نەیەوێ کەس ناچاری ناکات؛ چونکە بابەتێك نییە کە پەیوەندی بە دادگا و دادوەرەوە هەبێت. لە ئایەتی دەین (قەرز)دا، باسی ئیستشهاد دەکات نەك شەهادە:

﴿یا أیها الذین آمنوا إذا تداینتم بدین إلی أجل مسمی فاکتبوه ولیکتب بینکم کاتب بالعدل ولا یأب کاتب أن یکتب کما علمه الله فلیکتب ولیملل الذی علیه الحق ولیتق الله ربه ولا یبخس منه شیئا فإن کان الذی علیه الحق سفیها أو ضعیفا أو لا یستطیع أن یمل هو فلیملل ولیه بالعدل واستشهدوا شهیدین من رجالکم فإن لم

* واتە ئەو بەڵگەی کە پووچەڵ دەکرێتەوە. لێرەیە کە حوکمی "قذف" لەسەر هەر سێ کەسەکە جێبەجێ دەکرێت، کە هەر یەکێکیان (80) قامچیی لێ دەدرێت؛ تەنانەت ئەگەر چوار شایەتیش هەبێ، بەڵام ئەگەر هەر یەکێکیان بە شێوەیەکی جیاواز ئیفادەی دا، بۆ نموونە: زانیاریی لەبارەی ڕووداوەکە، یان شوێن یان حاڵەتەکەی بە شێوەیەکی جیاواز و ناکۆك لەگەڵ ئەوانی دیکە بگێڕێتەوە، هەر چوار شەیاتیش، ئەگەرچی لە ڕووی ژمارەشەوە تەواون، بەڵام حوکمی قذف لەسەر ئەوانیش جێبەجێ دەکرێت و شایەتییەکەیان پووچەڵ دەکرێتەوە و لێیان دەدرێ، تاکو فێر بن چیتر کەسێك تۆمەتبار نەکەن!

** نکول واتە ڕێگری لە سوێندخوارن.

1 . إبن القیم الجوزي (1977): **"الطرق الحکمیة فی السیاسة الشرعیة"**: القاهرة: ص 34.

2 . المصدر السابق؛ صص 115- 117. هەروەها: یوسف القرضاوي؛ همان منبع: ص 24.

یكونا رجلین فرجل وامرأتان ممن ترضون من الشهداء أن تضل إحداهما فتذكر إحداهما الأخرى ولا يأب الشهداء إذا ما دعوا...﴾.[1] واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ئەگەر قەرزێکتان کرد لە یەکتر تا ماوەیەکی دیاریکراو، ئەوە بینووسن و با نووسەرێك کە دادپەروەر بێت بە ڕاستی و دروستی لە نێوانتاندا بینووسێت، با هیچ نووسەرێك سەرپێچی نەکات لە نووسین، هەروەك خوا فێری کردووە (کە نابێ فێڵ و چەواشەکاری بکات) بنووسێت. خۆ ئەگەر کەسەکە خوێندەوار نەبوو، ئەوەی هەقەکەی بەسەرەوەیە و قەرزەکەی لایە با بە دەمی خۆی ئەندازەی قەرزەکە بە کاتبەکە بڵێت و لە خوای پەروەردگاریش بترسێت و هیچی لێ نەقرتێنێت و لێی کەم نەکاتەوە. خۆ ئەگەر ئەوەی قەرزەکە لەسەرە عەقڵسووك یان لاواز بوو (وەکو منداڵ یان بەساڵاچوو) یان نەیدەتوانی دان بە هەقەکەدا بنێت (کەڕولاڵ بوو) با بەخێوکەر، یان سەمیان و سەرپەرشتیارەکەی دادگەرانە هەقیقەت و ڕاستیی قەرزەکەی بڵێت و با دوو پیاو لە خۆتان بکەنە شایەت لەسەر قەرز و مامەڵەی، ئەگەر دوو پیاوتان دەست نەکەوت بۆ شایەتی، با پیاوێك و دوو ژن شایەتییەکە بدەن لەو کەسانە کە ڕازین بە شایەتیدانیان، نەوەکو یەکێك لەو ژنانە گومڕا بوو (واتە لە بیری بچێت یان لێی تێکەڵ ببێ، یان لە لایەن یەکێك لە لایەنەکان لێی تێك بدرێ) با ئەویتریان بیری بهێنێتەوە و شایەتەکان کاتێك داوا کران، نابێت خۆ وێڵ بکەن و ئامادە نەبن...!

هەروەك بینیمان خوا بە باوەڕداران ئەمر دەکات هەر کاتێك قەرزێك بدرێتە کەسێك بۆ ماوەیەکی کاتیش بێ، بۆ ئەوەی خاوەن قەرزەکە هەقەکەی نەفەوتێ، یان ئەوەی قەرزی لەسەرە تووشی تۆمەت و ئیدیعایەکی ناڕاست و ناڕەوا نەبێ لە لایەن خاوەن قەرزەکەوە، با لە نێوان خۆیاندا بنووسنەوە و دوو شایەتی پیاویش بگرن و هیچ خاڵێکی بچووك و گەورە لەبیر نەکرێت و ئاماژەیان پێبکرێ لە نووسینەکەدا. ئینجا دەڵێ: ئەگەر هات و دوو پیاوتان بەدەست نەکەوت، پیاوێك لەگەڵ دوو ژن بە شایەتی بگرن، ئەوانەی کە بەدڵتانە و پەسەندیان دەکەن... گەورە زانایان و فەقیهەکانی ئیسلامی وەك: ئیبن تەیمییە، ئیبن ئەلقەییم، محەممەد عەبدە، مەحموود شەلتووت (سەرۆکی پێشووی زانکۆی ئەلئەزهەری میسر)، یوسف ئەلقەرزاوی، د. عەلی جومعە محەممەد (موفتیی میسر)، لەسەر ئەم ڕایەن کە ئەمە ئەمرێکی پەند و ئامۆژگاری و ڕینماییکردنە (الأمر الإسترشادي) و فێری خاوەن قەرزەکان دەکات کە لە کاتی قەرزدان لە بەینی خۆتاندا بنووسن و... ئەوە بە هیچ شێوەیەك پەیوەندی بە گەواهی و شایەتیدانی ژنان و

---

1 . (البقرة: 282).

پیاوانەوە نییە؛ واتە ئەم هەڵوێستە ڕێسا و یاسایەکی شەرعی و گشتگیر نییە کە لە هەموو کایەکانی دادەوەری، ئابووری، سیاسی، ئەمنی، خێزانی، کۆمەڵایەتی جێبەجێ بکرێت، بەڵکو تەنها تایبەتە بە بواری قەرزەوە، کە مامەڵەیەکە نێوان دوو کەس و ژنانیش ئەگەر بیانەوێ دەتوانن ببنە شایەد، ئەگەر نا، کەس ناتوانێ ناچاریان بکات.

بەڵام هۆکاری بەشایەتیگرتنی دوو ژن لەبری یەك پیاو لەم ئایەتەدا، إبن‌تیمیة دەگەڕێنێتەوە بۆ دۆخی ئەو کاتەی کە سروشتی ئەو سەردەمە ئەوەی نەخواستووە کە ژنان لەو جۆرە کۆبوونەوانەدا ئامادە بن.[1] هەروەها ژمارەی ژنانی خوێندەوار کەمتر بووە لە پیاوان. جگە لەوەش ژنان لە ڕووی ئابوورییەوە هیچ ئەرك و بەرپرسیارییەتییەکیان نەبووە کە لەو بوارانەدا بە ئەزموون بن. لە لایەکی‌ترەوە لەوانەیە هەردوو لایەنی خاوەن قەرز و قەرزدارەکە، بەهۆی گوشارهێنان و هەڕەشە یان هەڵخەلەتاندنەوە، یەکێك لەو ژنانە بەلاڕێدا ببەن و گومڕای بکەن و ناوەڕۆکی گرێبەستەکە یان بڕی قەرزەکە لە بیری ببەنەوە، یان بگاتە ئەو ڕادەیەی کە ئامادە نەبێ ڕاستییەکەی بڵێت! بۆیە دەفەرموێ: (أن تضل إحداهما فتذكر إحداهما الأخرى: ئەگەر یەکێك گومڕا بوو، با ئەوی‌تر بە بیری بهێنێتەوە!). ئێستاکە لەبەر هەبوونی نووسینگەی تایبەت و دادنووسەکان، ئەم کێشەیەش چارەسەر کراوە و هەروەك إبن‌تیمیة دەڵێ: "تەنانەت لە ئیشهاد (بەشایەتیگرتن)یشدا ژن وەکو پیاو بە یەکسانی شایەتییەکانی وەردەگیرێ و چیتر پێویست بە دوو شایەت ناکات!".[2]

زۆر ئایەتی قورئان هەن کە بە ڕاشکاوی فەرمان بەوە دەکەن، کەوا پێویستە ژن وەکو پیاو لە کۆمەڵگا و هەموو دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکاندا ئامادە بێت و شانبەشانی پیاوان ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بکات؛[3] چونکە ئەوەی بۆ پیاو هەیە بۆ ژنیش هەیە.[4] خوا، کە پەسنی ئوممەتی میانەڕەوی ئیسلامی دەکات (کە لە ژن و پیاو پێك هاتووە) بەوەی کە شایەتی لەسەر خەڵك

---

1 . عمارة، د. محمد (2002)؛ **"التحرير الإسلامي للمرأة"**: القاهرة: دارالشروق؛ ص 79.

2 . المصدر السابق؛ نفس الصفحة.

3 . ﴿والمؤمنون والمؤمنات بعضهم أولياء بعض يأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر ويقيمون الصلاة ويؤتون الزكاة ويطيعون الله ورسوله أولئك سيرحمهم الله إن الله عزيز حكيم﴾؛ (التوبة: 71) واتە: پیاوانی باوەڕدار و ژنانی باوەڕدار یارمەتیدەر و پاڵپشت و خۆشەویستی یەکترن، کە ئەمر بە چاکە دەکەن و نەهی لە خراپە دەکەن و نوێژ دەکەن و زکات دەدەن و گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن. ئەوانەن کە خوا ڕەحمیان پێدەکات.

4 . ﴿ولهن مثل الذي عليهن بالمعروف﴾؛ (البقرة: 228) واتە: ژنان مافیان هەیە بەسەر پیاوانەوە وەکو هەمان مافانەی کە بۆ پیاوانە لەسەر ژنان بە گوێرەی باو و نەریتێك کە باوە.

دەدەن و پێغەمبەریش ــ د.خ ــ شایەتی لەسەر ئەوان دەدات،[1] چۆن شایەتیی ئەوان وەك پیاوان قبووڵ ناکات؟ چۆن شایەتیی ژن لە شایەتماندا کە شایەتی دەدات خوا تاقانەیە و محەممەدیش ــ د.خ ــ نێردراوی ئەوە، قبووڵ دەکرێت، بەڵام شایەتییەکەی لەسەر خەڵکیتر قبووڵ ناکرێت؟

سەرەڕای هەموو ئەوانە، گریمان ئیسلام شایەتیی ژنی بە نیوەی پیاو داناوە، ئەوە چ پەیوەندییەکی بە کۆت و بەندی ژنەوە هەیە؟! بۆ نموونە ئەگەر وەکو گریمانەیەك، بگرین یەك ژن بۆی نەبێ بچێتە دادگا مەگەر ببنە دوو، یان دەبێ دوو ژن لە ژێر گرێبەستی نێوان قەرزدار و خاوەن قەرزەکە ئیمزا بکەن، ئەوە چ پەیوەندییەکی بە خۆسووتاندنی ژنی کوردەوە هەیە؟! ئەوە چ پەیوەندییەك بەوەوە هەیە کە کچ بچێتە نانکرین یان کوڕ؟! پێم وایە ژن، هەروەها پیاو، دەبێ لە خوا بپاڕێنەوە کە هەرگیز پێویستییان بە دادگا و شایەتی و سوێندخواردن و ئەم بابەتانە نەبێ؛ چونکە هەموو ئەوانە بارگرانی و ئەرکن، زیاتر لەوەی ماف و ئازادی و بەشداریی کۆمەڵایەتی بن!

5) **سەبارەت بە خوێنبایی**: ڕاستە کە هەندێ بۆچوون لە لایەن هەندێ زانایانی پێشوو هەیە، ئاماژە بەوە دەکات کە دیە (خوێنبایی)ی ژن نیوەی پیاوە، کە ئەوانیش پشتیان بەستووە بە حەدیسێك کە زۆر لە زانا بەناوبانگەکان گومانی جددییان هەیە لەسەر ڕاست و دروستیی فەرموودەکە. کەسانێکی وەك شێخ (مەحموود شەلتووت) و (یووسف قەرزاوی) لەگەڵ هەندێ زانایانی پێشووی وەك (ئیبن عولیە) پێیان وایە کە خوێنبایی ژن وەکو پیاوە بەبێ جیاوازی، نە کەم نە زۆر و ئاماژەشیان بەو ئایەتە کردووە کە هیچ مەرجێکی بۆ ژنبوون و یان پیاوبوونی نەهێناوە و هەردووکیانی وەکو یەك ژماردووە:

﴿ومن قتل مؤمنا خطأ فتحرير رقبة مؤمنة و دية مسلمة إلى أهله﴾؛[2] واتە: هەر کەسێك بە هەڵە ئیماندارێك بکوژێت (پیاو یان ژن) ئەوە دەبێت بەندەیەکی ئیماندار ئازاد بکات و خوێنباییەکەی بدات بە کەسوکاری (ئەگەر لێی خۆش نەبوون).

1 . ﴿وكذلك جعلناكم أمة وسطا لتكونوا شهداء على الناس ويكون الرسول عليكم شهيدا﴾؛ (البقرة: 143) واتە: بەو شێوەیەش ئێوەمان بە ئۆمەتێك (نەتەوەیەك)ی میانەڕەو گێڕاوە، تا ببنە شایەت بەسەر خەڵکەوە و بۆ ئەوەی پێغەمبەریش (لە ڕۆژی قیامەت) ببێتە شایەت بەسەرتانەوە.

2 . (النساء: 92).

با ئەمجارەش وای دابنێین کە خوێنبایی ژن نیوەی پیاوە، ئایا ژنی کورد کە خۆی دەسووتێنێ، یان توندوتیژی دژی دەکرێ، پەیوەندیی بە خوێنباییەوە هەیە؟ ئایا پیاوە کوردەکان کێشە بۆ ژنە کوردەکان دەنێنەوە لەبەر ئەوەیە خوێنباییەکەیان نیوەی ئەوانە؟ ئەی ئەو هەموو کوشتن و خۆکوژییە لە وڵاتانی ئەوروپا لەبەر چییە؟ ئایا لەوێش بڕوایان بە نیوەبوونی خوێنبایی ژنان هەیە؟

6) سەبارەت بە تەڵاق و مارەیی: ڕاستە کە زۆربەی زانایانی ئیسلام پێیان وایە هەروەك چۆن ژن مافی "نەفەقە"، مافی "مارەیی"ش بەدەستە، کە بڕی چەند بێ و کەی بدرێتێ و چۆنی بدرێتێ، "تەڵاق"یش دراوەتە دەست پیاو، بۆ ئەوەی هاوسەنگییەك هەبێت لە نێوان مافەکان و مەترسییەکان و هەڕەشەکان؛ واتە هەر یەك چەکی خۆی هەیە کە لەکاتێ پێویست بەکاری دەهێنێ؛ چونکە ئەگەر مارەیی لەدەست ژن بێ کە مافی ئەوە تەنانەت وەك قورئان دەفەرمێ بۆی هەیە داوای (قنطار: زێڕ و سامانێکی زۆر) بکات،[1] تەڵاقیشی هەر لەدەست بێ، کێ گەرەنتی دەکات لەکاتێ بچووکترین دەمەقاڵێ لەگەڵ مێردەکەی، هەم مێردی خۆی تەڵاق نەدات و هەمیش داوای ئەو بڕە مارەییە نەکات کە خۆی دیاریی کردووە و ئینجا شوو بە کەسێکی دی بکات و هەمان بەزم بەویش نەکات و کار و پیشەی ئەو ژنە ببێتە مێردکردنەوە! ئایا ئەوە نابێتە بازرگانیکردن بە پیاوەوە؟ ئەم هاوسەنگی و دادپەروەرییە لە نێوان ژن و پیاو، بووەتە هۆی ئەوەی کە کەسانێکی وەك "ڤۆلتێر" لە کتێبێکی خۆی بە ناوی "بەرگری لە خاڵە گیانم"دا بڵێ:

"هەرگیز یاسایەك کامڵتر و تەواوتر لە یاساکانی قورئان لەبارەی تەڵاق دانەنراوە!"[2]

یان "لویس سیدیۆ"* ـ ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی ـ دەنووسێ:

---

1. مێژوو دەگێڕێتەوە کە جارێك عومەری کوڕی خەتتاب ـ ر.خ ـ کە خەلیفەی موسڵمانان بوو، خەریکی خوتبەدانی جومعە بوو و لە وتارەکەیدا، ئامۆژگاریی ژنانی دەکرد و دەیگوت: هەوڵ بدەن بڕی مارەیی زۆر بەرز مەکەنەوە تاکو کوڕە گەنجەکان بتوانن بە ئاسانی ژن بهێنن! کە لەو کاتەدا دەڵێن: پیرەژنێکی ئەنساری، هەستایەوە و قسەکانی خەلیفە و سەرۆکی موسڵمانانی بڕی و وتی: ئەی سەرداری باوەڕداران! تۆ چ حەقەکت هەیە کە ئەو مافەی خوا بە ئێمەی ژنان داوە، لێمان زەوت بکەیتەوە؟! ئەی خوا نافەرمێت: ﴿وإن أردتم استبدال زوج مكان زوج وآتيتم إحداهن قنطارا فلا تأخذوا منه شيئا أتأخذونه بهتانا وإثما مبينا﴾؛ (النساء: 20) واتە: ئەگەر بڕی مارەییەکەی زێڕ و سامانێکی زۆریشتان پێدابوو، ئەوە نابێت هیچ شتێکی لێ بگێڕنەوە و لێی کەم بکەنەوە. ئایا ئەو مارەییەی کە پێتان داوە، لێی وەردەگرنەوە بە دروستکردنی بوختانێکی ناڕەوا و گوناه و ستەمێکی ئاشکرا؟! کە لەو کاتە عومەر ـ ر.خ ـ وتی: ئەو پیرەژنە ڕاستی کرد، عومەر هەڵەی کرد! (نموونەی بەشداریی ژنان تا ئەو ڕادەیەی کە سەرۆکی کۆمەڵگای موسڵمانانی ئەو سەردەمە بخەنە ژێر پرسیارەوە، لە مێژووی ئیسلامدا زۆرن؛ بڕوانە:

أحمديان، ملا عبدالله (1997)؛ "**سيماى خليفه دوم عمربن خطاب**"؛ سقز: مؤسسه انتشارات سقز؛ چاپ 3؛ صص 585 - 586.

2 . Voltair; op.cit,. vol 26. P. 375.

"ئەگەر ئیسلام تەڵاقی نەداوەتە دەست ژنان، بۆ ئەوەیە کە ڕێژەی تەڵاق بەرز نەبێتەوە. ژن دەتوانێت داوای تەڵاق بکات، کە پیاوەکەی بە خراپی مامەڵەی لەگەڵدا بکات، بەڵام ئەگەر تەڵاق بە دەست پیاوە، مانای ئەوە نییە کە پیاو هەرکات ویستی دەتوانێ ژنی خۆی تەڵاق بدات، بەڵکو ئەوەش مەرجی خۆی هەیە و پێویستە بە سێ قۆناغ بکرێت. ئەو ژنەش کە سێ جار لە لایەن پیاوەکەیەوە تەڵاق درا، بۆ پیاوەکەی حەڵاڵ نابێتەوە تاکو مێرد بە پیاوێکی دیکە نەکاتەوە و لەویش تەڵاق وەربگرێ، ئینجا مێرد بە پیاوی یەکەم بکاتەوە. ئەمە هەموو نیشانەی حیکمەتی گەورەن تاکو ڕێژەی تەڵاق کەم بێتەوە."[1]

"گۆستاڤ لۆبۆن"یش دەڵێ:

"ئیسلام ئەگەر تەڵاقی داوەتە دەست پیاو، بەوەش مەرجی داناوە کە: للمطلقات متاع بالمعروف."[2]

"مارسێل بۆواسار"یش لە کتێبی "مرۆڤگەرایی ئیسلام"دا دەنووسێ:

"لەبارەی تەڵاقیش ئەگەر بە جوانی سەیری بکەین، ئیسلام بۆ ژن و پیاو ـ هەردووکیان ـ مافێکی داوەنەتێ کە ژیانیان گەرەنتی دەکات. هاوسەرێتی لە ئیسلامدا لە هەقیقەتدا جۆرێ گرێبەستێکە کە ژن و پیاو ئیمزای دەکەن. ئەم گرێبەستە لە هەندێ کاتدا لە لایەن یەکێکیان، کاری پێناکرێت و پێشێل دەکرێت، کە لەو حاڵەتەدا لە ڕووی یاسایی و شەرعییەوە ئیعتیبارەکەی لە دەست دەدات و کاریگەرییەکەی نامێنێتەوە. قورئان لەو کاتەی کە گرێبەستی هاوسەرگیری دەگاتە ئەو حاڵەتە شپرزەییەوە و درێژەپێدانی ژیانی هاوبەش سەخت دەبێت، بابەتی تەڵاق دەهێنێتە پێش؛ ئەویش بە مەرج و دۆخێکی دادگەرانە و لە چەند قۆناغێکی جیاجیادا. لە تەڵاقی ئیسلامیدا، سازش و یەکبوونەوە و گەڕانەوە بۆ ژیانی هاوسەرایەتی پێشبینی کراوە. لە هەندێ بارودۆخی تایبەتیشدا، مافی تەڵاقی داوەتە ژنیش و، جگە لەوەش پیاو هەرگز ناتوانێ بە دڵی خۆی و بەبێ بەڵگە هاوسەرەکەی تەڵاق بدات. لە تەڵاقی شەرعیدا، پیاو پێویستە جگە لە بڕی مارەیی، هەموو ئەو زەرەر و زیانانەی کە هاوسەرەکەی داوا دەکات، بە تەواوەتی بداتێ تاکو ڕازیی دەکات. قورئان سوورەتێکی تایبەت بە ناوی "الطلاق"ی هەیە و بە وردی باسی هەموو ڕەهەندەکانی کردووە... هەورەها لە سوورەتەکانی دیکەش بە وردبینییەکی تەواوەوە شی دەکاتەوە... سەرەڕای هەموو ئەوانە، ئایینی ئیسلام تەڵاقی بە نەشتەرگەرییەك شوبهاندووە، کە پێویستە هەندێ جار سەر جەستەی کۆمەڵگادا ئەنجام بدرێت... ڕێنمایی

* Louis Sedillot (1876-1808).

1 . سيديو، لويس. أ (2009): "تاريخ العرب العام: إمبراطوريه العرب، حضارتهم، مدارسهم الفلسفية و العلمية و الأدبية": ترجمه: عادل زعيتر؛ القاهرة: دار العالم العربي؛ ص ١١١.

2 . Le Bon, op.cit., p. 401.

زۆر سەختیشی بۆ داناوە، تاکو ژنە تەڵاقدراوەکان لەپێناو بژێوی ژیانیان تووشی لادان و گەندەڵی نەبن و کۆمەڵگاشی گەندەڵ نەکەن."[1]

"ڕۆژە گارۆدی"یش لە کتێبی "بەسەرهاتی سەدەی بیستەم"دا دەڵێ:

"ئەی لە سەردەمی خودی پێغەمبەری ئیسلام نەبوو کە مافی تەڵاق دراوەتە ژن؟ ئەی یەکێك لە هاوسەرانی پێغەمبەر بە ناوی "أمية بنت الجون" داوای تەڵاقی لە پێغەمبەر نەکرد و ئەویش قبووڵی نەکرد؟ بەڵێ داواکەی قبووڵ دەکات و نەفەقەشی دەداتێ (لە بوخاری وەرگیراوە)، کەچی ژنی ڕۆژئاوایی تەنها لە سەدەی بیستەمدا توانیی ببێتە خاوەن مافی تەڵاق و مافی موڵکایەتی."[2]

"بڕی مارەیی" کە قورئان بە وشەی "نحلة: دیارییەکی ئارەزووومەندانە" ناوی دەبات، خۆیلەخۆیدا نیشانە و بەڵگەی ئارەزووومەندی و ڕەزامەندیی ژنە لە شووکردنەکەی، کە بۆی هەیە هەرچەند بخوازێ، دیاریی بکات. جگە لە مافی مارەیی، شەرعی ئیسلام لە چەند حاڵەتێکدا مافی تەڵاقیش دەداتە ژن: 1) زۆربەی زانایان بە تایبەتی ئەبوحەنیفە ـ ر.خ ـ پێیان وایە کە ژن بۆی هەیە لەکاتی مارەکردندا "مەرج" (شرط)ی تەڵاقیش دابنێ، کە لە دەست ئەودا بێت. ئەو کاتە بۆی هەیە هەر کات ویستی پیاوی خۆی تەڵاق بدات و مارەییەکەیشی لێ وەربگرێ. 2) ئەگەر لە لایەن مێردەکەیەوە دووچاری زەرەر و زیان ببێ، یان مافی پێشێل بکرێ، یان نەفەقەی پێ نەدات و توانای بەخێوکردن و دابینکردنی بژێوی هاوسەر و منداڵانی نەبێت، یان لێی بدات، یان نەزۆك بێ، یان سەرجێیکردنی پێ نەکرێت، یان نەخۆشییەکی درێژخایەنی هەبێ، یان بە ماددەیەکی هۆشبەر وەك مەی و تریاك و تەنانەت جگەرە ئالوودە بێ، یان مارەی کردبێ و نەیگوازێتەوە، بۆی هەیە کە لە مێردەکەی جیا بێتەوە و تەڵاق وەربگرێ، کە لە شەرعی ئیسلامدا بە تەڵاقی خولع (داماڵین) ناسراوە.[3] تەنانەت بۆ قازی و دادگاش هەیە کە لە زۆر حاڵەتدا ژن و مێرد بە تەڵاق لێك جیا بکاتەوە، ئەگەر بزانێ مانەوەیان پێکەوە لە زیانی ژنەکەدایە، با پیاوەکەش بەو تەڵاقە ڕازی نەبێت.[4]

سەبارەت بە مافی مارەبڕینی کچ بەبێ مۆڵەتی سەمیان (وەلیئەمر)، دیسان زانایان هەر یەك بە پشتبەستن بە کۆمەڵێك بەڵگەی بەهێز، ڕای جیاواز و تەنانەت دژ بە یەکتریشیان هەیە؛ بۆ

1 . Boisard, op.cit., 139-140.

2 . Garaudy, Roger (1985), "**Biographie du XXe siècle: Le testament philosophique de Roger Garaudy**", Paris: Tougui, p. 294.

3 . طعيمة، د. صابر (2005)؛ "**ما يقال حول المرأة بين الإفراط و التفريط**"؛ بيروت: دار الجيل؛ ص284.

4 . عبدالواحد، مصطفى (1971)؛ "**الأسرة فى الإسلام**"؛ بيروت: دار المعرفة؛ صص 105 - 107.

نموونە: ئەبوحەنیفە ــ ر.خ ــ پێی وایە کە کچ (یان بێوەژن) بەو مەرجەی کە پێگەیشتوو و فامدار بێ، واتە باڵغ و ئاقڵ بێ (کەم تەمەن و شێت نەبێ و ئەقڵی پێ بشکێت)، هەروەها کوڕ یان ئەو مێردەی کە داوای کردووە، هاوشان و هاوئاستی ئەو بێ و لە پایەیدا بێت، بۆی هەیە بە بێمۆڵەت و ڕەزامەندیی باوك یان وەلیی ئەمری خۆی شوو بەو کوڕە یان ئەو مێردە بکات.[1] جگە لە زۆر لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ــ د.خ ــ گەورەترین بەڵگەیان ئەم ئایەتە قورئانییەیە کە دەفەرمێت: ﴿فلا تعضلوهن أن ينكحن أزواجهن إذا تراضوا بينهم بالمعروف﴾؛[2] واتە: ئێوە (کەسوکاری ژن) مەبنە کۆسپ لە ڕێگەیاندا ئەگەر ویستیان شوو بکەن، هەر کات لە نێوان خۆیاندا ڕەزامەندییان نواند بە شێوەیەکی جوان وەکو عورف. ئەم فەرمان و ئامۆژگارییە بۆ ئەو کەسانەتانە، کە ئیمانی بە خوا و ڕۆژی قیامەت هەبێت. هەروەها "ئیمامی شافیعی" و "ئیمامی مالیك"یش ــ ر.خ ــ دەڵێن: بێوەژن (بەبێ ڕەچاوکردنی تەمەنی) بۆی هەیە کە بەبێ مۆڵەتی وەلیی ئەمرەکەی شوو بکات.[3] سەرباری هەموو ئەوانەش، با بڵێین: ژن (کچ یان بێوەژن) بۆی نییە کە بەبێ بڕیار و ڕەزامەندیی باوك یان وەلیی‌ئەمری خۆی شوو بە کەسێك بکات، خۆ ئیسلام (بە هەموو مەزهەبەکانیەوە) ڕێگرە لەو بەشوودانەی کە بە حەز و ویست و ئارەزووی کچ یان بێوەژنەکە نەبێ،[4] تەنانەت ئەگەر مارەش کرابێ، هەورەك لە زۆرێك لە حەدیسەکاندا هاتووە، مارەییەکەی دروست نییە و ژنومێردایەتییەکە هەڵدەوەشێتەوە.[5] "هێنری دی کاستری" دەڵێ:

"هەڵەیەکی گەورە و وتەیەکی زێدەڕەوییانەیە کە دەڵێن: مارەیی لای موسڵمانان بریتییە لەو گرێبەستەی کە ژن دەکاتە پاشکۆ و پەیڕەو و موڵکی پیاو؛ چونکە هەرکەس شارەزای ئیسلام بێت، دەزانێت کە ژن مافی هەڵبژاردنی شووی خۆی هەیە و مافی زانستی و ڕۆشنبیری و ماددیی پێ دەدرێ و پلەوپایەی لە فۆرمی کۆمەڵایەتیدا بەرز دەکاتەوە."[6]

---

1 . إبن عابدين (1992)؛ "حاشية رد المحتار على الدر المختار: شرح تنوير الأبصار"؛ المجلد 3؛ بيروت: دارالفكر؛ ص 55.

2 . (البقرة: 232).

3 . بڕوانە: الدردير، أحمد (2002)؛ "الشرح الصغير على أقرب المسالك إلى مذهب الإمام مالك"؛ المجلد 2؛ بيروت: دار الكتب العلمية؛ ص 232. أيضا: الشربيني، الخطيب (1997)؛ "مغني المحتاج إلى معرفة معاني ألفاظ المنهاج (مذهب الإمام الشافعي)"؛ المجلد 3؛ بيروت: دار المعرفة؛ ص 212.

4 . بيرقدار، تحسين (2007)؛ "الأنكحة المنهي عنها في الشريعه الإسلامية"؛ دمشق: دار إبن حجر؛ ص 86.

5 . بڕوانە: يوسف القرضاوي؛ هەمان منبع؛ ص 73-87. هەروەها: البوطي؛ المصدر نفسه؛ صص 52-53.

6 . De Castries, op.cit., p.57.

پرسیار ئەوەیە: ئایا چەواشەکاری نییە کە تەنها ڕاوبۆچوونی خۆیان، یان هەندێ لە زانایان بهێننەوە و ئەوانیتر باس نەکرێن، ئینجا ئەو حوکمەیان بگشتێنن و بڵێن: شەرعی ئیسلام دژی ژنە؟!

7) سەبارەت بە لێدان لە ژن: دوو ڕای جیاواز هەیە: هەندێ تەفسیر و لێکدانەوە هەن، کە زۆرینەن، پێیان وایە کە مەبەست لە وشەی (واضربوهن) لەو ئایەتەی کە بە ئایەتی نشوز بەناوبانگە، "لێدان"ی ژنی سەرپێچیکەرە و، پیاو بۆی هەیە تەنها کاتێك کە ژنەکەی یاخی بوو بە قۆناغەکانی پێشتر کە ئامۆژگاری (موعظة) و پشتتێکردنی سەرجێگایە (واهجروهن فی المضاجع) کارساز نەبوو، لێی بدات، ئەویش نە لێدانێکی سەخت، کە بریندازی بکات، بەڵکو هەروەك لە فەرموودەکاندا هاتووە، لێدانێکی ڕەمزی وەك لێدان بە سیواك! ئایەتەکە دەفەرمێ: ﴿واللاتی تخافون نشوزهن فعظوهن واهجروهن فی المضاجع واضربوهن﴾،[1] بەڵام ئەوانەی ئەم بۆچوونەیان هەڵبژاردووە لێدانی ژن بەبێ هیچ پاساوێك، هەروەها بەبێ برینی هەنگاوەکانی پێشوو بە حەرام دەزانن و دەشڵێن: ئەو لێدانە تەنها ڕێپێدانێکە بۆ کاتی ناچاری، نەك بە ئەمر و واجب، یان سوننەت و موستەحەبیان دانابێت.[2] هەروەها دەڵێن: سەرەڕای ڕێپێدانی شەرع بە لێدانی ژنانی سەرپێچیکەر، پێغەمبەری ئیسلام ـ د.خ ـ لە هەموو تەمەنی خۆی بەر لە پێغەمبەرایەتی و دواتریش تەنانەت بۆ جارێکیش لە هاوسەرێکی خۆی نەداوە؛ هەروەك عایشە ـ ر.خ ـ دەگێڕێتەوە: ﴿ماضرب رسول الله ـ صلى الله علیه و سلم ـ قط بیده و لا إمرأة و لا خادما﴾؛[3] واتە: پێغەمبەر ـ د.خ ـ هەرگیز دەستی بەرز نەکردووەتەوە، نە لە ژنێك و نە لە خزمەتکارێك؛ بۆیە "ئیمامی نەوەوی" لە شەرحی ئەم حەدیسەدا دەڵێ:

"مەبەستی لێدانی هاوسەر و خزمەتچی و ئاژەڵە، کە سەرەڕای موباحبوون و ڕێگەپێدان بۆ تەمێکردن، بەڵام تەرك و وازهێنان لێی باشتر و جوانترە."[4]

هەروەها بە ئاشکرا دەفەرمێ: ﴿لا تضربوا إماء الله﴾؛ واتە: لە ژنان مەدەن! لەدوای ئەوەی هەندێ ژن هاتنە لای پێغەمبەر ـ د.خ ـ و سکاڵایان لە مێردەکانیان کرد، کە لێیان داون، فەرمووی: ﴿لیس

---

1 . (النساء: 34).

2 . بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: الزحیلي، د. وهبة (2012)؛ "**الفقه الإسلامي و أدلته**"؛ دمشق: دار الفكر؛ الجزء 9؛ ص6854.

3 . متفق علیه.

4 . شرح مسلم.

أولئك خياركم﴾؛[1] واتە: ئەوانە (کە لە ژنانیان داوە) هیچکامیان ماقووڵ نین! یان لە شوێنێکی دیکەدا هاتووە: ﴿لن يضرب خياركم﴾؛[2] واتە: هەرگیز باشەکەتان لە ژنان نادات! یان دەفەرمێ: ﴿إنما النساء شقائق الرجال، ما أكرمهن إلا كريم، و ما أهانهن إلا لئيم﴾؛[3] واتە: ژنان وەکو پیاوانن (پیاو چۆنە، ژنیش وایە)، کەسێك ڕێزی لێ دەگرێ کە خۆی بەڕێز بێ، هەروەها کەسێك بێڕێزییان پێ دەکات کە خۆی بێڕێز بێ؛ بۆیە هەروەك خۆی لە هاوسەرانی خۆی نەداوە، ئەمر دەکات کە هەموو پەیڕەوی لەو بکەن و وەك ئەو بن: ﴿خيركم خيركم لأهله و أنا خيركم لأهلي﴾؛[4] واتە: باشترین کەستان ئەوەیە کە لە هەمووتان باشترە بۆ هاوسەرەکەی و کەسیش بە قەد من باش نییە بۆ هاوسەرەکەی! یان دەفەرمێ: ﴿أكمل المؤمنين إيمانا أحسنهم خلقا وخياركم خياركم لنسائهم﴾؛[5] واتە: لە هەمووان بەئیمانتر ئەو کەسەیە کە خۆشڕەفتارترینیانە و باشترین کەستان، باشترینتانە لەگەڵ هاوسەرەکانتان. ئیمامی شافیعی ـ ر.خ ـ دەڵێ:

"لن يضرب خياركم، نیشانەی ئەوەیە کە لێدان شتێکی موباحە، تەنها بۆ ئەو کاتەی کە پێویست بکات؛ واتە تەنها لە سەرپێچیکارییەکی گەورە کە ئەمری خوا پێشێل بکات، بەڵام ئەگەر بە ترساندن یان شتێکی هاوشێوە بێ، گونجاوتر و باشترە لە لێدان."[6]

لە حەدیسێکی سەحیحی دیکەدا هاتووە: کەسێك هاتە لای پێغەمبەر ـ د.خ ـ وتی:

"ئەی پێغەمبەری خوا! ژنێکم هەیە زۆر زمانپیس و بێشەرمە و جنێو دەدات! پێغەمبەر ـ د.خ ـ فەرمووی: مادام وایە تەڵاقی بدە! وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! منداڵم لێی هەیە. فەرمووی: جا ڕایگرە و لەگەڵی بسازە و بەردەوام ئامۆژگاریی بکە، ئەگەر دیتت هەر سوودی نەبوو، دوایی تەڵاقی بدە، بەڵام نەکەی لێی بدەی!"[7]

ژنانی سەرپێچیکەریش بریتین لەو ژنانەی کە ئەمری خوا و نەهیەکانی بەجێ ناهێنن و هاوسەنگی لە نێوان ئەرك و مافەکانیان تێك دەدەن و دژی گرێبەستی مارەیی و پەیماننامەی هاوسەرگیری ڕەفتار دەکەن، کە خوا بە "ميثاق غليظ" ناوی دەبات.

---

1 . رواه الحاكم.

2 . رواه الحاكم.

3 . رواه الإمام أحمد.

4 . رواه الترمذي و إبن ماجه.

5 . رواه الترمذي.

6 . فتح الباري.

7 . عن لقيط بن صبرة قال: قلت: يا رسول الله إن لي امرأة في لسانها شيء يعني البذاء، قال : طلقها، قلت: إن لي منها ولدا ولها صحبة، قال: فمرها، يقول: عظها فإن يك فيها خير فستقبل، ولا تضربن ظعينتك . (رواه أبوداود و الإمام أحمد؛ صححه الألباني).

کەواتە: بەپێی ئەم بۆچوونە، لە کاتی پێویست ڕێپێدراوە بە شێوەیەکی ڕەمزی لە ژنی سەرپێچیکەر بدرێت، تەنها بۆ تەمێکردن، بەڵام باشترە لێی نەدرێت و ڕێگای‌تر بگیرێتە بەر؛ هەروەك فەرموودەکانی پێغەمبەر ــ د.خ ــ جەخت لەوە دەکەنەوە، کە خۆی یەکەم شیکەرەوەی قورئانە.

ڕای دووەم سەبارەت بەم ئایەتە بریتیە لە لایەن زۆرێك لە زانایانی دیکە، بەتایبەتی زانایانی بەناوبانگ و خاوەن ڕا و ئیجتیهادی ئەم سەردەمەش،[1] ئەوەیە کە وشەی (ضرب) بە مانای "لێدان" نازانن، بەڵکو بە مانای "جێهێشتنی ماڵ" و "مانگرتن" دەزانن؛ هەروەك دەوترێ: مانگرتن (إضراب)ی کرێکاران.

ئەوان دەڵێن: وشەی (ضرب) وشەیەکی فرەواتایە و مانای جیاوازی هەیە، کە لە شوێنەجیاجیاکانی قورئاندا (لە 17 ئایەتدا) بە چەندین مانای جیاواز هاتووە؛ بۆ نموونە خوا دەفەرمێت: (ضرب الله مثلا[2]: خوا نموونەیەکی دەهێنێتەوە...)؛ لێرە بە واتای نەخش و چاپدان هاتووە، هەروەك دەڵێن: ضرب المثل، ضرب الدراهم. (و إذا ضربتم فی الأرض[3]: کاتێك کە لێتاندا لەسەر ئەرد)؛ لێرە بە واتای سەفەر و جێهێشتن هاتووە. (فضربنا علی آذانهم[4]: پەردەمان هێنا بەسەر گوێیاندا)؛ لێرە بۆ ڕێگریکردن و نەهێشتن بەکار هاتووە. (أفنضرب عنکم الذکر صفحا[5]: چۆن دەکرێت ئێمە وازتان لێ بهێنین و هۆشیارتان نەکەینەوە بەو قورئانە؟)؛ لێرە بە مانای پشتگوێخستن و بەجێهێشتن هاتووە. (کذلك یضرب الله الحق و الباطل[6]: خوا بەم شێوەیە ڕاستی و ناڕاستی لە یەکتر جیادەکاتەوە)؛ لێرەش واتای لێکجیاکردنەوە دەدات. (و ضربت علیهم الذلة[7]: سووکی و ڕیسوایی درا بەسەریاندا)؛ لێرەش بە مانای داپۆشین و شاردنەوە هاتووە. (فاضرب لهم

1 . "عەبدولڕەحمان سدیق" لە وتارێکدا ـ کە هێشتا چاپ نەکراوە ـ بەناوی **"لێدان لە ئافرەت لە ڕوانگەیەکی ئایینییەوە"** هاوکات لەگەڵ پێشکەشکردنی ڕاوبۆچوونی خۆی سەبارەت بە تەفسیری وشەی (ضرب) لەو ئایەتە، ناوی چەندین کەس لەو زانایانە دەهێنێ و بە وردی ئاماژە بە بۆچوونەکانیان دەکات، وەك: د. عبدالحمید أحمد أبو سلیمان، د. احمد الکبیسی، د. عبدالمحسن العبیکان، فتح الله گولن، عبدالحمید الأطرش، کە هەموویان لەسەر ئەو ڕایە کۆکن کە وشەی (ضرب) لەو ئایەتە بە واتای (بەجێهێشتن)ـە نەك لێدان.

2 . (النحل: 76).

3 . (النساء: 101).

4 . (الکهف: 11).

5 . (الزخرف: 5).

6 . (الرعد: 17).

7 . (البقرة: 61).

طريقا فی البحر[1]: ڕێگایەکیان بۆ بکەرەوە لە دەریادا)؛ لێرەش واتای لەتکردن دەگەیەنێ. (فضرب بينهم بسور له باب[2]: دیوارێك لە نێوانیاندا دروست دەکرێت کە دەرگایەکی هەیە)؛ لێرەش بە مانای جیاکردنەوە لەوانی دیکە هاتووە... ئەم نموونەیانە زۆرن کە مانای زۆر لە یەکتر جیاواز دەگەیەنێ بۆ وشەی (ضرب). بەڵام (ضرب) بە مانای لێدان کە لە چەند شوێنێکی قورئاندا هاتووە و زۆر بە وردی دیاریکردووە: ئەگەر مەبەست لە لێدانەکە، لێدانی گیانلەبەر و مرۆڤ بووبێ، شوێنی لێدانەکەی دیاریکردووە؛ بەم واتایەی ئەگەر لە دوای وشەی (ضرب) شوێنێك لە جەستە هاتبێ، ئینجا مانای (لێدان) دەگەیەنێ، بۆ نموونە: (فكيف إذا توفتهم الملائكة يضربون وجوههم و أدبارهم[3]: ئاخۆ حاڵیان چۆن دەبێت ئەو کاتەی کە فریشتەکان لەکاتی گیان کێشانیاندا، لە ڕوومەت و پشتیان دەدەن). هەروەها ئەگەر مەبەست لە لێدانەکە، لێدانی شتی بێگیان بووبێ، ئەوا کۆی شتەکە ناو براوە بێ دیاریکردنی بەشێك لێی، وەك: (فقلنا اضرب بعصاك الحجر[4]: پێمان وت: بە گۆچانەکەت لە بەردەکە بدە!).[5]

لە حەدیسەکانی پێغەمبەریشدا ــ د.خ ــ ئەگەر باسی وشەی (ضرب) بە مانای لێدان هاتبێ، باسی شوێنی مەبەست لە لێدانیش هاتووە؛ وەکو: (إذا ضرب أحدكم فليتق الوجه[6]: ئەگەر لە یەکێکتان دا، ئاگاتان لە دەموچاوی بێ و لەوێ مەدەن).

لە لایەکیترەوە، قورئان هەرگیز وشەی (ضرب)ی وەکو تەمێکردن بۆ کەسی سەرپێچیکەر بەکار نەهێناوە، بەڵکو بە وشەی دی ناوی هێناوە: وەکو (جلد: قامچیلێدان). بۆ نموونە دەفەرمێ: (والذين يرمون المحصنات ثم لم يأتوا بأربعه شهداء فاجلدوهم ثمانين جلدة و لا تقبلوا لهم شهادة أبدا: ئەوانەی کە بوختان هەڵدەبەستن بۆ ژنانی پاکیزە و داوێنپاك، بەبێ ئەوەی چوار شایەتیان هەبێ، ڕێك هەشتا قامچییان لێ بدەن[7] و ئیتر شایەتیشیان لێ وەرمەگرنەوە!).

1 . (طه: 77).
2 . (الحديد: 13).
3 . (محمد: 27).
4 . (البقرة: 60).
5 . بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: أبوسليمان، د. عبدالحميد أحمد (2002)؛ **"ضرب المرأة وسيلة لحل الخلافات الزوجية"**: القاهرة: دارالسلام للطباعة والنشر و التوزيع و الترجمة؛ صص 28 - 29.
6 . رواه المسلم.
7 . با فێر بێت لەمەودوا بۆختان بەکەس نەکاتەوە، ئەگەر بوختانیشی نەکردبێ و بە ڕاستی شایەتی ئەو جۆرە ڕووداوانەش بووبێ، مادەم تەنها بینیویەتی و سێ شایەتی دیکەی نییە کە بینە چوار، با بێدەنگ بێت و ئابڕووی خەڵك، ژن بێ یان پیاو نەبات. هەروەها ئەو قامچیلێدانە دەبێتە پەندێکیش بۆ خەڵکیتر کە لەوانەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان تۆمەت بۆ کەسێك هەڵبەستن!

له حەدیسیشدا هاتووه که: (لایجلد أحدكم أمرأته جلد العبد ثم يجامعها فی آخر اليوم[1]: نابێ هیچ کەسێکتان بە قامچی لە ژنی خۆی بدات وەك ئەوەی لە کۆیلە دەدەن، پاشانیش (لە حدیسێکیتر هاتووه: پاشانیش شەرم ناکات و) شەوەکەی لەگەڵ جووت دەبێت!

"عەبدولڕەحمان سدیق" لەوبارەیەوە دەڵێت:

"خێزانێك كه له دوو هاوتا پێك هاتبێت و، وەكو دوو مرۆڤی ڕێزلێگیراو له لایەن خوداوه تەماشا بكرێن و، خێزانیش ئەم هەموو بایەخ و رووبەره زۆرەی له قورئاندا بۆ تەرخان كرابێت، چۆن خودا بۆ چارەسەری كێشەیەكی خێزانیی ڕێگە بە پیاو دەدات لە هاوسەرەكەی بدات؟ دەڵێن لێدانەكە دەبێت ئازاردەر نەبێت، بەڵام خۆ ئازار تەنها ئازاری جەستە نییە، بەڵكو ئازاری ناخ و بێڕێزیكردنە بە نافرەتێكی خاوەن كەرامەت و ماف. ئەگەر لێدان لە قورئاندا هاتبێت، دەبوایە پێغەمبەر بۆ جارێكیش بێت لێدانی بەكاربهێنایە بۆ ئەوەی وەكو سوننەتێك بمانتوانیبا چاوی لێبكەین! ئەگەر لێدان چارەسەر بووایە، دەبوایە پێغەمبەر بۆ جارێكیش بووایە ئەم چارەسەرەی بەكاربهێنایە لەگەڵ یەكێك لە هاوسەرەكانی! چۆن لێدان لە قورئاندا هەیە و، پێغەمبەریش بۆ یەكجار چییە ئەم ئایەتە جێبەجی ناكات؟! وەك بۆ نوێژ فەرمووی (صلوا كما رأيتموني أصلي)، ئەی بۆ لێدان سەیری كێ بكەین، لە كاتێكدا پێغەمبەر لە ژنی نەداوە و، داواشی لێكردووین لە ژن نەدەین؟! ئیتر گشت ئەو قسانەی لەبارەی جۆری لێدان و، چۆنیەتی لێدان و، بە سیواك بێت و، ئاسەوار بەجێ نەهێڵێت و... هتد، قسەی فوقەهاكانن، نەك پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر)... بەڵگەی زۆر بەهێزی كرداریش لە ژیانی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر)، هەر ئەمەیە كە گومان، بە بەڵگەی ئەوەی لە كێشەی لەم جۆرەدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر)، (واضربوهن)ی بە بەجێهێشتنی ماڵ ئەنجام داوە نەك لێدان.[2] هەر وەك لە دوای یەك مانگ جێهێشتنی ماڵ، ئەوسا خوای گەورە ئایەتی *28* و *29* سوورەتی ئەلئەحزاب دادەبەزێنێت[3]... هەروەها لە كێشەی نێوان ئیمامی عەلی و فاتیمەشدا، هەر ئیمامی عەلی

---

1 . رواه البخاري.

2 . ئەوەتا لە فەرموودەی سەحیحدا کە إبن‌عباس ـ ر.خ ـ دەیگێڕێتەوە، هاتووه: ﴿...فاعتزل النبي صلى الله عليه وسلم نساءه من أجل ذلك الحديث حين أفشته حفصة إلى عائشة تسعا وعشرين ليلة وكان قال ما أنا بداخل عليهن شهرا من شدة موجدته عليهن حين عاتبه الله فلما مضت تسع وعشرون ليلة دخل على عائشة فبدأ بها فقالت له عائشة يا رسول الله إنك كنت قد أقسمت أن لا تدخل علينا شهرا وإنما أصبحت من تسع وعشرين ليلة أعدها عدا فقال الشهر تسع وعشرون ليلة فكان ذلك الشهر تسعا وعشرين ليلة قالت عائشة ثم أنزل الله تعالى آية التخير فبدأ بي أول امرأة من نسائه فاخترته ثم خير نساءه كلهن فقلن مثل ما قالت عائشة﴾؛ (صحيح البخاري؛ كتاب النكاح؛ باب موعظة الرجل ابنته لحال زوجها).

3. ﴿يا أيها النبي قل لأزواجك إن كنتن تردن الحياة الدنيا وزينتها فتعالين أمتعكن وأسرحكن سراحا جميلا وإن كنتن تردن الله ورسوله والدار الآخرة فإن الله أعد للمحسنات منكن أجرا عظيما﴾. (الأحزاب: 28 - 29).

ماڵ جێ دەهێڵێت بە مەبەستی چاککردنەوەی بارودۆخەکە[1]... هەروەها ئەم داب‌ونەریتە لە کۆمەڵگەی کوردەواریشدا هەتا دەیان ساڵ لەمەوبەر باو بوو، کە لەکاتی کێشەی خێزانیدا پیاوان پەنایان دەبردە بەر مزگەوت، یان سەفەرکردن. لێرەوەیە کە فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) لێدانی ژن قەدەغە دەکەن و، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر) لە ژنی نەداوەو، سوونەتی لێدانیشی نییە و، لە لێدانی ژندا هیچی بۆ بەجێ نەهێشتووین. تەنانەت پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ ڕازیی نەبووە کە ئافرەت شوو بە پیاوێك بکات کە لە ژن دەدات، ئەوەتا (فاتیمەی کچی قەیس) دوای جیابوونەوەی لە (ئەبو عەمری کوڕی حەفس) ـ لەسەر داوای خۆی بە (خُلع) ـ دوو کەس دێنە داواکردنی، کەچی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ ڕازی نابێت شوو بە هیچیان بکات؛ چونکە یەکێکیان لە ژن دەدات و ئەوی دیکەشیان ماڵی پێ بەڕێوە نابرێت لەبەر نەبوونیی[2]... لە سەردەمی ئێستاشدا ئەم بەڕێزانە: عبدالمحسن العبيكان (ئەندامی ئەنجوومەنی شورای سعوودی)، فتح الله گولن (کەسایەتیی ئیسلامیی تورکیا)، عبدالحميد الأطرش (سەرۆکی لیژنەی فەتوای زانکۆی ئەلئەزهەری میسر) فەتواکانیان دژی لێدانی ژنانە، ئەو فەتوایەشیان داوە کە ژن نابێت لێدان لە مێردەکەی قبووڵ بکات و بۆی هەیە بەرگریی لە خۆ بکات و دەست بکاتەوە."[3]

دوکتورە "سۆهەیلا زەینولعابدین" ــ ئەندامی یەکێتیی زانایانی ئیسلامی جیهان، هەروەها کچی ئیمام و وتارخوێنی مزگەوتی پێغەمبەر (مسجد النبي)یە لە شاری مەدینە ــ دوای ئاماژە بە ڕاوبۆچوونی "شێخ خالد الجندي" لە ڕوونکردنەوەکەی ئەم ئایەتەدا دەڵێت:

"ئەم ئایەتە لە ساڵی (5)ی کۆچی دابەزیوە و پێغەمبەری خوا لە ساڵی (11)ی کۆچی وەفاتی کردووە، لە میانەی ئەو ساڵانەی کە ژیاوە، هەرگیز تەنانەت بۆ یەکجاریش لە هاوسەرەکانی خۆی نەداوە و بێڕێزی نەکردوونە. سوننەتی کردەوەیی پێغەمبەر ـ د.خ ـ لەو کاتەی کە لەگەڵ هەردوو هاوسەرەکەی عایشە و حەفسە ـ ر.خ ـ تووشی کێشە بوو، جەخت لەوە دەکاتەوە کە قۆناغ‌بەقۆناغی ئەم ئایەتەی جێبەجێ کردووە و لە کۆتاییدا ناچار بووە مانگێکی تەواو لە ماڵی خۆی دەرچێت و هاوسەرانی خۆی بەجێ بێڵێ، تا ڕادەیەك دوای ئەوەی کە خەڵك هەستیان بە کێشەکە کرد و ئەبووبەکری (باوکی عایشە) و عومەری (باوکی حەفسە) ـ ر.خ ـ وەکو ناوبژیوان هاتنە لایان پێکیان هێنانەوە. ئەی ئەگەر مافی لێدان لە ژن ڕێگەپێدراو و ئەمرێکی ئیلاهی بووایە، دەبووایە خۆی یەکەم کەس بێت

1 . ﴿عن سهل بن سعد الساعدي ـ رضي الله عنه ـ أنه قال: جاء النبي ـ صلى الله عليه وسلم ـ إلى بيت فاطمة فلم يجد عليا فقال: أين ابن عمك؟ فقالت: كان بيني وبينه شيء فغاضبني فخرج. فقال النبي لرجل: انظر أين هو، فقال الرجل: هو في المسجد راقد. فجاءه وهو مضطجع، وقد سقط رداؤه عن شقه فأصابه تراب، فجعل النبي ـ صلى الله عليه وسلم ـ يقول: قم يا أبا تراب قال سهل: وما كان له (أي لعلي) اسم أحب إليه منه﴾. (رواه البخارى و مسلم)

2 . بڕوانە: صحيح مسلم؛ كتاب الطلاق؛ باب المطلقة ثلاثا لا نفقة لها؛ ج 2؛ ص1119؛ رقم الحديث: 1480

3 . عەبدولڕەحمان سدیق: سەرچاوەی پێشوو.

ئەم ئەمرەی جێبەجێ بکات! بۆچی نە لە ڕووی جەستەییەوە، نە لە ڕووی دەروونییەوە ئازاری نەدان؟"[1]

ئێستا بە ڕەچاوکردنی هەر دوو تەفسیر و بۆچوون (لێدان) و (بەجێهێشتن)، ئایەتەکەی شرۆڤە دەکەین:

﴿فالصالحات قانتات حافظات للغيب بما حفظ الله واللاتي تخافون نشوزهن فعظوهن واهجروهن في المضاجع واضربوهن فإن أطعنكم فلا تبغوا عليهن سبيلا إن الله كان عليا كبيرا و إن خفتم شقاق بينهما فابعثوا حكما من أهله وحكما من أهلها إن يريدا إصلاحا يوفق الله بينهما إن الله كان عليما خبيرا﴾؛[2] واتە: ژنانی چاك و ساڵح ئەوانەن كە گوێڕایەڵن (ملكەچی ئەمری خوان) و شتە نهێنییەكانی نێوان خۆیان و مێردەكانیان دەپارێزن، كە خوای گەورە ستریان دەكات و دەیانپارێزێت (پێی خۆش نییە خەڵك بزاننەوە). ئەو ژنانەی كە لێ دەترسن سەرپێچیكاری بكەن، (یەكەمجار) ئامۆژگاری بكەن، (ئەگەر سوودی نەبوو) لەناو جێگادا پشتیان تێ بكەن، (ئەگەر دیسان سوودی نەبوو) "لێیان بدەن/بەجێیان بهێڵن" (و لە ماڵ بڕۆنە دەر). ئەگەر وازیان لە یاخیگەری هێنا، ئەوە ئیتر نابێ ستەمیان لێ بكەن و لێیان بەهەنجەت بن، بێگومان خوا بەرز و بڵند و گەورەیە (واتە دەتانبینێ و ئەگەر ستەم بكەن ئەو باڵادەستە و زۆریش گەورە و توانایە و دەتوانێ بە ئاسانی تۆڵەتان لێ بستێنێتەوە)، ئەگەر (ئەوەش كارساز نەبوو و) ترسان لەوەی نێوان هەردووكیان (ژن و مێرد) بشێوێت و (مەترسیی تەڵاق هەبێت)، ناوبژیوانێك لە خزمی پیاوەكە و ناوبژیوانێكیش لە خزمی ژنەكە بنێرن بۆ پێكهێنانیان. ئەگەر بە ڕاستی چاكسازی و ئاشتبوونەوەیان بوێت، ئەوا خواش پێكیان دەهێنێتەوە. بێگومان خوا زانا و بەئاگایە (و دڵی هەمووتان دەخوێنێتەوە كە كێ دەیەوێ بە ڕاستی كێشەكە چارەسەر بێ و كێ كێشەكە ئاڵۆزتر دەكات. دەشزانێت كە ڕێگەچارە چییە):

یەك) وشەی (نشوز: سەرپێچی) تەنها لە دوو ئایەتەدا هاتووە: یەكێك ئەو ئایەتەی كە باسی ئەو پیاوانە دەكات كە لە دەست "سەرپێچیكارییەكانی ژنان"ی خۆیان دەناڵێنن و دەترسن كە كێشەكەیان بگاتە ڕادەی تەڵاق. لە بەرامبەردا ئایەتێكی‌تر هەیە كە باسی ئەو ژنانە دەكات كە لە دەست "سەرپێچیكارییەكانی مێردەكان"یان دەناڵێنن و دەترسن ئەم نافەرمانییە ببێتە هۆی

1 . زين العابدين، د. سهيلة حماد (2012)؛ "المرأة المسلمة بين النص الديني و الواقع الإجتماعي"؛ لمؤتمر "المرأة في المجتمعات العربية"؛ بيروت: جامعة الروح القدس (26-23 أكتوبر 2012)؛ الموقع الإتحاد العلماء المسلمين: http://iumsonlinc.org

2 . (النساء: 34 - 35).

تەڵاق: ﴿وإن امرأة خافت من بعلها نشوزا أو إعراضا فلا جناح عليهما أن يصلحا بينهما صلحا والصلح خير﴾؛[1]
واتە: ئەگەر ژنێك لە سەرپێچیکەری و لووتبەرزی و پشتتێکردنی مێردەکەی ترسا، ئەوە هیچ گوناهیان لەسەر نییە و کارێکی باشە ئەگەر نێوان خۆیان چاك بکەن و لەسەر شێوازێك ڕێك بکەون. سازش و ڕێککەوتن باشترە (لەوەی لە یەکتر جیا ببنەوە)؛ کەواتە: قورئان ئەگەر باسی ژنانی سەرپێچیکەری کردووە، دادگەرانە باسی پیاوی سەرپێچیکەریشی کردووە و ئامانجی سەرەکیشی پێکهێنانەوەیانە لە هەردوو ئایەتەکەدا: (إن يريدا إصلاحا) و (أن يصلحا بينهما صلحا و الصلح خير).

دوو) ئایەتی یەکەم تەنها باسی ئەو ژنانە دەکات کە لەو بەڵێنانە و ئەرکانەی کە ژن و مێرد پێویستە بەرامبەر یەکتری جێبەجێ بکەن و مافی یەکتری بپارێزن، سەرپێچی دەکەن نەك هەموو ژنان بە گشتی! بۆ نموونە ژنێك کە شتە نهێنییەکانی نێوان خۆی و مێردەکەی نەپارێزێت، یان کە مێردەکەی لە ماڵەوە نەبوو، لەگەڵ کەسی بێگانە پەیوەندی بکات، کە مێردەکەی پێی خۆش نییە و بێئاگایە، یان سامانی مێردەکەی بەهەدەر بدات، یان کارێك بکات کە دەزانێ مێردەکەی پێی ناخۆشە و هتد، لە شەرعی ئیسلامدا بە یاخی لەقەڵەم دەدرێت.

سێ) ئەو ژنەی کە پەیمان و گرێبەستی نێوان خۆی و مێردەکەی دەشکێنێ و بە لادان و سەرپێچیکردن پێشێلی دەکات، خۆ هەروا بەو حاڵە وێڵ ناکرێت و پێویستە ڕێگری لە لادانەکەی بکرێت، تاکو کێشەکە لەوە گەورەتر نەبێت. لە فێمێنیست و ڕۆشنبیران دەپرسم: ئایا ئەوەش زوڵمە و شتێکی نامەعقووڵ و خراپە کە ڕێگری لە ژنێکی پێشێلکەر بگیرێت؟ ئایا کەسێك کە لە خاڵەکانی ڕێککەوتنی نێوخۆیان نافەرمانی دەکات، سەرپێچیکەر نییە و نابێ بگەڕێندرێتەوە سەر ڕێگای ڕاست؟ یان دەڵێن نابێ کەس هەقی بەسەرەوە هەبێ و چی دەکات با بیکات؟ ئەگەر وابێ، ئەی ئەوەندە قسەکردنتان (نووسراو، بینراو و بیسراو) خۆتانگوتەنی بۆ ڕۆشنبیرکردن و پەند و ئامۆژگاری و ئاگادارکردنەوە و پێشکەشکردنی ڕێگەچارە بۆ خەڵکی ڕەشۆك و عەوام، بۆ چییە؟ ئەگەر پیاو مافی ئەوەی نەبێ کە ژنی خۆی ئامۆژگاری بکات، ئینجا ئەگەر چارەسەر نەبوو پشتی تێبکات، ئەی دەبێ چی بکات؟ خۆ ناڵێن: دەبێ دابنیشێت و چاوپۆشی لێبکات و چەپڵەشی بۆ لێ بدات؟ ئەگەر وا بێ، پۆلیسی هاتوچۆش مافی فیتکەلێدان یان ڕاگرتنی ئۆتۆمۆبێلی شۆفێرە

---

1 . (النساء: 128).

سەرپێچیکەرەکانی نییە و بۆی نییە ئامۆژگارییان بکات و، بۆ نموونە بە بیریان بێنێتەوە و بڵێت: پشتێنەی دڵنیایی خۆتان ببەسن! کەواتە باس، باسی ژنی پێشێلکەر و لووتبەرزە؛ نەك هەموو ژنان.

چوار) خوا دەفەرمێت: دەبێ لە قۆناغی یەکەمەوە دەستی پێ بکرێت کە بریتییە لە (فعظوهن)؛ واتە ئامۆژگارییان بکەن. نافەرمێت (فانصحوهن: نەسیحەتیان بکەن)؛ چۆنکە "موعظة" زۆر لە نەسیحەت بەرفراوانتر و گەورەترە. هەر نەسیحەتێك "موعظة" نییە؛ چونکە نەسیحەت دەکرێ سەرزەنشت و لۆمە و ترساندن و... تێدابێت. "موعظة" بریتییە لە نەسیحەتێکی بەردەوام نە بە یەك جار و دوو جار، کە بە نەرمی و پڕ بە دڵسۆزی و میهرەبانی دەکرێت، کە دڵی ژن نەرم بکات و هەست بەوە بکات بە ڕاستی مێردەکەی چاکەی ئەوی دەوێت. بەڵام ئەگەر ژنە سەرپێچیکارەکە واز لە لاساری و سەرکێشی نەهێنێ و پشت لە ئەقڵ و مەنتیق و چاکسازی بکات، قۆناغی دووەم دەست پێدەکات بەو مەرجەی کە قۆناغی یەکەم بێسوود بووبێ، ئەوا ئەمر دەکات کە هەر لە ناو جێگا پشتی تێ بکات و لەگەڵ نەخەوێت، چونکە دەفەرمێت: (واهجروهن فی المضاجع؛ نەك عن المضاجع). بەمە، مێردەکە عاجزی و دڵگرانییەکەی خۆی نیشانی ژن دەدات. ژن بەوە دەبێ بزانێ کە دیارە کارێکی کردووە کە پیاو لێی نارازییە و وەکو جاران نەماوە؛ چونکە ناکرێ ژن سەرەڕای ئامۆژگارییەکی زۆر، هەر لەسەر لادانەکەی بێت و ئینجا پیاوەکەش بەردەوام گڵۆپی کەسکی بۆ پێ بکات و پشتی تێ نەکات! ئەی ئەگەر لەدوای ئەم هەموو ئامۆژگارییە، ژن نەهێتە سەر ڕێ و، ئینجا پیاویش بە ئاسایی وەکو جاران باوشی بۆ بکاتەوە، ئایا ئەو مانایە ناگەیەنێ کە پیاوەکە خۆی بڕوای بە قۆناغی یەکەمی نەبووە و ئامۆژگارییەکان و هەوڵەکانی هەموو بە فیڕۆ دەدات!

پێنج) ئینجا لە قۆناغی سێیەم، بە مێردەکە دەفەرمێت: مادام ژنێکی سەرپێچیکەر بە زمانی خۆش و مەنتیقی هۆش و ئەقڵ تێنەگەیشت، هەروەها ساردوسڕییش نەبێتە هۆی وازهێنانی لە لاملی و سەرپێچییەکەی، ئەمجارە بە ناچاری شێوازی سێیەم بەکار دەهێنرێ، کە بریتییە لە: (واضربوهن: لێیان بدەن)! بەڵام لێدانێك تەنها بۆ وشیارکردنەوە و تەمێکردن! ئەگەر ڕای دووەمیش وەربگرین کە (دژ بە لێدان)ـە، بەم شێوەیە مانا دەکرێت: بەجێیان بێڵن و لە ماڵ بڕۆنە دەرەوە! کەواتە: ئەگەر دوو قۆناغی پێشوو سوودی نەبوو، لە قۆناغی سێیەم پێویستە پیاو، ژنەکەی بە شێوەیەکی کاتی لە ماڵ بەجێ بێڵێ، تاکو ئەم دوورکەوتنەوەیە ببێتە مایەی

بەخۆداچوونەوە و بیرکردنەوە و بێتاقەتی و دڵتەنگیی ژن. دەروونناسان دەڵێن: باشترین چارەسەر بۆ ئەمجۆرە گرفتانە، بەجێهێشتنی ئەو دۆخ و شوێنەیە؛ چونکە مانەوە لەو شوێنە دەبێتە هۆی دەمەقاڵییەکی زیاتر و دەمارگرژی و توندوتیژی و خوانەخواستە ڕووداوی نەخوازراو! ئەگەر بەوەش هەر چارەسەر نەبوو، قۆناغی چوارەم دەگرێتە بەر، کە بریتییە لە ناوبژیوانیی دوو کەس، یەکیان لە خزمی ژنەکە و یەکێشیان خزمی پیاوەکە. ئەگەر بەمەش چارەسەر نەبوو، قۆناغی پێنجەم پەیڕەو دەکرێت کە تەڵاقە. زۆر جار بینیومانە کە پیاو لە جیاتی ئامۆژگاری، بەسەر هەموو قۆناغەکاندا باز دەدات و یەکسەر ژنەکەی تەڵاق دەدات و لە ماڵەوە دەریدەکات، لەجیاتی ئەوەی خۆی ماڵەکە بەجێ بێڵێ![1] یان هاوکات لەگەڵ ئامۆژگاری، توندوتیژی دەکات، یان دەیشکێنێتەوە، یان لە ڕووی نەفەقە و ئابوورییەوە بێبەشی دەکات و باری شانی قورس دەکات! هەموو ئەوانە دوورن لە ڕەفتار و ئادابی ئیسلامێتی. یان زۆر جار دەبینین کاتێك کە دوو ناوبژیوان، کە لێرە زیاتر ڕیش سپییەکان قۆڵی لێ هەڵدەماڵن، بانگهێشت دەکرێن بۆ پێکهێنانەوە، ئەو ناوبژیوانە لەبەر بەرژەوندیی خۆیان، وەکو بەجێهێشتنی کەسابەت و بازرگانی، یان درێژبوونی کاتی کۆبوونەوە و ماندووبوون، بە یەك دوو قسە حەز دەکەن کۆتایی بە دانیشتنەکە بێنن! هەموو ئەوانە نە تەنها جێبەجێکردنی قۆناغەکان نین، بەڵکو ئاڵۆزترکردنی کێشەکە بەدوای خۆیدا دەهێنێت. سروشتییە کاتێك کە پیاو ماڵەکەی بەجێ هێشت، خزم و کەسوکار لە هەردوو لایەن ئاگادار دەبن و دەستتێوەردان و کارتێکردنەکان دەست پێ دەکات؛ بۆیە بۆ ئەوەی هەرکەسێك لە لای خۆی ڕێگەچارەسەرێك دانەنێت کە زۆر جار دەبێتە مایەی ئاڵۆزترکردنی کێشەکان، ئەمر دەکات کە حەکەم و دادوەرێك لە هەر دوو لایەن، کە ڕێز و سەنگیان هەبێت و لە هەردوو لایەن پەسەندکراو بن، لەسەر کێشەکە کۆدەبنەوە تاکو پێکیان دەهێننەوە.

1 . لە شەرعی ئیسلامدا ژن ئەگەر تەڵاقیش درابێت، بەڵام هێشتا ماوەی (عدە)ی تەواو نەبووبێ، نابێ لە ماڵ دەربکرێت، مەگەر ئەو ژنەی کە لەو کاتەدا کارێکی ناپەسەند و نەشیاو بکات، کە زۆر بەرچاو و ئاشکرا بێت؛ هەروەك دەفەرمێت: ﴿یا أیها النبی إذا طلقتم النساء فطلقوهن لعدتهن و أحصوا العدة واتقوالله ربکم لا تخرجوهن من بیوتهن ولا یخرجن إلا أن یأتین بفاحشة مبینة﴾؛ (الطلاق:1) واتە: ئەی پێغەمبەر! هەر کات ژنانتان تەڵاق دا، لە کاتی عدە (واتە سەرەتای پاکبوونەوەی ژن لەو بێنوێژییەی کە مێردەکەی نێزیکی لەگەڵ نەکردبێت) تەڵاق بدەن و، حیسابی عدە بژمێرن (واتە دەبێ 3 جار لە بێنوێژی پاك ببێتەوە تاکو پشتڕاست بکرێتەوە کە سکپڕ نییە)، و لە خوا کە پەروەردگارتانە بترسن و ژنان (هەتاکو عدەیان تەواو نەبووە) لە ماڵی خۆیان دەریان مەکەن و ژنانیش با (وەکو زیزبوون) لە ماڵ دەرنەچن، مەگەر ئەوەی کارێکی خراپی ناپەسەند و ئاشکرا بکات (وەکو زینا، پەیوەندی لەگەڵ کەسی بێگانە، شەڕی بەردەوام کە مانەوە لە ماڵەوە مەترسی ئەوەی هەبێت دۆخێکی دژوارتری بەدوادا بێت).

شەش) بە بۆچوونی یەکەم، ئەوانەی دەڵێن وشەی (واضربوهن) بە واتای "لێدان"ی ژنانە، ماناکەی بەم شێوەیە دەبێت: ئەگەر دوو قۆناغی یەکەم و دووەم کارساز نەبوون، لێیان بدەن! ئەگەر ژنێکی فەرمانشکێن و پێشێلکەر و بێگوێ، بە ئامۆژگاری و قسەی نەرم و خۆش نەهێتە سەربار و بەو خاڵانە پابەند نەبێت، کە لەو ڕێککەوتنانەی نێوان خۆیاندا هەن، هەروەها نەخەوتن لەگەڵی و پشتتێکردنیش هیچ کارساز نەبوو، ڕیگەی پێ دەدرێت کە وەك تەمێکردن لێی بدات، ئەگەرچی وا باشترە لێی نەدات. لێرە ئەو پرسیارە دروست دەبێت و ئاراستەی فێمێنیستان و ڕۆشنبیرانی دەکەم: وای دادەنێین کە مانای وشەکە تەنها بریتییە لە "لێدانی ژن"، هەروەها واش دادەنێین کە مەبەست لە ژنیش تەنها "ژنی سەرپێچیکەر" نییە، بەڵکو هەموو ژنەکان بگرێتەوە! ئایا ئەو پیاوانەی کە لە ژنەکانیان دەدەن، بەهۆی ئەم ئایەتەوەیە کە توندوتیژی دژیان دەنوێنن؟ چەند لەو پیاوانە بەئاگان لە بوونی ئەم ئایەتە لە قورئاندا؟ چەندیان ئایەتەکەیان لەبەرە؟ چەندیان ئەگەر بۆ یەکجاریش بێت خوێندوویانەتەوە؟ وادادەنێین کە هەرهەموویان ئەو ئایەتەیان بەو تەفسیرەشەوە لەبەرە، کە دەڵێت پیاو بۆی هەیە لە هاوسەرە سەربزێوەکەی بدات، ئایا هەموویان ئەم ئایەتە دەکەنە پاڵنەری توندوتیژییان؟ ئایا کەس لە ئێوە و توێژەرانی دیکە لەوانەتان کۆڵیوەتەوە کە بڵێن: لەبەر ئەوەی خوا لە قورئاندا فەرموویەتی لە ژنی خۆت بدە، منیش ئەمری خوام جێبەجێ کردووە؟ دیسان وای دادەنێین: کە هەر هەموویان دەڵێن: هۆی سەرەکیی لێدانی ژنەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەم ئایەتە! ئەی ئەو پیاوانەی کە هەر موسڵمان نین لە سەرانسەری جیهان و ڕۆژانە لە ژنەکانیان دەدەن، هۆکاری ئەوان چییە؟ دکتۆرە "جۆن بیریە" کە مامۆستای یاریدەدری ماددەی دەروونناسییە لە زانکۆی "کارولینا"ی ئەمریکا، لە توێژینەوەیەکدا دەڵێ: (79%)ی پیاوان لە ئەمریکا لە ژنەکانیان دەدەن، بە لێدانێکی توند، کە (17%)ی ئەو ژنە لێدراوانە بارودۆخیان وادەخوازێت کە ببرێنە ژێر چاودێری وردەوە (ICU). هەروەها بەپێی ڕاپۆرتی دەزگای ناوەندی ئەمریکی بۆ پشکنین و لێکۆڵینەوە ـ ناسراو بە (FPT) ـ هەر (18) چرکەیەك لە ئەمریکادا پیاوێك لە ژنەکەی دەدات. "میشیل ئاندرێ" ـ متمانەداری نهێنییەکانی وڵاتی فەرەنسا ـ دەڵێ: ساڵانە دوو ملیۆن ژن تێیان هەڵدەدرێ و لێیان دەدرێ. هەروەها دەڵێ: هەندێك جار ئاژەڵەکان مامەڵەیەکی باشتریان لەگەڵدا دەکرێت وەك لە ژنان. دەڵێ: (92%)ی لێدان لە شارەکاندایە و، (60%)ی ئەو سکاڵانەش کە شەوانە لە بنکەی پۆلیسی فریاکەوتنی پاریس تۆمار دەکرێن، بریتین لە هاناهێنانی ژنان لەدەست خراپیی مامەڵەی

مێردەکانیان. لە بریتانیاش، (77%)ی مێردەکان هەر بەبێهۆ لە ژنەکانیان دەدەن و، (50%)ی ژنە کوژراوەکانی بریتانی ئەوانەن کە دەبنە قوربانیی دەستی مێرد یان بۆیفرێندەکانیان.[1] ئایا ئەم ئامارە ڕەسمی و ترسناکانەی ڕۆژئاوا (کە دواتر لە بەشی دووەم بە وردی و زیاتر باسیان لێوە دەکەین)، کە باس لە توندوتیژیی دژ بە ژنانی وڵاتانی پێشکەوتوو دەکەن، دەگەڕێتەوە بۆ ئیسلام؟ پێم وایە جگە لە چەواشەکاری و دوژمنایەتیکردنی ئایینی ئیسلام، کە پاڵنەرەکەی ڕق و قینێکی لەڕادەبەدەرە، هیچ هۆکارێکی دی لە پشتەوە نییە! کەسێکیش دوژمنایەتیی لەگەڵ ئەم ئایینە دەکات، دیارە دژی پەیامەکانێتی، کە دەفەرمێت: خوا یەکە، ژیان تەنها ئەم دونیایە نییە و دواڕۆژێك هەیە، ژیان بێهوودە نییە، بەڵکو ئامانجدار و بەمانایە، لەگەڵ دایك و باوك و منداڵان و خزم و کەستان باش بن، لەگەڵ دراوسێتان باش بن، ئاسایشی خەڵك و کۆمەڵگا بەهۆی دەست و زمانتان مەشێوێنن، یارمەتیی یەکتر بدەن بە چاکەکاری، یەکتر نەسیحەت و ئامۆژگاری بکەن، زوڵم مەکەن و زوڵمیش قبووڵ مەکەن، کەس مەکوژن (کوشتنی کەسێك وەك کوشتنی هەموو مرۆڤەکانی سەر گۆی زەوی وایە، بووژاندنەوە و ڕزگارکردنی کەسێکیش وەك ئەوەی وایە هەموو مرۆڤەکانی سەر زەویی ڕزگار کردبێ)، زەوی ئاوەدان بکەنەوە، بەردەوام کار بکەن و لە کارێك بوونەوە، کارێکیتر دەست پێ بکەن، بەردەوام بخوێنن و بیر بکەنەوە، بەبێ بەڵگە شتێك قبووڵ مەکەن، بڕیاری پێشوەختە مەدەن و ڕواڵەتپەرست مەبن، لاساییکەر مەبن، درۆ مەکەن، دزی مەکەن، زینا مەکەن، قۆرخکاری مەکەن، غەش و خیانەت و فێڵبازی و چەواشەکاری مەکەن، لە هیچ شتێکدا تەنانەت لە ئایینی خوادا زێدەڕەوی مەکەن، هەر شتێك کە سەرخۆشتان دەکات وەك مەی و مادده هۆشبەرەکان لێی دوور بکەونەوە، خۆتان لە ڕیبا بپارێزن و ماڵی یەکتر بە حەرام مەخۆن، چاوتان لە هەژار و نەدار و یەتیمەکان بێ، بوختان بەکەس مەکەن، غەیبەتی یەکتر مەکەن، یەکتر مەکوژن و بە کوشتن مەدەن، جاسوسی و سیخوڕیی یەکتر مەکەن، لەگەڵ ئاژەڵەکان بە بەزەیی بن، خۆتان هەڵمەکێشن بەسەر یەکتریدا، بەهۆی ڕەگەز، یان نەتەوە، یان نەژاد، یان ڕەنگی پێست و زمانەکەتانەوە، ئەوەی بۆ خۆتانتان پێ خۆشە، بۆ خەڵکیشتان پێ خۆش بێت و هتد. دیارە هەموو ئەم پەیامانە لە دژی مرۆڤایەتین، یان لە دژی بەرژەوەندییەکانی ئەو نەیارانەن، کە دژی ئیسلام دەوەستێنەوە!

---

1 . د. علی جمعە؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 134-135.

8) سەبارەت بە سەرپەرشتی یان قەوامەی پیاو: ئەو ئایەتەی کە فێمێنیستەکان و ڕۆشنبیران وەکو بەڵگە دەهێننەوە و دەڵێن: قورئان ژن دەکاتە کۆیلە و ژێردەست و ملکەچی پیاو و، پیاویش دەکاتە سەرداری ژن، هەرگیز بەو مانایە نییە کە ئەوان لێی بەگلەیین، بەڵکو هیچکام لە گەورە زانایانی تەفسیری قورئان وەکو ئەوان لێکیان نەداوەتەوە. ئایەتەکە دەفەرمێ:

﴿ ولا تتمنوا ما فضل الله به بعضكم على بعض للرجال نصيب مما اكتسبوا وللنساء نصيب مما اكتسبن واسألوا الله من فضله إن الله كان بكل شيء عليما. ولكل جعلنا موالي مما ترك الوالدان والأقربون والذين عقدت أيمانكم فآتوهم نصيبهم إن الله كان على كل شيء شهيدا. الرجال قوامون على النساء بما فضل الله بعضهم على بعض وبما أنفقوا من أموالهم﴾؛[1] واتە: ئاوات بە شتێك مەخوازن کە خوا بەخشیویەتی بە هەندێکتان (واتە پیاو هەندێ تایبەتمەندیی دراوەتێ، کە ژن نییەتی و بە پێچەوانەشەوە. ئەوەش مانای نایەکسانی نییە لە ماف و ئەرکدا، هەروەك:) پیاوان، بەشێکیان هەیە لەوەی کە (بە کەسابەت یان هەر ڕێگایەکی‌تر) بەدەستیان هێناوە، هەروەها ژنانیش بەشێکیان هەیە لەوەی کە (بە کەسابەت یان هەر ڕێگایەکی‌تر) بەدەستیان هێناوە، هەمیشە داوای بەخشش و بەهرەی زیاتری خوا بکەن (زیاتر کاربکەن تاکو زیاترتان بداتێ)؛ چونکە بە ڕاستی خوا ئاگاداری هەموو شتێکە. بۆ هەموو کەسێك و هەموو سامانێك چەند میراتبەرێکمان داناوە لەوەی کە لە دایك و باوك و خزمان بەجێ ماوە (تا بە دادپەروەریی وەك دیاریکراوەکان دابەشی بکەن) و بۆ ئەوانەش کە پەیمانتان لەگەڵ بەستوون کەوا میرات لە یەکتر بگرن، مافی ئەوانیش بدەن؛ چونکە بەڕاستی خوا شایەتە بەسەر هەموو شتێکدا (و دەیشتانبینێ ئەگەر خیانەت یان زوڵم بکەن). پیاوان سەرپەرشتیارانی ژنەکانن، ئەمەش بەهۆی زیادە ئەرکێکەوەیە کە خوا داویەتی بە هەندێك بەسەر هەندێکی‌تردا و بەوەی کە پیاوان لە ماڵ و سامانی خۆیان خەرج دەکەن.

ئەم ئایەتە لە شاری مەدینە دابەزیوە و لە ژێر سایەی ئەم ئایەتەدا بووە کە ژنی موسڵمان لە نەریتی کۆنەپەرستیی سەردەمی نەفامی (جاهلییەت) ئازاد بووە و لە بوارە جیاجیاکانی کاری گشتی، سیاسی، ئابووری، سەربازی و کۆمەڵایەتیدا بەشدار کراوە و ئەم تێگەیشتنەش لەو ئایەتە و ئایەتەکانی دیکە سەبارەت بە ژنان، لەو کاتەوە بە درێژایی مێژوو بەردەوام بووە و کەس ئەم ئایەتە و ئایەتانی دیکەی بە ڕێگر و بەربەست لە بەردەم ژنان و ماف و ئازادییەکانیان نەزانیوە.

1. (النساء : 32 - 34).

ئەگەر سەیری ئایەتەکە بکەین، دەبینین خوای گەورە سەرەتا باسی یەکسانی و بەرابەری نێوان ژن و پیاو دەکات لە ڕووی ماف و ئەرکەوە، دواتر بەهۆی پیتی (واو) ـ کە ئامرازی پەیوەندییە (حرف عطف)ـە و دوو وشە یان دوو ڕستە پێکەوە گرێ دەدات ـ چەمکی "یەکسانی" لەگەڵ چەمکی "قەوامەی پیاو" پێکەوە دەبەستێتەوە، کە نیشانەی پەیوەندارێتیی نێوان یەکسانی و قەوامەیە.

هەروەك لە سوورەتی (البقرة)دا بەرلەوەی باسی چەمکی (درجة: پلەوپایە) بکات، لەوێش سەرەتا باس لە یەکسانیی ژن و پیاو دەکات لە ڕووی ماف و ئەرکەوە؛ جێگای سەرنجە کە سەرەتا بە مافی ژنانیش دەست پێ دەکات (لهن: بۆ ژنانە) ئینجا ئەرکەکانیان (عليهن: لە سەریانە):

﴿ولهن مثل الذی عليهن بالمعروف وللرجال عليهن درجة﴾؛[1] واتە: ژنان مافیان هەیە بەسەر پیاوانەوە بە وێنەی ئەو مافانەی کە بۆ پیاوانە لەسەر ژنان، بە گوێرەی ئەو عورفەی کە شایستە و پەسەندە و پیاوان پلەیەکیان بەسەر ژنانەوە هەیە.

زانایان بۆ چەمکی (درجة: پلە) ڕاوبۆچوون و تەفسیری جیاوازیان هەیە و هەندێکیان پێیان وایە کە ئەم پلەیە دەگەڕێتەوە بۆ غەزا (جیهاد)کردنی پیاوان، کە ژنان لەسەریان واجب نییە. هەندێ زانای دیکە، وەك سەید قوتب، پێیان وایە کە دەرەجە لێرە تەنها پەیوەندیی بە سیاقی ئایەتەکەوە هەیە، کە ئەویش بریتییە لە تەڵاقی رجعی (تەڵاقێك کە پیاو دەتوانێ هاوسەرەکەی بگەڕێنێتەوە). ئایەتەکە پێش و پاشەکەی هەمووی باسی تەڵاقە و لە ڕستەی پێشتریدا دەفەرموێ: (وبعولتهن أحق بردهن فی ذلك إن أرادوا إصلاحا: شووەکانیان شایستەترن بۆ گەڕاندنەوەیان لە ماوەی چاوەڕوانی و عیددەدا، ئەگەر ویستیان چاکسازی بکەن و ئاشت ببنەوە)، ئینجا دەفەرمێ: "ولهن مثل الذی عليهن بالمعروف و للرجال عليهن درجة والله عزيز حكيم. الطلاق مرتان فإمساك بمعروف أو تسريح بإحسان: ژنان مافیان هەیە بەسەر پیاوانەوە... پیاوان پلەیەکیان بەسەر ژنانەوە هەیە (کە ئەویش بریتییە لە مافی گەڕاندنەوەیان لە دوای تەڵاقدانیان). خوا باڵادەست و زانایە. ئەم جۆرە تەڵاقە (کە پیاو دەتوانێ هاوسەرەکەی بەرێتەوە) دووجارە؛ کەواتە ئەگەر دەیەوێ بگەڕێنێتەوە و لەگەڵی بمێنێتەوە و ژیانی هاوسەریی بباتەسەر، بە جوانی و چاکەکاری و ڕێکوپێکی لەگەڵی بمێنێتەوە، یانیش زۆر بە جوانی و چاکەکاری بەری

1 . (البقرة: 228).

بدات و لێی جیا بێتەوە، نەك ئازاری جەستەیی و دەروونیی بدات". بە پێی تەفسیری قوتب، ئەم پلەیە کە دراوەتە پیاو، تەنها لە مافی گەڕانەوەی هاوسەرەکانیان کورت دەبێتەوە؛ چونکە پیاو بووە کە تەڵاقی داوە و هەر ئەویش مافی هەیە کە بگەڕێنێتەوە؛ ئەوەش تەنها پابەندە بەو شوێن و هەڵوێست و چوارچێوەیەوە، نەك مافێکی ڕەها و گشتی بێت، هەروەك زۆر لە زانایان وا تێگەیشتوون و بە هەڵە ئاماژە پێ دەکەن و لە غەیری شوێنی خۆی بە بەڵگە دەهێننەوە.[1]

خۆ ئەگەر ئەم حاڵەتە بە شێوەیەکی گشتیش لەقەڵەمی بدەین، نەك تەنها لە بواری تەڵاقدا، ڕای ئیبن عەباس ـ ر.خ ـ لە لایەن زانایانی تەفسیرەوە بە باشترین تەفسیر و لێکدانەوە هێنراوەتەوە، کە سەبارەت بە چەمکی دەرەجە دەفەرمێ:

"دەرەجە بریتییە لە پلەوپایەی زیاتری پیاو لە چاکەکاری و مافپێدانی ژنان لە مامەڵەکردن لەگەڵیاندا؛ واتە پیاو شایستەتر و پێشترە لە ژن، کە لە هەندێ مافی خۆی خۆش بێ یان لە هەندێ ئەرکی ژن چاوپۆشی بکات... پاشان دەفەرمێ: پێم خۆش نییە کە هەموو مافەکانم لە هاوسەرەکەم وەربگرمەوە و لێی داوا بکەم، بۆ ئەوەی بگەمە پلەوپایەی باشتربوون و بەرزتربوون لە هاوسەرم؟"[2]

کەواتە وشەی (دەرەجە) هەروەك زانایانی ئیسلام تەفسیریان کردووە بریتییە لە: گەیشتن بە پلەی ڕەحمەت، لێبوردەیی، چاوپۆشی و چاکەکاری لەگەڵ ژنان. ئەگەرچی ژنانیش دەتوانن بگەنە ئەو پلەوپایەیە، بەڵام قورئان دەفەرمێت ئەمە بۆ پیاوان شایستەتر و گونجاوترە و، زیاتر لەوان چاوەڕوانی دەکرێت کە ئەم چاکەکارییە لەگەڵ ژنان بکەن.[3]

بەڵام ڕۆشنبیرە فێمێنیستەکان و زۆریتر لە ناحەزانی ئیسلام بەهەڵە لەو ئایەتە تێگەیشتوونە و وشەی دەرەجە بە پلەی دەسەڵات و خۆسەپاندن و زاڵبوون بەسەر ژناندا دەزانن و، ئەمەش بە جۆرە زوڵم و ستەم و چەوساندنەوەیەك دژ بە ژنان دەناسێنن!

محەممەد عەبدە ــ زانای هەرە گەورەی ئیسلام لە سەدەی بیستەمدا ــ لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت:

"ئەمە ڕێسایەکی گشتی و عامە کە دەڵێت: (ولهن مثل الذی علیهن بالمعروف) ژن و پیاو لە هەموو ماف و ئەرکەکاندا لەگەڵ یەکتر یەکسانن، تەنها یەك شت نەبێت کە ئەویش:

1 . سید قطب؛ المصدر نفسه؛ صص 264 - 265.

2 . الطبري، إبن جریر (2006)؛ "**جامع البیان فی تفسیر القرآن**"؛ المجلد الرابع؛ دمشق: مؤسسة الرسالة؛ ص 536.

3 . مسیکه بر، د. فتنت (1992)؛ "**حقوق المرأة بین الشرع الإسلامي و الشرعة العالمیة لحقوق الإنسان**"؛ بیروت: مؤسسة المعارف؛ ص 104.

(للرجال عليهن درجة) کە ئەوەش بریتییە لە شایستەتربوونی پیاو بۆ پێدانی ماف بە ژنان و جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان... بۆیەش نبین عەباس ـ ر.خ ـ دەفەرمێ: من لەبەر ئەم ئایەتە ئارایشت دەکەم و خۆم دەڕازێنمەوە بۆ ژنی خۆم هەروەك ئەویش خۆی بۆ من ئارایشت دەکات و خۆی دەڕازێنێتەوە... ئەم ئایەتە ئەگەر شتێکی لەسەر ژن واجب کردووە، چەند شتێکی لەسەر پیاو بە ئەرك و واجب دەزانێت... چونکە ئەم ئایەتە تەفسیری ئایەتی‌ترە کە دەفەرمێت: (الرجال قوامون على النساء بما فضل الله بعضهم على بعض و بما أنفقوا)."[1]

شێخ مەحموود شەلتووت ـ سەرۆکی پێشووی زانکۆی ئەزهەر ـیش دەڵێت:

"ئەوانەی کە ئەم ئایەتە بەوە دەزانن کە ڕێگا بە پیاو دەدات ستەم لە ژن بکات، ئەوا لەو ئایەتە تێنەگەیشتوون. خوا دەفەرمێت: (و قد أفضى بعضكم إلى بعض و أخذن منكم ميثاقا غليظا:[2] لەکاتێکدا ئێوە - ژن و مێرد - چوونەتە لای یەکتر و ژنانیش پەیمان و بەڵێنێکی گەورە و گرنگیان لێ وەرگرتوون)، هەروەها دەفەرموێت: (ذكر أو أنثى بعضكم من بعض:[3] ژن یان پیاو وەکو یەکن (ئێوە لەوانن و ئەوانیش لە ئێوەن)، یان دەفەرمێت: (هن لباس لكم و أنتم لباس لهن:[4] ژنان پۆشاکن بۆ ئێوە و ئێوەش پۆشاکن بۆ ئەوان)، یان دەفەرمێت: (و من آياته أن خلق لكم من أنفسكم أزواجا لتسكنوا إليها و جعل بينكم مودة و رحمة:[5] یەکێك لە نیشانەکان و بەڵگەکانی دیکەی خوا ئەوەیە کە هەر لە خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لە لایدا و لە نێوانتاندا خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانیی فەراهەم هێناوە)."[6]

بەڵام سەبارەت بە مانای "قەوامە" کە لەم ئایەتدا دەفەرمێ: (الرجال قوامون على النساء بما فضل الله بعضهم على بعض و بما أنفقوا: پیاوان سەرپەرشتیارانی ژنەکانن، ئەمەش بەهۆی زیادە ئەرکێکەوەیە کە خوا داویەتی بە هەندێك بەسەر هەندێکی‌تردا و بەوەی کە پیاوان لە ماڵ و سامانیان خەرج دەکەن). وشەی "قوام" سیغەی موبالیغەی وشەی "قائم"ـە، بە واتای: ڕاوەستاو، هەڵسووڕێنەر، جێبەجێکەر، خزمەتکار. بەم پێیە مانای "قوام" دەبێتە کەسێك کە زۆر خزمەتکارە و بەردەوام ڕاوەستاوە لە خزمەتدا و چاودێری و بەخێوکاری دەکات. ئەم ئایەتە زۆر بە ڕوونی ئاماژە بە پەیوەندی نێوان (قەوامە: سەرپەرشتی) و (إنفاق: خەرجکردن) دەکات. هەروەك لە

1 . د. محمد عمارة؛ المصدر نفسه؛ صص 119 - 120.
2 . (النساء: 21).
3 . (آل‌عمران: 195).
4 . (البقرة: 187).
5 . (الروم: 21).
6 . شلتوت، محمود (2001)؛ "**الإسلام عقيدة و شريعة**"؛ القاهرة: دارالشروق؛ الطبعة 12؛ ص 159.

تەفسیرەکانیشدا هاتووە: لەبەر ئەوەی پیاوان بەتواناترن لە دابینکردنی خۆراك و پۆشاك و نەفەقە و خەرجیی ژن و منداڵان و خێزان بە گشتی، هەروەها بەخێوکردنیان، خوا ئەمەی کردووەتە قەوامەی پیاو بەسەر ژنانەوە؛ چونکە باشتر دەتوانن کاروباری ژنان جێبەجێ بکەن و پێداویستییەکانیان دابین بکەن.[1] وەك بڵێین: ئەگەر خێزانێك (ژن و پیاو و منداڵەکانیان) بە ئۆتۆمۆبیل بەتەمای سەفەرێك بن، یەکێك دەبێ ئەم ئۆتۆمۆبیلە لێبخوڕێ. ئەگەر پیاو ببێتە شۆفێر، ڕاستە کە سوکانی لە دەستە و چەپ یان ڕاست لێدەخوڕێت، بەڵام ئەمە جگە لە بەرپرسیارییەتی و ئەرك، خزمەتکردنی هاوسەر و منداڵەکانیشە کە بەهۆی زەحمەتی مێردەکەیەوە دەگەنە شوێنی مەبەست، بێ ئەوەی زەحمەت ببینن و لە ناو ئۆتۆمۆبیلدا جگە لە شۆفێر، هەر یەك بۆ خۆی پاڵ دەداتەوە!

ئەگەر پیاو نەتوانێ شۆفێری بکات، ژن دەتوانێت خێزانەکەی بگەیەنێتە شوێنی مەبەست! هەر بۆیەش لە شەرعی ئیسلامدا ئەگەر پیاوێك نەتوانێت خێزانی خۆی بەخێوبکات و پێداویستییەکانی هاوسەری خۆی دابین بکات، ناشتوانێ ببێتە قەوامی ژنی خۆی، و ژن بۆی هەیە لەبەر بەجێنەهێنانی مەرجەکانی عەقد (مارەیی) کە خوا بە پەیمانێکی گەورە ناودەبات، مارەییەکەی هەڵوەشێنێتەوە و لێی جیاببێتەوە.[2]

کەواتە قەوامەی پیاو لەسەر ژن، شتێکی ڕەها و هەمیشەیی و بۆ هەموو کات و شوێنێك نییە، نە لە ڕووی مەبدەئییەوە و نە لە ڕووی دەقی قورئانیشەوە، بەڵکو چوارچێوەیەکە حەسر کراوە لە بەرژەوەندی و خزمەتی خێزاندا؛ واتە ئەو بەرپرسیارییەتییەی کە لە ئەستۆی پیاودایە بەرامبەر بە دابینکردنی خەرجی و بژێوی ژیانی ژنان دانراوە، تەنها بریتییە لە چاودێری و خەرجکردن، نەك دیکتاتۆری و چەوساندنەوە. ئەمە تەکلیف و ئەرکە، نەك تەشریف و ماف؛ کەواتە قەوامە بریتی نییە لە خۆسەپاندنی پیاو یان بەژێردەستەکردن و ئازاردانی ژنان. هەروەها ئەو مانایەش ناگەیەنێت کە ژن خۆی بە بەرپرسیاری پیاو و منداڵ و ماڵ و سامانی نەزانێت!

باس، باسی چوارچێوەی خێزان و ناوماڵە، هەروەها دابەشکردنی کار و ئەرکەکان و مافەکانە لە نێوان هەردوو لایەنی (میثاق غلیظ) کە پێکەوە خێزانێکیان پێك هێناوە، کە ئەم دابەشکردنەش بەمانای جیاکاری نییە، بەڵکو بە مانای جیاوازییە بە پێی سروشتی هەریەك لەو دوو لایەن، کە

1 . إبن جرير الطبري؛ المصدر نفسه؛ ص 37.

2 . القرطبي؛ المصدر نفسه؛ المجلد 5؛ ص 169.

کامیان دەتوانن لەو ڕۆڵنواندنە باشتر بەرهەمیان هەبێت. ئەم تێگەیشتنە هەڵەیە کە تەنها لە هەندێ تەفسیرات و ڕاوبۆچوونەکان سەرچاوەیان گرتووە، لەگەڵ تێگەیشتنی ئیسلام و قورئان ناگونجێت. تەنانەت بۆ قەوامە کە تەنها تایبەتە بە ماڵەوە، ئاماژە دەکات کە پێویستە لە خێزاندا هەموو کارەکان، هەروەك گرێبەست و مارەبڕینەکان بە ڕەزامەندیی هەردوو لایەن (ژن و پیاو) دەبێت، بە ڕازیبوون و ڕاوێژکاریی هەردوو لایەن ئەنجام بدرێن. قورئان دەفەرمێ: دەبێ هەموو بڕیارەکان (چ لەسەر ئاستی گەورەترین دەسەڵاتی کۆمەڵگا بێت،[1] چ لەسەر ئاستی مامناوەند،[2] بگرە تا ئاستی خێزانیش) پێویستە بە ڕاوێژ (شورا) واتە بەشدارکردنی هەموو تاکەکانی خێزان ئەنجام بدرێن؛ چونکە شورا گەورەترین تایبەتمەندیی ژن و پیاوی ئیمانداره، کە پێویستە لە هەموو کایەکانی بەڕێوەبردن و ناوەندەکانی بڕیاردان هەبێت؛ چونکە بەپێچەوانەکەی دیکتاتۆری و فیرعەونییەت دروست دەبێت کە خوا لێی بێزارە. خێزانیش بچووکترین دامەزراوە و یەکەمین کایەی کۆمەڵایەتییە، کە پێویستە هەر کارێك کە ئەنجام دەدرێت (بەتایبەتی ئەو کارانەی کە بە هەردوو لایەن گرێدراوە)، نابێ تەنها یەکێکیان بڕیار بدات و پێویستە بە ڕاوێژ و ڕەزامەندیی هەر دوو لایەنی گرێبەستەکە بێت؛ هەروەك قورئان لەو ئایەتەدا ئاماژە بە هەر دوو چەمکی (تراض منهما و تشاور: ڕازیبوونی هەردوو لایەنی ژن و پیاو و ڕاوێژکردنیان) دەکات کە باس لە بڕیاری شیربڕینەوەی منداڵ و ماوەی شیردانەکەی و هەبوونی منداڵی نوێ و زیان نەگەیشتن بە دایك لەبەر منداڵ و ئەو بابەتانە دەکات:

﴿... فإن أرادا فصالا عن تراض منهما و تشاور فلا جناح عليهما﴾؛[3] واتە: ... ئەگەر دایك و باوك هەر کاتێك بە ڕەزامەندی و پرس و ڕای هەردوو لا ویستیان منداڵەکەیان لە شیر ببڕنەوە، ئەوە قەیناکات و هیچ گوناهێکیان لەسەر نییە.

ئەمەیە تێگەیشتنی ئیسلامییانە لە چەمکی قەوامە، کە بریتییە لە سەرپەرشتی و بەرپرسیارییەتی و ئەرکی زیاتری پیاو، هاوکات لەگەڵ یەکسانیی ژن و پیاو بەبێ جیاکاری؛ لە

1 . خوا بە پێغەمبەرەکەی ـ د.خ ـ کە بەرپرسی یەکەمی دەوڵەتی ئەو کات بووە، ئەمر دەکات: ﴿و شاورهم فی الأمر﴾؛ واتە لە هەموو بوارەکان ڕاوێژیان لەگەڵ بکە. (آل‌عمران: 159).

2 . لەدوای گەورەترین ئاست، ئاستی پەرلەمان و وەزارەتەکان و دامەزراوەکانی دیکە دێت، کە خوا لە میانەی ئەمرکردن بە ئەسحابی پێغەمبەر ـ د.خ ـ دەفەرمێت: ﴿و أمرهم شوری بینهم﴾؛ واتە: کاروبارەکان لە نێوان خۆیاندا بە شورا و پرس و ڕاوێژ ئەنجام دەدەن، نەك دیکتاتۆری. (الشوری: 38).

3 . (البقرة: 233).

حەدیسی عایشەدا ــ ر.خ ــ هاتووە كە پێغەمبەر ــ د.خ ــ دەفەرمێت: ﴿إنما النساء شقائق الرجال﴾.[1] واتە: ژنان لەتكی پیاوانن و وەكو ئەوانن. بەو مانایەی ئەگەر پیاو لەتكی دووەمی نەبێت دەبێتە نیوە و ئەمەش واتە ناتەواوبوونی مرۆڤایەتی؛ چونكە نە ژن، نە پیاو بە تەنیایی مرۆڤایەتی پێك ناهێنن، بەڵكو بە پەیوەندییەكی ئاریكارانە و تەواوكارانە پێكی دەهێنن؛ نەك بە دژایەتی و ململانێ و ڕكابەرایەتی.

یان ئەو كاتەی كە عایشە پرسیاری لێ دەكرێت كە پێغەمبەر ــ د.خ ــ لە ماڵدا چی دەكرد؟ دەفەرمێت: ﴿كان بشرا من البشر، يفلي ثوبه، و يحلب شاته، و يخدم نفسه﴾؛[2] واتە: مرۆڤێكی ئاسایی بوو، وەكو هەموو مرۆڤەكان. بەخۆی جلی خۆی دەشوشتەوە، بە خۆی مەڕی دەدۆشی و بە خۆی خزمەتی خۆی دەكرد. لە حاڵێكدا بەرپرسی یەكەمی هەموو ئۆمەتی ئیسلام بوو، لە دین و دونیا و، لە دەوڵەت و كۆمەڵگاشدا!

كەواتە قەوامە بەو مانایە نییە كە هەموو پیاوێك لە ماڵدا سەرپەرشتیاری ژن بێت و هەروەك گوتمان شتێكی ڕەها نییە؛ چونكە مەرجەكانی قەوامە گرێ دراوە بە توانستەكانی پیاو بۆ خەرجیی ماڵ، و لەبەر ئەوەی زۆربەی پیاوان بەرامبەر بە زۆربەی ژنان (وەكو بابەتێكی ئاماری) لەو تایبەتمەندییە تواناییان زیاترە، بۆیە پیاو لەو ئایەتەدا ناوی براوە؛ واتە ئەگەر پیاو نەیتوانی ئەم ئەركە بەجێ بێنێ و ژنەكەی ئەم ئەركە بە ئەستۆ بگرێ، ئەو كات ژن دەبێتە قەوام و سەرپەرشتیاری پیاو. بەو مەرجەی كە ئەو خاوەنی ئەم تایبەتمەندیی و سیفاتانە بێت. هەروەك لە زۆر ماڵاندا دەبینین كە پیاو لەبەر نەخوێندەواری، نەخۆشی، پەككەوتن، تەمبەڵی، هەرزەیی، یان زیندان، ژن ماڵ و منداڵی خۆی پێ بەخێو ناكرێ.

لە كۆتاییدا لەو فێمێنیستانە دەپرسم: سەرەڕای هەموو ئەو خاڵانەی سەرەوە كە باسمان كرد، هەروەك ئێوە دەڵێن، وا دادەنێین كە مەبەست لە قەوامە بریتییە لە سەرپەرشتی و سەرۆكایەتی و دەسەڵاتداری و باڵادەستیی پیاو لەسەر ژن! ئایا ژیانی هاوسەرێتی، ژیانێكی كۆمەڵایەتی نییە؟ ئایا خێزان یەكەیەكی كۆمەڵایەتی نییە و هەر یەكە و دامەزراوەیەك پێویستی بە سەرۆك و بەرپرسێك نییە كە ئیمزا و ڕەزامەندیی كۆتایی لە دەستی ئەو بێت؟ ئایا دەكرێ لە یەك دامەزراوەدا، وەك خێزان، دوو بەرپرس هەبێت و هەریەك بەبێ ڕەزامەندی و ڕاوێژی لایەنی

---

1 . رواه أبوداود و الترمذي و الدارمي و الإمام أحمد.

2 . رواه الإمام أحمد.

بەرامبەر بۆ خۆی بڕیار بدات؟ ئایا ئەو سیستمە ناڕۆخێ و تووشی لێکترازان نابێ؟ ئیسلام پێی خۆش نییە هیچ دامەزراوەیەك بێسەرپەرشت بێت، تەنانەت دەڵێ ئەگەر سێ کەسی ئاسایی کۆ بوونەوە و بە نیازی کارێك بوون، با یەکێك لە خۆیان بکەنە سەرپەرشتیار؛ پێغەمبەر ـ د.خ ـ دەفەرمێ: ﴿إذا كان ثلاثه في سفر فليؤمروا أحدهم﴾؛[1] واتە: هەرکات سێ کەس پێکەوە چوونە سەفەرێك، پێویستە یەکێکیان بکەنە بەرپرس و سەرپەرشت.

کەواتە ئەگەر مانای سەرۆکایەتی و دەسەڵاتداریی پیاویش بێت، هیچ شتێکی نالۆژیکی نییە و مەبەستیش ئەوە نییە کە ژن نەوێرێ بجووڵێتەوە یان بە ویستی خۆی کار بکات، هەروەها مانای ئەوە نییە کە ژن، ژێردەست و بێدەسەڵاتە و نابێ بەبێ ڕەزامەندی و ئیمزای پیاو هیچ کارێك بکات! ئەوەتا پێغەمبەر ـ د.خ ـ دەفەرمێ:

﴿كلكم راع، وكلكم مسئول عن رعيته، فالأمير الذى على الناس راع، وهو مسئول عن رعيته، والرجل راع على أهل بيته، وهو مسئول عنهم، والمرأة راعية على بيت بعلها وولده، وهى مسئولة عنهم، والعبد راع على مال سيده، وهو مسئول عنه، ألا فكلكم راع مسئول عن رعيته﴾؛[2] واتە: هەمووتان (بە ژن و پیاوەوە)- شوان و چاودێرن و هەمووشتان بەرپرسیاری ژێردەستەکانتانن. فەرمانڕەوا لەسەر خەڵك چاودێر و بەڕێوەبەرە و بەرپرسیارە لە ژێردەستەکانی. پیاو بەڕێوەبەرە لەسەر ئەندامانی ماڵەکەی و بەرپرسیارە بەرامبەر بەوان. ژن بەڕێوەبەری ماڵی شوو و منداڵەکانییەتی و، بەرپرسیاریشە لێیان. خزمەتکاریش شوان و چاودێری ماڵی سەردارەکەیەتی و لە بەرامبەریشدا بەرپرسیارە. هەمووتان بزانن کە هەرهەمووتان شوانن و لە ژێردەستەکانتان بەرپرسن.

ئەگەر سەیری ئەم فەرموودەیە بکەین، دەبینین کە پیاو بە بەرپرسیاری ئەندامانی ماڵەکەی دانراوە، بەڵام بۆ ژن دەفەرمێ: بەرپرسیار و لێپرسراوی ماڵی شوو و منداڵەکانیشە!

"لویس سیدیۆ" دەڵێ:

"قورئان ـ کە دەستووری موسڵمانانە ـ پلەی ژن بە قەوامەی پیاوان، نەك تەنها کەم ناکاتەوە، بەڵکو زۆر بەرز دەکاتەوە... ئەگەر پیاوی کردبێتە سەرپەرشتی ژنان، بەڵام لە بەرامبەردا ژنیش مافی چاودێری و پشتیوانی و خەرجیکێشان و بەخێوکردنی دەداتێ، کە هەمووی دەبێتە ئەرکی پیاو".[3]

---

1 . رواه الحاكم و الدارقطني و البيهقي.

2 . متفق عليه.

3 . سيديو؛ المصدر نفسه؛ ص 110.

9) **سەبارەت بە فرەژنی**: هەروەك لە قسەکانی فێمێنیستەکان و ناحەزانی ئیسلاممان، بە هەموو ڕەوتەکانیەوە بینی، فرەژنی بابەتێکی دیکەیە، کە دەیکەنە پاساوێك بۆ ڕەخنەگرتنێکی توند لە ئایین و زۆرهێنان بۆ ناوەندەکانی هێزی یاسادانان بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم دیاردەیە، تاکو بە شێوەیەکی ڕەسمی، بە ڕەفتارێکی نایاسایی لەقەڵەم بدرێت و هەر پیاوێك زیاتر لە ژنێك بهێنێ، وەکو تاوانبارێك تووشی سزای کۆمەڵگا ببێتەوە. ڕۆشنبیران و فێمێنیستەکان یاسای فرەژنی بە یاسایەکی سەدەی تاریکیی سەردەمی مسیحییەت دەزانن و، هەوڵ دەدەن حکومەت ئەم جۆرە هاوسەرێتییە لە ناو کۆمەڵگای کوردیدا یاساغ و قەدەغە بکات و، لەبەر ئەوەی ئەوان هەر شتێك کە ڕەنگ و بۆنی ڕۆژئاوای لێوەبێ، پێشوەختە قبووڵی دەکەن و بە واتایەکی‌تر لاسایی لە ڕۆژئاوا بووەتە ئەسڵێکی نەگۆڕ لای ئەوانە؛ بۆیە بەبێ لێکۆڵینەوە و بەبێ ڕەچاوکردنی دەرئەنجامەکانی جێبەجێکردنی لەناو کۆمەڵگادا هەوڵی بۆ دەدەن. کە دژایەتیی ئەوان لەگەڵ فرەژنییش بە هەمان شێوەیە. کەچی ڕێك ئەو کاتەی کە ڕۆژئاوا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە تاریکایی و شەوەزەنگدا سەری لێ شێوابوو، فرەژنی ئەسڵێکی بنچینەییان بوو و واش نەبوو کە بەهۆی قەدەغەکردنی فرەژنی پێش کەوتبێتن، بەڵکو بە پێچەوانەوە ڕێك ئەو کات کە ڕۆژهەڵات لە لووتەکی پێشکەوتندا بوو، ڕێپێدانی فرەژنیش نەببووە هۆی بەربەست و ئاستەنگ لە پێشکەوتن و گەشەکردنیان، بەڵکو "ئەوە بانگەشەکەرانی ئایینی مەسیحیەتی ڕۆژئاوایی بوون کە ڕێگرییان لە فرەژنی کرد و دوای سەردەمی ئیمپریالیزم و داگیرکاری، هەوڵی بنبرکردنی ئەم دیاردەیەیان دا."[1]

ئەوان بە شێوەیەك قسە دەکەن، وەك بڵێی ئیسلام داهێنەری ئەم دیاردەیە بووبێ و پێشکەشکاری یەکەمە بۆ هەموو جیهانییەکان و لەو ڕێگایەوە جیاکارییەکی زۆر ئاشکرا و ناپەسەند دەخاتە نێو ژن و پیاوەوە. پیاو بۆی هەیە هەتا چوار ژن بهێنێ، بەڵام ژن بۆی نییە جگە لە یەك شووی هەبێت! ڕۆشنبیران و فێمێنیستەکان بە شێوەیەك لەسەر بابەتی فرەژنی دەدوێن، گوایە ئەمە بەشێکە لە بنەماکانی ئیسلام و عیبادەتەکانی، یان یەکێکە لە واجبات یان لانیکەم موستەحەبەکانی!

بەڵام دەبێ بزانرێ ئەم تێگەیشتن و ئەم هاشوهووشکردنە زۆر بێبنەمایە و تەنها بۆ چەواشەکردنی خەڵکە؛ چونکە بەپێی چوارچێوەی گشتی و باو، هەروەها دۆخی سروشتیی ژیانی کۆمەڵایەتی لە ئیسلامدا، ئەسڵ ئەوەیە کە پیاو یەك ژنی هەبێت، تاکو ئامانجی سەرەکیی

1 . Giddens, Anthoniy (1993), "Sociology", Oxford Polity Press, p. 393.

هاوسەرێتی کە بریتییە لە ئارامی و ئاسوودەیی و خۆشەویستی و بەختەوەری بۆ هەر دوو لایەن دابین بکرێت؛ بۆیە زانایانی ئیسلام وتوویانە:

"کەسێك کە ژنێکی باشی هەبێ، کە بە شێوەیەکی ئاسایی پێداویستییەکانی دابین بکات، باش نییە (مکروە) ژنێکیتر بێنێ؛ چونکە بەبێهۆ خۆی دەخاتە بەر ڕێگای گوناە و کاری حەرام، لەبەر ئەوەی لەوانەیە نەتوانێ مەرجەکانی حەڵاڵبوونی ژنی دووەم بەجێ بێنێ."[1]

لێرە هەوڵ دەدەین لێکدانەوە و شیکردنەوەیەکی مێژوویی، ئەنترۆپۆلۆژی، ئەتنۆگرافی، دیموگرافی، کۆمەڵناسی و بایۆلۆژی بۆ دیاردەی "فرەژنی" بکەین، کە دەبنە پاساوی باوبوون و ڕێپێدانی لە کۆمەڵگا جیاجیاکاندا:

دیاردەی فرەژنی ـ هەروەك زانایان دەڵێن ـ لەسەرەتای ژیانی مرۆڤایەتییەوە هەبووە. "ئاندرێ دۆئێ" و "ڕێنزۆ ڕۆسی" ـ دوو دێرینەناسن ـ لە توێژینەوەکانی خۆیان دەردەخەن کە: مرۆڤی سەرەتایی، تاکهاوسەر نەبووە.[2] مێژوو نیشان دەدات کە فرەژنی لەسەرتاسەری زەوی لە نێوان زۆربەی شارستانییەتە کۆنەکان باو بووە؛ وەکو: ماد، بابل، ئاشووری، ئێرانی، هندو و چینییەکان.[3]

بەپێی لێکۆڵینەوەی زانایانی ئەنترۆپۆلۆژی و ئەتنۆگرافی کە لە (1231) کۆمەڵگای سەرەتایی کۆڵیونەتەوە و لە ئەتلەسی ئەتنۆگرافیی "مۆرداك" تۆمار کراون، لە (1041) کۆمەڵگا "فرەژنی" (Polygamy)، لە (186) کۆمەڵگاش "تاکهاوسەری"(Monogamy) و، تەنها لە (4) کۆمەڵگا "فرەپیاوی" (Polyandry) (واتە زیاتر لە یەك شووهەبوون) باو بووە![4] لە مێژووی ئایینە ئاسمانی و دەستکردەکانی جیهانیش فرەژنی بە شێوەیەکی بێسنوور دەبینرێت: لە ئایینی چینییەکان بەهۆی یاسایەکەوە بە ناوی "لیکی" بۆ هەر پیاوێك هەبووە کە هەتا (130) ژن بهێنێت. لە ئایینی یەهوودیدا یەك پیاو دەیتوانی زیاتر لە (100) ژنی هەبێت.[5]

یاسای فرەژنی لە ئایینی مەسیحییەتیشدا هەتا سەدەی (17) بە ئاشکرایی هەبووە. ئەگەر ئێستا لە وڵاتە مەسیحییەکان دەبینین کە ڕێگە لەو یاسایە دەگیرێت، بە واتای ئەوە نییە کە

---

1 . د. یوسف القرضاوي؛ همان منبع؛ ص 115.

2 . منتظمی، بهروز (2001/8/1)؛ "**نخستین بشر کیست؟**"؛ تهران: روزنامەی نوروز؛ چهارشنبە: شمارە 96.

3 . امیر علی هندی، سید سعادت (1991)؛ "**تاریخ سیاسی و اجتماعی اسلام**"؛ ترجمە: ایرج رزاقی و محمد مهدی حیدرپور؛ مشهد: انتشارات آستان قدس رضوی؛ ص207.

4 . George P. Murdock, op. cit., And Starkweather, Katherine; Raymond Hames, op. cit.

5 . امیر علی هندی؛ همان منبع؛ ص 208.

ئایینیان ڕێگریی لێ دەکات، بەڵکو بەهۆی یاسا مەدەنییەکانی ئەوانەوەیە؛[1] بۆیە ئێستاش فرەژنیی بێسنوور لە لایەن مەسیحییە ئوسوولییەکانی وەك "مۆرمۆنەکان" کە زیاتر لە (15) ملیۆن شوێنکەوتەی لە سەرتاسەری جیهاندا هەیە، باوە و پراکتیزە دەکرێت[2]. ئامارەکانی (CAPWOI)* "ڕێکخراوی نێودەوڵەتیی بەرەنگاربوونەوەی فرەژنی و چەوساندنەوەی ژنان" دەڵێن: زیاتر لە 3 ملیار کەس لە دانیشتووانی زەوی واتە (43%)یان بڕوایان بە فرەژنی هەیە و بە شتێکی پەسەند و باشی دەزانن. تەنها لە ئەمریکا نزیکەی (100) هەزار کەس، لە ژنێك زیاتریان هەیە. لە ساڵی (2000) ئامارێك لە لایەن هەمان ڕێکخراوەوە بڵاو دەبێتەوە، کە ئاماژە بەوە دەکات: زیاتر لە (100) هەزار پیاو لە ئەوروپای ڕۆژئاوا، بە شێوەیەکی نهێنی زیاتر لە یەك ژنیان هەیە.[3] لە ساڵی (1987) توێژینەوەیەك لە ئەمریکا لەسەر فرەژنی کراوە، کە ئەو مۆرمۆنیستانەی کە هاوکات چوار ژن یان زیاتریان هێناوە، ڕێژەی (77.3%)یان پێکدەهێنن![4] "بریگام یانگ"** پێشەوای ئایینی مۆرمۆنەکانی ئەمریکا، (55) ژنی هەبووە![5] جگە لە مۆرمۆنەکان، فرەژنی لە نێوان "ئانابابتیستەکان" ـ تایفەیەکی بناژۆخوازی پرۆتستانتە ـ لە ئەڵمانیاش زۆر باوە و ئێستاکەش پراکتیزە دەکرێت.[6] بەپێی توێژینەوەکانی "جۆرج پیتەر مۆرداك" ـ ئەنترۆپۆلۆژیستی ئەمریکی ـ فرەژنی ئێستا زیاتر لە (75%)ی کۆمەڵگاکانی جیهاندا باوە.[7]

فرەژنی ـ بەپێی بەڵگە مێژووییەکان ـ لە نێوان عەرەبە نەفامەکانی پێش ئیسلامیش بەبێ سنوور باو بووە. "ویل دیۆرانت" دەڵێت:

> "فرەژنی بەبێ هیچ کۆت و مەرجێك لە نێوان عەرەبەکاندا باو بوو و ژن کاڵایەك بوو لە سامانەکانی باوك یان شوو یان کوڕ..."[8]

1 . زیدان، جرجی (1990)؛ "تاریخ تمدن اسلام"؛ ترجمه: علی جواهر الکلام؛ جلد 5؛ تهران: انتشارات امیر کبیر؛ چاپ 6؛ ص 943.

2 . LDS News (2014), "**official newsroom of the church**", from: http://www.mormonnewsroom.org

* Campaign Against Polygamy And Women Oppression International.

3 . Polygomy stop (2005), "**Statistics**": http://www.polygamystop.org

4 . Jessie L. Embry (1987)," **Mormon polygamous families: life in the principle**", University of Utah Press: Salt Lake city. pp. 31-33.

** Brigham Young (1801-1877).

5 . Johnson, Jeffrey Odgen (1987), "**Determining and Defining 'Wife': The Brigham Young Households**", Dialogue: A Journal of Mormon Thought 20 (3),. pp. 57-70.

6 . Detmer, Heinrich (2010), "**Johann von Leiden**", Montana: Kessinger Publishing, LLC,. p. 6.

7 . Browne, Ken (1992), "**An Introduction to Sociology**", Oxford Polity Press, pp. 213-214.

8 . دورانت؛ همان منبع؛ ص 233.

هەروەها دەڵێت:

"زانایانی مەسیحیی سەدەکانی ناوەڕاست وایان دەزانی کە فرەژنی لە داهێنانەکانی پێغەمبەری ئیسلامە، لە حاڵێکدا وا نییە و ئەم دیاردەیە لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکانیشدا هەبووە."[1]

"گۆستاڤ لۆبۆن"یش دەڵێت:

"نەریتی فرەژنی، هەرگیز پەیوەندیی بە ئیسلامەوە نییە و بەرلە ئیسلام لەناو هەموو نەتەوەکاندا هەبووە؛ بە تایبەتی لە ڕۆژهەڵاتی جیهان وەکو یەهوودییەکان، ئێرانییەکان و عەرەبەکان و ..."[2]

"ڤۆلتێر"یش لە وەڵامی قەشەیەکی پرۆتستانی بە ناوی "ریلاند" (Reland) کە ئایینی ئیسلام تۆمەتبار دەکات، بە تووڕەییەوە دەڵێت:

"محەممەد یاسازانێکی زۆر زیرەك و ئاقڵ بوو، کە ویستووە مرۆڤایەتی لە بەدبەختی و نەفامی و گەندەڵی ڕزگار بکات. بۆ هێنانەدیی ئامانجەکانی، بەرژەوەندیی هەموو خەڵکی سەر گۆی زەوی، لە ژن و پیاو، بچووك و گەورە، شێت و فامدار، ڕەش و سپی، زەرد و سووری ڕەچاوکردووە و هەرگیز فرەژنیی دروست نەکردووە و بەڵکو بە پێچەوانەوە ژمارەی بێسنووری ئەو ژنانەی کە لەسەر جێگای پاشاکان و فەرمانڕواکانی وڵاتانی دنیا دەخەوتن، هەتا چواری سنووردار کرد... ئایا ئایینی ئیسلام شەهوەتپەرستە یان ئایینی تۆ و یەهوودییەت؟ ئەگەر محەممەد ڕێگەی داوە بە پیاوان کە هەتا چوار ژن دەتوانن بێنن، بەڵام مەرجی زۆر سەخت و دژواریشی داناوە، کە هەمووی لە بەرژوەندیی ژنانە... باشترە دەمی خۆت بگری کە شتێك نازانی! یاساکانی قورئان سەبارەت بە زەماوەند و تەڵاق، بێژمار لە یاساکانی ئینجیلەکەت باشتر و سەرترە!"[3]

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئیسلام ئەگەرچی موسڵمانان بۆ "زەماوەند" هان دەدات، بەڵام هەرگیز بۆ "فرەژنی" هانیان نادات. ڕوانگەی ئیسلام بەرامبەر بە فرەژنی، ڕوانگەیەکی ڕێپێدان و مۆڵەتدانە، نەك ڕاسپاردە (تەوسییە) و دەستووری. قورئان بە هیچ شێوەیەك کەسی ڕانەسپاردووە کە زیاتر لە یەك ژن بهێنێ، بەڵام ڕێگاش ناگرێت کەسێك دوو یان سێ یان چواری بهێنێ، ئەگەر بتوانێ مەرجە سەختەکانی جێبەجێ بکات. گەورەترین مەرج کە قورئان باسی دەکات بریتییە لە "دادپەروەری"، کە پێویستە هەموو پێداویستییەکانی ژیانی ماددی و فیزیکی، مەعنەوی و

1 . دورانت، ویل (2012)؛ "**تاريخ تمدن**"؛ جلد 1 (مشرق زمين گاهواره تمدن)؛ ترجمه احمد آرام و ديگران؛ تهران: انتشارات علمی و فرهنگی؛ چاپ پانزدهم؛ ص 50.

2 . Le Bon, op. cit,. P. 507.

3 . Voltaire; op.cit,. vol 11. P. 216.

دەروونی بە عەداڵەت بۆ ژنەکان دابین بکات کە زانایان زیاتر لەمانەدا کورت دەکەنەوە: خانوو، بژێوی و خۆراك، جلوبەرگ و پۆشاك، داوودەرمان، خوێندن، خەرجیی ماڵ و منداڵ، بگرە تا مانەوەی پیاو لە ماڵەکانی هاوسەرەکان بە یەکسانی و تەنانەت دەربڕینی خۆشەویستی و جووتبوونیش. خوا لەمبارەیەوە دەفەرمێ:

﴿و آتوا اليتامى أموالهم و لا تتبدلو الخبيث بالطيب و لا تأكلوا أموالهم إلى أموالكم إنه كان حوبا كبيرا. وإن خفتم ألا تقسطوا فى اليتامى فانكحوا ما طاب لكم من النساء مثنى وثلاث ورباع فإن خفتم ألا تعدلوا فواحدة﴾؛[1] واتە: ماڵ و سامانی کچە یەتیمەکان بدەنەوە دەست خۆیان (کاتێك گەورە بوون و فامیان کردەوە) و ماڵی خراپ و پیس تێکەڵ بە چاك و پاك مەکەن. ماڵ و سامانیان لەگەڵ ماڵ و سامانی خۆتاندا مەخۆن و مەیفەوتێنن. بەڕاستی ئەو کارە ستەم و گوناهێکی گەورەیە. ئەگەر دەترسن لە ئەنجامنەدانی دادپەروەری لەگەڵ کچە یەتیمەکان (ئەگەر بیانکەنە هاوسەرتان، ئەوە واز لەوان بهێنن و لەبری ئەوان)، لە ژنانیتر کە حەڵاڵن بۆتان ژن مارە بکەن دوو، یان سێ، یان چوار. ئەگەر (ناتوانن مەرجەکان بەجێ بێنن و) دەترسن لەوەی نەتوانن دادپەروەری بکەن لە نێویاندا، تەنها دەبێ یەك ژن بێنن.

ئەگەر سەیری ئەم دوو ئایەتەی سەرەوە بکەین، دەبینین کە بابەتی فرەژنی یەکسەر لەدوای بابەتی یەتیم و بێخاوەنەکاندا هاتووە و زۆر جەخت لەسەر پاراستنی مافیان دەکاتەوە. هەروەك زانایانی تەفسیر دەڵێن: دوور نییە کە ڕێگەپێدانی فرەژنی، ڕێگایەك بووبێ بۆ چاودێریکردنی مافی یەتیمە بێسەرپەرشتەکان، کە ئەرکی سەرشانی هەر موسڵمانێکی بەتوانایە کە بەخێویان بکات.

سەید قوتب ـ ر.خ ـ لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ:

"ئەم هەموو ئاماژەکردنە بە چەمکی (ئەگەر دەترسن) ترساندنی موسڵمانانە کە لەخوا بترسن و بۆ مەبەستی کەسۆکی و بەرژەوەندیی ماددیی خۆی، نزیك ماڵ و سەرمایەی یەتیمەکان نەبنەوە و نەگاتە ئەو ڕادەیەی کە لە پێناو گەیشتن بە ماڵ و سامانەکەیان، بێ ئەوەی خۆشەویستییەکیان لە ناو دڵدا هەبێ بۆیان، تامەزرووی هاوسەرێتییان لەگەڵ هەبێ. قورئان بەهۆی دووبارەکردنەوەی چەمکی (ترسان) دەیەوێ ویژدانی موسڵمانان بکاتە پاسەوان لەسەر ڕەفتاریان و بەردەوام هەست بە ترس بکەن لە خوا، هەمان ئەو خوایەی کە لە ئایەتێکی پێشتر دەفەرمێ: (يا أيها الناس اتقوا ربكم... إن الله كان عليكم

1 . (النساء: 2-3).

رقیبا: ئەی خەڵکینە لە خواتان بترسن... چونکە خوا شایەت و چاودێرە بەسەرتانەوە)؛ بۆیە ئەگەر ئەو سەرپەرشتیارانە کە ناتوانن دادپەروەری لەگەڵ ئەو کچە یەتیمانە بکەن کە بەخێویان دەکەن، با وازیان لێ بێنن و ژنانیتر هەن، کە ئەگەر بیانەوێ دەتوانن مارەیان بکەن... ئەم ڕێپێدانە بۆ فرەژنییە لەگەڵ ئەو خۆپاراستنە و ترساندنە لە بەرقەرارنەکردنی دادپەروەری، هەموو نیشانەی ئەوەیە کە بە یەك ژن بەس بکەن... ئیسلام سیستمێکە بۆ مرۆڤ؛ سیستمێکی واقیعی و پۆزەتیڤ؛ هەروەك لەگەڵ سرشت و پێکهاتەی گونجاوە، لەگەڵ واقیع و زەروراتەکەی، لەگەڵ دۆخی ژیانی کە بەردەوام لە شوێنە جیاواز و کاتە جیاوازەکاندا دەگۆڕێ، گونجاوە."[1]

هەندێ هۆکاری بایۆلۆژی و پزیشکی (شیکردنەوەی بایۆلۆژی) هەن، کە زۆر جار لە بارودۆخی جیاواز و گۆڕانکارییەکانیشدا دەمێننەوە و دەبنە هۆی بیرکردنەوە لە فرەژنی، وەکو ڕێگەچارەیەکی ناچارانە پەنای بۆ ببرێت بۆ چارەسەریی هەندێ کێشە یان ڕێگریکردن لە هەندێ گرفتی دیکەی چاوەڕوانکراو لە هەر سێ ئاستی تاکەکەسی و خێزانی و کۆمەڵایەتیدا؛ هۆکارە سروشتی و بایۆلۆژییەکانی وەك:

پێگەیشتنی زووتری کچان لەچاو کوڕان: کچان لە نێوان (9-13) ساڵاندا پێدەگەن، واتە هۆرمۆنی ژنانەی ستڕۆژن و پرۆژستڕۆن، هێلکەدان، منداڵدان و سینگ و ئەندامە مێیەکانی پێك دێت و گەشە دەکات و ئامادە دەبێت بۆ دووگیانکەوتن، کەچی کوڕان لە (13-15) ساڵان پێدەگەن و هۆرمۆنی تستوستڕۆن دروست دەبێت و دەبێتە هۆی دروستکردنی تۆم (سپێرم) و ئامادە دەبێت بۆ پیتاندن و دووگیانخستن.

هەروەها زووڕەسبوونی قۆناغی بێنوێژی و عوزروەستان و نەزۆکبوون لە ژنان بە شێوەیەك کە زۆربەی ژنان لە تەمەنی 45 ساڵی منداڵیان نابێتەوە، بەڵام پیاو هەتا کۆتایی تەمەنی ئەستێور (ستڕۆن) نابن؛[2] ئەمەش جگە لە نەخۆشیی نەزۆکی و نازابوونی ژنان و نەخۆشییەکانی دیکەی ژنانە.

---

1 . سيد قطب: المصدر نفسه: صص 578 - 579.

2 . Marcia E. Herman-Giddens PA MPH DRPH (2010), "**Assessment of Sexual Maturity Stages in Girls and Boys: Pediatric Research in Office Settings, Department of Research**"; American Academy of Pediatrics, pp. 1-38.

ژنان لە ڕووی سیستمی ئیمۆنۆلۆژییەوە (سیستمی بەرگەریی لەش) لە پیاوان بەهێزتر و قایمترن و پیاوان زیاتر تووشی نەخۆشی و مردن دەبن،[1] ڕاپۆرتی ساڵی (2014)ی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکان (WHO)، ئاماژە بەوە دەکات کە ڕێژەی ناوەندیی "ئومید بە ژیان" لە هەموو جیهاندا، ژنان (6) ساڵ زیاتر لە پیاوان دەژین،[2] ئەمە جگە لە مردن و لەناوچوونی پیاوانە لە شەڕ و ڕووداوەکانی نەخوازراو، کە دەکەوێتە بازنەی شیکردنەوەی دیموگرافی.

شیکردنەوەی دیموگرافی* و کۆمەڵناسییش** بۆ پەنابردن بۆ فرەژنی پاساو دەهێننەوە کە هانی هەندێ کۆمەڵگا دەدات کە لە ڕووی ناچارییەوە ڕووی تێبکەن. لە سەدەی بیستەمدا دوو شەڕی وێرانکەری جیهانی بوونە هۆی لەناوچوونی زیاتر لە (70) ملیۆن پیاوی ئەوروپی، کە تەنها لە ئەڵمانیا (7.4) ملیۆن پیاو لە شەڕی دووەمی جیهانیدا کوژران و (5.3) ملیۆنیش ئەوانەی کە لە دوای برینداربوون، نەخۆشی، خۆکوژی و بێسەروشوێنبوون لەناوچوون، لە سۆڤیەت (8.7) ملیۆن، لە پۆڵەندا (5.8) ملیۆن، لە بریتانیا (760) هەزار پیاو، لە ئەمریکا (418) هەزار و... هتد.[3] لە شەڕی ئەمریکا دژ بە ڤێتنام، (3.1) ملیۆن کەس کوژران، کە تەنها (143) هەزار کەس ژن و (84) هەزار منداڵ بوون و ئەوانیتر (واتە زیاتر لە 2.8 ملیۆن) هەموو پیاوی ڤێتنامی بوون.[4] لە ئەمریکییەکانیش بە پێی ئاماری ڕەسمیی حکومەتی ئەمریکا زیاتر لە (58) هەزار پیاو بوونە قوربانی.[5] شۆڕشی ئەلجەزایریش، ژمارەیەکی زۆر لە پیاوان دەکاتە قوربانی کە ئامارە وردەکانی

1 . Wiley-Blackwell (2011), "**Women have stronger immune systems than men and it's all down to X-chromosome related microRNA**", ScienceDaily, (28 September 2011): www.sciencedaily.com/releases/2011/09/110927192352.htm

2 . "**World Health Statistics 2014: Large gains in life expectancy**" (15 MAY 2014): http://www.who.int/mediacentre/news/releases/2014/world-health-statistics-2014/en/

* وەکو: تێکچوونی هاوسەنگیی ژمارەی دانیشتووانی ژن و پیاو لە کۆمەڵگادا.

** وەکو: هۆکارەکانی زۆربوونی ژمارەی کچانی قەیرە، ژمارەی بێوەژنان (پیاومردوو، ژنەشەهید و ژنی ئەنفال، ژنی تەڵاقدراو)، هەروەها هۆکاری خێزانیی، وەك ناکۆکی و ناتەبایی (زۆر ژن و پیاو هەن کە لەگەڵ یەکتر ناگونجێن و حەزیش ناکەن یان ناتوانن لەبەر هەندێ هۆکاری وەکو هەبوونی منداڵ لە یەکتر جیا ببنەوە و لە جیاتی تەڵاق، پەنا دەبردرێتە بەر ژنی دووەم)، هاوسەرگیریی زۆرەملێ (زۆر جاری وا هەبووە کە پیاوێك حەزی لە کچێك بووە، بەڵام بەهۆی فشاری دایباب، یان خێزان و دەوروبەرەوە، نەیتوانیوە هاوسەرگیری لەگەڵیدا بکات و ناچار بووە بە دڵی ماڵ بکات و دواتر ئەمە دەبێتە پاڵنەر بۆ ژنی دووەم) و...

3 . http://worldwar2.org.uk

4. Charles Hirschman et al (1995), "**Vietnamese Casualties During the American War: A New Estimate**", Population and Development Review, pp. 1-31.

5 . Nation Archives (2014), "**World War II Records**", from: http://www.archives.gov

دەوڵەتی ئەلجەزایر باس لە کوژرانی (44) هەزار پیاو دەکات لە گشت دانیشتووانی، کە ئەو کات (1991) بریتی بووە لە (25) ملیۆن کەس.[1] کوژرانی ئەم هەموو پیاوانە، واتای بێوەژنبوون و بێپیاوکەوتنەوەی ئەوەندە ژنە. لە وڵاتی عێراقیش لە دوای شەڕی ئەمریکا تاکو ساڵی (2008) بەپێی ئاماری وەزارەتی کاروباری ژنان، هەروەها وەزراەتی مافی مرۆڤی عێراقی، (1.5) ملیۆن بێوەژن لە عێراق هەیە، کە لە میانەی شەڕ و تەقینەوەکان مێردەکانیان لەدەست داون.[2] بەپێی ئامارە ڕەسمییەکان، ڕێژەی ژنان لە عێراق گەیشتۆتە (58%)ی دانیشتووان. ڕێژەی تەڵاق بە شێوەیەکی بەرچاو لە بەرزبوونەوە دایە؛ بۆ نموونە: تەنها لە دادگایەك لە ناوەندی شاری بەغداد، لە ماوەی (6) مانگی یەکەمی ساڵی (2012)دا، زیاتر لە (700) داوای تەڵاق پێشکەشی دادگا کراون، کە (356) حاڵەت بە تەڵاق یەکلا بووەتەوە. لە دادگایەکی ناوەندی شاری بەسرەش، لە ماوەی (3) مانگی هەمان ساڵدا، لە نێوان (297) داوای تەڵاق، (176) حاڵەتی تەڵاق یەکلا بووەتەوە.[3] لە دوای ڕاوەستانی شەڕی دووەمی جیهانی لە ساڵی (1945) خۆپیشاندانێکی گەورە لە لایەن بێوەژنانی ئەڵمانی ئەنجامدرا بۆ گوشارهێنان لەسەر حکومەتی ئەو کاتە، بۆ داڕشتنی دەقێکی یاسایی کە ڕێگە بە فرەژنی بدات و ڕێگەش لە لەشفرۆشیی ژنان بگرێت؛[4] چونکە لە هەندێ شارەکانی ئەڵمانیا، وەکو "بامبێرگ" (Bamberg) ـ سەر بە هەرێمی باڤاریا کە لە لایەن سۆپای ئەمریکییەکانەوە داگیر کرابوو ـ بە پێی ئامارەکانی ساڵی (1946) کە لە لایەن ئەمریکییەکان ئەنجامدرابوو، ڕێژەی ژنان (56%) بوو بەرامبەر بە ڕێژەی (44%)ی پیاوان، کە لە لایەن زانایانی ئەو کاتەوە پێشنیازی هێنانی پیاوانی بیانی لە دەرەوەی ئەڵمانیا کرا؛ چونکە ڕێژەی منداڵانیان زۆر کەم بوو و هەست دەکرا هەڕەشەیەکە بۆ ئایندەی ئەڵمانیا؛[5] ئەم ڕاپۆرتە دەڵێت:

1. Roman Hagelstein (2008), "**Explaining the Violence Pattern of the Algerian Civil War**", The Institute of Development Studies - at the University of Sussex - Falmer - Brighton - BN1 9RE,. pp. 1-28.

2 . حكومه جمهورية العراق؛ وزارة الحقوق الإنسان (2014)؛ "**تقييم واقع المرأة العراقية خلال عام (2008)**"؛ من الموقع الرسمي للحكومة: http://www.humanrights.gov.iq/uploads/pdf/arabic.pdf

3 . الجزيرة (2013/1/14)؛ "**المرأة العراقية و هم العنوسة و الطلاق: أرتفاع نسبة الإناث فی المجتمع العراقي تسبب فی قلة فرص الزواج**"؛ من الموقع: http://www.aljazeera.net/news/reportsandinterviews

4 . شلبي، رؤوف (1975)؛ "**إستوصوا بالنساء خيرا: نظرية الإسلام فی شؤون المرأة**"؛ القاهرة: مطبعة عيسى البابي الحلبي؛ ص65. أيضا: عبدالله، د. جمال شاكر (2011)؛ "**الثقافة الإسلامية**"؛ وزارة التعليم العالي السعودية: كلية العلوم و الآداب بينبع؛ ص 56.

5 . John Robert Stark (2003), "**The overlooked majority: German women in the four zones of occupied germany, 1945-1949, A comparative study**", The Degree Doctor of Philosophy in the Graduate School of the Ohio State University,. pp. 291-293.

لەگەڵ هاتنی ئۆکتۆبەری ساڵی (1946) سەرەڕای باشتربوون و ئارامبوونی دۆخەکە و گەڕانەوەی سەربازانی ئەڵمانی بۆ وڵاتەکەیان، هێشتا ڕێژەی ژنانی ئەڵمانی زیاتر بوو لە پیاوان. بە شێوەیەکی ڕەسمی هەر (124) ژن بەرامبەر بە هەر (100) پیاو بوون. ئەم ڕێژەیە لە ناوچەی داگیرکراو لە ژێر دەسەڵاتی ئەمریکییەکان بریتی بوو لە هەر (171) ژن بەرامبەر بە هەر (100) پیاو. ئەم ئامارەش تەنها توێژی ژنان و پیاوانی سەرووی (20) ساڵ دەگرتەوە، نەك کەمتر.[1] سروشتییە کە پەنا بردێتە بەر دیاردەی فرەژنی، یان هێنانی پیاوی بیانی لە دەرەوەی وڵات؛ چونکە ژیانی ئاسایی خێزانەکان تێکچووبوو و منداڵانی هەتیو و بێباوك، کە تەنانەت لەبەر تەمەنی بچووکیان بە کەڵکی کارکردنیش نەدەهاتن و ڕێژەی (65%)ی ژنانیش بێکار بوون و هیچ بەرهەمێکیان نەبوو، بە تایبەتی سکاڵاش لەوە دەکرا کە فرەژنی لە ماوەی شەڕی (30) ساڵە قەدەغەکرا، کەچی پێشتر لە ئەڵمانیای کشتوکاڵی بە بەرفراوانی باو بوو، هەروەها هیتلەریش لە سیاسەت و پلانی بەرزکردنەوەی ڕێژەی منداڵبوون هەرەسی هێنابوو، ئەڵمانیا بەرەو هەڵدێر و نەمان دەچوو.[2] ئامارێکی‌تر دەڵێ جگە لە (7.3) ملیۆن بێوەژن لە ئەڵمانیای دوای شەڕی دووەمی جیهانی، ژمارەی کچان و کوڕانی تەمەن (20_30) ساڵان کە هاوسەرگیرییان نەکردبوو، بریتی بوو لە هەر (167) کچ، بەرامبەر بە هەر (100) کوڕ، کە ئەمە ببووە هۆی خراپ بەکارهێنانی سەربازانی سوپای هاوپەیمانان کە بەرامبەر بە خواردن و نان و جگەرە، داوای سێکسیان لەو ژنانە دەکرد و تەنانەت مێژوو دەگێڕێتەوە کە بە چ شێوەیەك دەبوونە قوربانیی دەستدرێژیی سێکسیی سەربازانی بریتانیایی و ئەمریکایی.[3] پرۆفیسۆر "میریام گێبهارد" (Miriam Gebhardt) _ مێژوونووس و ئەکادمینیستی بەناوبانگی ئەڵمانی _ لە تازەترین کتێبیدا بە ناوی "کاتێك سەربازەکان هاتن"*، چەندین بەڵگەی ئاشکرا کردووە، کە سەربازانی هاوپەیمانان لە سوپای ئەمریکا، بەریتانیا و فەرەنسا، هاوشێوەی سوپای سووری ڕوسیا، لەکاتی داگیرکردنی ئەڵمانیا، دەستدرێژیی سێکسییان کردووەتە سەر یەك‌ملیۆن ژنی ئەو وڵاتە. لێکۆڵینەوەکان دەردەخەن کە تەنها سەربازانی ئەمریکی لە ساڵی (1945)دا، (190) هەزار حاڵەتی دەستدرێژیی سێکسی، بە شێوەیەکی ڕێکخراو

1 . Ibid,. p.293.

2 . Ibid,. p. 250.

3 . Frevert, Ute (1989), "**Women in German History: from Bourgeois Emancipation to Sexual Liberation**", Translat by: Barbara Norden,New York: Berg Publishers,. pp. 263-264.

* When the Soldiers Came: The Rape of German Women at the End of the Second World War.

بە سێ جۆر بۆ سەر ژنانی بەمێرد، ئەوانەی کە شوویان نەکردووە لەگەڵ ئەوانەی لە خوار تەمەنی (16) ساڵانەوە بوون، ئەنجامیان داوە.[1]

هەر بۆیەش لە کۆنفرانسێکی گەورەی نێودەوڵەتیی گەنجاندا لە ساڵی (1948)، کە لە شاری "میۆنیخ" بەسترا، وتووێژێکی زۆر لەسەر چارەسەرکردنی ئەم ناهاوسەنگییە (واتە زیاتربوونی ژمارەی ژنان لە پیاوان) لە نێوان بەشداربووان کرا، کە لە لایەن هەندێ لە بەشداربووان فرەژنی وەکو ڕێگەچارەیەك پێشنیاز کرا کە سەرەتا لە لایەن زۆربەی بەشداربووان بە شێوەیەکی توند ڕەت کرایەوە، بەڵام دوای گفتوگۆیەکی لەسەرخۆ و بیرکردنەوەیەکی زیاتر لەسەر ئەم پێشنیازە، زۆربەی بەشداربووان دەنگی پەسەندیان بۆ ئەم ڕێگایە دا و، لە کۆتاییدا فرەژنی یەکێك لە ڕاسپاردەکانی ئەم کۆڕبەندە بوو. تەنانەت "د. محەممەد یوسف مووسا" ـ کە یەکێك بوو لە بەشدرابووانی ئەم کۆنفرانسە ـ دەڵێت:

"من لەگەڵ هەندێ لە هاوڕێیەکانم لە پاریس بووین کە بۆ ئەم کۆنفرانسە بانگهێشت کرام، کە لە شاری میۆنیخی ئەڵمانیای دەبەسترا. من و هاوڕێیەکی میسریم پێکەوە بۆ ئەم کۆڕبەندە چووینە شاری میۆنیخ... و لە دوای پەسەندکردنی فرەژنی وەکو ڕێگەیەکی گونجاو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی زیادبوونی ڕێژەی ژنان بە بەراورد لەگەڵ پیاوانی ئەڵمانی، کاتێك کە لە ساڵی (*1949*) بۆ وڵاتی میسر گەڕامەوە لە ڕۆژنامەکانی قاهیرەم خوێندەوە کە هاووڵاتیانی شاری "بۆن" (*Bonn*)ی پایتەختی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا، گردبوونەوەیەکیان کردووە بۆ بە یاساییکردنی فرەژنی لە ئەڵمانیا."[2]

ئامارەکانی زۆربەی وڵاتانی جیهانیش ژمارەی ژنان زیاتر لە هی پیاوان نیشان دەدەن؛ بۆ نموونە لە ساڵی (1994) لە ئەمریکا (8) ملیۆن ژن زیاتر هەبووە لە پیاو.[3] بەپێی دوایین ئاماری یوروستات (Eurostat)* کە وردترین ئاماری یەکێتیی ئەوروپا ساڵانە بڵاودەکاتەوە، ژمارەی ژنان لە (28) وڵاتی یەکێتیی ئەوروپا لە ساڵی (2013)، (11,969,995) کەس لە پیاوان زیاترن، کە دەکاتە

1 . Dailymail (2 March 2015), **"New book alleges Allied soldiers 'raped one million Germans after the end of Second World War"**, from: http://www.dailymail.co.uk/news/article-2975016/New-book-alleges-Allied-soldiers-raped-one-million-Germans-end-Second-World-War.html

2 . سابق، سید (1994)؛ **"فقه السنة"**؛ المجلد 2؛ القاهرة: الفتح للإعلام؛ ص 77.

3 . Philip L. Kilbride (1994), **"Plural Marriage for Our Times"**, Westport: Bergin & Garvey, pp. 108.

* http://ec.europa.eu/eurostat

(52%)ی دانیشتووان.[1] بەم پێیە، ڕێژەی ژمارەی ژنان بەراورد بە ژمارەی پیاوان، (104.8) ژن، بە (100) پیاوە.[2]

ئەم کێشەیە لە ئەلجەزایر تا ڕادەیەکی باش چارەسەر کرا؛ چونکە جەنگاوەرە موسڵمانەکانی سەر بە ڕەوتی بزووتنەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی، ئەو بێوەژنانەیان مارە دەکردەوە، کە پیاوەکانیان لە شەڕ لەدەست دابوو و، بە خۆ و بە منداڵەوە بەخێویان دەکردن.[3]

کۆمەڵناسێکی ئەردەنی بە ناوی "د. ئیسماعیل ئەلزیود" توێژینەوەیەکی بە ناوی "واقع العنوسة في العالم العربي" لەبارەی ڕێژەی قەیرەیی (بەرزتر لە تەمەنی 35 ساڵ) لە وڵاتە عەرەبییەکاندا کردووە، کە پوختەکەی ئاوەهایە: لە سووریا (50%)ی کوڕان و (60%)ی کچان، لە ئەردەن (55%)، سوودان (20%)، کوێت و قەتەر و بەحرەین و ئیمارات هەریەك (35%)، هەرچی وڵاتی عێراقە بریتییە لە (85%) کە تەمەنیان لە (35) ساڵ بە سەرەوەیە و شوویان نەکردووە.[4] ژمارەی قەیرەکچان لە وڵاتی ئەلجەزایریش، بەپێی ڕاپۆرتی ڕەسمیی دیوانی نەتەوەیی ئەم وڵاتە کە لە ساڵی (2013)دا خراوەتە ڕوو، (11) ملیۆن کچ هەن کە تەمەنیان لە (25) ساڵ تێپەڕیوە و هێشتا شوویان نەکردووە، کە زیاتر لە (5) ملیۆنیان ئەوانەن کە تەمەنیان لە (35) ساڵ زیاترە. هەر بەپێی ئەو ڕاپۆرتە، ساڵانە (200) هەزار قەیرەکچ (تەمەنی سەرووی 35 ساڵان) زیاد دەبن.[5]

لە هەرێمی کوردستان بەپێی ڕاپۆرتی ساڵی (2012)ی دەستەی ئاماری هەرێمی کوردستان سەر بە وەزارەتی پلاندانان، ڕێژەی (7.6%)ی ژنانی هەرێمی کوردستان بێوەژنن، کە دەکاتە نزیکەی (196,600) ژن، هەروەها ڕێژەی ئەو خێزانانەی کە بەڕێوەبەر و سەرپەرشتیارەکەیان ژنە بریتییە لە (11.6%).[6] ئەو بێوەژنانە هەموو ئەوانەی کە پیاویان مردووە و، ئەوانەی کە تەڵاقدراون، دەگرێتەخۆ. ئامارێکی وردمان بەردەست نییە، کە ژمارەی ژنە پیاومردووەکان دیار

1 . Eurostat (2014), "**Population on 1 January by age and sex**", online:
http://appsso.eurostat.ec.europa.eu/nui/submitViewTableAction.do

2 . Eurostat (2014), "**Women per 100 men**", online:
http://ec.europa.eu/eurostat/tgm/table.do?tab=table&init=1&language=en&pcode=tps00011&plugin=1

3 . Roman Hagelstein, op. cit.

4 . مجلة البيان (2010/6/12): "**خطر العنوسة في العالم العربي.. الأسباب و الحلول**"؛ من الموقع:
http://www.albayan.co.uk/print.aspx?id=499

5 . موقع الجزيرة (2015/2/7): "**شبح العنوسة يطارد 11 مليون فتاة في الجزائر**"؛ من الموقع:
http://www.aljazeera.net/news/miscellaneous

6 . وەزارەتی پلاندانان، دەستەی ئاماری هەرێمی کوردستان (2014): "**ڕاپۆرتی بەدواداچوونی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری لە هەرێمی کوردستان (2012)**"؛ ل 12-15.

بێت، تەنها ئاماری وەزارەتی کاروباری ژنانی هەرێمی کوردستان نەبێت، کە ئەویش تەنها ئەو بێوەژنانە دەگرێتەوە، کە ناویان لەو وەزارەتە تۆمار کراوە و مانگانە مووچەیەك لەو وەزارەتەوە وەردەگرن، کە بریتییە لە (45) هەزار بێوەژنی پیاومردوو هەیە.[1] ئەمە جیایە لەو بێوەژنانەی کە خێزانی ئەنفال و شەهیدن، کە بەپێی ئاماری وەزارەتی شەهیدان، نزیکەی (80) هەزار بێوەژن ناویان تۆمار کراوە و مانگانە مووچەیەکیان بۆ تەرخان کراوە.[*] بەشێکە دیکە لەو بێوەژنانە، ژنە تەڵاقدراوەکانن، کە بەپێی "ئاماری ئەنجوومەنی دادوەرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان" بریتییە لە: (31,062) ژن لە ماوەی (5) ساڵ و (9) مانگدا، واتە: لە (2009/1) تا کۆتایی (2014/9).[2] بەپێی ئاماری وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی، (6,800) ژنی تەڵاقدراو لەو وەزارەتە مووچە وەردەگرن.[3] ئەمەش جیایە لەو کچانەی کە تەمەنی هاوسەرگیرییان گونجاوە و تەنانەت تەمەنیان لە (35) ساڵ زیاترە، بەڵام هێشتا شوویان نەکردووە. هیچ ئامارێکی وردمان لە ژمارەی قەیرەکچان لە هەرێمی کودرستان لەبەردەست نییە، بەڵام ژمارەی تەنها بەشێك لەو قەیرەکچانە کە ناویان لە وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی تۆمار کراوە و مانگانە مووچەیەك لەو وەزارەتە وەردەگرن، دیارە، کە بریتییە لە (2,900) قەیرەکچ.[4] ئەگەر هەموو ئەو کچ و بێوەژنانەی کوردستان کۆ بکرێتەوە، ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە ژنانی کورد دەبینین کە پێویستییان بە شووکردنە. دەبێ لەو فێمێنیستانە بپرسین ئاخۆ چ پرۆگرامێکتان هەیە بۆ چارەسەرکردنی کێشە ماددی و مەعنەوییەکانی ئەم ژنانە؟ ئایا ئەوانیش ژن نین؟ ئایا مافیان نییە؟ ئەی ئێوە داکۆکی لە مافی کام ژنان دەکەن؟

---

1 . پۆرتاڵی ڕووداو (2015/4/18)؛ "**ژمارەی بێوەژنانی عێراق نزیکەی دوو ملیۆنە**"; لە ماڵپەڕی:
http://rudaw.net/sorani/middleeast/iraq/18042015

* وەك دەگوترێت: تەنها ژمارەی ئەنفالکراوەکان زیاتر لە (180) هەزار کەس بووە.

2 . ئەنجوومەنی دادوەری هەرێمی کوردستانی عێراق، بەڕێوەبەرایەتی پلان و ئامار؛ مامەڵەکانی ئەنجامدراو لە دادگاکانی هەرێمی کوردستان (سەرەتای 2009 تا کۆتایی مانگی 2014/9)؛ بەم شێوەیە: (2009=4237 حاڵەتی تەڵاق)، (2010=3728 حاڵەت)، (2011=4516 حاڵەت)، (2012=6079 حاڵەت)، (2013=6417 حاڵەت) و (2014 "نۆ مانگ"= 6085 حاڵەت)، کە بە تێکڕایی دەکاتە: (31,062) حاڵەتی تەڵاق. بڕوانە:
پۆرتاڵی ڕووداو (2014/11/27)؛ "**هەرێمی کوردستان. ڕێژەی تەڵاق بەرز دەبێتەوە و هاوسەرگیری کەم دەکات**"; لە ماڵپەڕی:
http://rudaw.net/NewsDetails.aspx?PageID=82073

3 . ماڵپەڕی خەندان (2015/4/27)؛ "**ئاماری ئەو ئافرەتانەی لە وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی سوودمەندن بڵاودەکرێتەوە**"; لە:
http://www.xendan.org/dreja.aspx?=hawal&jmara=35179&Jor=1

4 . سەرچاوەی پێشوو.

لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا سێ ڕێگەچارەی بژاردە و نموونەیی لە لایەن هەندێ فێمێنیستانەوە پێشکەش کراوە، تەنها بۆ ئەوەی "فرەژنی" نەبێت: یەکێك پێشنیاز دەکات لە جیاتی فرەژنی پێویستە بە لۆری "چووك" (زەکەر)ی لاستیکی لە ئەوروپاوە بۆ کوردستان بهێنن:

"گەر ئێمە بزووتنەوەی ڕاستەقینەی فێمێنیزممان هەبووایە دەبوو بە لۆری لەعابەی ئۆتۆماتیکیی سێکسیان لەبەردەم پەرلەمانی کوردستان هەڵبڕشتایە؛ چونکە یەکێك لە پاساوەکانی ئەوان بۆ مەسەلەی فرەژنی ئەوەیە کە ژمارەی ژن زیاترە لە پیاو لە کوردستان. گەر پێوانەی ژن بە پێی گونی پیاو بێت ئەوا زۆر لەعابەی سێکسی ئۆتۆماتیکی هەیە کە زۆر لەو پیاوانە باشترن بۆ ژن...؟"[1]

پێم وایە ژنانی کوردستان هێشتا نەگەیشتوونەتە ئەو ڕادەیەی کە پێویستیان بە زەکەری لاستیکیی پیاویان بێت و هەرکات ڕای تەنانەت (10%)ی ژنانی کوردستان لەگەڵ ئەم فێمێنیستە بوایە، هەتا ئێستا بازرگانان و کاربەدەستانی زیرەك و سەوداگەر نەك بە لۆری، بەڵکو بە ترێلی بۆ کوردستانیان هاوردە دەکرد و لە بازاڕەکانیدا دەیانفرۆشت و پێویست بە یاسای پەرلەمانیش نەدەکرد، تەنها پارەی گومرکیان دەدا!

یەکێکیتر پێشنیاز دەکات لە جیاتی زەکەری لاستیکی و ئۆتۆماتیکی، پیاوی ڕاستەقینە (نەك پلاستیکی) وەکو کەلوپەل لە دەرەوەی وڵات هاوردە بکرێت:

"دەبینین لە ئەلمانیا دوای شەڕی جیهانی دووەم پیاویان ـ لە هەموو لایەکەوە دەهێنا بۆ وڵاتەکەیان ـ لە تورکیا، لە ئیتاڵیا، لە سربیا، ئەوە حکومەت دەتوانێت ئەو کێشەیە چارەسەر بکات، بەوەی ڕێژەیەکی پیاو ـ لە وڵاتانیتر ـ بهێنێت بۆ ئێرە."[2]

ئەوەش تەنها ڕای خۆیەتی و پێم وا نییە هەموو ژنانی کوردستان ئامادە بن شوو بکەن بە پیاوانی بیانی و بێگانە، کە خاوەن کولتوور و زمان و ئایین و داب‌ونەریتی جیاوازن. دواتر ئەو پرسیارە دروست دەبێت کە لە کام وڵاتەوە؟ پیاوانی بەنگلادیشی؟ فیلیپینی؟ نیپاڵی؟ ئایا بە خۆی ئامادەیە ئەم پیاوانەی کە لە دەرەوە هێنراون بۆ کاری خزمەت و کرێکاری لە کوردستان وەکو هاوسەری ژیان قبووڵ بکات؟ ئەگەر مەبەستی پیاوی ئەوروپییە، کێ دەڵێ پیاوی ئەوروپی ئامادەیە دەستبەرداری ئەم هەموو کچ و ژنانەی وڵاتی خۆی بێت و بێتە وڵاتێك کە تەنانەت بۆ

---

1 . گفتگۆی ئەرسەلان مەحمود لەگەڵ "ڕێکپۆش عەزیز"؛ **"گەر خاوەن بزووتنەوەیەکی ڕاستینەیی فێمێنیزم بووایـن، دەبوو بە لۆری لەعابەی سێکسیان لەبەردەم پەرلەمانی کوردستان هەڵبڕشتایە"**؛ هەمان سەرچاوە.

2 . "ئامان شاکر" لە کاناڵی تەلەفزیۆنیی "قەڵات تیڤی" میوان بوو لە بەرنامەی "تیشك"، ڕێکەوتی (2008/4/6)؛ کاتژمێر (8:30)ی ئێوارە؛ وەرگیراوە لە: فەرەمان خەرابەیی؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 41.

کەمترین ڕووداو، هەڵدەپەڕن یان تەقە دەکەن*؟ وای دادەنێین کە پیاوانی ئەوروپایی یان وڵاتێکی دیکە ئامادەن بێنە کوردستان بۆ بێوەژنان و قەیرەکان، کێ دەڵێ کچ و ژنەکانمان بەوان ڕازی دەبن؟ ئایا ئەوەش نابێتە هۆی زوڵم لە ژنان و کچان کە مافی هەڵبژاردنی شووی خۆیانیان نەبێ (پیاوێك کە ئەو پێی خۆشە)؟ باڵای چەند بێت؟ قژی چ ڕەنگ بێت؟ کوڵکن و پڕموو بێ یان لووس؟ کاڵ بێ یان ئەسمەر؟ خوێندەوار بێ یان نەخوێندەوار؟ تەمەنی چەند بێ و هتد؟ کێ هەموو ئەو مواسفاتە دابین دەکات؟

پێشنیازی سێیەمیش، کە پێشتر باسمان کرد، زۆربەیان لەسەری کۆکن کە بریتییە لە ئازادیی سێکسی و پەیوەندیی خۆشەویستی و گرتنی بۆیفرێند و گێرلفرێند بەبێ سنووردارکردن!

زۆر سەیرە کە ئامادەن ژنان پەیوەندیی سێکسیان هەبێ لەگەڵ پیاوێك کە حەزی لێیە، بەڵام ئەگەر هەمان پەیوەندی لە قاڵبی هاوسەرێتیدا بێ، بە پاشکەوتن و کۆیلەکردن و بۆگەنی دادەنێن!

کەواتە ئەم کێشەیە (زیاتربوونی ڕێژەی ژنان لەچاو پیاوان) لەناو زۆر لە کۆمەڵگاکانی پێشووتر و ئێستاشدا هەر هەبووە و هەیە و دەشبێ. دەکرێ سێ ڕێگا پێشنیاز بکرێ بۆ چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم کێشەیەدا:

یەك) هەر پیاوێك تەنها یەك ژن بهێنێ و ژنانیتر بێهاوسەر بمێننەوە هەتا دەمرن، کە ئەوە دەبێتە هۆی سەرکوتکردن و بێبەشکردنی ئەو ژنانە لە ژیانێکی ئاسایی و سروشتیی ئەم جیهانە و لەوانەیە نارازیبوونی ئەوان لەو کۆمەڵگا نامرۆییە کە ئەوان وەك مرۆڤ هەژماری ناکەن و تەنها خۆیان دەبیننەوە و ڕەچاوی سرشت و وزە و پێداویستییە دەروونی و جەستەییەکانیان ناکەن. لەوانەشە ببێتە هۆی دروستکردنی هەندێ ڕێکخراو و سەندیکای تایبەت بۆ ئەم کێشەیە کە لەو ڕێگایەوە حەقی خۆیان لە کۆمەڵگا بستێننەوە! ئایا چاوپۆشیکردن لەو ژنانە و بێبەشکردنیان لە مافی مرۆیی و سروشتییان، سزایەکی توند و گورچووبڕ نییە؟

دوو) هەر پیاوێك تەنها یەك ژن بهێنێ و هاوکات لەگەڵ ئەو ژنە، پەیوەندیی ناشەرعی و نایاسایی لەگەڵ ژنێك یان چەند ژنێکیتر ببەستێ و خیانەت لە ژنی شەرعی و یاساییەکەی بکات! ئایا ئەو ژنانەی کە جوانی و گەنجێتیی خۆیان هەموو لە پێناو تێرکردنی پیاوانی دڕەندە و هەوەسباز و خیانەتکار دەکەنە قوربانی و، لە کۆتاییشدا کەس بە چاوێکی باش و مرۆڤانەش

* بۆ نموونە یارییەکی فوتباڵ لە وڵاتێکی ئەوروپی دەکرێ، لێرە دوای یارییەکە، هەڵپەڕکێ و تەقە دەکەن!

سەیریان نەکات و لەوانەیە لە میانەی بازرگانی و مامەڵەکردن لەگەڵ پیاوان بکوژرێن و توندوتیژیی سێکسی و جەستەییشیان لەگەڵ بکرێت و ببنە خاوەن منداڵی ناشەرعیش، کە دیار نییە هی کامیان بووە، باشتر نەدەبوو کە وەکو ژنانیتر ببوانە خاوەن شوو و خێزان و منداڵ و خانوو و ... و کەسێك ببووایە چاودێر و بەخێوکەریان؟ ئایا ئەوەش نابێتە هۆی لێکترازانی خێزانی و هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگا و تێکچوونی باری کەسێتی ژنان؟ ئایا ئەوە دژی کەرامەت و ڕێزی ژنان نییە وەکو مرۆڤ؟ (لە بەشی داهاتوو ئەو ئامارە نوێ و فەرمییانە دەخەینە ڕوو، کە شایەتیی ئاکامە خراپەکانی ئەو دیاردەیە دەدەن لە ڕۆژئاوا).

سێ) هەر پیاوێك ژنێك بهێنێ و ئەو پیاوانەی کە ناچارن پەنا ببەنە بەر فرەژنی وەکو چارەسەرێك بۆ کێشەی خۆی و خێزانیان، هەروەها توانای بەجێهێنانی مەرجەکانی فرەژنیشیان هەیە، ژنانیتر بە ئاشکرایی لەو پیاوانە مارە بکرێن، نەك بە نهێنێ پەیوەندییان لەگەڵ دروست بکەن و بیانکەنە گێرلفرێند و دۆستی سێکسیی خۆیان! کە لە دوای بەهرە و چێژوەرگرتن، پشتی تێ بکەن و هیچ بەرپرسیارێتییەك لە ئەستۆ نەگرن! ڕاستە کە لە ژیانی فرەژنی و هەوێداریدا، زەمینەی گیروگرفت و کێشە و ناخۆشی زیاترە، بەڵام ئەو بەدیل و ڕێگەچارانەی کە ڕۆشنبیران و فێمێنیستان دەیخەنەڕوو، کارەساتیان بەدواوە دێت. فرەژنی ڕێگاچارەسەرێکی ناچارانەیە کە ئیسلام بەپێی واقیعەکان پێشکەش دەکات. ڕێگە بە پیاو دەدات کە ڕێگای فرەژنی بگرێتەبەر، بەڵام لە ڕێگەی شەرعی و یاساییەوە، تاکو مافە ماددی و مەعنەوییەکانی ژنان پێشێل نەکات و تەنها ڕەچاوی بەرژەوەندییەکانی خۆیشی نەکات. پێغەمبەر ـ د.خ ـ دەفەرموێ: ﴿من كانت له امرأتان فلم يعدل بينهما جاء يوم القيامة وشقه مائل﴾؛[1] واتە هەر کەس دوو ژنی هەبێت و لە نێوانیاندا دادپەروەری نەکات، ڕۆژی قیامەت دێ لەحاڵێکدا سەرشۆڕ و ملخوارە!

فرەژنی ڕێگایەکی ئەقڵانییە: هەموو دەزانین کە قۆناغی پیتاندن و وەچەهێنانی پیاو هەتا مردنە، با بڵێین هەتا (70) ساڵییە، بەڵام لای ژن لە (50) ساڵ کەمترە. لێرە وەکو ڕێژەی ناوەندی، (20) ساڵ جیاوازی دەکەوێتە نێوان تەمەنی وەچەهێنانی هەردووکیان. ئایا یەکێك لە سەرەکیترین پاڵنەرەکانی هاوسەرگیری دروستکردنی نەوە نییە؟ ئەی ئەو هاوسەرانەی کە منداڵیان نابێ، بەتایبەتی ئەو ژنانەی کە بە بەڵگەی پزیشکی نەزۆکن، دەبێ چی بکەن؟ چەند خێزان هەن کە

1 . رواه الترمذي.

بەدەست ئەو کێشەیەوە دەناڵێنن؟ ئایا ژیانی کۆمەڵگا بەهۆی نەوەکانی مرۆڤەوە بەردەوام نابێ و ئاوەدانی و پێشکەوتنەکەی بەهۆی نەوەکانییەوە مسۆگەر ناکات؟ جگە لەوە ئەگەر تەنها لەسەر ئاستی تاکەکەسی قسە بکەین، زۆر پیاو هەن کە حەزیان لە منداڵە و ئاواتەخوازن ببنە باوك و منداڵێکیان هەبێت، کە سۆزی باوکایەتی پێبەخشێ و ڕەمەکی خۆی تێر بکات و لە لایەکی‌ترەوە، هاوسەرەکەیشی ـ کە زۆریش یەکتریان خۆش دەوێ ـ نەزۆکە و لە هەبوونی منداڵیش بێهیوا بووە. ئایا تەڵاقدانی ئەو ژنەی کە مێردەکەی خۆش دەوێت و دوورخستنەوە لەو کەشوهەوا گونجاوەی کە لێی ڕاهاتووە و تەنانەت ناتوانێ هیوای منداڵبوونی لە پیاوێکی‌تریشی هەبێت کە لە دوای تەڵاقوەرگرتن لە پیاوی یەکەم، ئەگەر بیەوێ دووبارە شوو بکاتەوە، زوڵم و ستەم نییە لەو ژنە دەکرێت؟ ئایا شتێکی لۆژیکی و ژیرانە نییە کە لەو کاتەدا پیاو هاوسەرە خۆشەویستەکەی ڕابگرێ و بە ڕەچاوکردنی مەرجەکان، ژنێکی دیکە بخوازێ و ببنە خاوەن منداڵ و نەوەش؟ ئایا ئەوە بە سوودی هەموویان (پیاو، ژنی یەکەم و دووەم) نییە؟

فرەژنی ڕێگایەکی ئەخلاقی و مرۆییشە: چونکە ڕێگە بە پیاو نادات هەر کاتێك ویستی و لەگەڵ هەر کەسێك ویستی پەیوەندیی ناشەرعی و نایاسایی دروست بکات. فرەژنی، لە فۆرمی ئیسلامیدا، بۆ پیاو سەقفێکی دیاریکراو بەپێی شەرع و یاسا دادەنێت و ناهێڵێ تووشی خیانەت بێت و پیاو ناچارە کە هەموو مەرجە یاسایی و شەرعییەکان بە ئاشکرا، نەك بە نهێنی بەجێ بێنێ. خانوو، بڕی مارەیی، کە ژن دیاری دەکات، نەفەقە و هەموو پێداویستییە ماددی و مەعنەوییەکانی ژن لە ئەستۆی پیاوە؛ کەچی فرەژنی، لە فۆرمی ڕۆژئاواییدا، بەبێ سنوور دەکرێت، تەنها بەم جیاوازییە کە ناوی نانێن هاوسەرێتی، بەڵکو پێی دەڵێن: پەیوەندیی دۆستانە لە نێوان دوو خۆشەویستدا! ئەم پەیوەندییە بە چوار ژن کورت نابێتەوە، بەڵکو هەر کەس بیەوێ بەبێ سنوور بە نهێنی لەگەڵ ژنان پەیوەندیی سێکسی دروست دەکات، بێ ئەوەی هیچ بەرپرسیارێتی و ئەرکێك لە ئەستۆ بگرێ، تەنانەت ئەگەر منداڵی ناشەرعیش لەو پەیوەندییە بەرهەم بێ، ئەوا دەبێ دایك و منداڵەکە خۆیان بە دەستی خۆیان بەخێو بکەن! فرەژنیی ئیسلامی و ڕۆژئاوایی ڕاستە لە یەك شت هاوبەشن؛ ئەویش پەیوەندیی سێکسییە، بەڵام لە فۆرمی ئیسلامیدا پیاو بەرامبەر بە هەموو پێداویستییە ماددی و مەعنەوییەکانی ژن بەرپرسیارە و لەو جیهانە و دواڕۆژیش دەبێ وەڵامی هەموو خەمساردی و کەموکورتییەکانی بداتەوە!

"گوستاڤ لۆبۆن" لەو بارەیەوە دەڵێ:

"لە ئەوروپا هیچ یەك لە نەریتەکانی ڕۆژهەڵات بە ئەندازەی فرەژنی بە وێنەیەکی خراپ پێناسە نەکراوە و سەبارەت بە هیچ نەریتێکیش ئەوەندە تووشی هەڵە نەبووە! نووسەرانی ئەوروپا فرەژنی بە بنەمای ئیسلام دەزانن... لە حاڵێکدا ئەم نەریتە هیچ پەیوەندیی بە ئیسلامەوە نییە... لە ڕۆژئاواش سەرەڕای گونجاونەبوونی کەشوهەوا و سروشت، و چەسپاندنی ڕەسمییانەی نەریتی تاك هاوسەریش کە تەنها لە کتێبە یاساییەکاندا دەبینین، خۆ گومان ناکەم نکۆڵی لەوە بکرێ کە لە ئەرزی واقیعدا هەرگیز ئەم تاك هاوسەرییە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەدی ناکرێت! باشە من سەرم سوڕماوە لەوەی کە بۆچی فرەژنیی شەرعی و یاسایی ئیسلام لە فرەژنیی ناشەرعی و نایاسایی ڕۆژئاوا بە کەمتر و عەیبدارتر دەزانین؟... سیستمی فرەژنی، سیستمێکی چاکە و ئاستی ئەخلاقیی ئەو نەتەوانە بەرز دەکاتەوە کە لە ناویاندا پەیڕەو دەکرێت و، خێزانەکانیشیان زیاتر بەیەکەوە پەیوەست دەکات، ڕێز و بەختەوەرییەکی وەها بە ژنان دەبەخشێت، کە لە ئەوروپادا دەستیان ناکەوێت؟"[1]

"هێنری دی کاستری" دەنووسێ:

"ئەوروپییەکان مەسەلەی فرەژنییان زۆر گەورە کردووە؛ کەچی ئیسلام نەك هەر داهێنەری فرەژنی نەبووە، بەڵکو محەممەد نەیهێشت وەکو ئەو بێڕەوشتییانەی لێبێ کە لە پاریس و لەندەن و بەرلیندا دەبینرێن. ئەم گشتاندنە ڕووکەشبینانەیە کە لە زۆر نووسەرانەوە دەبینرێن، تەنها نووسینەکانی خۆیانی پێ پڕ دەکەنەوە، کە زۆر دوورە لە ڕاستییەوە."[2]

"ڕۆژێ گارۆدی" ــ فەیلەسووفی گەورەی فەرەنسی سەدەی بیستەم ــ دەنووسێ:

"ڕۆژئاوا لەبارەی فرەژنی بەبێ ئینسافی و دووڕوویی مامەڵە دەکات. ئەرێ بە ڕاستی کام پیاوی ڕۆژئاوایی هەیە کە تەنها بە یەك ژن بەسی کردبێت؟ چەند زۆرن ژمارەی ئەو پیاوانەی کە ژنانێکیان سکپڕ کردووە و لە دوای زانینی زۆر بە ناپەسەندی و نامەردی بەجێیان هێشتوون، لە حاڵێکدا لە ئیسلامدا پیاو پێویستە بژێوی ژن و منداڵان تەنانەت لە دوای تەڵاقیش دابین بکات... تەورات بەبێ هیچ بەربەست و سنووردارکردنێك ڕێگە بە فرەژنی دەدات. لە سەردەمی شەرلمانی (*Charlemagne*) ــ ئیمپراتۆری فەرەنسا لە سەدەی (*8*)ی زاییندا، کە لە دوای (*33*) ساڵ شەڕ دژی موسڵمانان توانیی وڵاتی ئیسپانیا لێیان بستێنێتەوە ــ دوو سەدە لە دوای هاتنە خوارەوەی قورئان، قەشەکانی ئەوروپا بەبێ حیساب ژنیان هەبووە و تەنها لە سەردەمی پاپا گریگواری هەفتەم (*1020-1085*) بوو کە سوێندی پاکداوێنی و دووری لە ژنان بۆ قەشەکانی کەنیسە واجب کرا."[3]

1 . Le Bon, op. cit., pp. 507-508.

2 . De Castries, op. cit., p.56.

3 . Garaudy, op. cit., p. 294.

"ئەمیل دێرمێنگێم"یش دەڵێ: "کامیان باشترە؟ فرەژنیی شەرعی ئیسلامی یان فرەژنیی شاراوای ڕۆژئاوایی؟ بە ڕاستی فرەژنی هەنگاوێکی باشە بۆ نەهێشتنی داوێنپیسی و چارەسەرکردنی کێشە سێکسییەکان و سەڵتمانەوەی ئەو ژنانەی کە لە مەترسیدان".[1]

"ئەنیێ بیزانت"* ـ نووسەرێکی ژن و چالاکڤانی مافی ژنان و سەرۆکی بزووتنەوەی عیرفانیی تیۆسۆفیای بریتانیایە ـ لە کتێبی خۆی بە ناوی "ژیان و ڕێنماییەکانی محەممەد"دا دەڵێت:

"خۆ فرەژنی لە ڕۆژئاواش هەیە، بەم جیاوازییە کە لە ڕۆژهەڵات و کۆمەڵگا ئیسلامییەکان بە شێوەیەکی یاسایی و شەرعییە و هەریەك لە ژنان بە یەکسانی بە هاوسەری شەرعی و یاسایی شووەکانیان دادەنرێن و ژنی دووەمیش هەمان مافی هەیە کە ژنی یەکەم هەیەتی، کەچی فرەژنی لە ڕۆژئاوا بە شێوەی مەعشووقە و دۆستگرتنە، کە هیچ مافێکی نییە و یاساش هیچ ئەرکێکی بۆ ئەم پیاوانە دیاری نەکردووە. هەر کاتێك ئێمە بە چاوێکی دادگەرانە و دوور لە ڕق و کینە سەیری یاسای فرەژنی بکەین، دەبینین کە ڕێگەدان بە فرەژنی لە ئیسلامدا، کە هەم پارێزگاری لە ژنان و هەم مافی نەفەقە و خۆراك و پۆشاکی تێدایە، زۆر باشتر و سەرووتر و مرۆڤانەتر دەزانین لە داوێنپیسی و فرەژنییەکەی ڕۆژئاواییەکان، کە ڕێگە بە پیاوان دەدات کە هەرچەند ژنێکی بوێت، تەنها بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانیان لەگەڵیان ڕابوێرن. ئەوەتا لە وڵاتانی خۆمان، بە هەزاران ژن بۆ چێژ و بەهرەی سێکسی وەك کاڵایەك بەکار دەهێنرێن، ئینجا فڕە دەدرێنە سەر شەقامەکان و وێڵیان دەکەن. شەرعی ئیسلام لەبارەی ژنانەوەو وەك مارەیی و تەڵاق و نەفەقە و چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵیان، هەتا ئێستاش زۆر سەرترە لە یاسا دەستنووسەکانی ئێمە!"[2]

"ویل دیۆرانت"یش دەنووسێ:

"سنوورەکانی هاوسەرینی لە ئیسلامدا زۆر بەرفراوانترن لەچاو ئایینەکانی دیکە؛ چونکە شەریعەتی ئیسلام زۆر ڕێگا، وەك ڕێگای فرەژنی دەخاتە پێش بۆ تێرکردنی غەریزەی سێکسی؛ هەر بۆیەش کە داوێنپیسی و لەشفرۆشی لە سەردەمی محەممەد و جێنشینەکانیدا بەتەواوەتی کەم کرایەوە."[3]

---

1 . Dermenghem, op. cit., p 331.

* Annie Besant (1847 -1933) was a prominent British socialist, theosophist, women's rightsactivist, writer and orator and supporter of Irish and Indian self-rule. See: MacKillop, I. D. (1986), **"The British Ethical Societies"**, Cambridge University Press, P. 97.

2. Besant, Annie (1932), **"The Life and Teachings of Muhammad"**, The Theosophist Office: Adyar, Madras. India, P. 162.

3 . دورانت، ویل (2012)؛ **"تاریخ تمدن"**؛ جلد 2 (یونان باستان)؛ ترجمه: امیرحسین آریانپور و دیگران؛ تهران: انتشارات علمی و فرهنگی؛ چاپ پانزدهم؛ ص 233.

لێرە ئاماژە بە سەرهاتێك دەکەم کە جیاوازیی فرەژنیی ئیسلامی لەگەڵ ڕۆژئاوایی بەدەردەخات، کە ڕۆشنبیران و فێمێنیستانی خۆمان ڕاشکاوانە لە میدیاکان بانگەشەی بۆ دەکەن و لە فرەژنیی ئیسلامی بە باشتری دەزانن:

"پیاوێکی موسڵمان لە یەکێك لە وڵاتانی ئیسلامی لە باکووری ئەفریقیا نیازی ژنی دووەمی هەبوو، بەڵام لەبەر ڕێگریی یاسایی لەو وڵاتە و ترسی دادگا، بە نهێنی ژنی دووەم بە شێوەیەکی شەرعی و عورفی مارە دەکات، بەڵام نەیدەتوانی لە دادگا بە ڕەسمی تۆمار بکات؛ چونکە یاسای ئەو وڵاتە فرەژنی بە تاوان دەزانێت... پیاو هەندێ کاتی دیاریکراو سەردانی ژنی دووەمی دەکرد کە ئەم هاتووچۆوە گومانی لای پۆلیس دروست کرد و بووە هۆی دەستگیرکرانی، بە تاوانی هەبوونی دوو ژن و سەرپێچی لە یاسا. کاتێك کە لەبەردەم دادوەری دادگا ئامادە کرا بۆ دادگاییکردن، بە زیرەکی وەڵام دەداتەوە کە: من ئەم ژنەم مارە نەکردووە و، بەڵکو تەنها دۆست و خۆشەویستی منە و جاربەجار سەردانی دەکەم! قازی بەو پەڕی ڕێزەوە داوای لێبوردنی لێکرد و وتی: دیارە خراپ تێگەیشتنێك هەبووە، کە پێویستە بمانبووری؛ چونکە ئەوان نەیان زانیوە کە ئەمە گێرلفرێندی تۆیە، بەڵکو پێیان وابووە کە هاوسەری تۆیە!"[1]

ڕۆشنبیران و فێمێنیستان لەبەر ئەوەی وا دەزانن فرەژنی لەگەڵ دەروون و خوو و سروشتی ژناندا ناگونجێت، هێرش دەکەنە سەر ئیسلام و ڕەخنەی قیناوی و توندی ئاراستەی دەکەن. سەرەڕای ئەوەی کە ئێمەش نکۆڵی لەوە ناکەین و هیچ کەسێکیش ناتوانێ ئیددیعا بکات کە فرەژنی لەگەڵ خوو و تەبع و ویستی ژنان بە گشتی دەگونجێت، بەڵام ناشکرێ نکۆڵی لەوەش بکەین کە ئەگەر ئەمە شتێکی گشتی و ڕەها بایە، ئەی بۆچی زۆر لە ژنان ئامادەن کە ببنە ژنی دووەم و وەك کوردەواریی خۆمان کە دەڵێن: بەسەر هەوێ دەچن؟ هەروەها بۆچی زۆر لە ژنانی یەکەم ئامادەن کە ژنی دووەم بەسەریان بێت و تەنانەت بۆ پیاوەکەیان بەدوای ژنێکی گونجاودا دەگەڕێن؟ ئەگەر فرەژنی لەگەڵ تەبع و ویستی ژناندا نەگۆنجێ، ئەوا داوێنپیسی و خیانەتی هاوسەر هەر هیچ لەگەڵ دەروونیاندا ناگونجێت. ئامارەکانی تەڵاق لە یەك ساڵ (بۆ نموونە ساڵی 2012) لە پارێزگای هەولێردا بە ڕوونی دەردەخەن، کە فاکتەری داوێنپیسی و ناپاکیی هاوسەرێتییە چەند ئەوەندەی فاکتەری فرەژنییە: ڕێژەی (7.2%)ی تەڵاقەکان لەبەر ناپاکیی هاوسەرگیرییە، کەچی ڕێژەی (3%) تایبەتە بە هۆکاری فرەژنی، ئەویش ــ هەروەك لە ڕاپۆرتی سەرۆکایەتیی دادگای باری کەسیی هەولێردا هاتووە ــ زۆربەیان لەبەر نەبوونی ماڵی جیا و

1 . القرضاوي؛ همان منبع؛ ص 135 - 136.

نادادپەروەریی مێردەکانیان، داوای تەڵاقیان کردووە.[1] لە مێزگردێکی تەلەفزیۆنی سەبارەت بەو دیاردەیە، پێشکەشکاری بەرنامە ئەم پرسیارەی لە ژنێکی چالاکڤان کرد، کە بەرپرسی یەکێتیی ژنانی کوردستانە، کە بۆچی زۆر لەو ژنانەی کە لە سەنتەرەکان و ڕێکخراوەکانی ژنان ئەندامن و ڕۆڵی گرنگیشیان هەیە، بەسەر ژن دەچن و ئامادەن ببنە ژنی دووەم؟* کە ئەو فێمێنیستە نکۆڵیی نەکرد و دانی بەوەدا نا و داخی خۆی دەربڕی![2] ئامارە ڕەسمییەکانی ئەنجوومەنی دادوەرانی هەرێمی کوردستان لە چوار ساڵی (2010)، تاکو (2013) لەگەڵ سێ مانگی یەکەمی ساڵی (2014) ئاماژە بەوە دەکەن کە (483) حاڵەتی هێنانی ژنی دووەم لە دادگاکانی هەولێر، سلێمانی، دهۆك و گەرمیان تۆمار کراون.* هەروەها ئامارە ناڕەسمییەکانیش دەڵێن: تەنها لە ساڵی (2013)، (600) پیاو لە هەرێمی کوردستان لە ڕێگەی دادگاکانی کەرکوك و مەخموورەوە ژنی دووەمیان مارە کردووە.[3]

گەورەترین بەڵگە، ڕاوبۆچوونی خودی ژنانە لە کوردستاندا، کە ڕێژەیەکی بەرچاوی ژنان بەپێی ئەو ڕاپرسی و توێژینەوە بەرفراوانەی کە سەنتەری نێودەوڵەتیی "WVS" (ڕووپێوی بەها جیهانییەکان) لە ساڵی (2013)دا لە هەرێمی کوردستان کردوویەتی، دژی بۆچوون و

---

1 . سەرۆکایەتی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی هەولێر: بەڕێوەبەرایەتیی پلان و ئامار؛ **"خشتەی ئاماری تایبەت بە دادگای باری کەسییەکانی ساڵی (2012)"**.

* مەلا فەرمان خەرابەیی لە نامیلکەی خۆیدا بە ئاماژەکردن بە سەرچاوەی زانیارییەکانی، باسی لە چەندین حاڵەتی وا کردووە، کە زۆربەیان کاربەدەست، چالاکڤان، شاعیر، ڕۆژنامەنووس و سەرنووسەرن، کە سەربەهەوێ چوونە؛ بۆ نموونە حاڵەتێك دەگێڕێتەوە کە هەڵسوڕاوی بواری مافی ژنان بووە لەو ئافرەتانەی بەردەوام بەگژ کولتوور و فەرهەنگ و ئایینی میللەتەکەیدا چووە و بە توندی داکۆکی لە مافەکانی ژن دەکرد و دژایەتیی خۆی بۆ پیاوسالاریی ڕادەگەیاند، تەنانەت هەر لەسەر پێشنیازی ئەو بوو بڕیاری قەدەغەکردنی فرەژنی دەرکرا، کەچی ئێستا دەست لە بیروڕاکانی هەڵدەگرێت و سەربە هەوێ دەچێت و شوو بە پیاوێکی خاوەن ژن دەکات! سەرنووسەری ڕۆژنامەیەکیش کە زۆر داکۆکی لە مافی ژنان دەکرد و ڕەخنەی لە پیاوان دەگرت لەبەر فرەژنی، کەچی خۆی شووی بە پیاوێکی خاوەن ژن دەکات و لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە بۆچی سەربەهەوێ چووی؟ بەم شێوەیە بەرگری لە خۆی دەکات: بەڵێ من وەك هەموو ئینسانێك پێویستیم بە ژیانی تایبەتی خۆم هەیە و شووم کردووە! دیارە تەنها خانم پێویستی بە ژیانی تایبەت هەیە و خەڵکی‌تر پێویستی بە ژیان نییە و با شوو نەکەن؟! ئافرەتێکی‌تر کە ئەندامی یەکێك لە ڕێکخراوەکانی ژنان بوو، شووی بە پیاوێکی خاوەن ژن کرد، کە 9 منداڵی هەبوو. هەروەها باس لەو پیاوانەش دەکات کە بەرگرییان لە مافی ئافرەت دەکرد (بەڵام تەنها ئافرەتانی 14 تا 30 ساڵ)، کەچی دوایی ژنی دووەم و سێیەم و هەتا پێنجەمیشیان هێناوە. بڕوانە: فەرمان خەرابەیی؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 42 - 44.

2 . کەناڵی ئاسمانیی ڕووداو؛ **"بەرنامەی ڕووداوی ئەمڕۆ"** بە پێشەکەشکاریی "هیوا جەمال"؛ بە ئامادەبوونی بەرپرسی یەکێتیی ژنانی کوردستان، هەروەها بەرپرسی بەڕێوەبەرایەتیی توندوتیژی دژ بە ئافرەتان لە ڕیکەوتی (2014/5/25).

* لە هەولێر (151) حاڵەت، لە سلێمانی (70) حاڵەت، لە دهۆك (53) حاڵەت، لە گەرمیانیش (209) حاڵەت لەو چوار ساڵ و سێ مانگەدا تۆمار کراون.

3 . ماڵپەڕی ڕووداو (2014/6/5) ڕاپۆرتێکی بڵاو کردووەتەوە لە ژێر ناونیشانی: **"483 پیاو لە دادگاکانی هەرێمی کوردستان ژنی دووەمیان مارە کردووە"**؛ بڕوانە:

http://rudaw.net/sorani/kurdistan/050620146

چاوەڕوانییەکانی فێمێنستانی کوردستان دەوەستن و، سەبارەت بە "فرەژنی" ڕێژەی زیاتری ژنە کوردەکان لەگەڵ فرەژنی کۆکن. ئەوەتا لە وەڵامی ئەم پرسیارە: "ڕەوایە پیاو لە یەك ژن زیاتری هەبێت"، ڕێژەی (42.18%)ی ژنە کوردەکان گوتوویانە: هەرگیز ڕەوا نییە، بەڵام (40.12%)یان گوتوویانە: لەکاتی پێویست ڕەوایە و، (17.7%)یش گوتوویانە: هەمیشە ڕەوایە؛ کەواتە ڕێژەی بەرزتری ژنان لە کوردستان، بە تێکڕای ئەوانەی کە فرەژنی بە شێوەیەکی ڕەها ڕەوا و گونجاو دەبینن، هەروەها لەگەڵ ئەوانەی کە لەکاتی پێویست و مەرجدار، بە ڕەوا دەزانن، کە دەکاتە (57.82%)، لەگەڵ فرەژنی کۆکن.[1]

ئەگەر ئەم ناڕەوایی و نەگونجانە ڕێسایەکی گشتی و ڕەها بێت لای هەموو ژنان، ئەی ئەم ڕێژە بەرزەی لایەنگرانی ژنان بۆ فرەژنی چییە؟ ئەی ئەم هەموو ژنانەی کە ئامادەن بەسەر یەکتری بچن و ببنە هەوێی یەکتری چین؟ نەك تەنها لێرە بەڵکو لە ڕۆژئاواش! ئەگەر ئەمە زوڵم و چەوساندنەوە و کۆت و قەفەس بێت، هەر ژنانن کە زوڵم لەگەڵ یەکتری دەکەن و بەسەر یەکتری دەچن، یان لە فۆرمی ڕۆژئاواییشیدا هەر ئەوانەن کە خیانەت لە هاوسەرانی پیاوەکان دەکەن و ئامادەن پەیوەندی لەگەڵ پیاوێك ببەستن کە خاوەن هاوسەرە!

لە فرەژنیدا، ڕەفتاری نادادپەروەرانە و جیاکارانەی پیاوان لە نێوان هاوسەرەکانی، کە زۆر جاریش خودی ژنان (هەوێیەکان) دەبنە هۆ و پاڵنەری ئەم جیاکارییانە، بووەتە هۆی ئەوەی کە ئەم دیاردەیە بەم شێوە ناپەسەندە پێناسە بکرێت و نیشان بدرێت، ئەوەتا نموونەی زۆرمان هەیە کە پیاو لەگەڵ خێزانەکانی زۆر دادگەرانە و یەکسانانە ڕەفتار دەکات و هەوێیەکان وەك دوو هاوڕێ یان دوو کەسی لەیەك نزیك لەگەڵ یەکتری هەڵسوکەوت دەکەن. ئەگەر بەپێی ئەم لۆژیکە ناتەندروستە ڕەفتار بکەین، هەر لە سۆنگەی ئەوەوە، کە لادان و کەموکورتییەکانی پیاوە موسڵمانەکان دەکرێتە هۆی ڕەفزکردنی ئایین بە گشتی و فرەژنیش بەتایبەتی، دەکرێ ئێمەش هەموو ئەو چەمکانەی کە چەواشەکاری و گەندەڵی بە ناویانەوە دەکرێ، بخەینە ژێر پرسیارەوە و لە بنەڕەتدا ڕەتیان بکەینەوە؛ وەك: دیموکراسی، ئازادی، مافی مرۆڤ، دادگەری، یەکسانی، سەروەریی یاسا و هتد!

سەرباری هەموو ئەوانەی باسمان کرد، چەند کەس لەوانەی کە ژنی دووەم دەهێنن لەبەر پابەندبوونیان بە ئایینی ئیسلام و ئەم ئایەتە قورئانییانەوە؟ پێم وایە ڕاستە کە دەزانن شەرعی

1 . WVS, op.cit., From: http://www.worldvaluessurvey.org/WVSOnline.jsp

ئیسلام ڕێی بە فرەژنی داوە، بەڵام پاڵنەری ئەوان هەرگیز ئایینی ئیسلام نەبووە! زۆر کەس هەن کە دوو ژن و سێ ژن دەهێنن، بەڵام لەوانەیە نوێژ نەکەن و ڕۆژوو نەگرن و هەر پابەندی فەرمانەکانی ئیسلامیش نەبن! ئەگەر کەسێك بە پاڵنەرێکی قورئانی و ئیسلامی ژنی دووەم دەهێنێ، دەبێ باش بیری لەو کارە کردبێتەوە و بزانێ کە بە ڕاستی دەتوانێ لە هەموو ڕوویەکەوە دادپەروەری لە نێوياندا بکات؛ بۆیە هەر کەسێك کە لە خوا بترسێ و بزانێ کە لە ڕۆژی دوایی دەبێ وەڵام بداتەوە و بشزانێ کە توانایی ڕاگرتن و بەخێوکردنی دوو خێزان یان زیاتری نییە، با خۆی گرفتار نەکات و، ژیانی دونیا و قیامەتیش لەکیس نەدات!

**10) <u>سەبارەت بە پۆشتەیی و حیجاب</u>**: هەروەك دەزانین، لەبەرکردنی پۆشاك و خۆداپۆشین، تایبەتمەندییەکی مرۆییە کە "مرۆڤ" لە "ئاژەڵ" جیا دەکاتەوە و دیاردەیەکە لە وەتەی مرۆڤ هەیە، ئەویش هەبووە.[1] لە کۆی گشتیی ئەو توێژینەوانەی کە هەتا ئێستا کراون، سەلمێنراوە کە پۆشاك لانیکەم وەڵامدەرەوەی سێ پێداویستیی سەرەکیی مرۆڤە: یەکەم) ئەوەیە کە مرۆڤ لە سەرما و گەرما و بەفر و باران دەپارێزێت، دووەم) ئەوەیە کە بۆ پاراستنی پاکداوێنی و عەیب و شەرمەکانی یارمەتیی دەدات و سێیەم) جوانی و ڕێکی و هاوسەنگی و شکۆی پێ دەبەخشێت.[2] بەپێی توێژینەوەکان هیچ نەتەوە و شارستانییەتێك نادۆزینەوە کە جلوبەرگی تایبەت بە خۆیان نەبووبێت. چەند لاپەڕەکانی مێژووی پێشتر هەڵدەدەینەوە، دەبینین کە ئەوەندەش خۆداپۆشتن و شێوازی پۆشاکیش، پۆشتەتر و گشتگیرتر بووە.[3]

کەواتە حیجاب بەرلە ئایینی ئیسلام لە نێوان ئایینەکانی پێشووتر و شارستانییەتە کۆنەکانیشدا هەبووە، بەڵام ئیسلام حیجابی هەم لەسەر ژن، هەم لەسەر پیاویش فەرز کردووە، بەڵام هەریەکە بە شێوازی خۆی و، ئەمەش هەتا نزیکەی (14) سەدە لە مێژووی ئیسلامدا و لە نێوان هەموو کۆمەڵگایەکی موسڵماندا باو بووە و قەت هیچ ژنێك حیجاب و لەچکەی سەری، بە کۆیلەکردن یان قەفەس و کۆت و بەند یان ئاستەنگ نەزانیوە و، هەرگیزیش نەمانزانیوە کە ژنێکی موسڵمان داوای لابردنی فەرزی حیجابی کردبێ و یان بە پرسێکی زۆر گرنگی زانیبێ، کە پێویستە

1 . بڕوانە: (الأعراف: 7).
2 . حداد عادل، غلامعلی (2012)؛ "فرهنگ برهنگی و برهنگی فرهنگی"؛ تهران: سروش؛ چاپ 22؛ ص 6.
3 . Anawalt, Patricia Rieff (2007), "The Worldwide History of Dress", London: Thames & Hudson, pp. 1-608.

چارەسەرێکی بۆ بدۆزرێتەوە، یان جێگرەوەیەکی دیکەی بۆ دابنرێت، بەڵکو دژایەتیکردنی حیجاب لە دوای نووسینەکانی کەسانێکی وەك "قاسم ئەمین"* لە سەدەی ڕابردوودا دەستی پێ کردووە، کە ئەویش هۆکاری سیاسی و مێژوویی خۆی هەبووە، کە لێرە دەرفەتی باسکردنی نییە![1]

حیجاب لە ئیسلامدا بەهۆی ئەو دوو ئایەتەی خوارەوە فەرز کراوە، کە دەفەرموێن:

﴿قل للمؤمنين يغضوا من أبصارهم ويحفظوا فروجهم ذلك أزكى لهم إن الله خبير بما يصنعون. و قل للمؤمنات يغضضن من أبصارهن و يحفظن فروجهن و لا يبدين زينتهن إلا ما ظهر منها وليضربن بخمرهن على جيوبهن و لا يبدين زينتهن إلا لبعولتهن أو آبائهن أو آباء بعولتهن أو أبنائهن أو أبناء بعولتهن أو إخوانهن أو بني إخوانهن أو بني أخواتهن أو نسائهن أو ما ملكت أيمانهن أو التابعين غير أولي الإربة من الرجال أو الطفل الذين لم يظهروا على عورات النساء و لا يضربن بأرجلهن ليعلم ما يخفين من زينتهن﴾؛[2] واتە: (ئەی پێغەمبەر!) بە پیاوانی ئیماندار بڵێ: چاویان بپارێزن (لە سەرنجدانی ژنانی نامەحرەم)، هەروەها داوێن و عەورەتی خۆیان بپارێزن (لە کاری حەرام)، بێگومان ئەوە پاکتر و پوختترە بۆیان (هەم بۆ دڵ و دەروونیان، هەمیش بۆ رواڵەت و جەستەیان). بە ڕاستی خوا ئاگادارە لەو هەڵسوکەوت و ڕەفتارانەی کە دەیکەن. بە ژنانی ئیمانداریش بڵێ: چاویان بپارێزن و داوێنی خۆیان بپارێزن (لە گوناە) و جوانیی خۆیان (وەکو قژ، سینگ، قۆڵ و باسك دەست، لۆلاق) دەرنەخەن، جگە لەوەی کە ئاشکرا دەبن و دیارن (وەك ڕوخسار و دەست) با لەچك و سەرپۆشەکانیان بدەن بە سەر سینگ و ملیاندا و جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن، مەگەر بۆ هاوسەرەکانیان، باوکیان، باوکی مێردیان (خەزووریان)، کوڕەکانیان، کوڕی مێردەکانیان، براکانیان، برازاکانیان، خۆشکەزاکانیان، یان ژنەکان و خزمەتکارەکانیان، یان ئەو پیاوانەی کە پێویستییان بە ژن نییە (وەکو پیرەمێردەکان،

* لە ساڵی (1863) لە شاری (طرة)ی میسر لە دایك دەبێت. باوکی بە ئەسڵ کوردی سلێمانی بووە و کاربەدەستێك بووە لە حکومەتی عوسمانی لە ویلایەتی عێراق، شاری سلێمانی. دواتر لە سەردەمی خەدیوی ئیسماعیل دەچێتە میسر، لەوێ هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکی میسری دەکات، کە قاسم منداڵە گەورەکەیان دەبێت و بۆ درێژەدان بە خوێندنەکەی، دەچێتە فەرەنسا و لەدوای وەرگرتنی بەکالۆریۆس لە بواری یاسا و ماف (حقوق) دەگەڕێتەوە و وەکو ڕۆژهەڵاتناسێك لەگەڵ کۆمەڵگای میسری مامەڵە دەکات و ئەزموونی خۆی لەگەڵ کچێکی فەرەنسی کە خۆی دەڵێ خۆشی ویستووە بگوازێتەوە بۆ گەنجە موسڵمانەکانی میسری، و بۆ ئەم مەبەستەش کتێبێك دەنووسێ بە ناوی "تحرير المرأة" بە پاڵپشتیی "سعد زغلول" و "احمد لطفي السيد" لە ساڵی (1899) چاپ دەکات. بڕوانە: قطب، محمد (2001)؛ "**قضية التحرير المرأة**"؛ مكة: جامعة أم القرى؛ صص 1-52.

1 . بۆ نموونە: کاریگەرییەکانی "لورد کرومێر" (Lord Cromer)ی بریتانی ـ حاکمی ئەو سەردەمەی میسر ـ لەسەر بڵاوکردنەوەی ئەم هەوڵانە لەبیر ناکرێن؛ بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:

Arthur, Goldschmidt (2000), "**Biographical Dictionary of Modern Egypt**", Colorado: Lynne Rienner Publishers, p.10. And: Esposito, "Who Speaks For Islam?: What a Billion Muslims Really Think", pp. 108-110.

2 . (النور: 30-31).

پیاوە شێتەکان، یان نەخۆشەکان و پەککەوتووەکان) یاخود ئەو منداڵانەی کە هێشتا شارەزاییان لەبارەی ژنانەوە نییە و (ئارەزووی سێکسییان بۆ دروست نەبووە و نازانن باسی داوێن و عەوراتی ژنان بکەن). نابێت ژنانی ئیماندار قاچیان دەربخەن و پێیان بدەن بە زەویدا، تاکو جوانییە نهێنییەکانیان بەدەر بکەون و بزانرێن (و دەنگی خشڵ و پاوانەکانیان بێت).

فەلسەفە و هۆکاری فەرزبوونی حیجابیش لەو ئایەتەدا ڕوون کراوەتەوە، کە دەفەرموێ:

﴿یا أیها النبی قل لأزواجك و بناتك و نساء المؤمنین یدنین علیهن من جلابیبهن ذلك أدنی أن یعرفن فلا یؤذین وکان الله غفورا رحیما﴾؛[1] واتە: ئەی پێغەمبەر! بە هاوسەرانت و کچەکانت و ژنانی ئیماندار بڵێ کە بە لەچك و باڵاپۆش خۆیان داپۆشن. ئەوە لەبارترین و کەمترین شتە کە پێی بناسرێنەوە (لانیکەم لەو ژنە بێبەندوبارەکانی دیکە جیا بکرێنەوە)، تا ئازار نەدرێن (لە لایەن پیاوە دڵنەخۆشەکانەوە تووشی کێشە نەبنەوە) و، خواش هەمیشە لێبوردە و میهرەبانە.

کەواتە: حیجاب کەمترین شتە بۆ:

- "جیاکردنەوەی ژنانی پابەند لە ژنانی ناپابەند بە ڕێنماییە ئاینییەکانەوە" (أن یعرفن).
- "ئەوەی لە لایەن پیاوە خراپ و لادەرەکانەوە ئازاری سێکسی نەدرێن" (فلا یؤذین).

ئەم ئازاردانەش دەکرێ: بە نیگایەك، یان قسەیەك، توانجێك، هێمایەك، یان ڕەفتارێك بێت؛ دەکرێ کەم بێت یان زۆر؛ دەروونی بێت یان جەستەیی؛ شاراوە بێت یان ئاشکرا؛ خوازراو بێت یان نەخوازراو.

بۆ زانینی چۆنییەتی میکانیزمی ئەو ئازاردانەش و هەروەها ڕێگریکردنی لێی، دەکرێ پەنا ببەینە بەر زانستی "بایۆلۆژی" و "کۆمەڵناسی" و "دەروونناسی"؛ واتە دەتوانین لە ڕووی ئەم سێ زانستەوە شیبکەینەوە:

حیجاب لە ڕووی بایۆلۆژییەوە: کاتێك قورئان باس لە پاراستنی (چاوەکان: أبصار)، (داوێنەکان: فروج)، (جوانییەکان: زینة)، (سینگ و مل: جیوب) و (لاقەکان: أرجل) دەکات، کەواتە باسی ئەندامی جەستەیی و فیزیۆلۆژیکیی مرۆڤ دەکات، کە هەموو ئەم ئەندامانە بە شێوەیەکی مانادار و ئامانجدار، بە فەرمانی "مێشك" ـ فەرماندەی لەش ـ دەجووڵێنەوە، یان لەکار دەوەستن. هەموو دەزانین کە "پەیام"ـەکان لە ژینگەی دەوروبەر لە دەرەوەی جەستەی مرۆڤ، لە

1 . (الأحزاب: 59).

ڕێگەی (5) هەستەکانی: (بینین، بیستن، بۆنکردن، تامکردن، بەرکەوتن) دەگوازرێنەوە بۆ مێشك و، لەوێشەوە پەیامی پێویست، کە زۆر جاریش پەیامێکی کاردانەوەیە، بە شێوەیەکی مەبەستدار دەگوازرێتەوە بۆ ئەندامە جیاجیاکانی لەش؛ بۆ نموونە: کاتێك کە کەسێك پەیامێکی ناخۆش و ترسناك بە مرۆڤ دەگەیەنێ (وەکو بیستنی هەواڵی مردنی خۆشەویستەکەی)، یان دیمەنێکیترسناك ببینێ، لە دوای گەیشتنی ئەو پەیامە بە مێشك، لە ڕێگای دەمارە عەسەبییەکانی (گوێ یان چاو)ەوە، یەکسەر ڕژێنی "هایپۆفیزس" (Hypophysis) و "هایپۆتالامۆس" (Hypothalamus)ی مێشك، هۆرمۆنی تایبەت دەڕێژنە دەر، کە لە ڕێگەی خوێنەوە بۆ ڕژێنی "ئەدرینالین" (Adrenalin)، کە لە سەرووی کلیەکانە، دەگوازرێتەوە و، ئەم ڕژێنەش یەکسەر هۆرمۆنێك بە هەمان ناو (ئەدرینالین) ئیفراز دەکاتە ناو خوێن، کە بە هۆیەوە هەموو لاشەی مرۆڤی دەخاتە ژێر کاریگەریی خۆی؛ وەك: هەست کردن بە ڕووخانی دڵ و هەناو، لەرزینی دەست و پێ، لێدانی خێرای دڵ، تەنگە نەفەس، ڕەنگ هەڵگەڕانەوە، دڵەڕاوکێ، بێتاقەتی و تەنانەت بەربوونەوەش. سەبارەت بە "حیجاب"یش، دیتنی دیمەنی سێکسی، بیستنی دەنگی سێکسی، بۆنی وروژێنەری سێکسی، دەستلێدان و لەمسکردنی ئەندامی لەش، بە تایبەتی ئەندامە سێکسییەکان، یەکسەر پەیامەکان بۆ مێشك دەگوازرێنەوە، کە ئەم پەیامانە بۆ مێشك زۆر مانادار و ناسراون. لە دوای وەرگرتنی ئەم پەیامانە، ڕژێنی "هایپۆتالامۆس" زۆر بە خێرایی دەورووژێ و هۆرمۆنێك بە ناوی "هۆرمۆنی ئازادکەری گونادۆترۆپین"ـەکان (GnRH)* دەرژێنێتە دەر، کە ئەویش خۆیلەخۆیدا دەبێتە هۆی وروژاندنی رژێنی "هایپۆفیزس" و دەرکردنی دوو هۆرمۆنی جیا لەوێ: "هۆرمۆنی لۆتێنین ساز" (LH)** و "هۆرمۆنی هێلکەوروژێن" (FSH).*** ئەم دوو هۆرمۆنەش ڕۆڵیان ئەوەیە کە ڕژێنەکانی "گون یان هێلکە"ی پیاو و "هێلکەدانەکانی ژنان"یش بوروژێنن، کە هەر یەکیان هۆرمۆنێکی تایبەت بە ڕەگەزەکەیان لە ناو خوێندا ئازاد دەکەن، کە پێویستە لە ڕادەی نورماڵ نە کەمتر بێت، نە زیاتر. ئەو هۆرمۆنەی کە تایبەتە بە پیاوەوە، کە لە هێلکەی ئەو دەرژێتە ناو جەستەدا "تستوسترۆن" (Testosterone)ی پێدەگوترێت. دوو هۆرمۆنی ژنانەش بە ناوەکانی "پرۆژسترۆن" (Progesterone) و "ئسترۆژن"

* Gonadotropin-releasing hormone.

** Luteinizing hormone.

*** Follicle-stimulating hormone.

(Estrogen) لە هێلکەدانەکانەوە ئیفراز دەبن. ئەم هۆرمۆنانەن کە لە پیاو و ژندا، هێز و توانا و حەزی سێکسی لە ئەندامە سێکسییەکانیان و تەنانەت هەستەکانی دیکەشیان دەجووڵێنن؛[1] بۆ نموونە: پیاو لەگەڵ دیتنی وێنەیەکی سێکسی، یان دەنگێکی وروووژێنەر، یەکسەر هەست بە حەزی سێکسی دەکات و ئەندامە سێکسییەکەی بەناچاری و نەخوازراوی دەورووژێت، کە زۆر جار هاوکات دەبێ لەگەڵ هاتنەخوارەوەی لیچاوێك، کە لە شەرعدا ناوی "مذی"ی پێ دەگوترێ. وەکو ئەو برسییەی کە بۆنی خواردنێك دەکات، یەکسەر دەمی ئاو دەکات! لێکۆڵینەوەکان دەریدەخەن کە چەند ژینگەی دەوروبەری پیاوان، پڕ بێ لە شتە وروووژێنەرە سێکسییەکان، ئەوەندەش ڕێژەی ڕژێنی هۆرمۆنەکان (بە تایبەتی هۆرمۆنی تستوستڕۆن لە پیاوان) لە ناو خوێندا زیاد دەبێت و ئەوەندەش حەزی سێکسییان دەورووژێنێ و هەتا ئەم حەزە تێر نەکات، کۆمەڵێك ئاسەواری سلبیی نەخوازراو بۆ بەدی دەهێنێ، کە زۆر جاریش دەبنە پاڵنەری پیاو بۆ دەستدرێژی یان ئازاری سێکسیی نەخوازراو لەسەر ژن یان کچێك، یانیش لانیکەم زوو هەڵچوون و تووڕەبوون و شەڕفرۆشتن و تاوانێکی نەخوازراو؛ پەیوەندیی نێوان "تێرنەبوونی حەزی سێکسی" و "هەڵچوون و تووڕەیی" لە لایەن زۆر لە دەروونناسان بە تایبەتی خاوەن قوتابخانە دەروونناسییەکان سەلمێنراوە؛ بۆ نموونە: خاتوو "کارن هۆرنێی"* ـ پزیشك و دەروونناسی ئەڵمانی ـ لە کتێبە بەناوبانگەکەی "کەسایەتییە تووڕەبووەکانی سەردەمی ئێمە"دا بە پێشکەشکردنی بیرۆکەی خۆی (کە سەرەڕای پابەندیی بە فرۆیدیزم، بەڵام بۆچوونە جیاوازەکەشی دەخاتەڕوو) و باسی چەندین توێژینەوە سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان حەزی سێکسی و تووڕەبوون دەکات و، دەیسەلمێنێ کە یەکێك لە هۆکارەکانی زوو هەڵچوون و تووڕەبوونی مرۆڤی ئەم سەردەمە، بابەتە سێکسییەکانە.[2]

نرۆسایکۆلۆژیستێکی ئەمریکی بە ناوی "ڕۆبن گێر" (Ruben Gur) ـ پرۆفیسۆرە لە زانکۆی پنسیلڤانیا ـ توێژینەوەیەکی وردی لەسەر مێشکی پیاو و پەیوەندیی لەگەڵ هێزی سێکسی و هەستەکانی کردووە، کە دەیسەلمێنێ:

---

1 . بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە کتێبە پزیشکییەکانی تایبەت بە کۆئەندامی زاوزێ یان ڕژێنەکان و هۆرمۆنەکان؛ بۆ نموونە:
Klosterman, Lorrie (2010), **"Reproductive System"**, New York: marshall cavendish, pp. 22-38.

* Karen Horney (1885–1952).

2 . Horney, Karen (1999), **"The Neurotic Personality of Our Time"**, London: Routledge, pp. 147-162.

"پیاو بە بینینی وێنەی سێکسی و ڕووت، زۆر بە خێرایی هەستە سێکسییەکەی لە مێشکەوە دەورووژێت و ڕێژەی هۆرمۆنە سێکسییەکانی ئەوەندە بەرز دەبێتەوە کە دوور نییە وەك خشۆکەیەك خۆی فڕە بداتە سەر کەسێك و پێوەی بدات!"[1]

زانستی سێکسۆلۆژی بە پشتبەستن بە (60) ساڵ توێژینەوە دەڵێت:

"ئەو شتانەی کە زیاتر لە هەموو شتێك هەستی سێکسیی پیاوان دەورووژێنن، بریتین لە: *1*) پۆرنۆگرافی (فیلم و وێنەی سێکسیی ڕووت)، *2*) ئەندامە ڕووتەکانی ژن، *3*) سەیرکردنی ئەندامە جوان و سەرنجڕاکێش و بەرجەستەکانی ژن، *4*) گۆڕانکاری و جۆراوجۆری لە سێکسکردن، *5*) جلی ژێرەوەی ژن، *6*) خۆپێشکەشکردنی ژن."[2]

هەروەها دەردەخات:

"پیاو لە تەماشاکردنی ئەو تایبەتمەندییانەی ژنان چێژ وەردەگرن: درێژەباڵا و کەڵەگەتی گونجاو، دەمی جوان، لاقی بڵند و بێموو، کەمەری باریك، چاوی جوان و سەرنجڕاکێش، قژی بڵند و ڕازاوە، لووتی بچووك، سکی ساف و چەماوەیی لە کەمەر، گەردەنی بڵند."[3]

توێژینەوەیەکیتر لەسەر ئەو پیاوانەی کە سەیری وێنەی پۆڕن (ڕووت و ئاڵۆشبزوێن) دەکەن، دەردەخات:

"کاتێك کە پیاوان وێنەی ڕووتی ژنێك دەبینن، هەرگیز بیر لەوە ناکەنەوە کە خاوەنی ئەم وێنەیە چ جۆرە ژنێکە و چۆن چێشت لێ دەنێت یاخود دەزانێ پیانۆ بژەنێت، ئایا ئاقڵ و زانایە یان نەزان و نەخوێندەوار، بەڵکو تەنها سەرنج دەداتە ڕواڵەتی جەستەی، چەمانەوە و باریکیی کەمەر و ئاناتۆمیی ئەندامە سێکسییەکانی (شێوە و شێوزای ناوگەڵیان). نامانەوێ کە پاساو بۆ زلەگرتنی بێنەدەبانە و ڕاشکاوانەی پیاوان لە ژنان و کچانی بیانی بهێنینەوە ـ کە هەندێ لە پیاوان هەرگیز ناتوان دەست لەو کارە هەڵبگرن ـ بەڵکو دەمانەوێ شرۆڤە بکەین کە پیاو لەکاتێ دیتن و تەماشاکردنی ژنان، هێز و هۆش و ئاگایی خۆی لە دەست دەدات؛ ئەوەش بەو مانایە نییە کە حەزی لە هاوسەرەکەی نییە و خۆشی ناوێت، بەڵکو ئەمە شتێکە لە سروشتی پیاودایە و، بۆیەش هۆکاری ئەم کارە و کونترۆڵەکەی لە دەست پیاودا نامێنێ."[4]

کەواتە بەپێی توێژینەوەکان، کاردانەوە لەسەر پیاوان و وورووژاندنیان لەدوای تەماشاکردنی جوانییەکانی ژنان و کچان، شتێکی نەخوازراو و سروشتییە و، تەنها دوو ڕێگا هەیە بۆ ئەوەی کەمتر بورووژێنەوە، ئەویش ئەوەیە: یان سەیریان نەکەن، کە ئەوەش شتێکی مەحاڵ و

1 . Pease, " Why Men Don't Listen and Women Can't Read Maps?", p. 157.
2 . Ibid., p. 249.
3 . Pease, "Why Men lie and Women cry?", p. 196.
4 . Ibid., p. 239.

نامومکینە، یانیش ژنان جوانییەکانیان لە ڕێگەی حیجابەوە لێیان بشارنەوە، کە ئەمە کردەنیتر و کارامەترە و زیاتر دەچێتە ئەقڵەوە. "ئالن پیز" و "باربارا پیز" ــ دوو توێژەری بەناوبانگی سێکسۆلۆژی و دەروونناسی و زمانی جەستە ــ لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە چۆن دەکرێت ڕێگری لەو حەزە سێکسییە کونترۆڵنەکراوەی پیاوان بگیرێ، کە دەبێتە هۆی چاولەدەری و زلەگرتن لە ژنان و کچانی بیانی و تەنانەت ناپاکی، بەم شێوەیە وەڵام دەدەنەوە:

"تستوسترۆن لە جەستەی پیاواندا هەمیشە هەیە، هەر کات لە ڕادەی پێویست زیاتر بێت، دەبێتە پاڵنەریان بۆ شەرواڵپیسی و بێبەندوباریی سێکسی، مەگەر کاتێك کە ڕێژەی ئەم هۆرمۆنە لە ناو جەستەدا کەم بکرێتەوە، یان ڕەچاوی ئەو یاسا وردانەی بکات کە لە لایەن ئایین و کۆمەڵگاوە دژی دەوەستنەوە، یانیش لە ترسی هاوسەرەکەیدا!... بۆ کێشەی بێوەفایی و ناپاکیی پیاویش، تەنها یەك ڕێگا هەیە، ئەویش: خەساندنە! کە لەو کاتەدا نە تستوسترۆنی دەبێتەوە، نە حەزی سێکسی و، لە ئەنجامیشدا نە زلەگرتن و نە ناپاکییش! بەڵام چەند سوودێکیشی هەیە وەکو: چیتر پێویست ناکات ڕدینی بتراشێت، چیتر کەچەڵ نابێت و زیاتریش تەمەن دەکات. توێژینەوەکان پیشان دەدەن کە ئەو پیاوانەی کە بەهۆی نەخۆشی یان هۆکارێکی‌تر تستوسترۆنیان کەم بووەتەوە، ڕێژەی ناوەندیی تەمەنیان (68) ساڵە، بەڵام ئەوانەی کە تستوسترۆنیان بەردەوامە و زۆر چالاکە، تەنها (56) ساڵ تەمەن دەکەن، پشیلەی نێریش هەروایە."[1]

توێژینەوەیەکی بەرفراوان لە ساڵی (2006) لە لایەن پرۆفیسۆر "ڕێبێکا تێرنێر" (Rebecca Turner)ـەوە ــ مامۆستای "دەروونناسیی ڕێکخستن" لە زانکۆی نێودەوڵەتیی "ئالیانت" (Alliant International University) لە "سان فرانسیسکۆ"ی ئەمریکا ــ ئەنجام دراوە، کە دەرئەنجامەکانی بەم شێوەیەی دەخاتە ڕوو:

"تستوسترۆن، هۆرمۆنی بەرپرسی حەزی سێکسییە لە پیاودا. ڕێژەی ئەم هۆرمۆنە لە جەستەی پیاودا (20) جاران زیاترە لە ژنان؛ بۆیەش هێز و پاڵنەری سێکسی لە پیاودا زۆر زیاتر و خێراتر و بەهێزترە لە ژنان. لەبەر ئەوەشە کە جەستەی پیاوان کوڵکنتر و پڕمووتر، گەورەتر، بەهێزترە و لە ڕووی دەروونی و ڕەفتاریشەوە تووڕەتر، هەڵچووتر و شەڕانگێزترن. ئەو ژنانەی کە ڕێژەی هۆرمۆنی تستوسترۆن لە جەستەیان لەبەر نەخۆشیی هێلکەدان و نارێکیی هۆرمۆنەکان بەرز دەبێتەوە، زۆر تووڕە، دەمارگرژ (عەسەبی)، بێتاقەت و شەڕفرۆش دەبن و هەندێ دیاردە و ڕەفتاری پیاوانە لێیان بەدیار دەکەوێت؛ وەکو: گڕبوونی دەنگ، زیادبوونی مووی جەستە، بەتایبەتی لە دەموچاو، ڕکابەرایەتی و ململانێی نابەجێ لەگەڵ پیاو و منداڵانی، تەنانەت شتشکاندن! هەروەها دەیسەلمێنن کە

1 . Ibid,. p. 235.

نێوان ڕێژەی هۆرمۆنەکانی "تستوسترۆن" و "ئۆکسیتۆکسین" لەگەڵ "بۆنکردن"ی بۆنێکی سێکسی، "بیستن"ی گۆرانییەکی وروژێنەر، "بینین"ی جلوبەرگی گرانبەها، ئارایشتی نموونەیی و جوان، زێڕ و خشڵ و جەواهرات، ئۆتۆمۆبیلی وەرزشیی نوێ، پەیوەندییەکی توندوتۆڵی هەیە؛ چونکە دەبنە هۆی بەرزبوونەوەی ئەو دوو هۆرمۆنە، کە هۆرمۆنی تستوسترۆن حەزی سێکسی بەرز دەکاتەوە و هۆرمۆنی ئۆکسیتۆکسینیش هێزی خۆشەویستی و عەشق زیاد دەکات، کە ئەم هۆرمۆنە لە ژناندا بەپێچەوانەی تستوسترۆن زۆر زیاترە بە بەراورد لەگەڵ پیاوان."[1]

توێژینەوەیەکی دیکەش "دەزگای کینزی" (Kinsey Institute) کردوویەتی، کە دەریدەخات:

"ڕێژەی (*37%*)ی پیاوان هەر نێو کاتژمێر جارێك بیر لە سێکس دەکەنەوە، کەچی ئەم ڕێژەیە لای ژنان تەنها (*11%*)ـە. هۆکارەکەشی دەگەڕێنەوە بۆ ڕێژەی تستوسترۆن لە پیاودا. جا چەند پاڵنەری دەرەکیی بەرزکردنەوەی ئەم هۆرمۆنە لە ژینگەی دەوروبەری پیاواندا زیاتر بێ، ئەوەندەش حەزی سێکسی لە پیاواندا زۆرتر و خێراتر دەبێت."[2]

کەواتە بێحیجابی و تێکەڵبوونی بێبەندوبارانەی ژن و پیاو، بە شێوەیەکی نەخوازراو ـ بمانەوێ و نەمانەوێ ـ دەبێتە هۆی بەرزبوونی ڕێژەی رژێنی ئاڵۆشبزوێن و هۆرمۆنە سێکسییەکان لە ناو جەستەدا، کە حەزی سێکسیی هەردوو لایەن، بەتایبەتی پیاوان دەجووڵێنێ و لەبەر ئەوەی ناشتوانن هەمیشە (بە شێوەیەکی شەرعی یان یاسایی یان باو و نۆرماتیڤ) ئەم حەزە تێر بکەن، حەز و ئاڵۆشەکەیان پەنگ دەخواتەوە و لێیان دەبێتە مەراق؛ بۆیە کۆمەڵێك گرێی دەروونی ـ سێکسی لایان دروست دەبێت و تووشی نەخۆشی و شڵەژانی دەروون و کەسایەتی دەبنەوە. توێژینەوە سێکسولۆژییەکان دەسەلمێنن کە: بۆ ئەوەی حەزی سێکسیی مرۆڤ (ژن و پیاو) تێر بکرێت و بگاتە قۆناغێ هێوربوونەوە و جێگیری، پێویستە بازنە و خولگەیەکی پێنجقۆناغە تێپەڕێنێت، کە بە "بازنەی وەڵامدانەوەی سێکسی" (Sexual Response Cycle) ناسراوە. ئەم پێنج قۆناغە بریتین لە: "حەز و ئارەزووی سێکسی" (Sexual Desire)، "خرۆش و وروژاندن" (Arousal)، "بەردەوامبوون لە چێژ" (Plateau)، "ئۆرگاسم و ئەوپەڕی چێژوەرگرتن و نەشەبوون" (Orgasm) و "دامرکان و هێوربوونەوە" (Resolution).[3] سەیرکردن و زلەگرتنی جوانییەکانی ژنان و کچان لە لایەن پیاوانەوە، دەبێتە هۆی زیادبوونی حەزی سێکسی و

1 . Pease, Allan & Pease Barbara (2010), "Why Men Want Sex And Women Need Love?", London: Orion Publishing Group Ltd, pp. 22.

2 . Pease, " Why Men Don't Listen and Women Can't Read Maps", p. 223.

3 . Crooks, Robert L. & Baur, Karla (2013), "Our Sexuality", Boston: Cengage Learning, pp. 145-179.

خرۆشاندن و ورووژاندنەوەیان و، لەبەر ئەوەی قۆناغەکانی دیکە تێناپەڕێنێت، کە تەنها بە سەرجێییەکی تەواوەوە نەبێ بەدی نایەن، لەو دوو قۆناغەی یەکەمدا دەمێنێتەوە و بازنەکەی تەواو ناکات و، لەبەر ئەوەی کە ئەم حەزە تێر ناکرێ، پرۆسەی تەماشاکردنی ژنان و کچان بەردەوامتر دەبێ و تەشەنە دەکات، بەو هیوایەی کە ئەم حەزە تێر بکرێت و بگاتە قۆناغی ئارامی، کەچی تەنها تێنووتر و بەخرۆشتر دەبێتەوە!

حیجاب لە ڕووی کۆمەڵناسییەوە: ئەگەر سەیری ئایەتەکانی حیجاب بکەین، دەبینین کە دەستەواژەکانی: (چاوپۆشین و تەماشانەکردنی ڕەگەزی جیاواز لە خۆی/غض الأبصار)، (پاراستنی داوێنەکان/حفظ الفروج)، (شاردنەوەی جوانییەکانی ژنان/لایبدین زینتهن) لە خەڵکانی بیانی، مەگەر لە هاوسەر و باوك و کوڕ و خەزوور و هتد، نیشانەی ئەوەیە کە حیجاب دیاردەیەکە کە تەنها لەبەر لایەنە کۆمەڵایەتییەکەی فەرز کراوە، بەتایبەتی کە لە ئایەتی دیکەدا ئەو دوو دەستەواژەیە بەکار هێنراون کە تەنها بە ڕەهەندە کۆمەڵایەتییەکەیەوە نەبێ، مانایان نابێت: (ناسینەوە لە کەسانی دیکە/أن یعرفن)، (ئازارنەدیتن لە کەسانی دیکە: فلا یؤذین)؛ چونکە ئەمر بە ژن و پیاو دەکات: چاویان بپارێزن لە سەیرکردن و زلەگرتن لە یەکتر، هەروەها داوێنەکانیان لە یەکتر بپارێزن، هەروەها ئەمرکردن بە داپۆشاندنی جوانییەکانی ژنان لە پیاوانی بیانی مەگەر ئەوانەی کە جیا کراوەنەتەوە، هەموو ئەمانە ئاماژە بەوە دەکەن کە حیجاب "کردار یان ڕەفتارێکی کۆمەڵایەتی"یە، کە لە بەر ڕەهەندە کۆمەڵایەتییەکەی ئەوەندە جەخت کراوەتە سەری، تاکو لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێو خۆیاندا لە یەکتر بناسرێنەوە و لە کارلێکە کۆمەڵایەتییەکانیشدا ئازار نەدرێن و ناڕاحەت نەکرێن. دەشزانین کە یەکێك لە گرنگترین و بنچینەترین بابەتەکانی زانستی "کۆمەڵناسی" (Sociology) بریتییە لە: "پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان" (Social Relationships) و "کارلێکی کۆمەڵایەتی" (Social Intraction)، کە هەموو کۆمەڵناسان لەسەر ئەوە کۆکن کەوا کۆمەڵگا بەرهەمی ئەم دوو پرۆسە سەرەکییەیە، کە هەرگیز بە یەك کەس دروست نابێت. دوو کەس یان زیاتر لە "شوێن"ێکی تایبەت و لە "کات"ێکی تایبەتدا، لە ڕێگەی پرۆسەی کارلێککردنەوە، پەیوەندی لەگەڵ یەکتر دروست دەکەن و پێداویستییە ماددیی و مەعنەوییە جیاجیاکانیان لەو ڕێگایەوە دابین دەکەن.

کۆمەڵناسان دەڵێن: "چەندایەتی و چۆنایەتیی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و ڕێکخستنیان، کاریگەریی هەیە لەسەر ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکان (*Social Behaviour*)ی تاکەکان".[1] بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە کۆمەڵناسی، لەسەر "کارلێکی کۆمەڵایەتی" دەکۆڵێتەوە، پێویستە "حیجاب" وەك "کردارێکی کۆمەڵایەتی" (Social Action) یان "ڕەفتارێکی کۆمەڵایەتی" دیراسە بکرێت. بە بۆچوونی "ماکس ڤێبەر"* ـ یەکێك لە دامەزرێنەرە کلاسیکەکانی کۆمەڵناسی ـ "کرداری مرۆڤی" تەنها لە کاتێکدا بە "کرداری کۆمەڵایەتی" دەژمێردرێت، کە تاك یان ئەو تاکانەی کە ڕەفتارێك دەنوێنن، مانایەکی زەینییان بۆ ئەو ڕەفتارە هەبووبێت و ڕەفتاری تاکەکانی دیکەشیان ڕەچاو کردبێت و لەو پرۆسەیەدا، خۆشیان بکەونە ژێر کاریگەریی ئەوانی بەرامبەردا.[2] بەم پێیە، ئەگەر بمانەوێ پێناسەی چەمکی "حیجاب" بکەن بە دیدگایەکی کۆمەڵناسییەوە، بریتی دەبێت لە: "کردارێکی کۆمەڵایەتی، کە تاکی ئەکتەر یان بکەر بۆ ئەوە دەیکات تاکو لە پرۆسەی کارلێك و پەیوەندی لەگەڵ تاکەکانی دیکەدا مانایەکی زەینی و بەهایەکی هێمایی پێ بەخشێت و، ڕووبەڕووی ئەو ڕەفتار یان زەینییەتە لە تاکەکانی دیکە لە کایەی گشتی و کۆمەڵایەتیدا ببێتەوە کە خۆی چاوڕەوانی دەکات"؛ واتە بکەری حیجاب (ئەوەی خۆی دادەپۆشێت) بەو ڕەفتارە هێماییەکەی خۆیەوە بە خەڵك دەڵێت: "من ئەوەمە کە دەمبینن (ناسینەوە لە خەڵکانی دیکە/أن یعرفن)، کەواتە ئێوەش ئەوە بن کە من چاوەڕانم! (ئازار نەدان/فلا یؤذین)؛ بۆیەش جوانییەکانیان دادەپۆشن، بۆ ئەوەی نەبینرێن، تاکو سەرنجراکێش نەبن و تەماحیان تێ نەکەن و گێشەڵیان پێ نەفرۆشن و، تووشی هەڕەشە و ئازاریش نەبنەوە.

کۆمەڵێك تیۆر و ڕوانگەی گەورە لەسەر پرۆسەی "پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان" و "کارلێکی کۆمەڵایەتی" دامەزراوە، کە ڕەفتاری کۆمەڵایەتی و ناکۆمەڵایەتی لە یەکتری جیا دەکەنەوە و کردارەکانی مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی، سیاسی و کولتووری لە ناو کۆمەڵگادا شی دەکەنەوە؛ لەوانە:

---

1 . چلبی، مسعود (1994)؛ "**تحلیل شبکه در جامعه‌شناسی**"؛ تهران: فصلنامه علوم اجتماعی؛ دوره دوم؛ شماره 5 و 6؛ ص 9.

* Karl Emil Maximilian "Max" Weber (1864-1920).

2 . روشه، گی (2000)؛ "**کنش اجتماعی**"؛ ترجمه: هما زنجانی زاده؛ مشهد: دانشگاه فردوسی؛ ص 21.

1) "تیۆریی کارلێکی هێمایی" (Symbolic Interaction Theory) کە بریتییە لەوەی هەموو پەیوەندییە مرۆییەکان، بەتایبەتی پەیوەندییە سیمبۆلیك و هێماییەکان، بە بنەمای هەموو کردارە کۆمەڵایەتییەکان دەناسرێنەوە.[1]

پەیوەندیکردن و گەیاندنی پەیامەکانیش (Communication) دەکرێ لە ڕێگەی قسەکردن، نووسین، نیشانە، هێما، زمانی جەستە و پۆشاکەوە لە نێوان دوو کەس یان زیاترەوە ئەنجام بدرێت. پەیوەندیکرنی ناووتەیی (Non-Verbal Communication) بەو پەیوەندییانە دەگوترێت کە بەهۆی ئامرازی جگە لە زمان و قسەکردن ئەنجام دەدرێت؛ وەکو: پەیوەندیی بینین (ڕێژە و چۆنیەتی سەیرکردن بە جەستە و ڕوخساری تاك یان تاکانی بەرامبەر)، پەیوەندیی دەم و زار (بە تایبەتی زەردەخەنە)، حاڵەتی ڕوخسار و برۆ و نێوچاوان، حاڵەتی جەستە، جووڵاندنی سەر و دەست و پەنجەکان، ژێستگرتن، بۆن، پێست، قژی سەر (وەکو بڵندکردن، کەچەڵکردن، یان شێوازی ئارایشتکردن)، هەروەها جلوبەرگ (بە تایبەتی بە ڕەچاوکردنی مۆدە) دەگرێتەخۆ، کە زۆر جار بە ناوی زمانی جەستە (Body Languge) ناودەبردرێت.[2] بە بڕوای "دێل لیترز" (Dale Leathers) ـ پسپۆڕی بواری گەیاندن ـ:

"ئێوە بە شێوازی ڕواڵەتی خۆتان شوناسی خۆتان بە تاکەکانی دیکە دەناسێنن و هیچ شتێکیش شوناسی وەرناگرێت، مەگەر لە سایەی دروستکردنی پەیوەندی."[3]

بەم پێیە شێوازی جەستە، زمانی جەستە، پۆشینی جەستە، ئارایشت و جوانکاریی جەستە، هەموویان جۆرێك لە گەیاندنی هێمایی (Symbolic Communication)ن، کە لەقەڵەمڕۆی گەیاندندا شوناس بە مرۆڤ دەبەخشن؛ کەواتە: ڕەفتاری ژن بە هەر شێوەیەك بێت، خاوەن پەیامە. شێوازی بەرێداچوون و هەنگاو هاوێشتن، سەیرکردن، قسەکردن (شێواز و ئاواز و لەحنی دەنگ)*، پۆششەکەی، زمانی گەیاندن و پەیوەندیکردنیەتی لەگەڵ تاکەکانی دیکە؛ بۆیە حیجاب وەکو پەیامێك نییە کە تەنها لە پۆششەوە بچووك بکرێتەوە، بەڵکو خاوەن لایەنە گەیاندنە هێماییەکانیشە، کە کاکڵە و ناوەڕۆکی حیجابە. لەبەر ئەوەشە کە بەر لە هەر قسەکردنێك،

1 . محسنیان راد، مهدی (2006)؛ "**ارتباط شناسی**"؛ تهران: سروش؛ ص 39.

2 . سولیوان، تام و دیگران (2005)؛ "**مفاهیم کلیدی ارتباطات**"؛ ترجمه: امیرحسن میش زاده؛ تهران: فصل نو؛ صص 274-275.

3 . Leathers, Dale G. (1976), "**Nonverbal communication systems**", Boston: Allyn and Bacon, p. 96.

* هەروەك قورئان دەفەرمێ: ﴿فلعرفتهم بسیماهم ولتعرفنهم فی لحن القول﴾؛ واتە: ". ئەوکاتە بە ڕوخسارياندا دەتناسینەوە و بە تەئکید بە لەحن و ئاهەنگی قسە و گوفتاریشیاندا دەیانناسییەوە. (محمد: 30).

ڕواڵەتی تاك و جلوبەرگەکەی کۆمەڵێك زانیاری لەبارەی تەمەن، ڕەگەز، کەسایەتی، کار و پیشە و تەنانەت پێگەی ئابووری و کۆمەڵایەتییەکەی دەخاتە بەر دەستی لایەنی بەرامبەر؛ بە واتایەکی دیکە: بۆ زۆربەی تاکەکان گرنگترین ئامرازی گەیاندن، ئەو جلوبەرگەیە کە دەیپۆشێت. توێژینەوەکانی "گیبێنز" (Gibbins) دەسەلمێنێ کە تاکەکان لەبارەی یەکتر، لەسەر بنەمای جلوبەرگەوە دادوەری دەکەن، هەروەها تاکەکان لەبارەی مانا نهێنییەکانی جۆرەکانی جلوبەرگ لەگەڵ یەکتری کۆکن. هەڵبژاردنی جۆری جلوبەرگ، وەکو هەڵبژاردنی وشەکانە، کە تاك پێویستە بەرپرسیارییەتی هەر دووکیان وەکو یەك بە ئەستۆ بگرێت و چاوەڕوانی کاردانەوەکانیشی بێت؛ کەواتە ئەگەر تاکەکان بیانەوێ لە پرۆسەی گەیاندندا لەگەڵ تاکەکانی دەوروبەری خۆیان کاریگەر و سەرکەوتوو بن، ناتوانن بە جۆرێك جلوبەرگ لەبەر بکەن، گوایە پۆشاکیان بەشێك نین لە پەیامە نێردراوەکانیان؛ چونکە هەمیشە ئەوانی دیکە یەکەمجار لەسەر بنەمای ڕواڵەت و هەڵبژاردنەکانی تاکەکان دادوەری دەکەن.[1] "ئالن پیز" و "باربارا پیز" لە توێژینەوەکەیاندا دەیسەلمێنن کە:

> "بمانەوێ یان نەمانەوێ ڕواڵەتی جەستەیمان کار دەکاتە سەر لایەنی بەرامبەرمان. (%90)ی ئەو کەسانەی کە بۆ یەکەمجار تووشی کەسێکیتر دەبن، لە هەمان (4) خولەکی ئاشناییدا، بەپێی ڕواڵەت و شێوازی فیزیکی و پۆشاکەوە دادوەری و هەڵسەنگاندن دەکەن".[2] "توێژەران و زانایان لە بواری مێشك لە نەخۆشخانەی "ماساچۆست"دا، لێکۆڵینەوەیەك لەسەر مێشکی چەندین پیاو ئەنجام دەدەن، کاتێك کە وێنەی چەند ژنێکی جوان و سەرنجڕاکێشیان پیشان دەدەن، ئەو بەشانەی لە مێشك لە بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەری کۆکائین یان کاتی وەرگرتن و بەدەستهێنانی پارەیەکی زۆر دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەوە و یەکسەر دەورووژێندرێن؛ بۆیە لە دەرئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیاندا دەڵێن: پیاوان تەنانەت لە سەدەی بیستویەکەمیشدا وەکو باب و باپیرمان لە سەردەمەکانی پێشوو، سیما و ڕواڵەتی ژنان باشتر و بەنرختر دەزانن بە بەراورد لەگەڵ ژیری و زیرەکییانەوە؛ چونکە پیاوان باشتر لەوەی کە بیردەکەنەوە، دەبینن."[3]

بەم پێیە، حیجاب بە مانای "پۆشین" دەکەوێتە چوارچێوەی کارلێککردن و پەیوەندیی کۆمەڵایەتییەوە، کە لە لایەك ڕەنگە خاوەن فۆرم و شێوازی جیاجیا بێت، بەڵام لە لایەن هەموو

1 . مایرز، گیل ای. و مایرز، میشلەتی (2004)؛ "**پویایی ارتباطات انسانی**"؛ ترجمە: حوا صابر آملی؛ تهران: دانشکدە صدا و سیما؛ صص 304-306.

2 . Pease, "Why Men lie and Women cry?", p. 194.

3 . Ibid., p. 196.

بکەرەکانییەوە ناوەڕۆکێکی هاوبەشیان هەیە، یان دەکرێ بڵێین: بە پێچەوانەوە لە ڕوانگەیەکی پەیوەندی و کارلێکییەوە، حیجاب بریتییە لە پەیامێکی ناسنامەیی و شوناسی کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووری و فەرهەنگی و خاوەن تایبەتمەندییەکی ئایینی، مەعنەوی، بەهایی و پێگەیی، کەسایەتی و ڕەفتاریی، کە دەکرێ لە سۆنگە و پارادایمی جیاجیاوە شیبکرێتەوە.

بە وتەی "هێلن واتسۆن" لە دیدی زانایانی ئەوروپاوە، هیچ شێوازێك لە جلوبەرگ وەکو حیجابی ئیسلامی، هەتا ئەو ڕادەیەی جێگای مشتومڕ و وتووێژ نەبووە. ئەو بە پشتبەستن بە ڕەهەند و ئامانجە کرداری و هێمایی و سیمبۆلیکییەکانی حیجابەوە، ڕیشەکەی دەگەڕێنێتەوە بۆ پاراستنی حەیا و شەرم لە ڕووتاتی. هەروەها دەڵێ: پرسی حیجاب، پێگەیەکی تایبەتی هەیە لە بابەتە هەنووکەییەکانی دونیا، پەیوەست بە پرۆسەی "بەجیهانیبوون" (Globalization) و "پۆستمودێرنیتە" (Post-Modernity)، بە شێوەیەك کە سنووره فەرهەنگییەکانی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، موسڵمان و ناموسڵمانیشی تێپەڕاندووە و کۆمەڵێك بابەتی ناکۆك و جیاواز دەگرێتەخۆ، کە پشت دەبەستێت بە بابەتە پۆست مودێرنیتەکانی وەك: "شێواز" (style)، "نیشانەناسی" (Icongraphy)، "بەرهەمخۆری و مەسرەفگەرایی" و بابەتی "هێز" و "نواندن و نمایشکردن" (Representation). بابەتی "حیجاب" بووەتە خەم و نیگەرانییەکانی زۆرێك لە بژاردە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئایینییەکان، هەروەها بریندابوونی کۆویژدانی زۆر لە توێژە کۆمەڵایەتییەکانی دونیا؛ بۆیە لێکۆڵینەوە و چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، زیاتر پێویست دەکات.[1]

2) "تیۆریی هەڵبژاردنی عەقڵانی" (Rational Choice Theory)؛ ئەم ڕوانگەیەش بنەمایەکی سەرەکیی هەیە کە ئەویش:

> "ئەوەیە کە ڕەفتاری مرۆڤ، ئامانجدار و هەڵسەنگێنراوە. مرۆڤەکان لە چەند ڕێبازێك، ڕێگایەك هەڵدەبژێرن کە لەگەڵ ئامانج و ئارەزووکانیان گونجاوە. چوونە هەر ڕێگایەکیش بە باشی هەڵدەسەنگێنن و قازانج و زیانەکانی لێك دەدەنەوە."[2]

یەکێك لە سەرەکیترین و کۆنترین ڕوانگەکانی هەڵقوڵاو لەو تیۆرییە، ڕوانگەی "دەرخستن و خواستن/ عرض و طلب" (Offer and Demand)ـە، کە ئەگەر بابەتی حیجاب بەپێی ئەو ڕوانگەیە شیبکەینەوە، پێویستە لە پێناو پاراستنی پێوەرەکان، چوارچێوەکان، بەها و نەریتەکانی زاڵ بەسەر

1 . Watson, Helen (1994), **"Women and the Veil: Personal Responses to Global Process"**, in Akbar Ahmed and Hastings Donnan (eds) "Islam, Globalization and Postmodernity", London: Routledge, pp. 141-59.

2 . لیتل، دانیل (1994)؛ **"تبیین در علوم اجتماعی"**: ترجمە: د. عبدالکریم سروش؛ مؤسسە فرهنگی صراط؛ صص 64-65.

کۆمەڵگادا، هەروەها ڕێگری لە لادانە کۆمەڵایەتییەکان، ئەم تیۆرە یان یاسایە لە پەیوەندیی نێوان ژن و پیاوەوە ڕێك بخرێت؛ چونکە هیچ کۆمەڵگایەك نییە کە لەو ڕووەوە خاوەنی پێوەر و ڕێسا ڕەفتارییەکان نەبێت. پێشێلکردنی هەر یەك لەو پێوەرانەش ـ بەپێی گرنگییەکەی ـ کاردانەوەیەکی گونجاو بەو پێشێلکردنە بەدوای خۆیدا دەهێنێت. بەپێی ئەم تیۆرە، ژن تاکێکی دەرخەر و نیشاندەر (Offer)ـە و، پیاویش خوازیار و داواکار (Demand)ـە؛ چونکە ژنان لە بەر تایبەتمەندییە سروشتی و بایۆلۆژییەکانیان کە بیەوێ و نەیەوێ لە ڕواڵەت و جەستەیاندا لە دیدی پیاوانەوە هەیانە (هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێ کرد)، هەروەها بەهۆی ئەو تایبەتمەندییە سەرنجڕاکێشانەی کە دەتوانن خوازراوانە یان نەخوازراوانە (بۆ نموونە لەبەر پەروەردەیەکی مزیر و خراپ) لە بەر چاوی پیاوانەوە بە ڕەفتاری خۆیان ببەخشن، دەکەونە بازنەی پرۆسەی "دەرخستن"، کەچی لە دۆخی ئاساییدا، تایبەتمەندییە سەرنجڕاکێشەکانی پیاوان لە دیدی ژنانەوە، لە چەشنی بابەتی ڕواڵەت، ئالۆش و سێکس نین؛ بۆیەش پیاوان لە پرۆسەی کارلێکی کۆمەڵایەتیدا هەرگیز بە دەرخەر و نیشاندەر ناژمێردرێن، بەڵکو داواکار و خوازیارن. لێکۆڵینەوە سێکسولۆژییەکان و دەروونناسیی سێکسی لە ماوەی (60) ساڵی ڕابردوودا سەلماندوویەتی کە خاڵە سەرنجڕاکێشەکانی پیاوان لە دیدی ژنانەوە بریتین لە: 1) کەسایەتی، 2) خۆشڕەفتاری، 3) بەهەستبوون، 4) جەستەی ڕێك (وەکو: لەشی وەرزشکارانە، شانوملی پان، چاوی میهرەبان، سکی ساف، هەبوونی تەنکەڕیش، قژی چڕوپڕ)؛[1] کەواتە تایبەتمەندییە سەرنجڕاکێشانی پیاوان لەچاو ژنان زۆر جیاوازە. هەروەك پێشتریش گوتمان: بەپێی ڕاستییەکانی زانستی بایۆلۆژی و سێسکۆلۆژی، هۆرمۆنی ئالۆشبزوێنی پیاوان لە هی ژنان زۆر جیاوازە؛ تستوسترۆن دەبێتە هۆی بەرزبوونەی حەزی سێکسی، کەچی هۆرمۆنی ئۆکسیتوکسین دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی خۆشەویستی و عەشق؛ بۆیەش ژنان حەزیان لێیە بویسترێن و دەستیان پێدا بهێنن و داوایان لێ بکرێت، بەڵام پیاوان حەزیان لێیە دەست پێدا بهێنن و داواکار بن. هەروەك پێشتریش ئاماژەمان پێ کرد، توێژینەوەی "دەزگای کینزی" باسی لەوە دەکرد کە

"ڕێژەی (*37%*)ی پیاوان هەر نیو کاتژمێر جارێك بیر لە سێکس دەکەنەوە، کەچی ئەم ڕێژەیە لای ژنان تەنها (*11%*)ـە. هۆکارەکەشی دەگەڕێننەوە بۆ ڕێژەی تستوسترۆن لە

1 . Pease, "Why Men lie and Women cry?", p. 198.

پیاودا. جا چەند پاڵنەری دەرەکیی بەرزکردنەوەی ئەم هۆرمۆنە لە ژینگەی دەوروبەری پیاواندا زیاتر بێ، ئەوەندەش حەزی سێکسی لە پیاواندا زۆرتر و خێراتر دەبێت."[1]

کەواتە هەرچەند ئەم جوانی و شتە سەرنجڕاکێشانەی ژنان (کە پێشتر باسمان کردن)، زیاتر لە بەردەست و چاوی پیاوان بێت، واتای ئەوەیە کە زیاتر خۆیان دەخەنە بەر داخوازییەکانی پیاوان. دەرئەنجامی لۆژیکیی ئەم دۆخەش ئەوە دەبێت کە پەیامێك لە لایەن ژنە بێحیجابەکانەوە ـ بیانەوێ و نەیانەوێ ـ دەنێردرێتە لای پیاوە داواکارەکان، بەتایبەتی پیاوە لادەرەکان یان بە وتەی قورئان "دڵنەخۆشەکان"، کە زۆر بە ئاسانی و هەرزانی دەستیان دەگاتە ئەو چەشنە ژنانە، بێ ئەوەی هەوڵی بۆ بدەن. لەو جۆرە کەشوهەوایەدایە کە پێوەر و نۆرمی کۆمەڵایەتی و ئایینیی زۆر ئاسانتر و هەرزانتر پێشێل دەبێ. بەپێی ئەم تیۆرە دەردەکەوێ کە بێحیجابی دەرخستنی زیادە لە ڕادەیە و بەپێچەوانەش، یەکێك لە ڕێگاکانی کەمکردنەوەی دەرخستن، ڕەچاوکردن و پابەندبوونە بە حیجاب و داپۆشانی ئەندامە ورووژێنەر و جوانییە سەرنجڕاکێشەکانی ژنانە و بەزماندارنەکردنی ڕەفتار و هەڵسوکەوتیانە؛ چونکە هەلی سنووربەزاندن و لادانی پێوەرە پەسەندکراوەکانی کۆمەڵگا لە دەست لادەرەکان دەردەهێنێ؛ بۆیەش لەم ئایەتە قورئانییەدا بە ژنان دەفەرمێ: ﴿إن اتقيتن فلا تخضعن بالقول فيطمع الذي في قلبه مرض و قلن قولا معروفا... و لا تبرجن تبرج الجاهلية الأولى﴾؛[2] واتە: ئەگەر لە خوا دەترسن (و حیسابی بۆ دەکەن)، بە نازەوە قسە مەکەن (و بە شێوەیەك خۆتان دەرنەخەن) نەوەك ئەو پیاوەی دڵی نەخۆشە، بورووژێت و نیازی خراپ بکات و، هەمیشە قسەی چاك و بەجێ و شایستە بکەن... هەروەها زینەت و جوانییەکانی خۆتان وەکو سەردەمی نەفامییەکەی جاران دەرمەخەن".

لەسەر ئەم بنەمایەشە قورئان خۆداپۆشین و حیجابی فەرز کردووە:

یەکەم) سنووردارکردنی داخوازییەکان: یەکەمجار ڕوو لە پیاوان دەکات و بەوان (داواکاران) دەفەرموێ: "چاویان بپارێزن لە سەرنجدانی ژنانی نامەحرەم و زلەیان لێ مەگرن، هەروەها داوێن و عەورەتی خۆیان بپارێزن لە کاری حەرام، بێگومان ئەوە پاکتر و یوختترە بۆیان (هەم بۆ دڵ و

1 . Pease, " Why Men Don't Listen and Women Can't Read Maps", p. 223.

2 . (الأحزاب: 32-33).

دەروونیان، هەمیش بۆ رواڵەت و جەستەیان)؛ چونکە خوا ئاگاداری هەموو ئەو هەڵسوکەوت و ڕەفتارێکیانە". [1]

دووەم) سنووردارکردنی دەرخستنەکان: دواتر بە ژنان (دەرخەرەکان) دەفەرمێ: "ئەوانیش پێویستە ئاگایان لە چاوی خۆیان بێ و داوێنی خۆیان بپارێزن (لە گوناە) و جوانییەکانی خۆیان (وەکو قژ، سینگ، قۆڵ و باسك، لۆلاق) دەرنەخەن، مەگەر ئەو ئەندامانەی کە ئاشکرا دەبن و دیارن (وەك ڕوخسار و دەست) و مەگەر بۆ هەندێ کەسی دیاریکراو"؛[2] کەواتە ژنان ئەرکێکی دیکەشیان هەیە، ئەویش نە لەبەر جیاکاریی نارەوای نێوان ژن و پیاوەوە بێت، بەڵکو لەبەر ئەو جیاوازییە سروشتی و بایۆلۆژییانەیە کە لە نێوان هەردوو ڕەگەزدایە. پیاو داواکار و کڕیارە و هەمیشە لە ڕێگەی "بینین"ـەوە دەکەوێتە داوی ڕەفتاری لاسار و ناپاك و گوناهەوە، کە خوا ئاگاداریی ئەو ڕەفتارە نهێنییانەشە.[3] بەپێچەوانەوە گوناە و ڕەفتارە لادەرەکانی ژن لە دەرخستنی جوانییەکانی خۆی و عەرزکردن و فرۆشتنی هەرزان و بێگرێبەستی هاوسەرێتی یان نەبوونی پەیوەندیی دیاریکراوی هاوخوێنی و خزمایەتی (سەبەبی و نەسەبی)یە لەگەڵ هەندێ کەسی دیاریکراو وەك: باوك، خەزوور، کوڕ، زڕکوڕ، خوشکەزا و برازا و هتد، کە هەمان خۆدەرخەری و بێحیجابییە؛ قورئان کاری "دەرخستن"، تەنها بە ژینگەیەکی تایبەتەوە (ژینگەی پڕ لە ئاسایشی خێزان) سنووردار دەکات، کە ئەم سنووردارکردنە لە بنەڕەتدا دەبێتە هۆی سنووردارکردنی دواخوازییەکانیش؛ چونکە ژنان بە ڕەچاوکردن و پابەندبوون بە حیجابەوە، خۆیان لە هەوەسبازییەکانی پیاوان دەپارێزن و دەتوانن بە ئاسوودەیی و ئازادانە بچنە ناو کۆمەڵگادا و لە هەموو چالاکییە ئیداری، ئابووری، سیاسی و فەرهەنگییەکانیشدا بەشدار بن، بێ ئەوەی گێچەڵیان پێ بکەن و ئازار بدرێن و هەست بە نارەحەتی بکەن و دڵەڕاوکێ بیانگرێت، یان بە ئاسانی و هەرزانی خۆیان بخەنە بەر چاوی پیاوانێك، کە هیچ پەیوەندییەکی وەها لە نێویاندا نییە.

1 . ﴿قل للمؤمنين يغضوا من أبصارهم ويحفظوا فروجهم ذلك أزكى لهم إن الله خبير بما يصنعون﴾. (النور: 30).

2 . ﴿و قل للمؤمنات يغضضن من أبصارهن و يحفظن فروجهن و لا يبدين زينتهن إلا ما ظهر منها وليضربن بخمرهن على جيوبهن و لا يبدين زينتهن إلا لبعولتهن أو آبائهن أو آباء بعولتهن أو أبنائهن أو أبناء بعولتهن أو إخوانهن أو بني إخوانهن أو بني أخواتهن أو نسائهن أو ما ملكت أيمانهن أو التابعين غير أولي الإربة من الرجال أو الطفل الذين لم يظهروا على عورات النساء و لا يضربن بأرجلهن ليعلم ما يخفين من زينتهن﴾. (النور: 31).

3 . بۆیە لە دوای ئەمرکردن بە خۆپاراستنی پیاوان لە زلەگرتنی ژنان، دەفەرمێ: ﴿إن الله خبير بما يصنعون﴾. (النور: 30)؛ لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرمێ: ﴿يعلم خائنة الأعين و ما تخفي الصدور﴾؛ واتە خوا چاوحیز و ناپاکەکان دەناسێت و دەزانێت چی لە دڵ و دەروون و سینەکاندا حەشار دراوە. (الغافر: 19).

هەروەك لە پێناسە و مانای حیجابیشدا ئاماژەمان پێ کرد، حیجاب تەنها بریتی نییە لە داپۆشینی ڕواڵەت و جوانییەکان، بەڵکو بوارێکی بەرفراوانتری هەیە، کە دەوەستێتە سەر ئەو دۆخەی کە حوکمەکەی (واتە فەرزبوونی) دەستنیشان دەکات؛ بەو مانایەی کە هەر شوێنێك کە داواکاری (Demand)ی لێ نەبێت، ئەو حوکمەش نامێنێ؛ هەروەك دەفەرمێ: ﴿... أو التابعين غير أولي الإربة من الرجال أو الطفل الذين لم يظهروا على عورات النساء﴾؛ واتە: "... ئەو پیاوانەی کە پێویستییان بە ژن نییە (وەکو پیرەمێردەکان، پیاوە شێتەکان، یان نەخۆش و پەککەوتەکان کە لەبەر نەبوونی هێزی دەرککردن و فامکردنی جوانییەکانی ژنان، پێویست ناکات ژنان لەبەر ئەوان خۆیان داپۆشن)، یاخود ئەو منداڵانەی کە هێشتا شارەزاییان لەبارەی ژنانەوە نییە و (ئاڵۆشیان نەجووڵاوە و لە داوێن و عەورەتی ژنان حاڵی نین). کەواتە ئەم چەشنە پیاو و منداڵانە لە بواری ئاڵۆشدا دەکەونە دەرەوەی بازنەی داخوازی. لە ئایەتێکی دیکەدا تاقمە ژنانێکیش لە دەرەوەی بازنەی "دەرخستن" دادەنێت و حیجابیان لەسەر فەرز ناکات؛ ژنانی بەساڵاچووش کە جوانییە ڕواڵەتی و فیزیکییەکانیان وەك کاتی گەنجێتییان نەماوە، لەو فەرزە جیایان دەکاتەوە: ﴿والقواعد من النساء اللاتی لا یرجون نکاحا فلیس علیهن جناح أن یضعن ثیابهن غیر متبرجات بزینة و أن یستعففن خیر لهن والله سمیع علیم﴾؛[1] واتە: ئەو ژنانەی کە پیر بوونە (یان نەخۆش و پەککەوتوون) و بە تەمای شووکردن نین، قەیناکات ئەگەر هەندێك لە پۆشاکیان دابکەنن، بەو مەرجەی مەبەستیان دەرخستنی جوانی و ئارایشت نەبێت. خۆ ئەگەر پۆشتە بن، بۆ ئەوانیش باشترە. خواش بیسەر و زانایە (لە نییەت و مەبەستی دڵەکان).

هەروەك دەبینین لە کۆی ئەم ئایەتانەدا، پەیامێکی گشتیی ئەخلاقی وەردەگرین، کە ئەویش ڕەچاوکردنی پاکداوێنی و پاراستنی پێوەر و نۆرمە کۆمەڵایەتییەکانە و خۆپارێزی لە لادان و ڕەفتارە نائاسایی و ناپێوەرانەی کە لە کۆتاییدا جگە لە زیانگەیاندن بە خودی تاك (ژن یان پیاو) لە ئاستی ورددا، زیان دەگەیەنێتە خێزانەکانیش لە ئاستی ناوەندی و، کۆمەڵگاش لە ئاستی گەورەدا؛ ئەویش لە ڕێگای ڕێکخستنی پەیوەندیی لە نێوان "دەرخستن و خواستن"ـەوە؛ کەواتە حیجابی ئیسلامی تەنها پارچە قوماشێك نییە کە ئەندامانی جەستەی ژن داپۆشێت، بەڵکو

1. (النور: 60).

ئامرازێکیشە بۆ پاراستنی کەسایەتیی ژن و خێزان و کۆمەڵگاش. حیجابی کامڵیش تەنها بە خۆداپۆشین بەدی نایەت، بەڵکو نابێ ڕەفتارەکان و قسەکانیش ورووژێنەر و نائاسایی بێت.

لەبەر ئەوەی بێحیجابی یان شێوازی پۆشینی نەگونجاو و شاز لەگەڵ پێوەر و بەها باوە ئایینی و فەرهەنگییەکانی کۆمەڵگا ئیسلامییەکان ناگونجێت و دەبێتە هۆی برینداركردنی کۆویژدانی زۆرینەی کۆمەڵگا، پێم وایە پێویستە ئەم ڕەفتارە (واتە بێحیجابی) وەك "گرفتێکی کۆمەڵایەتی" سەیر بکرێت و پێویستیشە بە شێوەیەکی زانستی (کەسانێکی وەك کۆمەڵناسان و دەروونناسە کۆمەڵایەتییەکانەوە) لێی بکۆڵنەوە؛ چونکە جگە لەمە، بابەتی حیجاب یەکێکە لە بابەتە فەرهەنگییەکانی ژنان، کە پەیوەستە بە چۆنیەتی ڕۆڵی ژن و پیاو لە ناو کۆمەڵگادا و، دیدگا و ڕەوانگەی جۆراوجۆر و جیاوازیشی بۆ خراوەتە ڕوو؛ بۆ نموونە: دیدگای فێمێنیستەکان بە تایبەتی ڕەوتی "فێمێنیزمی وێکچووگەرا" وەکو فێمێنیستە ڕادیکاڵ و ئیگزیستانسیالیستەکان، داوای بونیادتەکێنی (Deconstruction) و تێکشکاندنی پێوەر و نەریتە باوەکان دەکات، بۆ ئەوەی وەك پیاوان حیسابیان بۆ بکرێت و تەنانەت "دایکایەتی" و "هاوسەرێتی"ش بە نیشانەیەکی گۆشەگیریی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی ژنان دەزانن و نکۆڵی لە هەموو چەشنە جیاوازییەك دەکەن کە لە نێوان ژن و پیاودا هەیە. یان ڕەوتی "فێمێنیزمی جیاوازگەرا" وەك فێمێنیستە لیبراڵەکان، کە جەخت دەکاتە سەر جیاوازیی نێوان "جیهانی ژنانە" و "جیهانی پیاوانە" و لە پێناو دروستکردنی جیهانێکی ژنانە لە بۆشایی و خەلەئدا تێ دەکۆشێ. دەرئەنجامی هەردوو دیدگا لەم سەردەمەدا، دروستبوونی ژنانێکی تووڕە، دەمارگرژ و هەڵچووە، کە بەرامبەر بە هەموو شتێك بۆڵەبۆڵ دەکەن و تەنها ڕێز لە "بەهیستریککردنی"* جەستەی ژنان دەگرن. لە ڕاستیدا، ژن لە سەردەمی ئێستادا بریتییە لە: "ژیانێکی ڕووت" کە "فەرهەنگ" هەوڵ دەدات ببێتە خاوەنی و "هێز" لە جەستەی ژنانییەوە شەرعییەتی وەردەگرێت و هەوڵ دەدات بە ناوی زانست و ڕاستی، پێناسەی بۆ بکات.[1]

حیجاب لە ڕووی دەروونناسییەوە: هەروەکو دیتمان قورئان دوای ئەمرکردن بە ژنان کە حیجاب بکەن و خۆیان داپۆشن، دەفەرمێ: ﴿ذلك أدنى أن يعرفن فلا يؤذين﴾؛ واتە: ئەمە کەمترین

* نەخۆشییەکی دەروونییە کە بە نیشانەکانی جەستەیی و فیزیۆلۆژیکی بەدەردەکەوێت.

1 . دانیالی، عارف (2007)؛ "**فمینیسم همچون هیستریك شدن زنانگی**"؛ تهران: ماهنامه خردنامه همشهری؛ شماره 16؛ صص 74-75.

شتە بۆ ئەوەی بناسرێنەوە و ئازار نەدرێن.** ناسینەوە و جیاکردنەوەی ژنان، هەورەها ئازارنەدانیان بە هۆکاری فەرزکردنی حیجاب دانراوە. دەروونناسان پێیان وایە کە "ئاسایش" (أمنیە/Safety) گرنگترین پێداویستیی دەروونییە، کە مرۆڤ بە هۆیەوە دەتوانێ لە ناو کۆمەڵگادا گەشە بکات و خۆی پێبگەیەنێت و بسەلمێنێ؛ چونکە ئەگەر مرۆڤ نەتوانێ خۆی لە کۆمەڵگادا دەربخات و پێبگەیەنێ، ئەوا تووشی شڵەژانی دەروونی و کەسایەتی دەبێتەوە؛ هەورەك تیۆریی "هەرەمی مازلۆ" یان "پەیژە پێداویستییەکانی مازلۆ" (Maslow's hierarchy of needs) لەم بارەیەوە بۆمان شی دەکاتەوە. "ئابراهام هارۆڵد مازلۆ"* ـ سایکۆلۆژیستی ناوداری ئەمریکایی و خاوەن ئەم تیۆرە ـ لە کتێبی بەناوبانگەی "هاندان و کەسایەتی"دا دەڵێت:

"مرۆڤ خاوەن کۆمەڵێك پێداویستیی زاتییە (واتە لە دەروونی خۆیدا هەست بە پێویستیی کۆمەڵێك پێداویستی دەکات)، کە ئەم هەستانە دەبنە پاڵنەر و هاندەر و بزوێنەر و ئاراستەکەری ڕەفتارەکانی مرۆڤ. ئەم هەستانە یاخود ئەم پێداویستییە زاتییانە غەریزی و ڕەمەکین، بەڵام ئەو ڕەفتارەی مرۆڤ بۆ تێرکردنی ئەم پێداویستییانە دەیکات، بۆماوەیی و غەریزی نین، بەڵکو وەرگیراو و فێرکراون. هەر کاتێك ئەم پێداویستییانە تێر نەکرێن، گومان نییە کە دەبێتە هۆی دروستبوونی سترێس و دڵەڕاوکێ و نائۆقرەیی."[1]

مازلۆ ئەم پێداویستییانە پلەبەندی دەکات لە هەرەمێکدا، کە ژێرخانی ئەم هەرەمە تایبەت دەکات بە "پێداویستییە فیزیۆلۆژییەکان"، ئینجا لە سەرەوەیدا "پێداویستییە ئەمنی و ئاسایشییەکان" دادەنێت، دوایی "پێداویستییە پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و خزمایەتییەکان"، پاشان "پێداویستیی ڕێز و پێزانین" و، لە لووتکەی هەرەمەکەدا "پێداویستیی خۆپێگەیاندن و خۆسەلماندن" دادەنێت. مازلۆ پێی وایە کە تێرکردنی هەموو ئەم پێداویستییانە، پێویستیی بە هەبوونی ئاسایش، سەقامگیری، پاڵپشتی و هاندان، بونیاد و چوارچێوە، سیستم و ڕێکخستن، هەروەها ئازادی لە ترس و سترێس و دڵەڕاوکێ و ناجێگیرییە. دەڵێت: ئەگەر ئەم پێداویستییانە

** "ناسینەوە" واتە جیاکردنەوەی ژنانی بەحیجاب و پابەند لە ژنانی بێحیجاب و ناپابەند؛ بەو مانایەی کە حیجاب یونیفۆرمێکی تایبەتە، هەروەك چۆن لە پۆشاکەوە دەشێ پزیشکێك لە سەربازێك جیابکرێتەوە، پۆشاکی ژنی موسڵمان و پابەندیش شوناسێك دەبەخشێتە ژنی بەکارهێنەر، کە لە ژنەکانی دیکە جیا دەکاتەوە؛ "ئازارنەدان"یش واتە: ژن بە خۆداپۆشین پەیامێکی ڕوون و ڕۆشن دەداتە پیاوەکان، بەتایبەتی پیاوە دڵنەخۆش و ناپابەندەکان کە: "من جیاوازم لەو ژنانەی کە ئێوە دەتانەوێ ڕۆژانە خۆیان بە دڵی ئێوە برازێننەوە و چۆن پێتان خۆشە، جوانییەکانی خۆیان بە ئاسانی و هەرزانی پێشکەشتان بکەن؛ مادەم حەزم نەکردییە خۆم دەربخەم، پێویستە ئێوەش ڕێزم لێ بگرن و ئازارم نەدەن"! کەواتە حیجاب وەك قەڵغان و زرێیەکە بۆ ئاسایش و ئەمنیەتی ژن لە ئازاری جەستەیی و دەروونیی پیاوانی ناپابەند.

* Abraham Harold Maslow (1908–1970).

1 . Abraham H. Maslow (1987), "**Motivation and Personality**", London: Longman, p. 236.

بۆ ماوەیەکی درێژخایەن دەستەبەر نەکرێن، دەبێتە هۆی دەرکەوتنی جۆرەها نەخۆشیی دەروونی و ناجێگیریی کەسایەتی و، لە کۆتاییدا پەنابردن بۆ کۆمەڵێك میکانیزمی بەرگری، وەك ڕەفتارێکی کاردانەوەیی و بەرپەرچکاری بۆ پاراستنی خۆی لەو سەرکوتبوونەوە.[1]

ئەگەر مرۆڤ لە ژیانی ڕۆژانەی خۆی و لە ژینگەی دەوروبەریدا هەست بە ئاسوودەیی و ئاسایش نەکات و بەردەوام دڵیان پڕ بێ لە ترس و سترێس و خەم و خەفەت، وردەوردە بە شێوەیەکی درێژخایەن تووشی نەخۆشیی دڵەڕاوکێ دەبێتەوە. گومانیش نییە ژنان پێویستییەکی زیاتریان بەو ئاسایش و ئەمنییەتە هەیە؛ چونکە ژنان بەپێی ئاماری ڕەسمی و توێژینەوەی جیاجیا، لە هەموو کۆمەڵگا مرۆییەکاندا ڕووبەڕووی ئازار و توانجی پیاوان دەبنەوە، بەتایبەتی کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان، کە دوایی لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا ئاماژەیان پێ دەکەین. ئەم پیاوانەش یان لە پەروەردەیەکی تەندروست و گونجاو بێبەشن و، بە ڕەچاونەکردنی یاسا ڕەسمی و ناڕەسمییەکان، ڕێنمایە ئاینییەکان و نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان، بەدوای دەرفەتێکدان بۆ تێرکردنی ناڕەوای هەوەس و ئارەزووە سێکسییەکانیان، یان ئەو پیاوانەن کە بە قورئان‌گوتەنی (فی قلبە مرض) دڵیان نەخۆشە و بە دیتنی بچووکترین وێنە و دیمەنی سێکسی و ئاڵۆشاوی، یان پاڵنەرێکی ورووژێنەری دیکە، خۆیان پێ ناگیرێ و بێڕێزی و بێحورمەتی بە ژنان دەکەن و بە توانج و قسەی ناشیرین و تەنانەت کرداری ناشیرین، ئازاریان دەدەن و گێچەڵیان پێ دەکەن؛ بەم پێیە ئەو ژنانەی لە ناو شوێنە گشتییەکان، لەشولاری و جوانییەکانی جەستەی خۆیان وەدەردەخەن و ئەم جۆرە پیاوانە دەورووژێنن، با پێیان سەیر نەبێ گێچەڵیان پێ بفرۆشن؛ ئەم گێچەڵپێکردنەش لە نیگا و قسە و توانج و هێمایەکەوە دەست پێدەکات، تاکو دەگاتە ڕفاندن و لاقە و دەستدرێژی و توندوتیژیی سێکسی و تەنانەت کوشتنیش؛ کەواتە ڕووتاتی و بێ‌حیجابی، ژیان و ئاسوودەیی و تەندروستیی جەستە و دەروونی ژنان دەخاتە مەترسییەوە و لە ئاسایش و ئەمنییەت بێبەش دەبن؛ ئەوەتا ئاژانسی "سکای‌نیوز" هەواڵێك بڵاو دەکاتەوە، کە لە وڵاتی "کینیا" چەند پیاوێك هێرش دەکەنە سەر ژنێك و لەسەر شەقام ڕووتی دەکەنەوە! پۆلیسی کینیا دەڵێت: "ئەم پیاوانە گوتویانە پاساوی ئەم کارەیان دەگەڕێننەوە بۆ ئەو پۆشاکە نەگونجاو و سەرنجڕاکێشەی ئەو ژنە لەبەریدا بووە و خۆیان پێ نەگیراوە". لە ئەنجامی ئەم هێرشەدا ئەو ژنە بریندار بووە و ڕەوانەی نەخۆشخانە کراوە! "نیکۆلاس کامۆێندی" سەرۆکی لێکۆڵینەوەی تاوانی "نەیرۆبی"ی پایتەختی

1 . Ibid., pp. 90-93.

کینیا، لەوبارەوە ڕایگەیاندووە کە لەو ماوەیەدا زیاتر لە (90) پیاو لەبەر ئەم کردەوانە دەستگیر کراون.[1] ئەم ڕووداوانەش ــ بەپێی هەواڵ و توێژینەوەکان ــ تەنها تایبەت نییە بە وڵاتێکی وەك کینیاوە، بەڵکو لە وڵاتە هەرەپێشکەوتووەکانی دونیاشدا دەقەومێ؛ بۆ نموونە ئەزموون و تێبینییەکانی هەندێ لە توێژەرە ئەمریکاییەکانیش بۆمان دەسەلمێنێ ئەگەر ژن جوانییەکانی خۆی دەربخات و نەیشارێتەوە و تەنانەت بە جلوبەرگێکی سادەشەوە بە شێوەیەکی ئاسایی بە شەقامەکاندا بڕوات، لە لایەن پیاوانەوە تووشی جۆرەها توانج و گێچەڵ و قسەی دڵبریندارکەر دەبێتەوە؛ بەڵام ئەگەر هەمان ژن بە پۆشاکێکی ئیسلامی و حیجابێکی تەواوەوە دەربکەوێ، هەرگیز تووشی ئەم ئازارانە نابێتەوە؛ بۆ نموونە: ئاژانسەکانی هەواڵ بڵاو دەکەنەوە، ژنێك کە بۆدییەکی ڕەش و جینزێکی ڕەشی سادەی پۆشیوە و بۆ ماوەی (10) کاتژمێر بە نێو شەقامەکانی شاری نیویۆرکدا ڕێ دەکات، بۆ ئەوەی ئەم توێژەرانە بسەلمێنن کەوا ئەگەر ژنان بە شێوەیەکی سادەش ڕێ بکەن، ڕووبەڕووی ڕێژەیەکی یەکجار زۆر لە توانج دەبنەوە. "هۆلاباك" بلۆگێکی تایبەتە بە نیشاندانی ئەمجۆرە وێنە و ڤیدیۆیانە، کە ئەو گێچەڵانەی ڕۆژانە دەرهەق بە خەڵك دەکرێن بە مەبەستی هۆشیارکردنەوەی خەڵك نیشان دەدات. ڤیدیۆی ئەم ژنەش لە ماوەی (10) کاتژمێر تۆمار کراوە، بەڵام کورت کراوەتەوە و بە ناونیشانی "ئەگەر ژنێك *10* کاتژمێر بە پێ بڕوات لە شاری نیویۆرك" لە یوتیوب بڵاو کراوەتەوە. وەك لە ڤیدیۆیەکەدا دیارە پیاوان بەبێ جیاوازیی ڕەچەڵەك و تەمەن، توانج لە کچان دەدەن و داوای لێ دەکەن ژمارەی مۆبایلیان بداتێ، یان وەختێك بۆ پێکەوەبوونیان دیاری بکات و، بە ئازیزەکەم و شیرینەکەم و جوانەکەم بانگی دەکەن. لە کۆتایی گرتە ڤیدیۆییەکەدا ڕوون کراوەتەوە کە ئەو کچە لە ماوەی (10) کاتژمێردا زیاتر لە (100) توانجی لێ دراوە، ئەمەش بەبێ ئەژمارکردنی ئەو کەسانەی کە فیکەیان بۆ لێ داوە یان چاویان لێ داگرتووە.[2]

---

1 . News24 (Nov 20, 2014), **"Court to charge 90 for undressing woman"**, From: <http://www.news24.co.ke/National/News/Court-to-charge-90-for-undressing-woman-20141120>

2 . بڕوانە: پۆرتاڵی ڕووداو (2014/10/28)؛ لایف ستایل؛ **"ئەگەر ژنێك 10 کاژمێر بە پێ ڕێبکات لە شاری نیویۆرك"**؛ لە ماڵپەڕی: <http://rudaw.net/sorani/lifestyle/291020141> ــ هەروەها بڕوانە: ماڵپەڕەکانی: "یۆتیۆب" و "دێیلی مێل":

Yotube (Oct 28, 2014), **"10 Hours of Walking in NYC as a Woman"**, online: <https://www.youtube.com/watch?v=b1XGPvbWn0A>

Dailymail (Oct 28, 2014), **"Here's what it's like to be a woman walking through the streets of New York"**, From: <http://www.dailydot.com/lifestyle/woman-street-harassed-new-york-hollaback>

لە ئەزموونێکی هاوشێوەدا هەر لە شاری نیویۆرکدا، لە گەڕەکی "مەنهەتەن" (Manhattan)، ژنێکی بێحیجاب بە پۆشاکێکی سادە (بۆدییەکی ڕەشی نیوقۆڵ و جینزێکی ڕەشی سادە)وە، ماوەی (5) کاتژمێر بە شەقامەکانی ئەم گەڕەکەدا پیاسە دەکات، کە ئەمیش ڕووبەڕووی دەیان توانج و گێچەڵ دەبێتەوە. جگە لەو فیکە و زلەگرتنە مانادارانەی کە هەموو بە گێچەڵی سێکسی (Harassment) دەژمێردرێن. دواتر هەمان ژن کە گوایە ژنێکی ئاسایی (کۆری یان چینی) بێت، پۆشاکێکی ئیسلامی لەبەر دەکات و بە حیجابێکی تەواوەوە کە تەنها ڕوخسار و دەستی دیارە، (5) کاتژمێری دیکە لە هەمان شەقامەکان بە پێ دەسوورێتەوە و، تەنانەت تووشی یەکجار زلەلێگرتن یان توانجێك نابێتەوە.[1] ئەم ڤیدیۆیە تەنها بە دوو حەفتە زیاتر لە (35) ملیۆن جار بینراوە. ماڵپەڕی (BBC) باس لە دووبارەبوونەوەی ئەزموونێکی هاوشێوەی توێژەرانی نیویۆرك لە (46) شاری جیاجیای دیکە دەکات، وەکو: شاری ڕۆمای ئیتاڵیا، مۆمبای هیند، تورێنتۆی کەنەدا (3 کاتژمێر)، کۆلۆمبیا (2 کاتژمێر) و هتد.[2]

گومانی تێدا نییە کە حیجاب و خۆداپۆشین کاریگەرییەکی زۆری لەسەر پاراستنی دەروونی ژن و پێگەیشتن و کامڵبوونی پێکهاتەی دەروون و کەسایەتیی هەیە. دەروونناسان بە پشتبەستن بە تیۆری "پێنج قۆناغەی گەشەی کەسایەتی"یەکەی فرۆید، لە خۆداپۆشین و هۆکارە پێگەیشتنە دەروونییەکانی ژنان کۆڵیویانەتەوە و گەیشتوونەتە ئەم دەرئەنجامە:

"... قۆناغی چوارەم لە قۆناغەکانی پێگەیشتن و گەشەی دەروونیی مرۆڤ، قۆناغی "پێش زایەنی" یان "زایەنی شاراوە" (*Pre-genital Stage*)یە، کە گرنگترین قۆناغی ناسینەوەی کاریگەریی شاردنەوەی ئەندامی زایەنی و خۆداپۆشینە. لە سێ قۆناغی پێشتر جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان کوڕ و کچدا نییە، بەڵام لەگەڵ دەستپێکی ئەم قۆناغە، جیاوازیی نێوان دوو ڕەگەز لە ڕووی دەروونی و دەرکەوتنی کەسایەتییەوە دەست پێ دەکات. لەو قۆناغەدا جیاوازیی کوڕان و کچان لە شێوازی ڕەفتاری کۆمەڵایەتی یان چۆنیەتی ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ شتەکانی دەوروبەری خۆیان بەرجەستە دەبێت. کوڕان زیاتر شەڕەنگێز دەبن و بە ئاشکرا حەز دەکەن هێزی خۆیان بسەپێنن و لە ئاکامدا دەبنە تاکێکی ڕقدار و کەللەڕەق و ئەمرکەر و، لاسایی گەورەکان دەکەنەوە، بەڵام بەپێچەوانەوە، لە کچاندا حاڵەتی دڵڕفێنی و ملکەچی و هێزی سەرنجڕاکێشان تێیدا ئاشکرا دەبێت و لە

1 . Youtube (Nov 10, 2014), **"10 Hours of Walking in NYC as a Woman in Hijab"**, From: <https://www.youtube.com/watch?feature=youtu.be&v=E4xJ4Bn0zmw&app=desktop>

2 . BBC (Nov 12, 2014), **"BBCtrending: 46 catcalling video copycats"**, From: <http://www.bbc.com/news/magazine-30010645>

ئاکامدا حەزکردن لە پۆشاکی جوان و ڕازاوە و ڕەنگاوڕەنگ، ئارایشتکردن، قسەی ناسك و نازندەیی، مەکربازی و دەرخستنی حاڵەتی دایکایەتییان پێوە دیاری دەدات. قۆناغی پێنجەم قۆناغی پێگەیشتن و دەستنیشانکردنی ناسنامەی خود و شوناسی مرۆیی (-Self *Identity*)یە. لەو قۆناغەدا کوڕان و پیاوان تایبەتمەندیی پێگەیشتن (بلوغ) و شوناسە مرۆییەکەی خۆیان ئاشکرا دەکەن. پیاوان سیفەت و خووی وەك ئارامی، قبووڵکردن، لێبوردەیی و بەرگەگرتن و تاقەتهێنان، بە خووەکانیتریان زیاد دەکەن و لەجیاتی سەپاندنی هێز و دەسەڵاتی خۆیان بەسەر هەموو شت و تەنانەت هەموو ژناندا، حەز دەکەن هێزی خۆیان تەنها بەسەر یەك ژن و ژیان و خێزانی خۆیاندا بسەپێنن. ژنانیش لەجیاتی ڕاکێشانی سەرنجی هەموو پیاوان و سەرفکردنی هێز و کاتی خۆیان، تەنها بایەخ بە یەك پیاو (شوو یان دەزگیران یان دۆست) دەدەن و هێز و توانستی جەستەیی و ڕۆحییەکانی دیکەی خۆیان سەرفی پێگەیاندن و سەلماندنی خۆیان لە ناو کۆمەڵگادا دەکەن. لە قۆناغی چوارەمدایە کە لەوانەیە دوو جۆر نەخۆشیی دەروونی دەربکەون: یەکەم) گۆڕینی ڕۆڵی کوڕ و کچ، کە مەترسیی تووشبوون بە هاوڕەگەزبازی (*Homosexuality*) لێرەوە دەست پێدەکات. دووەم) وەستان و نەگۆڕی، کە لەو قۆناغەدا دەبێتە هۆی وەستانی کەسایەتی و جێگیربوونیان، کە کوڕان هەمیشە تینووی هێز و دەسەڵات دەبن و کچانیش بە تەواوەتی دەبنە وەرگرێکی بەردەوام و، تینووی سەرنج و بایەخی دەوروبەری خۆیان. ئەمانە ناچارن بەردەوام خۆیان بسەلمێنن و پێبگەیەنن و زاتی خۆیان هەم بۆ خۆیان، هەمیش بۆ دەوروبەریان تەحقیق بکەن؛ بۆیە ئەم جۆرە کوڕ و کچانە لە پێگەیشتن و داهێنان و سەربەخۆیی کەسایەتییەکانیان دەمێننەوە."[1]

بەداخەوە ئەمڕۆکە لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا، بەتایبەتی ڕۆژئاواییەکان، ئەم وەستانی کەسایەتی بە ناونیشانی جۆراوجۆرەوە هان دەدرێت. عەرزکردنی ژنانی هەرزە و نازفرۆش لەسەر پەردەی سینەما یان شاشەی تەلەفزیۆن و گۆڤار و بەنموونەکردنیان، یان پێشاندانی ئەو کەسایەتییە ناڕاستانەی پیاوانێك کە زۆر خێرا مرۆڤ دەکوژن و بە دەستبەسەرداگرتنی ژنان و بێهاوسەری، بە شانازییەوە برەوی پێ دەدرێت، کە بە ڕاستی خراپترین نموونەن، کە کچان و کوڕان لە گەشەکردن و گەیشتن بە قۆناغی بلوغی دەروونی دەهێڵێنەوە. ژنان و پیاوان کاتێ دەکەونە ژێر ئەو چەشنە کولتوور و فەرهەنگانە، هەمیشە لە نەمانی هێزی سەرنجڕاکێشان و بایەخی خەڵك، نیگەران و ناڕازین و بەتوندی لە پیربوون و بەساڵاچوویی دەترسن و ئەم تینوویەتییە

1 . Ewen, B. Robert (2014), "**An Introduction to Theories of Personality**", New York: Lawrence Erlbaum Associates, Inc, pp. 28-31. And: Shaffer, David R. (2008), "**Social and Personality Development**", Wadsworth: Cengage Learning, pp. 39-40.

هەرگیز ناشکێت و ئەم ژن و پیاوانە لەبەر ئەوەی تام و چێژی خۆشەویستیی ڕاستەقینەیان نەچێشتووە، هیچ مەجالێکیان بۆ خۆشەویستی، میهرەبانی، عەشق و قبوولکردنی بەرپرسیارییەتی نابێتەوە. لەوانەیە لەبەر ئەم هۆکارە بێت کە هەنووکە زیاتر لە (63%)ی خێزانە ئەمریکاییەکان تاکباوانن؛ واتە لەبەر تەڵاق، یان دایکیان هەیە یان باوك. ژیانی خێزانی نە ئەو شوێنەیە بۆ بەخاوەنبوونی هەموو ژنان و، نە بۆ ئەوەشە سەرنجی هەموو پیاوان ڕابکێشێ. یەکێك لە کاریگەرترین ڕێگاکان بۆ گەشەکردن و پێگەیشتنی کەسایەتیی ژن و ڕزگاربوون لە کۆت و بەندی وابەستەیی بە ڕاکێشانی سەرنج و بایەخی خەڵکی و خۆعەرزکردن، حیجاب و خۆپۆشتەکردنە. حیجاب بۆ کچان لە پێداویستییە سەرەکییەکانە بۆ گەشە و بلوغی دەروونی، کە پێویستە لە سەردەمی نەوجەوانیدا بۆی دەستەبەر بکرێت. کچان بە داپۆشینی خۆیان جگە لە سنووری ماڵەکەیاندا، لە ڕاستیدا فێر دەبن کە سەرنج و بایەخدان پێیان و دیتنی جەستەیان، شتێکی تایبەتی پرەیڤێتە بە ماڵەوە. خۆداپۆشینی کچان وەکو چوونە قوتابخانەیە لە بەیانییەکی ساردی زستانیدا، کە ڕاستە سەخت و دژوار و ناخۆشە، بەڵام بۆ ئەوەی لە پرۆسەی پێشکەوتن و پێگەیشتنی خۆی دانەبڕێت و بتوانێت لە ئایندەدا خۆی بسەلمێنێت، لە ماڵ نامێنێتەوە و لە خوێندنەکەی بەردەوام دەبێت.[1]

یەکێکی دیکە لە پێداویستییە دەروونییەکانی ژن، ڕێزگرتن و گرانبایبوونەتی لە نیگای پیاوانەوە. هەروەك "هەرەمی مازلۆ" ئاماژە پێ دەکات، پێداویستیی ژن بە میهرەبانی و خۆشەویستی و ڕێزلێگیران و پێزانران دەبێتە هۆی پێگەیاندن و خۆڕاستاندنی کەسایەتییەکەی؛ چونکە بوونێتیی دەروونی و کەسایەتیی ژن لەوەدایە کە ببێتە جێگای بایەخ و ڕێز. ئەگەر جوانییەکانی ژن بە بەردەوامی لەبەردەم چاوی پیاوانەوە بێت و بۆی عەرز بکرێت، ئەو جوانییانە کەم کەم بۆ پیاوان عادی و ئاسایی دەبنەوە و لە نرخ و بەهاکەی کەم دەبێتەوە، لە حاڵێکدا حیجاب و پۆشش نە تەنها لە نرخی ژن کەم ناکاتەوە، بەڵکو لە لای پیاو، سەرنجڕاکێشتر، بەڕێزتر، پڕبەهاتر، شکۆدارتر و ئایدیاڵتری دەکات. "ویل دیۆرانت" دەڵێ:

"شەرم و شوورەییکردن و داوێنپاکیی کچ، وەك ئامرازێکی بەرگرییە کە دەرفەتی دەداتێ تاکو لە نێوان خوازبێن و دواخوازکەرەکاندا، هەرە شایستە و باشەکەیان هەڵبژێرێت. یاخود خوازبێنەکەی ناچار دەکات کە بەر لەوەی دەستی بگاتێ و ببێتە خاوەنی، خۆی پاك

1 . روحانی، شهریار (1990)؛ "آیا حجاب ضرورت دارد؟ (بررسی مسئله پوشیدگی از دیدگاه روانشناسی)"؛ تهران: نشر اشراقیه؛ ص 51.

بکاتەوە. ئەو بەربەستانەی کە شەرم و شوورەیی و پاکداوێنیی ژن لە شەهوەت و هەوەسی پیاوان دەپارێزێ، خۆیلەخۆیدا هۆکارێکە بۆ گوڵکردنی خۆشەویستی و عەشقێکی شاعیرانە و قیمەت و بەهای ژن لە دیدی پیاواندا بەرز دەکاتەوە."[1]

خاتوو "سیمۆن دوبوڤار"یش ــ کە فێمێنیستی بەناوبانگی ڕادیکاڵی و ئیگزیستانسیالیستی فەرەنسییە ــ لە کتێبی "ڕەگەزی دووەم"دا دەڵێ:

"کچە گەنجەکان حەزیان لێیە، پیاوان خودی خۆیانیان بوێت، نەك مەبەستیان تەنها پەیوەندیی سێکسی و ناوگەڵ بێ؛ بۆیە نیگای پیاوان سەرباری ئەوەی ستایش و پەسنی ئەوان دەکات، بەڵام بۆیان ئازاردەر و ناخۆشە. هەوەسی نێرینە بە هەمان ئەندازەی کە ستایشگەرانە و ئافەرین گوتنە بۆ مێ، سووکایەتی و بێحورمەتی و کەمکردنەوەیشە. ئەگەر کچان لە سروشتیاندا هەست بەوە بکەن کە پیاوان بە چاوێکی مەبەستدار سەیری جەستەیان دەکەن، هەوڵ دەدەن خۆیان داپۆشن و شەرم و حەیاش لێرەوە بەدەردەکەوێت. کچ دەیەوێ بەو ئەندازەی کە جەستەی خۆی بەدەرخستووە سەیر بکرێت، بەڵام دەبینێ نیگاکان بۆ شوێنەکانی دیکەش دزە دەکات. ناهەماهەنگی و بەرجەستەییەکانی ئەندامی جەستەی کچە کە پیاوان شێت و شەیدا دەکات. کچ سەر و سینگ و لاقەکانی وەدەردەخات بۆ ئەوەی سەیر بکرێن، بەڵام لەگەڵ هەر نیگایەکی پیاوان ڕوخساری لە شەرم سوور هەڵدەگەڕێ و ئازاری دەدات و تووڕەی دەکات. وروژاندنی پیاوان ئەگەر چی جۆرێکە لە یاری و سەرگەرمی بۆ کچان، بەڵام لەگەڵ وروژاندنی پیاوان، هەست بە ڕق و تووڕەیی دەکات و هەوڵ دەدات هەڵبێت و پاشەکشەی بکات."[2]

مرۆڤ هەمیشە شتە جوان و پڕبەهاکانی خۆی تەنانەت شتە ماددییەکانی لە چاوی خەڵك دەشارێتەوە، کە حەز ناکات خەڵك دەستیان بگاتێ؛ چونکە هەموو تاکێك وایەروەردە نەکراوە کە چاوی لە سامان و موڵکی خەڵك نەبێت یان نیازی خراپی نەبێت؛ بۆیە ئێمە زێڕەکانمان لە ناو قەپاخێك دادەنێین، پارەکانمان لە ناو گیرفان یان جانتا یان قاسەیەك دەشارینەوە، دەرگاکانی ماڵەکانمان لەکاتێ دەرچوون دادەخەین و پەنجەرەکانمان پەردەپۆش دەکەین و هتد، هەموو لەبەر پاراستنی موڵك و سامان و شتە بەقیمەتەکانمانە. هەر شتێك کە بۆمان بەنرخ بێ، حەز دەکەین بیانپارێزین لە هەموو هەڕەشە ماددی و مەعنەوییەکان. وێنە تایبەتییەکانی خۆمان لە ئەلبۆمێك یان فۆلدەرێك لە کۆمپیوتەرمان دەشارینەوە بۆ ئەوەی بەرچاو نەبێ و دەستی هەر

1 . دورانت؛ همان منبع؛ جلد 1 (مشرق زمین گاهوارە تمدن)؛ ص 60.
2 . دوبووار، همان منبع؛ جلد 2؛ ص 125.

کەسێك پێ نەگات! ژن یان کچ کە ئەندامە جوانەکانی دادەپۆشێت، نیشانەی بەنرخزانین و پڕبەهابوونیانە و بەم شێوەیە ڕێز لە کەسایەتی و مافە تاکەکەسییەکانی خۆی دەگرێت و دەیەوێ خەڵکیش ڕێز لە کەسایەتییەکەی بگرن و مافەکەی بە ئازاردانەوە لێی زەوت نەکەن.

پێم وایە، هەروەك بڕوای زۆرێك لە فێمێنیستەکانیشە: خۆڕووتکردنەوە ڕێز و بەهای ژن کەم دەکاتەوە و تا ڕادەی "کاڵا" و بەرهەمێك نزمی دەکاتەوە. گومان نییە کە مرۆڤ خاوەن غەریزەی سێکسییە و پێویستە وەکو هەموو غەریزە سروشتییەکانی دیکەی تێر بکات، بەڵام تێرکردنی غەریزەی سێکسی بە مانای "هەمووانیکردن" و "هەمووشوێنکردن"ی مەسەلەی سێکس نییە. ژنێك کە ئەندام و جوانییەکانی جەستەی خۆی دەخاتە بەر چاوی هەموو کەسێکەوە، لە ڕاستیدا دەیەوێ بە پشتبەستن بە "ژنایەتی" و "مێینەتی" خۆی شوێنگەیەك بۆ خۆی لە ناو کۆمەڵگادا بکاتەوە و هەست بە "بوون"ی خۆی بکات؛ ئەویش نەك بە پشتبەستن بە خەسڵەتە "مرۆڤایەتی" و سیفاتە جوان و بەرزەکانی، یان "زانست و هونەر و هزر"ی خۆی. ژنێك کە بڕوای بە ڕووتاتی و بێحیجابییە، گوایە بە هەبوونی سیفاتە مرۆڤی و مەعنەوەییەکانی (وەك هەبوونی هونەر یان زانست و هزر و مەعریفەی خۆی) ڕازی نییە، کە بەهۆیانەوە بتوانێ خۆی لە ناو کۆمەڵگادا وەردەربخات و بیسەلمێنێ؛ بۆیە پەنا دەباتە بەر شتە ڕواڵەتی و جوانییە جەستەییەکانی، کە ئەمە نیشانەی هەژاریی هونەری و زانستی و، لاوازیی دەروونی و کەسایەتییە. لە حەقیقەتدا ئەو ڕادەگەیەنێ کە ئەوەی بۆ ئەسڵ و گرنگە، "ژن" بوونییەتی، نەك "مرۆڤ" بوون، نەك هزر و فیکر و ئەندێشە و لێهاتوویی و کارامەبوونی. ئەم چەشنە ژنانە، بەر لە هەموو کەسێك دیلی کۆت و بەندی خۆیانن. ئەوان وەك ئەو دووکانداره وان، کە بەردەوام وازی لە جوانکاری و ڕازاندنەوە و گۆڕانی دکۆراسیۆنی ڤیترینی دووکانەکەیەتی، بەشێوەیەك کە هیچ بوارێك بۆ ئامانج و ئارەزووە گەورەترەکانی نەهێڵێتەوە. ژنێك کە بەردەوام نیگەرانی جوانی و جوانپۆشی و ڕازاندنەوەی خۆیە، چۆن دەتوانێ وەك پێویست لە خەمی خوێندن و پێگەیاندنی خۆی و منداڵەکانی بێت؟ چۆن دەتوانێ نیگەرانی ئەو هاووڵاتییە هەژار و برسی و بێبەش و نەخۆشانە بێ، کە بەدەست برسێتی و نەخۆشی گیری خواردووە؟ چۆن دەتوانێ بیر لەوە بکاتەوە کەوا بێگانەکان چی بە سەر وڵاتەکەی دەهێنن؟ چۆن دەتوانێ هەوڵ بۆ ڕزگارکردنی لێقەوماوان و چەوساوەکانی دیکە بدات؟

لە لایەکیترەوە، حیجاب دەبێتە هۆی دروستکردنی هاوسەنگی لە نێوان غەریزەی خۆڕازاندنەوە و ئارایشتکردن، کە لەم سەردەمەدا یەکێکە لەو هۆکارە بەهێزانەی دڵەڕاوکێ و

سترێس و خەم و نیگەرانی دەخاتە زەین و دەروونی زۆر لە کچان و ژنانەوە؛ چونکە زێدەڕەویی لە ئارایشتکردن و دەرخستنی جوانییە مێینییەکان لە ناو کۆمەڵگادا، دەبێتە هۆی بایەخپێدانی لە ڕادەبەدەر بە جوانیی ڕواڵەت و جەستە، کە ئەم گرنگیپێدانە زێدەڕەوییانە زۆر جار دەبێتە هۆی کێشە و نەخۆشیی دەروونی. کاتێك کە کچ یان ژنێکی نەپۆشتە و بێحیجاب، بە ڕواڵەتێکی ئارایشتکراو دەچێتە ناو نێرەوزان، خوازراوانە یان نەخوازراوانە کۆمەڵێك کوڕ و پیاو زلەی لێ دەگرن و بە نیگاکانیان پەسن و ستایشی ڕواڵەتەکەی دەکەن؛ بۆیە بەردەوام هەوڵ دەدەن کە ڕواڵەتی خۆیان بە شێوەیەك جوانتر و بە مودێلێکی نوێتر و جیاواز لە دوێنێ ئارایشت بکەن، تاکو زیاتر ببنە جێگای پەسەندی پیاوان. لەبەر ئەوەش ئەم ژن و کچانە بۆ ڕازاندنەوەی خۆیان و بۆ ئەوەی بێنە بەرچاو، ڕۆژانە کاتێکی زۆر سەرفی ئارایشت و لاساییکردنەوەی مودێلە نوێیەکان دەکەن، بەڵام هەر دڵیان ئاو ناخواتەوە و، لە خۆیان بێزار دەبن و تووشی نارەحەتی و ماندووبوونێکی دەروونی یەکجار زۆر دەبنەوە؛ چونکە هەمیشە کارەکان بە دڵخواز و ویستی ئەوان بەرەو پێش ناڕوات و دەبێتە هۆی نیگەرانی و ئازاری دەروونی؛ بۆ نموونە: یان سەرەڕای مەسرەفێکی زۆر (کڕینی جلوبەرگی نوێ و مودێلی تازەی ئارایشتی قژ و پێست و دەموچاو) کوڕ یان ئەو پیاوانەی کە ئەو چاوەڕوانی دەکرد پێشوازیی لێ بکەن، بایەخی پێ نەدەن، یاخود لە هەمان کاتدا کچێك یان ژنێکی جوانتر و ڕازاوەتر بە ئارایشت و پۆشاکێکی جیاواز (لەوانەیە هەرزانتر لە هی ئەویش) دێتە ناو ئەو پێشبڕکێیەدا و گۆڕەپانەکەی لێی تەسك بکاتەوە. هۆکارێکی دیکەی توندبوونی دڵیان لەوانەیە ئەوە بێت کە بە درێژایی تەمەن ڕۆژبەڕۆژ جوانییەکەیان کەمتر دەبێتەوە و ژن و کچی جوانتر و ڕازاوەتر شوێنی ئەوان دەگرنەوە و هەمان ئەو کوڕ و پیاوانەی کە تا دوێنێ، کڕیاری ناز و جوانییەکەیان بوون، تەنانەت ئامادە نین بایەخێکیان پێ بدەن. ئەگەر لێکۆڵینەوەیەکی زانستی لەسەر ئەم بابەتە بکرێت، لەوانەیە زۆر لە نەخۆشییەکانی وەك خەمۆکی و دڵەڕاوکێ و تەنانەت هەوڵی خۆکوشتنی کچ و ژنانێك بۆ ئەوە بگەڕێتەوە.

"نەوال سەعداوی" ـ فێمێنیستی بەناوبانگی عەرەب ـ لە کتێبی "سیمای ڕووتی ژنی عەرەب"دا دەڵێ:

"جوانی بە عەرزکردنی ئەندامە بەرجەستەکانی جەستە و ئارایشتکردنەوە نییە، کە دڵەڕاوکێی دەروونی و متمانەبەخۆنەبوونی دەشارێتەوە، بەڵکو بەر لە هەموو شتێك قەرزداری هێزی بیرکردنەوە، تەندروستیی جەستە و خەوشدارنەبوونی دەروونە. زۆرێك لە

کچان هەن، کە بەهۆی شەوقی گەیشتن بە نیشانەکانی پەسەندبوونی جوانی و ژنێتی، تووشی نەخۆشییە دەروونی و جۆرەها خەم و سترێس بوونەتەوە. گومان و پنداری کچێك ئەوەیە کە ژیان و ئایندەی بە ئەندازەی جوانی و ڕێکوپێکیی لووت یان کەوانەبوونی برژانگ وابەستەیە تا ڕادەیەك کە یەك میلیمەتر کورتیی برژانگی دەشێ ببێتە کێشەیەکی قووڵ و قەیرانێکی ڕاستەقینە لە ژیانیدا."[1]

ئەوەی ئەم کێشەیە ئاڵۆزتر دەکات، ئەوەیە کە ژنی نەپۆشتە زیاتر لە ژنی بەحیجاب و پۆشتە پیر دەبێ و جوانیی خۆی لە دەست دەدات؛ هەروەك زانستی پزیشکی سەلماندوویەتی کە سەرباری زیانبەخشی و ژەهراوییبوونی زۆر لە کەرەستەکانی ئارایشتکردن، ڕووتاتیی ئەندامانی جەستەی ژن لە ژینگەی گەرم یان سارد، دەبێتە هۆی تێکچوونی هاوسەنگی لە چەورییەکانی ژێر پێست و، ناسکی، نەرمی و سافیی ماسولکەکانی تێکدەدات و تەنانەت تووشی جۆرەها نەخۆشیی پێستی دەبنەوە.[2] جگە لەمە، کاتێك کە ژنان هەموو جوانییەکانی خۆیان دەخەنە بەر چاوی پیاوان، شتێکیتریان نامێنێ بۆ عەرزکردن و بەپێی یاسای "دەرخستن و خواستن" (عرض و طلب)، بەها و نرخی خۆیان لە دەست دەدەن!

توێژینەوە دەروونییەکانی کۆمەڵێك لە زانایانی بریتانی دەردەخات کە ژنە سەرپۆشتە و لەچکبەسەرەکان زیاتر متمانەیان بەخۆیە و لە "وێنەی جەستەیی" (Body Image)یان ڕازین و خۆیان پێ جوانترە لە ژنە سەرکۆت و ئارایشتکراوەکان، کە ئەم ئەنجامانەش بەڕای دەروونناسان پەیوەندیی نییە بە ڕێژەی ئیمان و پابەندییان بە ئایینەوە، بەڵکو زیاتر پەیوەندیی بە خودی حیجابەکەوە هەیە. دەرئەنجامەکانی ئەم توێژینەوانە لە ماڵپەڕی ڕەسمیی "دەروونناسیی کۆمەڵگای بریتانی" (The British Psychological Society) دانراوە؛ بۆ نموونە: یەکێك لەوان، توێژینەوەی دوکتور "ڤیرن سوامی" (Dr. Viren Swami)یە ـ مامۆستای سایکۆلۆژی لە زانکۆی "وێستمێنستر" (Westminster)ی بریتانیا و شارەزای نێودەوڵەتی لە بواری "وێنەی جەستەیی" و دڵکێشی و جازبییەت و ڕواڵەت و سیما لە ڕوانگەی کولتووره جیاجیاکانەوە ـ کە توێژینەوەیەکی بەراوردکاری لە نێوان (587) ژنی موسڵمانی بریتانی دەکات، کە (218) لەوان سەرکۆتن و لەچك

1 . السعداوی، نوال (1980): **"چهره عریان زن عرب"**: ترجمه: حمید فروتن و رحیم مرادی؛ (بیجا؟)؛ ص 167.

2 . U.S Department of Health and human services, NIH News (National Institutes of Health) (July 30, 2009), **"Sun Exposure May Trigger Certain Autoimmune Diseases in Women"**, From: <http://www.nih.gov/news/health/jul2009/niehs-30.htm> And: Daily Mail (Nov 17, 2014 ), **"Danger that hides in make-up"**, From: <http://www.dailymail.co.uk/health/article-108549/Danger-hides-make-up.html>

ناکەن و (369)یش بە شێواز و مودێلی جۆراوجۆر حیجاب دەکەن، کە لە کۆتاییدا بۆی دەردەکەوێ کە ئەوانەی کە حیجاب ناکەن، لە وێنەی جەستەیی خۆیان ڕازی نین و حەز دەکەن وەك ئەکتەر یان ئەو نموونانە بن، کە لە ڕاگەیاندنەکانەوە بەدەر دەکەون و لە کۆتاییدا ئاماژە بەوە دەکات کە چەمکی "وێنەی جەستەیی" لە چەمکە گرنگەکانی زانستی سایکۆلۆژیی و دربڕینی هەستی مرۆڤە بەرامبەر بە وێنە و ڕوخساری خۆی و ڕواڵەتە دەرەکییەکەی، کە ئەگەر مرۆڤ لە وێنەی خۆی ناڕازی بێ، تووشی نەخۆشیی دەروونی و تەنانەت کۆمەڵایەتیش دەبێت؛ بۆیە ئامرازی ڕاگەیاندنی جەماوەری، کاریگەرییەکی بەهێز و مەترسیداریان هەیە لە برەوپێدانی وێنەی دیاریکراوی جەستەیەك یان نموونەیەکی جوان، کە لە پیشەسازیی لاوازبوونەوە و جوانکردنی خێرای جەستە لەو سەردەمەدا شەو و ڕۆژ بانگەشەی بۆ دەکرێت.[1]

زانستی "دەروونناسیی کۆمەڵایەتی" (Social psychology)یش دەیسەلمێنێ کە مرۆڤەکان لەکاتێ چالاکییەکانیاندا دەکەونە ژێر کاریگەریی دیمەن و دەنگ و شتە سەرنجڕاکێشەکانی دەوروبەری خۆیان، کە دەبێتە هۆی دابەزینی ئاستی واز و هۆش و لە ئاکامدا بەرهەمەکانیان. وەك ئەو مامۆستایەی کە لەکاتی وانەگوتنەوەدا زەنگی مۆبایلەکەی لێ دەدات و هزری دەپچڕێت. جا ئەگەر ئەو شتە سەرنجڕاکێشانەی بریتی بێ لە جوانیی ئەو کچ و ژنانەی کە خۆیان لە شەقامەکان عەرز دەکەن، پچڕاندنی زنجیرەی هزری پیاوان دووهێندە بەهێز دەکات. چەند شۆفێر هەبوونە کە لەکاتێ لێخوڕینی ئۆتۆمۆبیل، سەیری کچ و ژنانی دەوروبەری خۆیان کردووە، کە ئەم سەیرکردنە بووەتە هۆی خۆپێکدادانی نەخوازراو؟ ئەوەتا لە ئاژانسە هەواڵەکاندا ڤیدیۆیەك بڵاو بووەتەوە، کە شۆفێرێك لە موسکۆی پایتەختی ڕوسیا لەکاتی لێخوڕینی ئۆتۆمۆبیلەکەیدا، لەبەر سەیرکردنی ژنێکی سەرنجڕاکێش، تووشی ڕووداوی نەخوازراو دەبێت. بەپێی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەی "دێیلی‌مێل"، شۆفێرەکە دانی بەوەدا ناوە کە جوانییەکەی ئەو ژنە بووەتە هۆی پچڕانی دیقەت و هۆشیارییەکەی.[2] ئەزموونی مامۆستایەتیی خۆمیش دەسەلمێنێ کە ئەو قوتابییە کوڕ و کچانەی کە لەکاتی وانەگوتنەوەمدا سەیری یەکتری دەکەن و چاو و برۆ لێك هەڵدەتەکێنن، کەمتر لە قوتابییانی دیکە لە وانەکە تێدەگەن. ڕۆژنامەی "دێیلی‌مێل"ی بریتانی

1 . (bps) The British psychological Society (26/07/2013), "**Wearing hijab helps body confidence**", From: <http://www.bps.org.uk/news/wearing-hijab-helps-body-confidence>

2 . سایت العربیه فارسی (2015/3/20)؛ "**ویدیو: زنی در روسیه به دلیل زیبایی نزدیك بود جانش را از دست بدهد**"؛ از سایت: http://farsi.alarabiya.net/fa/international

ڕاپۆرتێك بڵاو دەكاتەوە كە جوانیی كچە بێژەری تەلەفزیۆنی و پەیامنێری (25) ساڵەی سربی بە ناوی "كاترین سرێچكۆڤیچ" (Ktarin sreckovic) لەبەر ئەوەی دەبووە هۆی سەیركردن و سەرنجدانی یاریزانەكانی تۆپی پێی یانەی "ئەستێرە سوورەی بلگراد" (Red Star Belgrade) و تێكدانی دیققەت و پچڕاندنی تەركیزیان لە یاریدا، داوا لێدەكرێت كە ستادیۆمەكەی بەجێ بێڵێ و لەوێ دوور بكەوێتەوە![1]

لێكۆڵینەوەیەكی فەرەنسیش كە زانكۆی "بغێتانی ـ سیود" كردوویەتی، دەریخستووە: پیاوان جیاوازتر مامەڵە لەگەڵ ئەو ژنانە دەكەن كە پێڵاوی پاژنەبەرزیان لە پێدایە، بە بەراورد لەگەڵ ئەو ژنانەی پێڵاوی فلات لە پێ دەكەن. "ژان كلود فلۆمان" ـ كە توێژەرێكی كۆمەڵایەتییە لە پاریس ـ لەمبارەیەوە دەڵێت:

"ئەو ژنانەی كە پێڵاوی پاژنەبەرزیان لە پێیە، زیاتر سەرنجی پیاوان ڕادەكێشن".[2]

هەروەك لە قسەكانی ڕۆشنبیرانیشدا ئاماژەی پێ كراوە، حیجاب لە زۆر كۆنەوە ـ بەر لە ئایینە ئیبراهیمییەكانیش ـ لە نێوان شارستانییەتە كۆنەكاندا باو بووە. ئایا ئەوە خۆیلەخۆیدا تا ڕادەیەك نیشانەی فیتری و سرشتیبوونی حیجاب نییە، كە هەر لە سەرەتای ژیانی مرۆییەوە هەبووە و تا ئێستاش هەر ماوەتەوە؟ هەروەك ئەو ژنە ڕۆشنبیرە دان بەوەدا دەنێت كە ژمارەی لەچكبەسەر ڕۆژبەڕۆژ لە كوردستان زیاتر دەبێ و بەداخەوە ئەوەش بە نیشانەی دواكەوتنی كۆمەڵگا لەقەڵەم دەدات، ئایا پێشوازیی ژنان لە حیجاب نە تەنیا لێرە، بەڵكو لە ناو ڕۆژئاواش (كە دواتر باس لە هەندێ داتای ڕاستەقینە دەكەین) نیشان نادات كە جگە لە بەفەرز و پیرۆز زانینی، وا دەڕوانە حیجاب كە ئاسایشی دەروونی و كۆمەڵایەتییەكەیان دەپارێزێت؟ ئەگەرچی لەوانەیە كە هەندێ جۆری حیجاب لە هەندێ كۆمەڵگاكانی پێشووتر و ئێستاشدا بەهۆی پیاوانەوە قۆزرابێتەوە، بەڵام ئەوە هیچ لە حیكمەت و فەلسەفە و بەهاكەی كەم ناكاتەوە؛ چونكە حیجاب لە هەموو ئایینە ئاسمانییەكاندا فەرمانی پێ كراوە، لە پێناو دابینكردنی كەرامەت، كەسایەتی، ڕێز

1 . Gadd, Michael (5 Novamber, 2014), **"Red Star Belgrade TV presenter Katarina Sreckovic ordered away from pitch area for being too attractive after players complained they 'couldn't concentrate' in her presence"**, From: <http://www.dailymail.co.uk/sport/football/article-2822006/Red-Star-Belgrade-TV-presenter-Katarina-Sreckovic-ordered-away-pitch-area-attractive-players-complained-couldn-t-concentrate-presence.html>

2 . پۆرتاڵی ڕووداو (2014/12/12)؛ **"پێڵاوی پاژنەبەرز هەڵسوكەوتی پیاوان دەگۆڕێت"**؛ لە ماڵپەڕی: http://rudaw.net/sorani/lifestyle

و حورمەت بۆ ژنان و، پێشگیری و پاراستنیان لە گێچەڵ و ئازاری سێکسی و هەڕەشەی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی. چەند سەدەیە کە خۆڕووتکردنەوە و بێحیجابی و تیکەڵاوبوونی ڕەهای ژنان و پیاوان لە ڕۆژئاوادا باوە و بە پێی ئامارە ڕەسمییەکانیان (کە لە بەشی داهاتودا بە وردی باسیان دەکەین) ئاکامی زۆر سلبی و جۆرەها کێشەی ناپەسەندی بەدوای خۆیدا هێناوە، کە پێویستە ژنی کورد ـ بە تایبەتی ئەوانەی بانگەشەی ئازادی دەکەن وەك نموونەی ڕۆژئاوا ـ دەرس و پەند و عیبرەتی لێ وەربگرن و چالاکڤانانی مافی ژنانیش زیاتر بۆ ئەوان شیوەن و ڕۆڕۆ بکەن و بۆ ئازادیی و مافی ئەوان تێبکۆشن!

بەداخەوە ئەمڕۆکە دەبینین کە چەوساندنەوە و توندوتیژیی سێکسی بە شێوازی مودێرن ڕۆژبەڕۆژ زیاتر و تەنانەت "سێکس" بووەتە قەیرانێکی بێهەوسار و کۆنترۆڵنەکراو[1] کە وڵاتانی ڕۆژئاوای ناچار کردووە بۆ چارەسەرکردنی ئەم قەیرانە پەنا ببەنە بەر دامەزراندنی هەندێ دامەزراوەی تایبەت، وەکو: بنکەی ئاسایش و پۆلیسی ژنان، بنکەی بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی دژ بە ژنان و هتد، کە پێم وایە لە جیاتی ئەو شوێنانە ـ یان لانیکەم لە تەنیشت ئەوانەوە ـ حیجاب وەك ڕێگەچارە و پێشگیری و خۆپارێزی باشترین و گونجاوترین دەرمانە؛ چونکە سەرەڕای هەبوونی ئەو شوێنانە، هێشتا نە ئاسایشی دەروونی و کۆمەڵایەتیی ژنان دابین بووە و نە کێشەی توندوتیژی بە تایبەتی دەستدرێژیی سێکسی، بنبڕ یان ڕێژەکەی کەمتر بووەتەوە.

"ڕۆژنامەی دێیلیمێل" ساڵی (2012) ڕاپۆرتێکی توێژەرێکی ئیتاڵیایی بە ناوی "دون پیێرۆ کۆرسی" بڵاو دەکاتەوە، کە ئاماژە بەوە دەکات:

> "ئەو ژنانەی کە تەنوورەی کورت و جلوبەرگی تەسك لەبەر دەکەن، خۆیان هۆکاری سەرەکیی توندوتیژی و گێچەڵی سێکسین؛ چونکە هەستی سێکسیی پیاوەکان بە هۆی ئەو جلوبەرگانەوە دەورووژێنن".[2]

لە ساڵی (2014)شدا خوێندنگەیەك لە هوڵەندا پۆشینی تەنوورەی کورت لە کچەکانی قەدەغە دەکات. ئیدارەی ئەم قوتابخانەیە ئاگادارییەك لە ڕێگەی قوتابییەکانی بۆ خێزانەکانیان

1 . د. نەزەند بەگیخانی ـ فمێنیستێکی کوردە ـ "سێکس" لە وزەی ئەتۆم بە مەترسیدارتر دەزانێت؛ بڕوانە وتاری: **"ئاراستەیەك بۆ وزەی سێکسی لە کوردستان"**؛ لە ماڵپەڕی کچی قەندیل تایبەت بە مافی مرۆڤ و پرسی ژن:
http://kchiqendil.wordpress.com

2 . Evans, Becky (28 December 2012),"**Women wearing tight clothes are to blame for domestic violence**", Online: <http://www.dailymail.co.uk/news/article-2254269/Tight-clothes-blame-domestic-violence-Outrage-Italian-priest-Piero-Corsi-claims-women-responsible-provoking-worst-instincts-men.html>

دەنێرێ و داوایان لێ دەکات کە کارێکی وا بکەن کچەکانیان جلوبەرگێکی گونجاو و ماقووڵ بپۆشن و خۆیان لە پۆشینی تەنوورەی کورت بە دوور بگرن.[1]

بەشداریی ژنە کوردە موسڵمانەکان لە بوارە جیاجیاکانی کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی، ئابووری و سیاسی بە ڕوونی دەریدەخات کە حیجاب نەك هەر فەزای جووڵانەوە و چالاکی و پشوودانی کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی، ئابووریی ئەوان تەسك ناکاتەوە و سنوور و چوارچێوەی گەشەکردن و پێگەیشتن و پێشکەوتنیان بچووك ناکاتەوە، بەڵکو بە سڕینەوەی ورووژێنەرە سێکسییەکان و ئاراستە سلبییەکانی، لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیدا بەشداری دەکات. ئەگەر مەبەستی ئەو فێمێنیستانە لە هەڵگرتنی بەربەست و چوارچێوەکان، تەنها بریتییە لە ئامادەبوون و بەشداریی ژنان لە تەنیشت پیاوان بۆ کارە تاقەتپڕووکێنەکان و پیشە سەختەکان بە شێوەیەکی ڕەها و بەبێ ڕەچاوکردنی سنوور و حورمەتە ئەخلاقییەکان، ئەم جۆرە بەربەست و چوارچێوانە لە ڕووی ئایین و ئەقڵ و زانستەوە، کارێکی زۆر مەنتیقی و ئەقڵانییە و بە سوودی ژنانە و دواتریش کۆمەڵگا؛ هەروەك هەندێ لە زانایان و بیرمەندان و ڕێفۆرمخوازانی ئەوروپاییش دان بەوەدا دەنێن و کاری بەردەوامی لەسەر دەکەن. ئەم جۆرە چوارچێوەیە پیشەیی و کۆمەڵایەتییانە کە کاری ژنان و پیاوان لە یەکتر جیا دەکاتەوە، لەبەر پابەندبوون بە حیجاب و خۆپۆشتەکردنەوە نییە، بەڵکو زیاتر دەوەستێتە سەر شکڵ و ڕواڵەت و پێکهاتەی جەستەی ژنان، کە هەندێ لە کۆمەڵناسان ناوی "ڕەگەزی سێیەم" یان "ژنانی پیاوئما" بۆ ئەم ژنانە بەکار دەبەن؛ واتە ئەو ژنانەی کە لەبەر کاری سەخت و دژواری پیاوانە زۆر شکاون، نە بە پیاوان دەچن و نە بە ژنان، بەڵکو لەبەر گۆڕانکاریی شکڵی و جەستەیی و جلوبەرگ و پۆشاکیان، بوونەتە ڕەگەزێکی نێوان هەردووکیان!

پێم وایە لە کورتبینی و ڕواڵەتگەرایی ئەم تاقمە فێمێنیستانەیە کە بەم شێوەیە دەڕواننە نیو مەتر قوماشێك بەسەر ژنانەوە و ئەمەش بە چەوساندنەوە و پاشکەوتن لەقەڵەم دەدەن، بەبێ ئەوەی ڕاپرسی یان لێکۆڵینەوەیەکی زانستییان کردبێ لەسەر ئەم دیاردەیە یان ڕەفتارە کۆمەڵایەتییە؛ ئەوەتا زانای بەناوبانگی ئەمریکایی و مامۆستای زانکۆی "جۆرجتاون" و دامەزرێنەری "سەنتەری لێکتێگەیشتنی ئیسلامی ـ مەسیحی"ی زانکۆی جۆرجتاون، "جۆن لویس ئسپۆزیتۆ" لە کتێبە بەناوبانگەی "ئایندەی ئیسلام"دا دەڵێ:

1 . بڕوانە: ماڵپەڕی خەندان (2014/10/11): **"لە خوێندنگەیەکی هوڵەندا تەنوورەی کورت قەدەغە دەکرێت"**؛ لە سایتی:
<http://www.xendan.org/mobile.aspx?jmara=9208>

"ژنە موسڵمانەکان بۆ لەبەرکردنی جۆری جلوبەرگ و پۆشاکەوە ئازادن. هەندێکیان جلی ئیسلامیانی جوان لەبەر دەکەن، هەندێکیان بەحیجابن و هەندێکی دیکە جلی ڕۆژئاوایی لەبەر دەکەن. لە هەندێ وڵاتدا ژنانی بەحیجاب کار دەکەن، وەکو ئەندازیاران، پزیشکان، مامۆستایان، پارێزەران و ئیدارییەکان لە تەنیشت هاوکارە پیاوەکانیان. حیجاب ڕەمزێکە کە مانایەکی تایبەتی هەیە... ژنی بەحیجابی موسڵمان لە زۆربەی وڵاتان دەتوانێت دەنگ بدات و خۆی بۆ پۆستی سیاسی کاندید بکات، یان لە پەرلەمانەکان و تەنانەت سەرۆکایەتیی دەوڵەت یان جێگیری سەرۆك لە ئێران، پاکستان، تورکیا و بەنگلادیش کار بکات. ژنی سعوودی خاوەن (*70%*)ی دارایی بانکەکانی سعوودیا و خاوەن (*61%*)ی کۆمپانیا تایبەتییەکانی ناو سعوودیایە، هەوەها خاوەن زەوی و عەقاراتی زۆرە لە ریاز و جدەدا... دادوەرەکانی وڵاتی مەغریب زیاتر لە (*20%*)یان ژنن... لە ئێران کە بە جلوبەرگی تایبەتەوە سەرتاسەری جەستەیان لە سەرەوە تاکو قولەپێ دادەپۆشن، لە کاری پیشەیی، کارگەکان، ئیدارەکان، پەرلەمان و تەنانەت جێگری سەرۆکی کۆمار بەشدارن و لە تەنیشت پیاوانەوە کار دەکەن... لە دەوڵەتی ئیماراتی عەرەبیشدا وەکو ئێران، زۆرینەی قوتابییە دەرچووەکانی زانکۆکان، ژنن؛ کەواتە حیجاب و لەچکە پەکی کار و پیشە و خوێندن و جووڵانەوەی ژنە موسڵمانەکان ناخات".[1] هەورەها دەڵێ: "حیجاب و پۆشاکی ئیسلامی لە سەدەی (*21*) مانای جۆراوجۆری هەیە؛ چونکە جەخت دەکاتە سەر ئەخلاقی گشتیی نوێ، کە ڕیشەیەکی ئیسلامییانەی هەیە و لە بەرامبەر بەها و نەریتی ڕۆژئاوایی جێبەجێ کردنێت، کە پیاوان ناچار دەکات ڕێز لە ژنان بگرن، هەروەها هانیان دەدات کە تەرکیز نەکەنە سەر سەرنجدان بە هەستە وروژێنەرەکان، هەروەها مامەڵەکردنیان لەگەڵ ژنان بەوەی کە ئەوانیش مرۆڤن و تاکێکی پیشەیین، لەبری ئەوەی وەك بوونەوەرێکی ئاڵۆشبزوێن و سێکسی سەیر بکرێن."[2]

لە لایەکی‌ترەوە، چۆن دەکرێ ڕەفتارێك ــ جا ئەقڵانی بێت یان ڕۆحی ــ بخەینە ناو قاڵبی چەوساندنەوە و زوڵم و ستەمەوە، کە تاکێك خۆی هەڵیبژاردووە و پڕ بە دڵ پراکتیزەی دەکات؛ هەروەك "ژۆزف سامۆئیل نای" ــ مامۆستای زانکۆی هارڤارد و یاریدەدەری وەزیری پێشووی بەرگریی ئەمریکا و دەستیاری وەزیری دەرەوەی پێشوو و خاوەن تیۆریی "هێزی نەرم" (Soft Power) ــ لە کتێبی بەناوبانگی "ئایندەی هێز"دا دەڵێت:

1 . Esposito, John L. (2013), "**The Future of Islam**", Oxford University Press; Reprint edition, pp. 148-149.
2 . Ibid., p. 152.

"ئایا دەکرێ و گونجاوە کە ژنانی ئەفغانی کە خوازیارانە حیجاب و پەچە دەکەن، بە چەوساوە و زوڵملێکراویان بزانین؟ سەبارەت بەو ژنە فەرەنسییانە چی، کە لەو فەرەنسا دموکراتیکەکەدا، بە حەز و ویستی خۆیان لەچك دەکەن؟"[1]

بە تەئکید ناکرێ حیجابی ئەو ژنانەی کە هەروەك بە زۆرەملێ نوێژ ناکەن و ڕۆژوو ناگرن، بەڵکو بە پاڵنەرێکی ئایینی و ئیمانییەوە دەیکەن، بە زوڵم و ستەم یان کۆت و بەندی لەقەڵەم بدەین، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ڕێگری لە حیجابی ژنە موسڵمانەکان لە هەر کات و شوێنێك بێ، واتە: ڕێگری لە ئازادیی ئایینی و زەوتکردنی مافی تاکەکەسی و، کۆت و بەندکردنی ئازادییە تاکەکەسییەکان. ئەم بام و دووهەوایە چییە لە ئەوروپادا؟ چۆن خۆیان بە لانکی ئازادی و مافی مرۆڤ دەزانن و دژایەتیی حیجابی ژنە موسڵمانەکان دەکەن، کە ئەو شێوازە جلوبەرگەیان هەڵبژاردووە؟ ئایا مەعقووڵە بە بەهانەی ئیسلامۆفۆبیاوە ڕێگری لە ئازادییە تاکەکەسییەکانی موسڵمانان بکەن؟ ئەوەتا ساڵانێك لەمەوبەر هەر لەم سەدەی بیستویەکەدا لەو فەرەنسایەی دموکراتیکەدا، بینیمان کە چۆن لەبەر نیو مەتر قوماشی سەرپۆشی کچێکی موسڵمان، کردیان بە هەرا و، لە خوێندنگا دەریان کرد و لە مافێکی مرۆیی بێبەشیان کرد!

لە هەموو گرنگتر، زانینی ڕاوبۆچوونی ژنی کورد خۆیەتی لەبارەی حیجابەوە. بەپێی ئەو ڕاپرسی و توێژینەوەی کە سەنتەری نێودەوڵەتیی "WVS" (ڕووپێوی بەها جیهانییەکان) لە ساڵی (2013)دا لە هەرێمی کوردستان کردوویەتی، بۆچوونی ژنان لە کوردستان بە تەواوەتی دژی فێمێنیستان و ڕۆشنبیرانی کوردستانە. لە وەڵامی پرسیاری "حیجاب و باڵاپۆشی بەهای ژن بەرز دەکاتەوە"، ڕێژەی (91.4%)ی ژنە کوردەکان گوتوویانە: لەگەڵیدام و، تەنها (8.6%)یان گوتوویانە: لەگەڵیدا نیم؛ کەواتە ژنانی کوردستان بەپێچەوانەوەی ئیددیعا و بانگەشە و دروشمی فێمێنیستان، حیجاب و لەچك بە کۆت و بەند نازانن.[2]

"کاندیۆتی" ـ پسپۆڕی بواری جێندەر و مامۆستای زانکۆی ئیکونۆمیی لەندەن ـ لە کتێبی "ئیسلام و پیاوسالاری: دیدگایەکی بەراوردکارانە"دا دەنووسێ:

"هەندێ لە ژنان کە ناچارن لەپێناو بەدەستهێنانی پارە و مووچەیەك لە دەرەوەی ماڵەوە کار بکەن، لەوانەیە هەندێ کاردانەوە ـ بە تایبەتی حیجاب ـ لەخۆ نیشان بدەن، کە نیشانەی جەختکردنەوەیانە لەسەر هێمای نەریتیی شەرم و حەیا. ئەم ژنانە دەکەونە

1 . Nye, Joseph S. (2011), "The Future of Power", New York: Public Affairs, pp. 13-14.

2 . WVS, op.cit., From: http://www.worldvaluessurvey.org/WVSOnline.jsp

بەرچاوی خەڵکانێکی دیکە و بۆیە بە پێویست دەبینن کە سوود لە هەر ئامرازێکی هێمایی وەربگرن، تاکو بسەلمێنن کە هێشتا پابەندن بە پاراستنی بەها و نەریتەکانیان؛ کەواتە ئاراستەی پارادۆکسیتە و ئاشکرای ژنان بە حیجابەوە لە ژینگە و کایەی گشتیی کار و خوێندندا، کردار و چالاکییەکی دژ بە فێمێنیزم نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە جۆرێکە لە "فێمێنیزمی پێچەوانە و ئاوەژوو" *(Feminism in Reverse)* کە هەڵگری مانا و ناوەڕۆکێکی سیاسی و ئەخلاقییە. هەڵبژاردنی حیجاب لە شوێنە گشتییەکانی کار و خوێندندا دەکرێ وەك کاردانەوەیەك دژ بە فێمێنیزمی ڕۆژئاوایی لەقەڵەم بدەین. ئەو وێنە چەواشەکارانەی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوایی لە ژنانی بەحیجاب و لەچکبەسەر پێشکەش دەکەن، نیشاندەری پلەنزمیی کۆمەڵایەتی و نەبوونی ئازادییەکانی ژنانە لە کاروباری خۆیاندا. بە سەیرکردنێکی خێرای نووسینەکانی ڕۆژئاواییەکان دەبینین کە ئەوان بۆ وەسفکردنی حیجابی ژنە موسڵمانەکان، دەستەواژەی وەك: "کفن"، یان "پۆشاکی هەڵخەڵەتێن و درۆزنانی" و "شەرم و حەیای ڕەش" بەکار دەهێنن. بە شێوەیەکی گشتی کاردانەوەی ڕۆژئاواییەکان بەرامبەر بە حیجاب دەکەوێتە دوو دەستەوە: یەکەم) شیکردنەوە و تەفسیرێکی دوژمنانە لە حیجاب، کە بە نیشانەیەکی ئاشکرای ستەم و چەوساندنەوەی ژنان دەزانن لە لایەن ئیسلامەوە. دووەم) دیدگایەکی وەهمی و خەیاڵی، کە حیجاب بە بەشێك لە نەریتە بێگانەکانی ڕۆژهەڵاتییەکان دەزانن، کە ئامانجی سەرکوتکردنی چێژ و حەزی سێکسییە؛ کەچی هەروەك لێکۆڵینەوە مێژووییەکان دەسەلمێنن، حیجاب لە ڕابردوو و ئێستاشدا بووەتە هۆی جۆراوجۆری و پلۆرالیزم لە نێوان کولتوور و فەرهەنگە جیاجیاکاندا. خاتوو "ماری" ـ هاوسەری کونسوولی بریتانیا لە ئیستانبوڵ ـ لە یادداشتەکانی خۆیدا نووسیویەتی: ژنە خۆجێیەکانی ئیستانبوڵ، ئازادییەکی زیاتریان هەبوو لە کاروباری خۆیاندا، بە بەراورد لەگەڵ ئێمەی ڕۆژئاوایی لە لەندەن؛ ئەوان بەهۆی پارچە قوماشێك کە سەری خۆیانی پێ دادەپۆشن، بەو پەڕی ئاسوودەیی و ڕاحەتییەوە لە شەقام و بازاڕەکان دەسووڕێنەوە، بێ ئەوەی هەست بە هیچ ئازار و مەترسییەك بکەن."[1]

"ئسپۆزیتۆ"ش لە توێژینەوە بەناوبانگەکەیدا "کێ لە لایەن ئیسلامەوە قسە دەکات؟" دەڵێت:

"دەرئەنجامەکانی توێژینەوەکەمان کە لە دوای شیکردنەوەی داتاکان پێی گەیشتین، هیچ لەگەڵ ئەو گریمانە پێشوەختە و بۆچوونەمان ناگونجێت، کە بەر لە توێژینەوە پێمان وابووە "حیجاب" نیشانەی پلەنزمیی ژنانی جیهانی ئیسلامە؛ چونکە ژنە موسڵمانەکانی نموونەی لێکۆڵینەوەکەمان لە (*130*) وڵات، نەبوونی پاکداوێنی و خۆنەپاراستن و

1 . Kandiyoti, D. (1991), "**Islam and Patriarchy: A Comparative Perspective**", in: Keddie, N. and Baron, B. (eds) (1991), "Women in Middle Eastern History: shifting Boundaries in Sex and Gender", New Haven and London: Yale University Press, p. 36.

خۆعەرزکردنی ژنە ڕۆژئاواییەکان بە نیشانەی داڕووخان و ئاستنزمیی ڕەوشی فەرهەنگیی ڕۆژئاوا دەزانن، کە دەیانگەڕاندەوە بۆ نەبوونی حیجاب و پێشکەشکردنی ئەندامەکانی جەستەی خۆیان بۆ پیاوە بیانییەکان، کە لە هیچ ڕوویەکەوە مافی دیتنی ئەم ئەندامانەیان نییە. لە هەردوو حاڵەتدا، گریمانەکەمان ئەوە بوو کە ژنان بۆ ڕازیکردنی پیاوان یان ملکەچی و ژێردەستی بەرامبەر بەوان خۆیان دادەپۆشن یان دادەپۆشن؛ بۆ نموونە: ڕێژەی زۆرینەی ژنانی مالیزیا ـ کە دەزگای گالۆپ چاوپێکەوتنیان لەگەڵ کردووە ـ گوتوویانە: "بۆ ژنە ڕۆژئاواییەکان خەم دەخۆن و بە جێگای داخی دەزانن؛ چونکە ئەوان ئەوەندە خۆیان خۆش ناوێت و گرنگی بە کەسایەتییەکەی خۆیان نادەن؛ ئەگینا چۆن خۆیان و جەستەیان بۆ دامرکانەوەی حەزە سێکسییەکانی پیاوان پێشکەش و تەسلیم دەکەن؟"[1]

لە شوێنێکی دیکەی هەمان توێژینەوەدا لە دوای شیکردنەوەی ئەو گریمانەیەدا: "ئایا ژنە موسڵمانەکان کە قۆناغی خوێندنی باڵایان بڕیوە و بە باشی شارەزای مافەکانیانن، مامەڵەیەکی دژ بە ئیسلامیان هەیە؟"، دەگاتە ئەو دەرئەنجامە:

"وەڵامی ئەو پرسیارە، بەپێی دەرئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکەمان بریتییە لە: هەرگیز!... یەکێك لە دەرئەنجامە یەکلاکەرەوەکان لە توێژینەوەی ئێمە لەسەر جیهانی ئیسلام، بریتییە لە: ئیمان و، پابەندی بە ئایینی ئیسلامەوە، بەتایبەتی "حیجاب"، گرنگییەکی زۆری هەیە بۆ وەڵامدەرەوەکان لە ژیانی تاکەکەسی و ژینگەی کۆمەڵایەتییاندا. ڕێژەی زۆرینەیان لە هەموو ئەو وڵاتانەدا کە گالۆپ هەڵیسەنگاندوون، گوتوویانە: "ئایین بەشی هەرە سەرەکی و گرنگە لە ژیانیان"... و "وابەستەبوون بە بەها مەعنەوی و ئەخلاقی و ڕەفتارە ئایینییەکان بۆ پێشکەوتنی ئەوان لە ژیاندا بە خاڵێکی زۆر گرنگ و هەستیار دەزانن". کاتێك کە پرسیاریان ئاراستە کراوە: "چ شتێك زیاتر لە هەموو شتەکانی دیکە لە کۆمەڵگای خۆتان بە باشتر دەزانن و شانازیی پێوە دەکەن؟"، زۆربەیان لە وەڵامدا گوتوویانە: "وابەستەیی باوەڕدارانە و ڕاستگۆیانە بە باوەڕ و یاسا شەرعییەکان و ڕێزگرتن لە ڕێنمایی و سیمبوڵە ئایینییەکان"... هەروەها ژنان زیاتر لە پیاوان گوتوویانە کە: ئیمان بە بنەماکانی ئیسلام، هەم لە لایەن خۆیانەوە، هەمیش وەك گەورەترین سەرمایەی کۆمەڵگا، بە گرنگترین شت دەزانن."[2]

"لەیلا ئەبولغود"* (Lila Abu-Lughod)یش ـ پرۆفیسۆری ئەنترۆپۆلۆژی و پسپۆری سوسیۆلۆژی لە بواری توێژینەوەی ژنان و جێندەر لە زانکۆی کولۆمبیای ئەمریکی ـ کە

1 . Esposito, "Who Speaks For Islam?: What a Billion Muslims Really Think", p. 110.

2 . Esposito, op.cit., pp. 112-113.

* باوکی بیرمەند و ئاکادیمیەکی فەڵەستینی ـ ئەمریکییە، بە ناوی "ئیبراهیم ئەبولغود" (مامۆستای زانستە سیاسییەکان و سەرۆکی بەشی زانستە سیاسییەکان لە زانکۆی نورپویسترن ) و دایکی کۆمەڵناسێکی ئەمریکییە، بە ناوی "جانیت لیپمان ". دوکتۆرای لە

داکۆکیکارێکی توندە لەسەر مافی ژنان و، لە ماوەی (20) ساڵی ڕابردوو لێکۆڵینەوەی زۆر لەسەر ژنانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی کردووە، لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە بۆچی ئەو سکاڵانامەی فێمێنیستەکانی ئەمریکی کە بە چاودێری و کۆششەکانی "لۆرا بۆش" ـ هاوسەری جۆرج بۆش ـ بۆ پاڵپشتیکردن و ڕزگاریی ژنانی ئەفغانی لە دەست تالیبانەوە ئیمزای نەکردووە، هۆکارەکەی بەم شێوەیە شەرح دەکات:

"من هەرگیز سکاڵانامەیەکم بۆ نەهاتووە لە لایەن ئەو گروپە لە ژنان بۆ داکۆکیکردن و پاڵپشتیی مافی ژنە فەڵەستینییەکان بۆ ڕزگاربوونیان لە بۆمبەکانی ئیسرائیل، یان ئەو ئازارانە و سووکایەتی و بێڕێزییانەی کە ڕۆژانە لە وێستگەکانی پشکنینی پۆلیسی پێیان دەکرێ. لەوانەیە هەندێ لەو ژنە فێمێنیستانە بۆ ڕزگاریی و ئازادیی ژنە ئەفریقییەکان لە خەتەنەکردن یان ژنە هیندییەکان لە قەرزەکانی تایبەت بە بڕی مارەییەکانیان زۆر سکاڵانامەیان ئیمزا کردبێ، بەڵام من وەکو ئەوان بیر ناکەمەوە".[1] هەروەها دەڵێت: "جۆرج بۆش و لۆرای هاوسەرەکەی "کولتوور" و "سیاسەت" تێکەڵ دەکەن و هەروەها "پەچە" (برقع/*Veil*) و "تالیبان"یش؛ بۆیەش ئەمریکییەکان وا دەزانن ژنی ئەفغانی لە دوای ڕووخانی حکومەتی تالیبان، یەکسەر حیجاب و پەچەی خۆیان فڕێ دەدەن. تەنانەت ژنە ئەمریکییە لیبراڵییەکان و فێمێنیستەکانیش گومانیان وابوو کە ژنە ئەفغانییەکان لەمەودوا "جینز" دەپۆشن و سینگیان ڕووت دەکەنەوە و فیستانی "شانیل" لەبەر دەکەن، کەچی مەسەلە بەو سادەییە نەبوو؛ چونکە کولتووری جلوبەرگ دەکەوێتە ژێر کاریگەریی هۆکارەکانی: "ئەخلاقی" (بنەما ئایینی و نائایینییەکان)، "مێژوویی" (کولتوور و داب‌ونەریتەکان)، "جوگرافی" (جۆری کەشوهەوا و پلەی گەرما و سەرما) و، لە هەمووی گرنگتر هۆکاری "ڕێزگرتن"ـە لە خودی خۆیان. سەرەڕای ئەوەی تەفسیری ڕێزگرتنیش لە کولتوورێك بۆ یەکێکی‌تر دەگۆڕێ... ژنان جۆرەها جلوبەرگی جیاجیا لەبەر دەکەن لە بەر دوو هۆکار: "بۆ ڕەحەتی" و "بۆ ڕێز و حورمەت"یان. ڕەحەتییش شتێکی ڕێژەییە؛ بۆ نموونە: ژنێکی ئەمریکی جلی قورس و گەرمی زستانی دەگۆڕێ بە هی سووك و فێنکی هاوینی لە هاویندا. ژنی ئەفغانیش جلی درێژی دەرەوەی ماڵ دەگۆڕێ بە جلی کورت و تەسك کاتێك کە دێتە ماڵەوە. ڕێز و حورمەتیش شتێکی ڕێژەییە؛ پەچە یان حیجاب یان لەچك بۆ ژنێکی ئەفغانی شتێکی پەسەند و مەقبووڵە کاتێك کە لە ماڵەکەی دەردەچێت.

---

زانکۆی هارڤاردی ئەمریکی وەرگرتووە (1984). شوو بە زانایەکی سیاسیی بریتانی کردووە بە ناوی "تیموتی میچل " کە مامۆستای زانستە سیاسییەکانە لە زانکۆی کولۆمبیا لە نیویۆرك.

1 . Abu-Lughod, Lila (2013), "Do Muslim Women Need Saving?", Harvard University Press, p. 41.

فیستانێکی درێژیش بۆ ژنێکی ئەمریکایی پەسەند و گونجاوە کاتێك کە دەچێتە ئۆپێراخانە، یان ئاهەنگی زەماوەندێك."[1]

سەبارەت بە پۆشاکی ئازادانەش لەسەر ئەم پرسیارە دەدوێت: "کام پۆشاکی ژنان ئازادانەیە؟ پۆشاکی ئەفغانی یان ئەمریکی؟"، دواتر بە پێشکەشکردنی کۆمەڵێك بەڵگە و داتایەوە دەسەلمێنێ کە "پەچە" لە دیدی ئەو ژنانەی کە دەیپۆشن و بەکاری دەهێنن، هەمان "ئازادی"یە؛ چونکە: یەکەم) دەبێتە هۆی پۆشتەکردنی ئەوان لە پیاوان بەپێی ویستی خۆیان و هەروەك خۆیان دەیانەوێ، نەك هەروەك پیاوان دەیانەوێ. دووەم) دەیانپارێزێت لە ئازاری پیاوان و چاوەکانیان، مادام کە ئەوان پێیان خۆش نییە سەیریان بکەن و ئازاریان بدەن. سێیەم) بەم شێوەیە دەتوانن لەگەڵ پیاوان تێکەڵ بن و بە شێوەیەکی تایبەت لە ناو بازاڕ و شوێنە گشتییەکاندا بە ئاسوودەیی بە پێیان بڕۆن و ئازادانە پیاسە بکەن و کاروباری خۆیان ڕاپەڕێنن. بەپێی تەفسیری ژنانی ئەفغانی بۆ پۆشاکەکەیان، بۆمان دەرکەوتووە کە پۆشاکی ژنە ئەفغانییەکان زۆر ئازادیبەخشترە لەهی ئەمریکییەکان. بەڵام ژنی ئەمریکی جلوبەرگی ئامادەکراو دەکڕێ و بۆیەش دەکەوێتە ژێر کاریگەریی تەفسیری خاوەن کۆمپانیاکانی مۆدەی جلوبەرگ و پۆشاکەکان، کە لێرەیە بابەتی "دیکتاتۆریی مۆدە" دێتە ئاراوە؛ چونکە ئەو کۆمپانیانەن* کە مۆدە و دەستووری هەر وەرزێك دەگۆڕن و دەیانەوێ ژنە ئەمریکییەکانیش لاسایيان بکەنەوە و لەو لاساییکردنەوەش تەنانەت ڕکابەرایەتی و پێشبڕکێ لەگەڵ یەکتر دەکەن و لە کۆتاییدا کەسێك لەوان دەباتەوە کە پارەیەکی زیاتری لە ئەوانەی دیکە هەبێت؛ بۆیە دەپرسم: کامیان باشترە؟ "دیکتاتۆریی مۆدە" یان "ئازادیی پەچە"؟ سەبارەت بە ڕێز و حورمەتیش، تەفسیری ژنی ئەمریکی و ژنی ئەفغانی بۆ ڕێزگرتنیش زۆر جیاوازە؛ بۆ نموونە: ژنی ئەمریکی کاتێك کە دەیەوێ بچێتە ناو کەنیسە پۆشاکێکی شیاو و بەحورمەت لەبەر دەکات، بەڵام کاریگەریی ئیسلام لەسەر پۆشاکی ژنان زۆر زیاترە لە مەسیحییەت؛ بۆیەش ژنی موسڵمان لەکاتی چوونە ناو مزگەوتێکەوە بەدوای پۆشاکێکی بەڕێز و شیاودا ناگەڕێت؛ چونکە هەمان پۆشاکی لە دەرەوەی مزگەوتیش لەبەرە. ئەبولغود دواتر هۆشداریی دەداتە هاوکارە فێمێنیستە لیبراڵییە ئەمریکییەکانی خۆی و دەڵێت:

"زۆر جەخت و داکۆکیمان کردە سەر ئازادیی ژنی ئەفغانی، کەچی تووشی دوو کێشە بووینەوە: یەکەم) بۆچی کە ئازادیشمان کردن، ئەوان هەر بەردەوامن بە پەچەوە و بە

1 . Ibid., p. 36.

* کە خاوەنەکانیان زۆربەیان پیاون!

توندی بەرگریی لێ دەکەن؟ دووەم) بۆچی ئێمە ئەسڵەن دەمانەوێ خەڵك ڕزگار بکەین؟ دواتر ڕوون دەکاتەوە کە سەرەڕای ئەوەندە ئازادی و پێشکەوتن و نوێبوونەوە، هەروەها ڕەخنەگرتن لە هەڵە و گەندەڵی و ستەم و چەوساندنەوە لە کولتوورەکانی دیکە، بەڵام هێشتا ئەمریکییەکان نازانن کە پێویستە ڕێز لە کولتوورەکانی غەیری خۆیان بگرن. پەندێکی ئەمریکی هەیە کە دەڵێت: "بژی و لە ئەوانیش بگەڕێ با بژین". پرسیار ئەوەیە: ئایا ژنی موسڵمان پێویستیی بە کەسێك هەیە کە ڕزگاری بکات؟ و لە چیش؟... ئەوەندە جەختکردنەوەی ئەمریکییەکان لە ڕزگارکردنی ژنی موسڵمان، نیشانەی خۆبەگەورەزانینە کە ڕیشەیەکی کۆنی هەیە و بۆیەش هیچ چارەیەك نییە کە بەرەنگاری ئەم خۆبەگەورەزانینەش بێتەوە... لێرە ئاماژە بە دوو خاڵ دەکەم: یەکەم) دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان زۆر دەوڵەتی ئیسلامییانی داگیر کرد و بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لە ژێر چەتری فەرمانڕوایی و قەڵەمڕەوی ئەواندا ماونەوە و لێ نەگەڕان لە ژێر هەژموونیان دەرچن، زۆر بە ئاسانی دەیانتوانی ئەوکاتە گەشە بە بواری ژنان بدەن، بۆ نموونە کردنەوەی قوتابخانەی تایبەت بە ژنان؛ کەواتە ڕۆژئاوا دەبێ بەرپرسیارییەتیی ئەو دواکەوتنەی ژنە موسڵمانەکان لە ئەستۆ بگرێ، کە ئێستا ڕەخنەی لێ دەگرێت. دووەم) لەجیاتی چارەسەری سەربازی، بۆچی پەنا نابەنە بەر چارەسەری مرۆیی؟ کەچی زۆر بە ئاسانی دەتوانن گرنگی بە بواری خوێندن و تەندروستیی ژنە موسڵمانەکان بدەن. بۆچی لەبری پشتگیری لە سەرۆك و فەرمانڕەوا زاڵم و ستەمکارەکان، دژیان ناوەستنەوە؟ بۆچی تەنها دەیانەوێ ژنان ڕزگار و ئازاد بکەن، بۆچی گشت موسڵمانان بە پیاوان و منداڵانەوە ڕزگار ناکەن؟"[1]

سەیر ئەوەیە فێمێنیست و ڕۆشنبیرانی کوردستان داوا لە ژنە کوردەکان دەکەن سەرپۆش و حیجابەکەیان لا ببەن، بۆ ئەوەی وەك ژنە ڕۆژئاواییەکانیان لێ بێ، بەڵام زۆر لە ژنە ڕۆژئاواییەکان جگە لەوانەی کە دەبنە موسڵمان و یەکسەر سەریان دادەپۆشن و حیجاب دەکەن، ژنە ڕۆشنبیر و چالاکڤانە مەدەنییەکانیشیان دەبینین، کە بۆ ژنە موسڵمانان پەیامی ئامۆژگارانە دەنێرن، بۆ ئەوەی هەرگیز وەك ئەوان نەکەونە ژێر باری کولتووری ڕووتاتی و سووکایەتی و خۆبەدەستەوەدانی پیاوە هەوەسبازەکان؛ ئەوەتا ژنە چالاکڤان و نووسەر و ژۆرنالیستێکی بەناوبانگی ئەمریکی بە ناوی "جۆوانا فرەنسیس" (Joanna Francis)، پاش ئەوەی سەردانی چەند وڵاتێکی ئیسلامی دەکات، نامەیەکی کراوە بۆ ژنە موسڵمانەکان دەنووسێ و بەم شێوەیە ئامۆژگارییان دەکات:

1 . Ibid., pp. 37-40.

"... دەیانبینم کە هەرچەندە سەری خۆیان داپۆشیوە، بەڵام هێشتا جوانییەکانیان دەدرەوشێتەوە. بەڵام ئەوە تەنها جوانیی دەرەکی و ڕواڵەتی نییە، بەڵکو کە دەیانبینم هەستێکی سەیر لە دەروونم دروست دەبێت... بەڕاستی ئیرەییان پێ دەبەم، بەڵام ناشتوانم شتێك بڵێم، تەنها دەستخۆشی لە هێز، جوانی، پاکی و زیاتر لە هەموو شتێك ڕەزامەندی و شادییەکەت دەکەم... چونکە تۆ هێشتان ژنی و سروشتی خۆتت نەگۆڕیوە، وەك داپیرمان لە ڕۆژئاوای دەیەی (*1960*)، تاکو بەهۆی دوژمنێکی هاوبەش بۆمەباران کراین! بەڵام ئێمە وەك ئێوە بە بۆمبی ڕاستەقینە بۆمەباران نەکراین، بەڵکو بە بۆمبی گەندەڵی و بەڕەڵایی و فێڵبازیی زیرەکانە لە ڕێگەی وەسوەسەوە بۆمەباران کراین... بە بۆمبی هالیوود... ئەوان دەیانەوێ لەدوای بۆمبەبارانی ڕاستەقینە، کە بە فڕۆکەکانیان ژێرخان و بونیادی وڵاتەکانتان دەڕووخێنن، بە شێوازی ئێمە بۆمبەبارانتان بکەن. نامەوێ ئەوەی بەسەر ئێمەیان هێناوە، بەسەر ئێوەش بێت... ئەوەی لە هالیوودەکەمان دەبینی، دڵنیابە کۆمەڵێك درۆ، چەواشەکاری، ساختەکاری و فێڵبازیی زیرەکانە و وەستاکارانەیە... داواتان لێ دەکەم کە مەهێڵن ژەهراوی بکرێن. ئەگەر ژەهری ئەوەتان خواردەوە، هیچ دژەژەهرێك نییە و هەرگیز وەکو جارانتان لێنایەنەوە... هەمیشەش پاراستن باشترە لە دەرمان... ئەوان هەوڵ دەدەن بە فیلم و ڕیکلامە وروووژێنەرەکانیان، بە درۆ، ئێمەی ژنە ئەمریکییەکان شاد و ڕازی پیشان بدەن، کە شانازی بە پۆشاکی ڕووتەوە دەکەن و بە نەبوونی خێزان و منداڵ خۆشحاڵ و ڕازین. دڵنیابە، ئێمە شاد نین. متمانەم پێ بکە! ملیۆنەها ژن لە ئێمە دەرمانی دژەخەمۆکی دەخۆن، لە کارەکانمان بێزارین و شەوان تا بەیانی، لەبەر ئەو پیاوانەی کە سەرەتا پێیان دەگوتین: خۆشمان دەوێن، بەڵام بە چڵێسی و چاوبرسییانە ئیستغلالی کردین و بەجێیان هێشتین، دەگریێین... ئەوان دەیانەوێ خانەوادەتان لەناو ببەن، ڕازیتان بکەن کە منداڵی کەمترتان هەبێت، هاوسەرگیریتان بە کۆیلایەتی، دایکایەتیتان بە شتێکی قێزەوەن و نەفامی، پاك و حەیاتان بە پاشکۆیی و دواکەوتن و گێلی دەربخەن. ئەوان دەیانەوێ خودی خۆت، بە دەستی خۆت سووك بکەیت، بەڵام فریو مەخۆ! تۆ زۆر بەڕێزیت، ڕێزی خۆت بگرە: "من، تۆ وەك گەوهەرێکی گرانبەها، زێڕێکی نایاب، مرواریيەکی بەنرخ دەبینم" (ئینجیلی مەتا؛ دەروازەی *13*؛ ئایەتی *45*). هەموو ژنان مرواریيەکی گرانبەهان، بەڵام ئەوە ئێمەین کە خۆمان بێنرخ دەکەین. عیسا دەیفەرموو: "ئەوەی پاك و پیرۆزە، بە سەگانی مەدەن و مرواریيەکانی خۆتان مەخەنە بەردەستی بەرازە دڕندەکان، نەوەك لە دوای پیسکردن و لەژێرپێنانی، حەتمەن دەگەڕێنەوە و لە پشتەوەشڕا دەتاندڕن" (ئینجیلی مەتا؛ دەروازەی *7*؛ ئایەتی *6*)... ئەو مۆدانەی کە لە ژێر دەستی خەیاتە ڕۆژئاواییەکان دەردەچن، بۆ ئەوە دیزاین دەکرێن کە بە تۆ بقبووڵێنن کە بەنرخترین سەرمایەی تۆ، جوانییە سەرنجڕاکێشەکانی جەستەی تۆن، بەڵام حیجابی تۆ لە ڕاستیدا زۆر جوانترە لە هەر مۆدەیەکی ڕۆژئاوایی؛ چونکە زۆر بە جوانی دەتپۆشێنێ و ڕێز و کەرامەت و متمانەبەخۆبوونت پێ دەبەخشێت. جوانییەکانی جەستەی ژن پێویستە لە چاوە ناشیاوەکان داپۆشرێ، هەڵبەت ئەمە دەبێ لە لایەن تۆوە

دیارییەك بێ، تەنها بۆ ئەو پیاوەی کە تۆی خۆش دەوێت و ڕێزت لێ دەگرێت و پەیمانی هاوسەرگیریت لەگەڵ دەبەستێت و، لەبەر ئەوەی پیاوەکانتان ـ هەروەك بینیم ـ زۆر مەرد و بەغیرەتن، مافی ئەوانە کە ئەم دیارییەی پێ بەخشی. پیاوانی ئێمە چیتر گرنگی بە داوێنپاکی نادەن، ئەوان پشت لە مرواریيە گرانبەهاکە دەکەن و ڕوو لە بەردێکی دەستکردی سەرنجڕاکێش دەکەن، کە دوای ئیستغلالکردنی، پشت لەوەش دەکەن. سەرەکیترین سەرمایەی تۆ، جوانییە دەروونییەکانتە، نەجابەت و پاکیتە، هەروەها ئەو شتەیە کە تۆی کردووەتە تۆ، بەڵام لەکاتی ئەم سەردانم ـ بەداخەوە ـ هەندێ ژنی موسڵمانم بینی کە وەکو ئێمەی ڕۆژئاوایی پۆشاك دەپۆشن و حیجاب ناکەن و بە ئارایشتێکی زەق خۆیان عەزر دەکەن. بۆچی چاو لە ژنانێك دەکەن کە لەبەر پاکیی لەدەستچووی خۆیان پەشیمانن، یان بەم زووانە پەشیمان دەبنەوە؟... ئەگەر دەتەوێ ڕاستییەکە بزانی، پەیوەندیی ناشەرعیی بەر لە هاوسەرینی هیچ باش نییە. ئێمە جەستەمان خستە بەر دەستی پیاوانێك کە خۆشمان دەویستن و عاشقیان بووین، وامان دەزانی ئەمە ڕێگایەکی باشە تاکو ئەوانیش خۆشیان بوێین و ببنە عاشقمان و دواتر بە هاوسەر قبووڵمان بکەن، وەك ئەوەی کە بەردەوام لە تەلەڤزیۆنەکانمان دەبینی... بەڵام پەشیمان دەبیەوە، تۆ دەمێنی و فرمێسکەکانت! من وەك ژنێك کە قسە لەگەڵ ژنێکی دیکە دەکات، دەزانم کە تۆ باش لە من تێدەگەی؛ چونکە سەرەڕای جیاوازیی نەژادی، ئایینی، نەتەوەیی و کولتووریی نێومان، بەڵام دڵی هەموو ژنێك لە هەر شوێنێك یان کاتێك بێ، وەك یەکە. ئێمەی ژنان بە باشی دەتوانین عەشقی خۆمان دەرببڕین و خێزانەکانمان پەروەردە بکەین و، بە پیاوێك کە خۆشمان دەوێت، ئارامی دڵنەوایی و هێزی پێ بەخشین، بەڵام ئێمەی ژنی ئەمریکی هەڵفریودراوین و وادەزانین خۆشبەختین؛ چونکە کار و پیشەمان هەیە، خانووی تایبەتمان هەیە و دەتوانین تێیدا بە ئازادی و سەربەستی بژین و عەشقی خۆمان پێشکەشی هەر کەسێك بکەین کە بمانەوێ، کەچی نە ئەمە ئازادییە، نە ئەوەش عەشق و خۆشەویستییە. تەنها لە پەناگای پڕ لە ئاسوودەیی هاوسەرگیرییە کە جەستە و دڵی ژن هەست بە ئاسایش و حەسانەوە دەکات؛ بۆیە بە شتێك کەمتر لەوە ڕازی مەبە. ئەگەر وات نەکرد، نە تەنها عەشقەکەت دەبێتە ڕق و کینە، بەڵکو ڕقت لە خۆشت دەبێتەوە... ئێمەی ژنی ڕۆژئاوایی مێشکمان شوشتراوەتەوە کە وا دەزانین ئێوەی ژنە موسڵمانەکان دەچەوسێنەوە، بەڵام ڕاستییەکە ئەوەیە کە ئەوە ئێمەین کە دەچەوسێینەوە. بووینەتە کۆیلەی ئەو مۆدانەی کە سووکمان دەکەن. سەبارەت بە کێش و باڵابەرزی و ئەندامەکانی جەستەمان تووشی وەسواس و گرێی دەروونی بووینەتەوە و، بەردەوام بەدوای خۆشویستنی پیاوانێکدا وێڵین، کە نابەرپرس و نامەردن... لە ناخی خۆماندا هەست دەکەین کە فریو دراوین. ئێمە لە پشت پەردەوە دەستخۆشیت لێ دەکەین و ئیرەییت پێ دەبەین، هەرچەندە کە زۆر کەس لە ئێمە ئامادە نین دان بەوەدا بنێین. تکاتان لێ دەکەم بە چاوێکی کەم سەیرمان نەکەن، وا مەزانن کە ئێمە ئەو ڕەوشەمان پێ خۆشە و هەڵبژاردەی ئێمەیە، بەڵکو ئەوە هەڵە و تاوانی ئێمە نییە.

زۆربەمان خاوەن باوکێکی بەرپرسیار نەبووینە تاکو بەخێومان بکات و پشتمان بێت، بەڵکو دایکانی ئێمەیان بەجێ هێشتووە و خێزانێکی بێباوك یان بێدایکمان هەبووە. خوشکانی من! فریو مەخۆن! مەهێڵن ئێوەش تووش بکەن. پاك و نەجیب و پۆشتە بمێننەوە. ئێمەی ژنە مەسیحی بە ڕاستی پێویستیمان پێتانە، تاکو بتانکەینە نموونە و سەرمەشقی خۆمان. ئێمە ون و بزر بووینە و خۆمان ناناسینەوە. پاکییەکەت بپارێزە و لە بیریش مەکە کە ئاوی ڕژاو، خڕ ناکرێتەوە... هیوادارم ئەم ئامۆژگارییەم هەر بەو نیاز و گیانەوە وەربگری کە ئاراستەت کراوە: ڕۆحییەتی خۆشەویستی، ڕێز و پێزانین و دەستخۆشی".[1]

1 . Francis, Joanna (March 7, 2007), "A letter from a Christian to Muslim women", From: https://www.youtube.com/watch?v=tG6xu9ne9Jk

## 3- ژنانی کوردستان، تا چەند ڕۆشنبیرە فێمێنیستەکان بە نوێنەری خۆیان دەزانن؟

فێمێنیستانی کوردستان، بە هەموو ڕوانگەکانیانەوە، چ ئەوانەی لە دەرەوەی کوردستاندا دەژین، چ ئەوانەی لێرە نیشتەجێن، چ ئەوانەی وەك کەسایەتییەکی سەربەخۆ چالاکی دەکەن، چ ئەوانەش کە لە میانەی ئەندامێتی لە یەکێك لە سەنتەر و ڕێکخراو و کۆمەڵەکانی تایبەت بە مافی ژنانەوە چالاکی دەکەن، زۆر هەڵەن ئەگەر خۆیان بە نوێنەر و چاوساغی ژنانی کوردستان بزانن. ڕەنگە ژمارەی ئەو سەنتەر و ڕێکخراوانە لە خودی فێمێنیستە پێشڕەوەکانی کوردستانیش زیاتر بێت: "ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان؛ دەزگای یەکسانیی ڕەگەزی و کارامەکردنی ژنان" (UN WOMEN)*، ڕێبەرێکی خزمەتگوزاری، دەروونی، کۆمەڵایەتی و یاسایی بۆ ژنانی کوردستان بڵاو دەکاتەوە، کە تێیدا پێناسەی تێکڕای سەنتەر و ڕێکخراو و کۆمەڵەی ژنان دەکات ـ حیزبی یان کۆمەڵگای مەدەنی ـ کە ژمارەیان هەتاساڵی (2013) دەگەیشتە (81) ڕێکخراو: هەولێر (41)، سلێمانی (35)، دهۆك (10).[1] ژمارەی ئەم ڕێکخراوانە لە ساڵی (2014)دا بەپێی ئاماری هەندێ سەرچاوەی باوەڕپێکراو زیاتر بووە و، گەیشتووەتە (92) دامەزراوە.[2]

چەندین ڕاپرسی و توێژینەوەی زانستی لە لایەن ناوەندە جیاجیاکانەوە سەبارەت بە ڕازیبوونی ژنانی کوردستان لەو فێمێنیستە کوردانە و سەنتەرەکانی تایبەت بە کاروباری ژنانەوە ئەنجام دراوە، کە هەموویان ئەم ڕاستییەمان بۆ دەردەخەن کە ئەم تاقمە ڕۆشنبیرە فێمێنیستانە ناتوانن خۆیان بە نوێنەری ڕاستەقینەی ژنانی کوردستان بزانن:

ڕاپرسییەکی زۆر بەرفراوان لەسەر داوای "ئەنجوومەنی باڵای کاروباری خانمانی حکومەتی هەرێمی کوردستان"، لە لایەن "کۆمپانیای بارومەتر بۆ ڕاپرسی و توێژینەوە" بە ناونیشانی

---

* United Nations Entity for Gender Equality and the Empowerment of Women (UN Women)

1 . UN WOMEN (2013)؛ "ڕێبەری خزمەتگوزاریی دەروونی و کۆمەڵایەتی و یاسایی"؛ چاپی یەکەم؛ ل 3-95.

2 . کەناڵی ئاسمانیی ڕووداو؛ "بەرنامەی لەگەڵ ڕەنج" (2014/11/29)؛ تەوەری بەرنامە: "پرسی ژنان و ڕۆڵی ڕێکخراوەکان"؛ بە ئامادەبوونی سێ ژنی فێمێنیست و چالاکڤانی مافی ژنان: (هەڵاڵە رافع، ڤیان سلێمان، تێڤار ئیبراهیم) و توێژەری کۆمەڵایەتی (فازڵ عومەر)؛ بڕوانە:

http://rudaw.net/sorani/onair/tv/episodes/episode/lagal_ranj_29112014muh

"ڕاپرسی لەبارەی ئەنجوومەنی باڵای خانمان" لە ساڵی (2012)دا لە هەر سێ پارێزگای هەرێمی کوردستان ئەنجام دراوە، کە دەرئەنجامەکانی بریتی بووە: تەنها (16%)ی ژنانی هەرێمی کوردستان ئاگاداری بوونی ئەم ئەنجوومەنەن، کە ڕەسمیترین و بەناوبانگترین دامەزراوەی تایبەت بە ژنانە، کەچی (69%)یان ئاگاداری نین و (15%)یش گوتوویانە: کەمێك ئاگادارین. هەروەها تەنها (16%) گوتوویانە کە ئاگاداری کار و چالاکیی ئەنجوومەنەکەین، ڕێژەی (76%)یش گوتوویانە: ئامادە نین بەشداری لە کار و چالاکییەکانی ئەم ئەنجوومەنەدا بکەین. لە وەڵامی ئەو پرسیارەش کە (پێت وایە ئەو کار و چالاکییانە لە بەرژەوەندیی ژنان و ئافرەتانی کوردستان دان؟)، ڕێژەی (59%)ی ژنان بە سلبی (نەرێنی) وەڵامیان داوەتەوە!

تایبەتمەندییەکانی ئەم ڕاپرسییە بریتی بووە لە:

- ئەم ڕاپرسییە لە نێوان (1,000) ژندا کراوە (هەولێر: 43%، سلێمانی: 39% و دهوك: 18%). ئەمەش بە نموونەیەکی گونجاو دادەنرێت، بەوەی ئەگەری هەڵەی نموونەوەرگرتن دەکاتە (3.5%).
- نموونەکە لە سێ ناوەندی جیاوازدا وەرگیراون، لە گەڕەکە جیاوازەکان، شوێنە گشتییەکانی وەك: بازاڕ و مۆڵەکان، هەروەها فەرمانگەکانی حکومەت.
- لە ڕووی تەمەنەوە: ڕێژەی (79%)ی نموونەکە پێك هاتووە لە ژنان و کچانی تەمەن (16-35) ساڵ، ڕێژەی (14%)یش لە تەمەنی (36-45) ساڵەدان، (5%)یش تەمەنی (46-55) ساڵ و (2%)یش تەمەنی (56) ساڵ و سەرووتر پێك دەهێنن.
- لە ڕووی ئاستی خوێندەواری: تەنها (11%)یان نەخوێندەوار و (89%)یش خوێندەوار بوونە، کە (37%)ی ژنە خوێندەوارەکان، دەرچووی پەیمانگا و زانکۆ و خوێندنی باڵان.
- لە ڕووی باری ئابووریشەوە: (79%) باش، (11%) زۆر باش و، (10%)یش خراپ.[1]

سەنتەری "WVS"• (ڕووپێوی بەها جیهانییەکان) ـ ڕێکخراوێکی جیهانیی سەربەخۆیە ـ ساڵانە توێژینەوەیەکی زۆر ورد و بەرفراوان لەسەر دانیشتووانی هەموو وڵاتانی دونیا ئەنجام

1 . کۆمپانیای بارومەتر بۆ ڕاپرسی و توێژینەوە (2012)؛ "ڕاپرسی لەبارەی ئەنجومەنی باڵای خانمان"؛ لە ژێر سەرپەرشتی د. موراد حەکیم ئەنجام دراوە؛ ل 1-13.

دەدات، کە بۆ یەکەمجار لە ساڵی (2004) توێژینەوەیەکی بەرفراوان، لە وڵاتی عێراق و هەرێمی کوردستانیش ئەنجام دەدات. نموونەی وەرگیراو لەو ڕاپرسییە (2325) کەس بووە[1] و، دواجار لە هەرێمی کوردستان (هەولێر و سلێمانی) لە ساڵی (2013)ش توێژینەوەکەی لەسەر (1200) کەس دووبارە دەکاتەوە. بەشێکی گەورەی ئەم توێژینەوەیە (کە خۆی لە 257 پرسیاری سەرەکی پێك هاتووە و هەر پرسیارێکیش پرسیارگەلێکی لاوەکیش دەگرێتەخۆ)، تایبەتە بە پرسی ژنانەوە، کە دەرئەنجامەکانی جێگای سەرنجدان و وردبوونەوەن، بەتایبەتی بۆ فێمێنیستە کوردەکان و سەنتەرەکانی تایبەت بە ژنان. لە کۆی گشتیی نموونەکە، (571) کەسیان ژن بووە، کە دەکاتە ڕێژەی (47.5%) و، تایبەتمەندییەکانی ژنانی وەرگیراو لەو ڕاپرسییەدا بەم شێوەیە بووە:

- <u>تەمەن</u>: ڕێژەی (41.1%)ی ژنان تەمەنی (29-18) ساڵ پێکدێنن. ڕێژەی (44.8%)یش تەمەنی (49-30) ساڵ و، ڕێژەی (14.1%)یش تەمەنی (50-سەرووتر)؛ کەواتە زۆربەیان کچی گەنج و ژنی پێگەیشتوون.
- <u>کار و پیشە</u>: ڕێژەی (7.47%)یان قوتابین، بێکار (1.86%)، ژنی ماڵەوە (75.7%)، ژنی کارکەریش (14.97%).
- <u>خوێندەواری</u>: سەرەتایی (44.36%)، ناوەندی (11.21)، پەیمانگا (24.29%) و خوێندنی باڵا (20.56%).
- <u>چینی کۆمەڵایەتی</u>: چینی سەروو (66.36%)، چینی ناوەند (27.1%) و چینی خوارووش (%6.54).

لێرە وەڵامەکانی ئەم ژنە کوردانە بۆ هەندێ پرسیار و گۆڕاوی تایبەت بە ژنانەوە دەکەین، کە لە دەرئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیەدا خراوەنەتەڕوو:

* ڕووپێوی بەها جیهانییەکان (World Values Curvey): تۆڕێکی جیهانی و نێودەوڵەتییە لە زانایانی بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکان، کە ساڵانە لێکۆڵینەوە لەسەر گۆڕانی بەهاکان و کاریگەرییان لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی خەڵك، لە هەموو وڵاتێکی دونیادا دەکەن، بە سەرپەرشتیی تیمێکی نێودەوڵەتیی توێژەران، کە سەر بە ئەنجومەنی (WVS)ن و، نووسینگەی سەرەکیی لە شاری ستۆکهۆڵمی سویدە؛ بڕوانە:

www.worldvaluessurvey.org

1 . د. موراد حکیم (2011)؛ **"ڕەوشی بەهاکان لە عێراق لە ژێر ڕۆشنایی تیۆریی ڕۆناڵد ئنگهارت"**؛ هەولێر: زانکۆی سەلاحەددین/تێزی دوکتۆرا؛ ل 1-4.

- سەبارەت بە "خێزان": (پێکهێنانی خێزان زۆر گرنگە): [زۆر گرنگە: (100%)]، [تا ڕادەیەك گرنگە: سفر]، [گرنگ نییە: سفر]. کەواتە هەموو ژنانی کوردستان کۆکن لەسەر گرنگیی خێزان و مێردکردنی ژنان. هەروەها: (مێردکردن بە دڵی دایك و باوك بێ، یان بە خۆشەویستیی): [بە دڵی دایك و باوك: (54.16%)]، [بە خۆشەویستیی: (45.84%)].
- سەبارەت بە "دایکایەتی": (ژن پێویستە دایکێکی باش بێت): [زۆر گرنگە: (97.4%)]، [تا ڕادەیەك گرنگە: (2.60%)]، [گرنگ نییە: سفر]. کەواتە ژنانی کوردستان ڕۆڵی دایکایەتی بۆ ژن بە بەهایەکی بەرز دەنرخێنن.
- سەبارەت بە "هاوسەرێتی": (پێویستە ژن هاوسەرێکی باش بێت): [زۆر گرنگە: (97.4%)]، [تا ڕادەیەك گرنگە: (2.08%)]، [گرنگ نییە: (0.52%)]. کەواتە بەپێچەوانەی بۆچوونی فێمێنیستان، ژنە کوردەکان هاوسەرێتی بە شتێکی پێویست و پڕبەها دەزانن.
- سەبارەت بە پەیوەندیی "ژن و مێرد": (پێویستە ژن گوێڕایەڵی مێردی بێت): [زۆر گرنگە: (68.75%)]، [تا ڕادەیەك گرنگە: (19.27%)]، [گرنگ نییە: (11.98%)]. کەواتە زۆربەی هەرە زۆری ژنانی کوردستان تایبەتمەندیی گوێڕایەڵیی بۆ ژنان بەرامبەر بە شووەکانیان بە بەهایەکی گرنگ و پێویست دەزانن. هەروەها: (پێویستە ژن و مێرد هاوکاری یەکتر بن، نەك ڕکابەر): [لەگەڵیدام: (83.85%)]، [لەگەڵیدا نیم: (16.15%)]. هەروەها: (لێدانی پیاو لە ژنەکەی): [هەرگیز ڕەوا نییە: (81.22%)]، [تەنها لە کاتێ پێویست: (18.69%)]، [هەمیشە ڕەوایە: (0.09%)]. لێرەش ئەنجامەکان دژی خواستی فێمێنیستان دەردەچێت.
- سەبارەت بە "پەیوەندیی سێکسیی بەر لە هاوسەرێتی": (پەیوەندیی سێکسیی پێش هاوسەرێتی شتێکی پەسەندە): [هەرگیز ڕەوا نییە: (100%)]، [تەنها لە کاتێ پێویست: سفر]، [هەمیشە ڕەوایە: سفر]. کەواتە ژنانی کوردستان بەتێکڕایی لەگەڵ ئازادی لە پەیوەندیی سێکسیی ژنان کۆك نین.
- سەبارەت بە "منداڵداری": (ژن بۆ ئەوەی سەرکەوتوو بێ، پێویستە منداڵی هەبێت): [لەگەڵیدام: (86.98%)]، [لەگەڵیدا نیم: (13.02%)].

- سەبارەت بە "لەبار بردنی منداڵ": (لەناوبردنی کۆرپەلە ڕەوایە): [هەرگیز ڕەوا نییە: (71.02%)]، [تەنها لە کاتێ پێویست: (25.23%)] ، [هەمیشە رەوایە: سفر]. کەواتە ژنانی کوردستان لەگەڵ بۆچوونی فێمێنیستان لەو بارەیەشەوە کۆك نین.
- سەبارەت بە "تەڵاق": (تەڵاق بۆ ژن): [هەرگیز ڕەوا نییە: (49.53%)]، [تەنها لە کاتێ پێویست: (50.47%)] ، [هەمیشە رەوایە: سفر]. ئەم ئامارەش بە ڕوونی دژی بۆچوونی فێمێنیستان دەوەستێت.
- سەبارەت بە "کار و پیشەی ژن": (ژنی ماڵەوە سەرکەوتووە):[لەگەڵیدام: (85.6%)]، [لەگەڵیدا نیم: (14.4%)]. هەروەها: (کاری ژن لە دەرەوەی ماڵ و بەجێ هێشتنی منداڵان، کاریگەریی خراپ دەخاتە سەریان): [لەگەڵیدام: (68.22%)]، [لەگەڵیدا نیم: (31.78%)]. هەروەها: (ڕەزامەندیی ژن وەك کابانی ماڵ باشترە لەوەی کە لە دەرەوەی ماڵ، بەرامبەر بە کارێك مووچەیەك وەربگرێ): [لەگەڵیدام: (30.8%)]، [لەگەڵیدا نیم: (69.2%)]. هەروەها: (ئەگەر دەرفەتی کار کەم بێت، پێویستە پیاو مافی زیاتری هەبێت بۆ کار، نەك ژن): [لەگەڵیدام: (78.5%)]، [لەگەڵیدا نیم: (21.5%)]. هەروەها: (هەبوونی کار بۆ ژن، باشترین ڕێگایە بۆ سەربەخۆیی ژن لە پیاوان): [لەگەڵیدام: (11.21%)]، [لەگەڵیدا نیم: (88.79%)]. کەواتە زۆرینەی ژنە کوردەکان حەزیان لە کاری ماڵەوە و خزمەتکردنی منداڵانیانە و، ماڵدارییان پێ باشترە لە کاری دەرەوەی ماڵ، ئەگەرچی مووچەیەکی باشیشیان هەبێت.
- سەبارەت بە "ئایین": (گرنگیی ئایین لە ژیاندا): [زۆر گرنگە: (92.52%)]، [تا ڕادەیەك گرنگە: (6.54%)]، [گرنگ نییە: (0.94%)]. هەروەها: (بۆ ئەوەی ژن لە ژیانیدا سەرکەوتوو بێ، پێویستە بە ئایینەوە پابەند بێت): [لەگەڵیدام: (82.24%)]، [لەگەڵیدا نیم: (17.76%)]. هەروەها: (ئەگەر لە نێوان "ئایین" و "زانست" ناکۆکی هەبێت، هەمیشە ئایین ڕاستتر و دروستترە؟): [لەگەڵیدام: (81.31%)]، [لەگەڵیدا نیم: (18.69%)]. هەروەها: (دەستێوەردانی سیستمی ئایین لە یاساکان): [لە هەموو یاساکان: (81%)]، [لە هەندێ یاسا: (18.07%)]، [لە هیچ یاسایەك: (0.93%)].

- سەبارەت بە "فرەژنی": (ڕەوایە پیاو لە یەك ژن زیاتری هەبێت): [هەرگیز ڕەوا نییە: (%42.18)]، [تەنها لە کاتێ پێویست: (%40.12)]، [هەمیشە ڕەوایە: (%17.7)]. کەواتە ڕێژەیەکی بەرچاوی ژنان واتە (%57.82) فرەژنی بە شتێکی ڕەوا دەبینن.
- سەبارەت بە "حیجاب و باڵاپۆشی": (باڵاپۆشی بەهای ژن بەرز دەکاتەوە): [لەگەڵیدام: (%91.4)]، [لەگەڵیدا نیم: (%8.6)]. کەواتە ژنانی کوردستان بەپێچەوانەوەی دروشمی فێمێنیستان، حیجاب و لەچك بە کۆت و بەند نازانن.
- سەبارەت بە "بەساڵاچووان": (ڕێزگرتن لە پیرەژن وەکو دایك و خەسوو و، پیرەمێرد وەکو باوك و خەزووری بە تەمەنی (60) ساڵ بۆ سەرەوە واجبە) و (بەساڵاچووان خۆشەویست و دڵسۆزمانن): [ڕێزگرتنیان واجبە: (%98.9)]، [خۆشەویست و دڵسۆزمانن: (%86.1)].
- سەبارەت بە "جۆری دراوسێ": (ئامادە نیم کەسێکی هاوڕەگەزباز/لێزبیەن ببێتە دراوسێم): [هەرگیز: (%68.22)]، [زۆر گرنگ نییە بۆم: (%31.78)]. هەروەها: (ئامادە نیم کەسێکی مەیخۆر ببێتە دراوسێم): [هەرگیز: (%75.7)]، [زۆر گرنگ نییە بۆم: (%24.3)]. هەروەها: (ئامادە نیم دوو کەس پێکەوە (بۆیفرێند و گێرلفرێندێك) بێ ئەوەی زەماوەندیان کردبێت، ببنە دراوسێم): [هەرگیز: (%66.35)]، [زۆر گرنگ نییە بۆم: (%33.65)].
- سەبارەت بە "ڕێکخراوەکانی تایبەت بە ژنان": (تا چەند متمانەت هەیە بە ڕێکخراوەکانی چالاك لە بواری ژنان): [هیچ: (%51.41)]، [کەم: (%38.31)]، [زۆر: (%10.28)].[1]

ئایا ئەم ئامارانە نیشانەی شکستی پەیامی فێمێنیستان لە کوردستاندا نییە؟ ئەگەر ژنانی کوردستان، ئەم فێمێنیست و چالاکڤانانەی بواری ژنان، هەروەها سەنتەر و ڕێکخراوەکانیان بە نوێنەری خۆیان بزانییایە، بۆچی نە وەکو ئەوان بیردەکەنەوە، نە وەکو ئەوان ڕەفتار دەکەن و، نە وەکو ئەوانیش هەڵوێستیان هەیە بەرامبەر ئەو هەموو توخمانەی کە فێمێنیستان بە کۆت و بەند و قەفەسی دژ بە ژنان دەزانن؛ هەروەك بینیمان "ئایین" گرنگترین شتە لە ژیانی زۆربەی هەرە زۆری ژنان و، بەشی زۆرینەشیان پێیان وایە کە پێویستە ژن ئیندار بێت و بە ئایینەوە پابەند

1 . WVS (7/11/2014), "Online Analysis: Wave 4 (2000-2004), iraq 2004 & wave 6 (2010-2014), Iraq 2013", From: http://www.worldvaluessurvey.org/WVSOnline.jsp

بێت. هەروەها پابەندی بە "کولتوور و داب‌ونەریت"ی وەك: "دایکایەتی"، "منداڵداری"، "هاوسەرێتی"، "گوێڕایەڵی لە شوو"، "ڕێزگرتن لە پیرەژن و پیرەمێرد و بەخێوکردنیان"، "بەنرخزانینی خێزان" و "ژنی ماڵ و کابانی"، زۆرینەی هەرە زۆری ڕێژەکان بەگرنگ دەزانن. ئەمە بە ڕوونی شکستی دروشمەکانی فێمێنیستامان بۆ دەردەخات. ئامارە ڕەسمییەکانی هەرێمی کوردستانیش، بە ڕوونی دەردەخەن کە ژمارەی "هاوسەرگیری" و پێکهێنانی خێزان زۆر بەرزترە لە "تەڵاق"؛ بۆ نموونە: لە ساڵی (2013)دا، ژمارەی (52،749) هاوسەرگیری و (6،417) تەڵاق تۆمار کراوە کە ڕێژەکەیان بریتی دەبێ بە: (89.15%) بەرامبەر بە (10.85%)، کەچی یەکێك لە دروشمەکانی فێمێنیزم و تەنانەت نیشانەکانی فێمێنیستبوون، بەرزبوونەوەی ڕێژەی تەڵاق و کەمکردنەوەی ڕێژەی زەماوەندەکانە؛ هەروەك پێشەنگی ئەم فێمێنیستانە "د. نەوال سەعداوی" لە دیدارێکی ڕۆژنامەوانیدا لەگەڵ کۆمەڵێك فێمێنیست و چالاکڤانی بواری ژنان، کە لە ڕێکەوتی (2014/11/28) لە شاری هەولێر ئەنجامدرا، بە ڕاشکاوی سیستمی "هاوسەرێتی" بە کۆیلایەتی و فرۆشتنی جەستە دەزانێت و هیچ جیاوازییەکی نێوان "هاوسەرگیری" و "لەشفرۆشی" نابینێ و، دەڵێ:

"ئەو ژنەی کە جەستەی خۆی بۆ لەشفرۆشی دەفرۆشێت، هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ئەو ژنەی کە جەستەکەی دەفرۆشێت بۆ هاوسەرێتی"... [ئینجا بە شانازییەوە ئەزموونی خۆی بۆ بەشداربووان دەگێڕێتەوە و دەڵێ:] "من سێ پیاوم تەڵاق داوە و، چوارەمیش بەڕێوەیە!"[1]

یان لە هۆڵی ڕۆشنبیریی سلێمانی، لە دەستپێکی قسەکانیدا، بە چەپڵەلێدانێکی زۆر پێشوازیی لە قسەکانی دەکرێت، کە لە سەرەتای وتاریدا "حیجاب" و باڵاپۆشیی ژنان بە کۆیلەیی و کۆت و بەند دەزانێ.[2] لە حاڵێکدا هەروەك بینیمان ئاماری ئەو ژنانەی کە لە هەرێمی کوردستان، هاوسەرگیری، ماڵداری، منداڵداری، دایکایەتی، دینداری، داوێنپاکی و باڵاپۆشی بۆ ژنان بە شتێکی پێویست و پەسەندی دەزانن، لەگەڵ چاوەڕوانییەکانی نەوال سەعداوی و فێمێنیستە کوردەکان

---

1 . حنان زبيس (مراسلة موقع "حقائق أونلاين" فى أربيل) (2014/11/29): **"نوال السعداوي: نساء تونس قدمن مثالا تحرريا للعرب"** من الموقع:

http://www.hakaekonline.com/?p=67837

2 . بەهرۆز فرەیدوون (پەیامنێری پۆرتاڵی ڕووداو) (2014/11/28): **"نەوال سەعداوی باسی پرسی ژنانی کورد دەکات"؛ لە ماڵپەڕی:**
http://rudaw.net/sorani/kurdistan/281120141

زۆر ناکۆکە، کە زۆربەیان لاسای نموونەی وەك سەعداوی دەکەنەوە. بەپێی ئامار و ڕاپۆرتی وەزارەتی پلاندانانی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا، پێشبینی دەکرێت، کە ڕێژەی پیتاندن لە کوردستان (3.1%)ـە؛ واتە هەر ژنێك بەدرێژایی تەمەنی لە کوردستان، بە تێکڕایی دەبێتە خاوەن (3.1) منداڵ.[1]

جگە لەمە، ئەو هەموو یاسا ڕەسمییانەی تایبەت بە ژنان، کە لە پەرلەمانی کوردستان دەردەچن (وەك یاسای فرەژنی)، جگە لە خودی ئەو فێمێنیستانە، ئەمجۆرە یاسایانە بە دژی ژنان نازانن و، جگە لەوانیش بۆ دەربڕینی نەڕەزایەتییان هیچ کەسێکی دیکە نارژێتە سەر شەقام و بەڵکو بێدەنگ دەبن و ڕێگە دەدەن کە زۆر بە ئاسایی و ئاسانی لە ناو کۆمەڵگادا بچەسپن؟[2] چ جای ئەو هەموو ڕەفتارانەی کە لە لایەن ژنە کوردەکانەوە ئەنجام دەدرێت، کە سەداسەد جیاوازە لەگەڵ بۆچوون و خواست و ویستی ئەو فێمێنیستانە؛ وەکو: بەسەر هەوێ چوون! ئەی ئەو هەموو ژنانەی کە ئامادەن ببنە هەوێی یەکتری (چ ژنی یەکەم، چ ژنی دووەم) چین؟[3] هەروەك بینیمان ڕێژەی (57.82%)ی ژنان، فرەژنی بە شتێکی ڕەوا دەبینن. هەروەها ئەو هەموو کچ و ژنانەی لەچك بەسەر، کە بەشی زۆرینەی ژنانی کوردستانی پێکدەهێنن، نیشانەی چییە؟[4] ئەگەر ئەم فێمێنیستانە نوێنەرایەتیی ڕاستەقینەی ژنانی کوردستان بوونایە، هەموویان یان زۆربەی زۆریان لە هەموو هەڵوێستێکدا لەگەڵیان یەکدەنگ دەبوون و، هیچ یاسایەك کە بە ویستی نوێنەریان نەبوایە، وەکو پێشەنگەکانیان دەڕژانە سەر شەقام و، ناوەندە بەرپرسیارەکانیان دەخستە ژێر فشارەوە. هەروەها هیچ ژنێکیش بەسەر هەوێ نەدەچوو و، هیچ ژنێکیش ئامادە

1 . وەزارەتی پلاندانانی حکومەتی هەرێمی کوردستان: دەستەی ئاماری هەرێم (2014)؛ **"ڕاپۆرتی بەدواداچوونی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری لە هەرێمی کوردستان (2012)"**؛ ل 14.

2 . هەروەك بینیمان، "د. نەزەند بەگیخانی" لەوە زۆر بە گلەیی بوو کە بۆچی تەنانەت ژمارەیەکی کەم لە ژنان، لە دژی یاسای فرەژنی ڕژاونەتە سەر شەقام و خۆپیشاندانیان نەکردووە. بڕوانە: چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەی "ڕۆژنامە" لەگەڵ د. نەزەند بەگیخانی؛ هەمان سەرچاوە.

3 . ئامارە ڕەسمییەکانی ئەنجومەنی دادوەرانی هەرێمی کوردستان لە چوار ساڵی (2010)، تاکو (2013) لەگەڵ سێ مانگی یەکەمی ساڵی (2014) ئاماژە بەوە دەکەن کە (483) حاڵەتی هاوسەرگیری دووەم لە دادگاکانی هەولێر، سلێمانی، دهۆك و گەرمیان تۆمار کراون، هەروەها ئامارە نارەسمییەکانیش دەڵێن: تەنها لە ساڵی (2013)، (600) پیاو لە هەرێمی کوردستان لە ڕێگەی دادگاکانی کەرکوك و مەخموورەوە ژنی دووەمیان مارە کردووە. بڕوانە: ماڵپەڕی ڕووداو (2014/6/5) ڕاپۆرتێکی بڵاو کردووەتەوە بە ناونیشانی: **"483 پیاو لە دادگاکانی هەرێمی کوردستان ژنی دووەمیان مارە کردووە"**؛ لە ماڵپەڕی:

**http://rudaw.net/sorani/kurdistan/050620146**

4 . هەروەك کەسانێکی وەك "تامان شاکر" و "ڕوناك فەرەج" لە هەبوونی ژنانی لەچکبەسەر ـ لە وتارەکانیاندا کە ئاماژەمان پێ کرد ـ ناڕازی و بەگازندە بوون و، تەنانەت تەوەی یەکەم، نیگەرانیی و دڵگرانیی خۆی لە زیادبوونی کچانی لەچکبەسەر لە شاری سلێمانیی پایتەختی ڕۆشنبیریی کوردستان دەردەبڕێت.

نەدەبوو بکەوێتە ژێر باری هاوسەرێتی و دایکایەتی و منداڵداری و کاباندارى، هەروەها گوێڕایەڵی وەلیئەمری خۆی نەدەبوو لە شووکردن، هیچ ژنێکیش بەلەچك نەدەبوو و هتد، وەك ئەوەی ئێستا لە کوردستاندا پێچەوانەکەی دەبینین!

ڕێکخراوی "ڕۆژهەڵات"یش ڕاپرسییەکی کردووە لە سێ شاری هەولێر، دهۆك و سلێمانی، کە بەم شێوەیە بووە: "ڕۆڵی ڕێکخراوەکانی ئافرەتانت پێچۆنە بۆ باشکردنی ڕەوشی ئافرەتان لە کوردستان؟"، کە ئەنجامەکانی بەم شێوەیە بووە: ڕۆڵی لاوازیان بینیوە: (42.26%)؛ هیچ ڕۆڵیان نەبینیوە: (37.26%)؛ ڕۆڵی باشیان بینیوە: (16.46%).[1]

"یەکێتیی ژنانی کوردستان"یش لە سایتەکەی خۆیان ڕاپرسییەکیان کردبوو، کە بەم شێوەیە بووە: "دوای هەژدە ساڵ کارکردن، ئایا یەکێتیی ژنانی کوردستان توانیویەتی ببێتە داکۆکیکاری مەسەلەکانی ژنان"، کە ئەنجامەکانی بەم شێوەیە بووە: بەڵێ (19.82%)، نەخێر (80.18%).[2]

ڕێکخراوی "وادی" ئەڵمانی، ڕۆژنامەی "هاووڵاتی" و سایتی "ڕێگای کوردستان"یش هەر یەك بە جیا، ڕاپۆرتێکیان بڵاو کردووەتەوە، کە ئەوەی لێی بەدەست دێت، تەنها بریتییە لە ناڕازیبوونی زۆربەی هەرەزۆری ژنانی کوردستان لە بەرنامە و پلان و چالاکییەکانی ئەم فێمێنیستانە و سەنتەر و ڕێکخراوەکانیان.[3]

توێژینەوەیەکی کۆمەڵایەتی ـ یاسایی (کۆمەڵناسی و قانون) کە دوو توێژەر کردوویانە، کە هەبوونی ئەم فێمێنیست و چالاکڤانان و داواکارانی مافی ژنان، بە چوارەمین فاکتەری هەڵوەشانەوەی خێزان و هاوسەریی لە کوردستان دەزانن و پێیان وایە:

"کۆمەڵگای کوردی تووشی کێشە بووە و لە ژێر ئەم هەوڵانە چەندەها خێزان تووشی هەڵوەشانەوە هاتوون و تا ئێستاش دیاریدەی خۆکوشتنی کوڕان و کچان هەر بەردەوامە، بگرە لە زیادبوونە و ڕووەو تێکشکانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و بنەماکانی ڕەوشتە، ئەمانەش ڕەنگیان داوەتەوە لەناو کۆمەڵگا، لەوەی بەشێك لە ژنەکان خۆیان بێبەری دەکەن لە زۆر لەو ئەرکانەی کە لەسەریانە وەك هاوسەرێك ئەنجامی بدات و پێویستە بۆ مانەوە و دروستی خێزان. ئەمە هەمووی شوێنەواری ئەو هەڵە تێگەیاندنەیە کە

1 . بڕوانە: فەرمان خەرابەیی؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 23. وەرگیرتووە لە: ڕۆژنامەی بارزان (2008/3/16)؛ ژمارە 59؛ ل 1.

2 . سەرچاوەی پێشوو؛ ل 21. وەرگیرتووە لە: ماڵپەڕی ژیانەوە، یەکێتیی ژنانی کوردستان:
http://www.zhyanawe.com/sereta.aspx

3 . بۆ زانیاریی زیاتر و ورد و تێروتەسەل، بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو؛ ل 22-26.

کۆمەڵەکان و هەندێ داواکاران تووشی کۆمەڵگایان کردووە، هەڵە تێگەیشتنیش لە ماف و ئەرکەکان لە ناو خێزان بۆتە فاکتەرێکی گەورەی تەڵاق و جیابوونەوە."[1]

لەو توێژینەوەدا، باسی هەڵەکانی ئەو داواکاران و فێمێنیستانە دەکرێت کە دەبنەوە هۆی ئەوەی ببنە فاکتەری هەڵوەشانەوەی ژیانی ژنومێردایەتی لە کوردستاندا، کە بریتین لە:

"*1*) بەکارهێنانی ڕێگەیەکی دوژمنانە و توندڕەوانە لەو کار و چالاکییانەی ئەنجامی دەدەن. *2*) هەوڵەکان تەنها بۆ داواکردنی یەکسانی نییە، بەڵکو بە دانانی ئافرەت بە بەرزتر لە پیاو. *3*) لە جیاتی بەرژەوەندیی گشتی (کە ئەویش خێزان و کۆمەڵگایەکی دروستە) داوای وا دەکرێ دەبێتە فاکتەری تێکدانی خێزان. بۆ نموونە دەوترێ: کچ ئازاد بێ کەی دێتەوە ماڵەوە. *4*) هێرشکردنە سەر ئایین و کولتوور و دابونەریت بە شێوەیەکی گشتی و هەڕەمەکی، بەمەش چاك و خراپ بەیەکەوە دەسووتێ. *5*) تەنها ژمارەیەك پیاو پێویستە قسەکانیان بۆیان ئاراستە بکرێ، کەچی ئەوان جەنگیان جاڕ داوە بەرامبەر هەموو پیاوێك، بە مانای جەنگی جیاوازکردنی ڕەگەز بۆ نەهێشتنی جیاوازیی ڕەگەزی. *6*) لە چاوکردنەوەیەکی تەواوی ڕۆژئاوا، کە گرفتەکان و ئایین و سروشت و ... هیتر جیاوازن لە نێوان کۆمەڵگاکان، لەوانەیە کارێك چارەسەر بێ لە کۆمەڵگایەك و تێکشکێنەر بێ لە کۆمەڵگایەکی تر."[2]

ئەم هەڵانەش ـ بەپێی ئەم توێژینەوەیە ـ ئەم کاریگەرییانەی هەیە:

"*1*) دوو چین لە کۆمەڵگادا دروست دەبن: چینی ئافرەت و چینی پیاو، دەبنە بەرهەڵستکاری یەکتر و ڕك و کینە و دوژمنایەتی دروست دەکات لە نێوانیان (ژن و مێرد، خۆشك و برا و هتد). *2*) پێگەیاندنێکی هەڵە بۆ کۆمەڵگا: چونکە بێ بەرنامەیی لە گەیاندنی بیرۆکەکان بۆ هاوولاتیان دەبێتە هۆی ئەوەی هەریەکە لە نێر و مێ لە ئەرکەکانی خۆی کەمکاتەوە و تەنها داوای ماف بکات، هەتا لە بابەتێك مافی ئەویش نەبێ. *3*) نەهاتنەدی ئامانجەکانی ئەم کۆمەڵانە: لە جیاتی چاکسازیی کۆمەڵایەتی، تێکدانی کۆمەڵایەتی دەبێ بە ئەنجام. *4*) تێکشکانی بنەما جوانەکانی کەلتوور و ڕەوشت و ئایین و دابونەریت و بنەما جوانەکانی مرۆڤ. *5*) زیاتر ڕەشبینکردنی کۆمەڵگا و یەکە یەکەی تاکەکانی لەسەر حاڵی خۆیان... ئەمانە هەر هەموویان سەردەکەنە زیادکرنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان و بەرزکردنەوەی ڕێژەی هەڵوەشانەوەی خێزان."[3]

لێکۆڵینەوەیەکی تیۆریی دیکە بە ناوی "ئافرەت لە ڕوانگەی عەلمانی و ئایینییەوە"، ئەم تێبینییانەی خوارەوە دەخاتە سەر کار و چالاکیی فێمێنیستەکان و داواکارانی ماف و ئازادییەکانی ژنان لە کوردستان:

1 . بێدار فارس عزیز و نیگار دلێر أحمد؛ هەمان سەرچاوە؛ ل 68.

2 . سەرچاوەی پێشوو؛ ل 70-72.

3 . سەرچاوەی پێشوو؛ ل 72.

"1) لاسایکردنەوەی ئەزموونی سەدەیەك پێش ئێستای جیهان: بۆ نموونە لە کورستان ڕۆژنامەیەکی مافی ئافرەت بە ناوی "یەکسانی" دەردەچوو، هەمان ڕۆژنامە بە هەمان ناو و ناوەڕۆك و ئامانجەوە پێش (112) ساڵ لەمەوبەر لە ئەڵمانیا بە ناوی "گلایخایت" واتە یەکسانی دەردەچوو، کە دوای (18) ساڵ شکستی هێنا؛ واتە ئێمەی کورد لاسای ئەزموونێکی شکستخواردووی پێش سەدەیەك لەمەوپێش دەکەینەوە. 2) بەشی هەرە زۆری ئەم ڕێکخراوانەی لە کوردستان بۆ ئافرەتان دروستبووینە، لە لایەن پیاوانەوە دروست کراون. 3) ئەو ڕێکخراوە ئافرەتانە بە موتڵەقی ئافرەتێکی تەمەن گەورە و پیرەژنی تێدانییە، وا دیارە تەنها ئافرەتە گەنج و جوانەکان مافیان هەیە. 4) داواکارییەکانیان خەیاڵین: بۆ نموونە داوای یەکسانی دەکەن، کە لە هیچ کونجێکی ئەم جیهانە هەتا ئێستا نەهاتۆتەدی. 5) هەندێ داوایتر دەکەن نازانن مانای چییە: داوای دایکسالاری دەکەن لە بەرامبەر باوکسالاری، جارێ بناغەی ئەو تیۆرەیە هەر هەڵەیە. 6) زۆربەی کێشەکانی ئافرەت لە سووتان و کوژران و خنکان و بەرەو لەشفرۆشی و هتد، ئەو کەسانە و ڕێکخراوانە لێی بەرپرسیارن، کاتی هانیان دەدەن لە خانەوادە و ژینگەکەیان یاخی بن و... تووشی کارەسات دەبن. بۆ زانیاریی زیاتر لەو بارەیەوە کتێبی "ئۆقیانووسێك لە تاوان" بخوێنەوە. 7) لە کۆتاییدا، گومانی ئەوە دەکرێ خاوەن ئەو گەڵالانە واتێگەیشتوون هەرچی دژ بە ئاین بکەی، پێشکەوتنە. ئەو بیرە وەختی خۆی لە لایەن أبوالعلاء المعری و دوایش لە لایەن هوایتهد پەیڕەو کراوە."[1]

لە توێژینەوەی "ئۆقیانووسێك لە تاوان"، کە توێژینەوەیەکی مەیدانی و کۆمەڵایەتییە لەسەر دیاردەی لەشفرۆشی لە کوردستاندا، باسی چەند حاڵەت (Case)ێك دەکات، کە کچە لێقەوماوەکان پەنایان بردووەتە بەر هەندێ سەنتەر و ڕێکخراوی تایبەت بە داڵدەدانی ژنان و کچان ـ بە تایبەتی ئەوانەی لە لایەن خانەوادەیانەوە لە مەترسی و هەڕەشەدان ـ بەڵام بەهۆی کەمتەرخەمی و بایەخپێنەدانی ئەمجۆرە سەنتەرانە و داڵدەنەدانیان، تووشی دیاردەی لەشفرۆشی و کەوتنە ناو داوی نێچیری باندە بازرگانییە سێکسییەکان بوونەتەوە.[2]

بەڵگەکانی سەرەوە بۆمان دەردەخات کە ئەم فێمێنیستە ڕۆشنبیرانە نوێنەری ژنانی کوردستان نین، تاکو بە نوێنەرایەتیی ئەوان قسە بکەن و هەڵوێست بنوێنن و، کەسیش وەکالەتی نەداونەتێ ببنە دەمڕاست و وتەبێژی ژنانی کوردستان و لە جیاتی ئەوانەوە قسە بکەن و بڕیاریان بۆ بدەن. جگە لەمەش زۆر لە چالاکییەکانیان، بەتایبەتی ئەوانەی لە میانەی سەنتەرەکان و

1 . مسعود عبدالخالق (2014)؛ **"ئافرەت لە ڕوانگەی عەلمانی و ئاینییەوە"**؛ هەولێر: حاجی قادری کۆیی؛ چاپی دووەم؛ ل 239-242.

2 . بۆ خوێندنەوەی بەسەرهاتی ئەو حاڵەتانە، بڕوانە: خەندان محەمەد جەزا سەرپاچ (2008)؛ **"ئۆقیانووسێك لە تاوان: توێژینەوەیەکی کۆمەڵایەتییە، سەبارەت بە دیاردەی لەشفرۆشی و بازرگانی بە جەستەی ڕەگەزی مێینەوە لە کۆمەڵگای کوردستاندا"**؛ ڕێکخراوی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیی خانزاد؛ چاپی سێیەم؛ ل 95-97 و 142 و 153-155.

ڕێکخراوەکانیانەوە دەیکەن، نە تەنها لە بەرژەوەندیی ژنانی کوردستاندا نەبووە، بەڵکو بە زیانی ژنان بە تایبەتی و، خێزان و کۆمەڵگاش بە گشتی تەواو بووە.

یەکێك لەو ژنە چالاکڤانانە لە گفتوگۆیەکدا بە ناونیشانی "ژنبوون لە نێوان ئازادی و بەکاڵابووندا" بەم شێوەیە گلەیی لەو بەناوفێمێنیستانە دەکات و دەڵێ:

"لە واقیعدا ئەوەی لە کوردستان دەیبینم ئەوانەشی کە بەو ناوە کار دەکەن زۆربەیان ڕێکخراون سەر بە پارتە سیاسییەکانی کوردستانن و جا چ علمانی بێت یاخود ئیسلامی،... چونکە زۆربەی ئەوانەی کە بەو ناوانە کاریان بۆ مافەکانی ژنان و ئافرەتان دەکرد ئەمڕۆ دەبینیت لە قەرەی پارتێکی سیاسیدا خۆی دەبینێتەوە و زیاتر کار بۆ خودی بەرژەوەندی خۆی و کەسی خۆی دەکات، پێشم وایە ئەو ڕێکخراوانەشی کە دروست بوون بە ناوی جیاجیای مافەکانی ژن و ئافرەت و خوشك ...تاد، ئەمانە ژنان و ئافرەتان و خوشکانیان وەك ئامرازێك بەکار هێناوە بۆ گەیشتن بە مافە کەسییەکانی خۆیان بە شێوەیەکی گشتی و گەیشتنە بە دەسەڵاتێك و بەکارهێنانیانە بۆ بەرژەوەندی خۆیان، جگە لەمەش لەو ماوەیەی واقعی کوردستاندا ئافرەت و ژنێکی زۆر بانگەشەی وەرگرتنەوەی مافی ژن و ئافرەت دەکەن، بەڵام لە واقعدا خۆیان مافەکانی ژنان و ئافرەتیان پێشێل کردووە... پێم وایە ئەمانە نوێنەرایەتی ژنان و ئافرەتان و خوشکان ناکەن لە کوردستاندا؛ چونکە خۆیان ئەو پێگەی ژنان و ئافرەتیان پێشێل کردووە."[1]

ئەم گلەییانە لە ڕەوتە فێمێنیستەکان، تایبەت نییە بە کوردستانی خۆمان، بەڵکو لە وڵاتە ئیسلامییەکان و تەنانەت ئەورووپییەکانیش توێژینەوە و ڕاپرسیی هاوشێوەی کوردستان کراوە، کە نیشاندەری شکستی بیرۆکەی فێمێنیزمە و ڕەتکردنەوەی دروشمەکان و دەستکەوتەکانیانە؛ بۆ نموونە:

لە ڕاپرسییەکی بەرفراواندا، کە ساڵی (2006) لە لایەن "سەنتەری جیهانیی پیۆ" (Pew Global) لە (13) وڵاتی: ئەمریکا، ئەڵمانیا، ئیسپانیا، بریتانیا، فەرەنسا، ڕوسیا، بلیجیکا، تورکیا، میسر، ئەردەن، ئەندونیزیا، پاکستان و نیجیریا ئەنجامدراوە، دەریخستووە کە چوار لەسەر پێنجی ژنە موسڵمانەکان لەو وڵاتانەدا (واتە 80%) بڕوایان وایە کە ژنە ئەورووپییەکان خاوەن ڕێز و ماف و کەرامەت نین و بەباشی مامەڵەیان لەگەڵ ناکرێت؛ کەواتە ئەنجامەکانی ئەو توێژینەوە، ئەو ڕای

---

1 . هەتاو کەریم (2013): "ژنبوون لە نێوان ئازادی و بەکاڵابووندا"؛ گۆڤاری شیکار؛ ساڵی یەکەم؛ ژمارە 3؛ ل 156-157.

گشتییەی کە لە ئەوروپا سەبارەت بە ژنە موسڵمانەکان هەیە و پێیان وایە لە ناخی دڵەوە چاوەڕوانن کە وەکو ژنە ڕۆژئاواییەکان لە مۆدە و پۆشاکەوە ئازاد بن، بە هەڵە دەردەخاتەوە.[1]

توێژینەوەیەکی دیکە لە لایەن "زانکۆی پرینسێتۆن" بەهۆی خاتوو "سەمیرا مەحموود"ەوە لەسەر ژنانی میسر ئەنجام دراوە (ساڵی 2005)، کە لە هەمان ساڵ وەك کتێبەك لە ژێر ناونیشانی "سیاسەتە ئایینخوازییەکان: بووژاندنەوەی ئیسلامی و بابەتی فێمێنیست" بڵاو دەکاتەوە. لە دەرئەنجامەکانیدا دەڵێت:

"کەواتە زۆرینەیان دەڵێن: ئێمە بە ناو موسڵمانین، ڕەفتارەکانمان جیاوازە لەگەڵ ئیسلام... باوەڕەکانمان، حیجاب و پۆشاك، خواردن و خواردنەوەمان پێویستە بۆ خوا بێت و لە ڕووی عەشق و خۆشەویستیشەوە بێت... ئەوان پێتان دەڵێن: ئەم شێوازە ژیانە ناشارستانییە و گوێ مەدەنە قسەکانیان (مەبەستی ژیانی ڕۆژئاوا و قسەی فێمێنیستەکانە)؛ چونکە ئەوان دەزانن: شارستانییەتی ڕاستەقینە بۆ موسڵمانان، تەنها نزیکبوونەوەیە لە خوا و پەیڕەویکردنی ڕێنماییەکانی خوایە، کە مرۆڤ لە ئاژەڵ جیادەکاتەوە."[2]

فێمێنیستێکی بەناوبانگی ئێرانیش، خاتوو "د. ناهید مطیع" لە دەرئەنجامی توێژینەوەکەی بە ناوی "فێمێنیزم لە ئێران بەدوای ڕێگەچارەیەکی خۆماڵی"دا دەڵێ:

"وێکچوواندن و هاوشێوەزانینی ژنان و پیاوان لە ڕووی بەهاییەوە، شۆڕشێکی گەورە بوو، کە دیاردەی وەك هاوڕەگەزبازی، نێربازی، لێکترازان و ئەنۆمیی خێزانی بەبار هێناوە... و وردبوونەوە لەو خاڵە زۆر گرنگە؛ چونکە سەرباری ئەوەی لەو سەردەمەدا سیستمی بەرابەرخوازی لەجیاتی پیاوسالاری پێشنیاز دەکرێت، بەڵام ئەم بەرابەری و یەکسانییە بۆتە هۆی قوربانیبوونی ژنان و مێینەیی، یان بە کاڵازانینی ئەوان و دوورخستنەوەیان لە هێزی وەچەهێنان؛ بەواتایەکیتر، ژنی ڕۆژئاوایی لە ڕێگەی هاوشێوە بوون بە پیاوان و بە کەمزانینی توانایە بایۆلۆژییە تایبەتییەکانی خۆی توانیوە لەگەڵ پیاوان یەکسان بێت، تەنانەت هەندێ لە تیۆرەوانان پێیان وایە جێگەی پیاوانی دەسەڵاتپەرست، باڵادەست و توندڕەوی سەردەمی پێشوو (پیاوسالاری) بگرنەوە؛ بەواتایەکیتر، ڕۆژئاوا وردەوردە دەڕواتە ناو قۆناغێکی نوێ، کە دەکرێ چەمکی "سەردەمی ژنسالاریی نوێ" بۆ بەکار ببەین... تەوەری خەبات و کێبرکێی تیۆری و پراکتیزیی بزووتنەوەی فێمێنیزم لە ڕۆژئاوا دروشمی بەرابەری و یەکسانیی مافی ژن و پیاو بووە، بەڵام لەوانەیە دەرئەنجامی ناچارانە

1 . Pew Global Attitudes Project (22/6/2006), **"The Great Divide: How Westerners And Muslims View Each Other"**, p. 2, from: <http://www.pewglobal.org/files/pdf/253.pdf>

2 . Mahmood, Samira (2005), **"Politics of Piety: The Islamic Revival and The Feminist Subject"**, New Jersey: Princeton University Press, pp. 44-45.

و نەخوازراوی گەشەی ئەم بزووتنەوەیە، سەرباری هێنانەدیی هەندێ لە دیاردەکانی وەك هاوڕەگەزبازی، دوو ڕەگەزیتی و زیادبوونی ڕێژەی تەڵاق، ئاراستەی ژنان بۆ دەسەڵاتپەرستییە."[1]

یان ئەو دەرئەنجامانەی کە "ئسپۆزیتۆ" لە توێژینەوەکەیدا لە دوای شیکردنەوەی ئەو گریمانەیە: "ئایا ژنە موسڵمانەکان کە قۆناغی خوێندنی باڵایان بڕیوە و بە باشی شارەزای مافەکانیانن، مامەڵەیەکی دژ بە ئیسلامیان هەیە؟" دەخاتەڕوو و دەڵێ:

"وەڵامی ئەو پرسیارە، بەپێی دەرئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکەمان بریتییە لە: هەرگیز!... یەکێك لە دەرئەنجامە یەکلاکەرەوەکان لە توێژینەوەی ئێمە لەسەر جیهانی ئیسلام، بریتییە لە: ئیمان و پابەندبوون بە ئایینی ئیسلام، بەتایبەتی "حیجاب"، گرنگییەکی زۆری هەیە بۆ وەڵامدەرەوەکان لە ژیانی تاکەکەسی و ژینگەی کۆمەڵایەتییاندا. ڕێژەی زۆرینەیان لە هەموو ئەو وڵاتانەدا کە گالۆپ هەڵیسەنگەیاندووە، گوتوویانە: "ئایین بەشی هەرە سەرەکی و گرنگە لە ژیانیان"... و "وابەستەبوون بە بەها مەعنەوی و ئەخلاقی و ڕەفتارە ئایینییەکان بۆ پێشکەوتنی ئەوان لە ژیاندا بە خاڵێکی زۆر گرنگ و هەستیار زانراوە". کاتێك کە پرسیاریان لێکراوە: "چ شتێك زیاتر لە هەموو شتەکانی دیکە لە کۆمەڵگای خۆتان بە باشتر دەزانن و شانازی پێوە دەکەن؟"، زۆربەیان لە وەڵامدا گوتوویانە: "وابەستەیی باوەڕدارانە و ڕاستگۆیانە بە باوەڕ و یاسا شەرعییەکان و ڕێزگرتن لە ڕێنمایی و سیمبۆلە ئایینییەکان"... هەروەها ژنان زیاتر لە پیاوان گوتوویانە کە: ئیمان بە بنەماکانی ئیسلام، هەم لە لایەن خۆیانەوە، هەمیش وەك گەورەترین سەرمایەی کۆمەڵگا، بە گرنگترین شت دەزانن."[2]

ئەمە ڕای ژنە موسڵمانەکان بوو لە وڵاتە جیاجیا ئیسلامی و ئەوروپییەکاندا، کە بە جۆرێك لە جۆرەکان نیشاندەری "فێمێنیزمی پێچەوانە" (Reverse Feminism)یە. ڕاوبۆچوونی ژنە ئەوروپییەکانیش بە هەمان شێوە؛ ئەوەتا توێژینەوەیەکی ئاکادیمی لە "زانکۆی شاهانەی لەندەن" (King's College London) کە لە ساڵی (2013)دا ئەنجام دراوە، پوختەی دەرئەنجامەکەی بریتییە لەوەی کە ئێستا ژنانی ئەوروپی، فێمێنیزم بە کۆن و بەسەرچوو (Obsolete)، یان پەیوەست بە بیروباوەڕی توندڕەوی وەسف دەکەن و بە توندی ڕەتی دەکەنەوە و دەشڵێن: ڕاستە کە فێمێنیزم داوای یەکسانیی ژن و پیاو دەکات، بەڵام ژنانی ئەوروپی بە بیرۆکەی "پیاوبێزاری" (man-hatred)، "هاوڕەگەزبازیی ژنانە" (Lesbianism) و "ژنانی دژەمێینە"یی (Unfemininie Women)

---

1 . مطیع، ناهید (1997)؛ "فمینیسم در ایران در جستجوی یك رهیافت بومی"؛ فصلنامه کتاب زنان؛ سال ششم؛ شماره 33؛ ص44.

2 . Esposito, op.cit., pp. 112-113.

دەبەستنەوە.[1] ئەم توێژینەوە زانستییە بووەتە جێگای سەرنجدانی زۆر لە زانایان و توێژەرانی دیکە، تا ڕادەیەك کەسێکی وەك خاتوو "د. کریستانا شارف" (Dr. Christina Scharff) ـ کە مامۆستای زانکۆیە لە بەشی کولتوور و میدیا ـ ئەم توێژینەوەیە لە کتێبێکی جیادا شی دەکاتەوە، کە پوختەکەی دەڵێ: فێمێنیزم لەگەڵ ژیانی مودێرنی ئێستا ناگونجێت و ئیتر پێویست نییە هەبێت. تەنانەت لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی ئەوروپا، تەنها بە ناوهێنانی وشەی "فێمێنیزم"، ئەم چەمکانە یەکسەر لە ناخی خەڵکدا بە تایبەتی ژنان دەوروووژێنێ: "نائاسوودەیی و ناڕەحەتی"، "سەرلێشێوان و گومڕایی" و "دوژمنایەتی و نەیاری". کتێبەکەی کە بە ناوی: "دەستبەرداربوون لە فێمینیزم: ئافرەتانی گەنج لە جیهانی نیولیبراڵیدا" بڵاو بووەتەوە، پاڵێوراو بووە بۆ وەرگرتنی خەڵاتی (BSA Philip Abrams Momrial Prize).[2]

گۆڤارە ئەمریکییەکەی "نیۆیۆرك تایمز" (NewYork Magazine)یش، ئەنجامەکانی توێژینەوەیەکی مەیدانی زۆر بەرفراوان، کە لە ساڵی (2013) ئەنجام دراوە، بە ناونیشانی "ژنی کۆن" (The Retro Wife) لە (7) لاپەڕدا بڵاو دەکاتەوە، کە پوختەی دەرئەنجامەکانی ئەوەمان بۆ دەردەخات کە: ژنە گەنجە ئەمریکییەکان، کە لە دەرەوەی ماڵ کار دەکەن، بەپێچەوانەی بانگەشەکانی فێمێنیستە ئەمریکییەکان، خۆزگە دەخوازن و وەك خۆیان دەڵێن: "دەستیشمان پێکردووە" کە وەکو داپیرەکانیان دایکایەتی بکەن و منداڵیان هەبێت و بەخێویان بکەن و وەکو ژنانی کۆن، ژیانی خێزانی پێك بهێنن و ڕۆڵی هاوسەرێکی سۆزدار، کە منداڵداری بکەن پێ پەسندترە لەوەی کە بە دوای کار و پیشەدا بگەڕێن و مووچەیان هەبێت. ئەوان دەڵێن: بۆمان سەلمێنراوە کە دروشمی فێمێنیزم سەبارەت بە کاری دەرەوەی ماڵ بۆ ژنان بێهوودەیە.[3]

ئامارەکانی بەشی دووەم، زیاتر ئەم ڕاستییانە دووپات دەکەنەوە؛ بەتایبەتی ئەو ئامارە ڕەسمی و توێژینەوە زانستییانەی کە شکستی بیرۆکەی فێمێنیزم و دەستکەوتەکانی لە ڕۆژئاوا دەسەلمێنن.

---

1 . King's College London (Mar 8, 2013), "**Young women may reject Feminism as Marginal and old-fashioned**": http://www.kcl.ac.uk/newsevents/news/newsrecords/2013/03-March/Young-women-may-reject-feminism-as-marginal-and-old-fashioned.aspx

2 . Scharff, Dr. Christina (2013), "**Repudiating Feminism: Young Women in a Neoliberal World**", Surrey: Ashgate Publishing, pp. 1-174.

3 . Miller, Lisa (Mar 17, 2013), "**The Retro Wife**", NewYork Magazine: http://nymag.com/news/features/retro-wife-2013-3/

## پوخته و دەرئەنجامەکانی بەشی یەکەم:

لە کۆتاییەکەی ئەم بەشەدا، پوختەی بابەتە سەرەکییەکانی، خاڵبەخاڵ دەهێنینەوە، کە بە تاوتوێکردن و شیکردنەوە و ڕەخنەی وتارەکانی ڕۆشنبیرە فێمێنیستە کوردەکان، هەوڵمان داوە بگەینە وەڵامی چاوەڕوانکراوی ئەو پرسیارانەی کە لە دەستپێکی ئەم بەشەدا دەستنیشانمان کردبوون، بۆ وەڵامدانەوە و ڕاڤەکردن:

1. ئەوانەی کە بانگەشەی "ئازادیی ژنان" لە کوردستاندا دەکەن و بوونەتە پێشەنگ و پێشڕەوی ئازادیخوازەکان، بریتین لە: کۆمەڵێك لەو ڕۆشنبیرانەی کە ئاراستەی فێمێنیستانەیان هەیە، یان ئەو فێمێنیستانەی کە کاری ڕۆشنبیری دەکەن و خۆیان بە ڕۆشنبیر دەزانن و باسی سەرچاوەی فیکری و مەعریفیی ئەوانمان کرد، کە گوتمان زۆربەی هەرەزۆریان لاساییکەر و ڕووکەشبینن و، تەنانەت ئەو ڕەخنانەش کە ئاراستەی کۆمەڵگا و پێکهاتەکانی دەکەن، بەرهەمی خۆیان نییە و وەکو بەکاربەران، بازرگانیی پێوە دەکەن. شێوازی بانگەشەی ئەوان بۆ ئازادیی ژنان، بابەتێکی دیکە بوو، کە تاوتوێمان کردەوە.

2. گوتمان: ڕەوتە باوەکانی فێمێنیزم لە کوردستاندا بریتین لە:

- فێمێنیزمی لیبراڵ: (کە هۆکاری چەوساندنەوەی ژنان دەگەڕێنێتەوە بۆ مانەوەی ژنان لە ماڵەوە و بێبەشکردنیان لە ئازادی، ماف و دەرفەتەکان لە بواری گشتی و کۆمەڵایەتی و سیاسیدا).
- فێمێنیزمی مارکسیست: (کە لە نێوان ڕۆشنبیرە چەپەکاندا باوە و، سیستمی سەرمایەداری و خاوەندارێتیی تایبەت، تەنانەت مارەیی و ناسەربەخۆیی ئابووری بە فاکتەری سەرەکیی ستەم و نایەکسانیی دژ بە ژنان دەزانێت).
- فێمێنیزمی ڕادیکاڵ: (کە سیستمی پیاوسالاری بە هۆکاری چەوساندنەوەی ژنان دەزانێت).

